محەمەد خدر

# پشووی چیا

چەمکێک لە بیرەوەرییەکانی پێشمەرگەیەک








**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **پشووی چیا** **(چمکێك لە بیرەوەرییەکانی پێشمەرگەیەك)**
- **محەمەد خدر**
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** هۆگر سدیق
- **نرخ:** ٤٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم :** ٢٠١٢
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی موکریانی (هەولێر)
- لە بەرێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٨٤٢) ساڵی (٢٠١٢)ی پێی دراوە

**زنجیرەی کتێب (٦٩٢)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

**پێشکەشە:**

بە دایکم و ئەو خۆشەویستانەی لە شەوانی پێشمەرگایەتیدا، لەشیرین خەودا بێدارم کردوونەوە...

چیرۆکی بیرەوەری ڕۆژانی پێشمەرگایەتی و ساڵانی دوای ڕاپەڕین، بەشێکە لە دەرهاویشتە و کەف و کوڵی دەروونی بەندە، کە هێشتا یادەوەری ئەو ڕۆژگارانە لە مێشك و دەروونمدا پەنگ دەخۆنەوە...نووسینەوەی ئەو بیرەوەریانە دەچێتە خانەی ماشتنەوەی ژیانی سیاسی بەندە لەو قۆناغە سەختانەی کە گەلەکەم پێیدا ڕەتبووە، لە باسکردنی ئەو ڕۆژگارانە خۆم لە خۆتێهەڵسوونی بڕیارەکانی سەرکردایەتی (حزب)، بواردووە. وەکو کادرێکی ئۆرگانەکانی خوارەوە پێشمەرگەیەکی مەیدانی بووم، ئەگەر بە مەیدانی هەژماربکرێ... لە ڕووداوەکانی ڕۆژانی سەخت پشتم بە تۆمارەکانی ڕۆژژمێرێکی هاوسەر بەستووە، کە ئەو ساڵە لە پێشمەرگایەتیدا باوبوو. ئەو بەسەرهاتەی لەو ڕۆژمێرەشدا تۆمارنەکرابێ، چەندە یادەوەرییەکانم بڕی کردبێ، مێشکی خۆم بەکارهێناوە بۆ ئەوەی ڕووداوەکانی دەوروبەری خۆم وەکو خۆی بنووسمەوە، بەڵام دیسان هەر بێ هەڵەو کەموکورتی نییە، هەر بۆیە پێشەکی داوای لێبوردن دەکەم لە خوێنەران بەگشتی و هاوڕێ و برادەرە دێرینەکانم بە تایبەتی ... ڕێڕەوی ژیانی پێشمەرگایەتی خۆم وەکو ڕێبوارێکی ئاسایی باسکردووە، لەباسکردن و نووسینەوەی ئەو ڕۆژگارانەدا نامەوێت ڕووماڵێکی جوانکاری بۆ بکەم، ئێمە زۆربەمان کوڕە هەژارو جووتیاری دەڤەری پشدەر بووین و هەین، لەناو پشدەریاندا جوێندان، نوکتە و قسەی نەستەق بەشێکی دانەبڕاوە لەژیانی ئاسایی خەڵکی دەڤەرەکە، هەر بۆیە جارجارە جوێن و قسە خۆشەکانی ئەوێ ڕۆژێم وەکو خۆی نووسیوەتەوە، یادەوەری ئەو ڕۆژگارانەم خۆشدەوێت، بەتایبەتی بەشێك لە قسە و بەسەرهاتەکان لەگەڵ هاوڕێ شەهیدەکاندا بووە، هیوادارم هاوڕێ دێرینەکانم لێم زیزنەبن.

بەشێك لە ڕووداوەکانی پشووی چیا لە ساڵی ١٩٩٩ بەناوی (ڕۆژانی پێشمەرگایەتی) لە نامیلکەیەکی قەوارە (١٢٢) لاپەڕەیی بەچاپ گەیشت، بەڵام هەڵەی چاپ و شێوازی نووسینەکە پەڕتوکەکەی بێ پێزو بێ بەهرەو هونەری نووسین کردبوو، هەر بۆیە بە پێویستم زانی بەشێوازێکی تر چیرۆکی ژیانی پێشمەرگایەتی و ساڵانی دوای ڕاپەڕین بنووسمەوە... زۆر سوپاسی هاوڕێی دێرینم کاك مستەفا غەفور دەکەم، کە ئەرکی پێداچوونەوەو هەڵەچنی (پشووی چیا)ی گرتەئەستۆی خۆی...سوپاس و ڕێزم بۆ ئەو بەڕێزانەی ئەرکی تایپکردن و کاری هونەری و تەکنیکی (پشووی چیا)یان گرتەئەستۆ، کاتەکانی خۆیان بۆ ئەو پەرتووکە تەرخانکرد...

نووسەر

## بارودۆخی دوای شۆڕشی ئەیلول:

لە دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول، هەلومەرجێکی نوێ سەریهەڵدا، ڕژێمی دیکتاتۆری عێراق لە روانگەی بیروباوەڕی شۆڤێنیستی حزبی بەعسەوە، سیاسەتی تواندنەوەی گەلی کوردی پەیڕەو دەکرد، هەر بۆیە لە هەموو بوارەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، ئابووری و سایکۆلۆژییەوە، پلانی دانابوو بۆ ئەوەی کۆمەڵگای کوردەواری دەستەمۆ بکات. لە رووی سیاسییەوە هەوڵی دەدا شوێنەواری شۆڕشگێڕی و شۆڕشی ئەیلول بسڕێتەوە، بۆ ئەو مەبەستەش شاڵاوێکی بەرفراوانی لە ناو دەڤەرە شۆڕشگێڕییەکاندا دەست پێکردبوو، هەرچی رۆژێك کاری سیاسی کردبوو داوای لێ دەکرد بچێتە ریزی حزبی بەعسەوە، لە هەموو بۆنەکانی حزبی بەعس رێپێوانیان لە شارو شارۆچکەکاندا سازدەکرد بە شان و باڵی حزبی بەعسیاندا هەڵدەگوت، هەر بۆ نموونە لە شارۆچکەی سەنگەسەردا ژمارەیەك گەنجی کەم ئەزموونیان فریودا بە پارەو ئیمتیازی هەمەجۆرە، وەپێش رێپێوانەکانیان دەدان، هاواریان دەکرد هەموو (سەنگەسەر) بەعسییە: ئەمنەکانی مونەزەمەی حزبی بەعسیش لە سەنگەسەر لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا دەیانگوت هەرچی حزبە لە عێراقدا وجودی نییە جگە لە (بەعس)، جارێکیان لە ساڵی ١٩٧٦ شاندێکی بەعس و مەئمور مەرکەزی سەنگەسەر بە ناوی (هاشم) ناوێك بۆ گوندەکەی ئێمە بەستەسێنی سەروو هاتبوون، کۆبوونەوەیان بە خەڵکی گوندەکە کرد، بەرپرسی شاندەکە ئەمنێك بوو پێیان دەگوت ئەمنە سەر(سپی)یەکە، کەسێکی زۆر دڵسۆز بوو بۆ بەعسییەکان، لە کۆڕەکەدا وتی: پێویستە هەمووتان ببن بە بەعسی، خەڵکەکە هەمووی بێدەنگ بوون، هەندێکیان سەری ڕەزامەندیان بۆ ئەمنە سەرسپی لەقاند، هەندێ لەوانە کە پێشتر لە ناو شۆڕشدا خۆیان بە دەمڕاست و شۆڕشگێڕ دەزانی بوون بە بەعسی، تەنها کەسێك کە دەنگی ناڕەزایی بەرزکردەوە، مام برایمی مامم بوو، وتی: من شیوعیم نابم بە بەعسی، ئەمنە سەرسپی سەیری مام برایمی کرد! پێی سەیر بوو پیاوێکی نەخوێندەواری هەژار چۆن وا بە راشکاوی دەڵێ من شیوعیم، (هاشم)ی مەئمور مەرکەز ویستی هەڕەشە لە مام برایم بکات، بەڵام ئەمنە سەر(سپی) چاوێکی لێکرد و وتی ئەو پیاوە لەگەڵ بیروباوەڕی خۆی راستگۆیە، هەر لەگەڵ شاندەکەدا کە کۆڕەکەیان ئامادەکردبوو کارمەندێکی دایرەی کشتوکاڵی سەنگەسەریان لەگەڵ بوو هەویەی دایرەی زراعەی دەدا بە جووتیاران، بە مام برایمی گوت لەسەر (مهنەکەت) واتا پیشەکەت بنووسم چی؟ مام برایم وا حەماسەت گرتبووی لە

جیاتی بلّیّ بنووسە جووتیار، وتی بنووسە(شیوعی)، بە پێکەنینەوە وتی باشە مام برایم وا بۆت دەنووسم (شیوعی)، هەتا ئەم سالاّنەی دوایی ئەو هەویە هەرمابوو....

ڕژێمی شۆڤێنی عێراق بە نشوستی شۆڕشی ئەیلول ئەوەندە لە خۆبایی بوو، تەنانەت بە لاوازترین ئاستی بەشداربوونی حزبی شیوعی عێراقی رازی نەبوو، کە وەکو حزبێکی سیاسی لە چوارچێوەی جەبهەکەیاندا بمێنێتەوە، هەر بە چاوی دوژمن سەیری دەکرد، ئەوە بوو شالاّوێکی بەرفراوانی دەست پێکرد بۆ سەر رێکخراوەکانی حزبی شیوعی عێراقی هەموو ئەندامەکانی خستە ژێر چاودێرییەوە، هەر جارە بیانوویێکی بە شیوعییەکان دەگرت، جارێك پێیان دەگوتن چەکتان شاردۆتەوە، جارێکی تر بە ناوێکی تر ئەندام و لایەنگرەکانیان بانگ دەکردن بۆ دائیرەی (ئەمن)، ئەو شالاّوە بەردەوام بوو هەتا بە یەکجاری لێدان و قەدەغەکردنی حزبی شیوعی راگەیەنرا، هەر لەو کاتەدا کە شالاّوی گرتن و پاکانە پێکردنی شیوعییەکان بەردەوام بوو لە شارو شارۆچکەکانی کوردستان، رۆژنامەی طریق الشعب و رێگای کوردستان لە بەغدا بە ئاشکرا بە چاپ دەگەیەندران، بارەگای سەرکردایەتی (ح.ش.ع) بە فەرمی هەبوو، ئەمەش جۆرێك بوو لە سیاسەتی (بەعس) دەیویست حزبی شیوعی عێراقیش وەکو حزبە کارتۆنییەکانی تر بچووك بکاتەوەو دایمالّیّ لە جەماوەرو بنکە حزبییەکانی، بەتایبەتی لە کوردستاندا کە حزبی شیوعی عێراقی هەمیشە خاوەن نفوزی خۆی بووە لە ناو چینی جووتیارو هەژاری ناوچەکەدا، ئەو بارودۆخە لەرزۆکەی نێوان حزبی شیوعی و حزبی بەعس، بە درێژایی سالانی ١٩٧٦،١٩٧٧،١٩٧٨ بەردەوام بوو، تا سالّی ١٩٧٨ بە یەکجاری شالاّوی گرتن و پاکانە پێکردنی شیوعییەکان لە سەرانسەری عێراق دەستی پێکرد، حزبی شیوعی عێراقی کەوتە نێوان دووڕییانێکی چارەنووسساز یا دەبوو ببێتە حزبێکی کارتۆنی دواتر چارەنووسی دەبەسترایەوە بە چارەنووسی حزبی بەعسەوە، یا پێویست بوو بڕیارێکی شۆڕشگێڕانە بدات، واتە شێوازی خەباتی چەکداری هەڵبژێرێت....

## شالاّوی بەعس و سەرەتای خەباتی چەکداری:

شالاّوی پاکانە پێکردن و گرتنی شیوعییەکان بە خێرایی دەستی پێکرد، رۆژانە دەستە دەستە شیوعییەکان لە دائیرەی مونەزەمەی حزبی(بەعس) لە قەلاّدزیّ و سەنگەسەر و دەوروبەری بانگ دەکران و پاکانەیان پێدەکرا.

من ئەوكاتە ماڵەكەم لە ئۆردووگای بەستەستێن بوو، بەڵام لە ڕێگای موختاری گوندی (بەستەستێنی سەروو) ئاگادارکرابووم، کە بچم بۆ دائیرەی(ئەمن) لە شارۆچکەی سەنگەسەر بۆ ئەوەی پاکانە لە حزبی شیوعی عێراقی بکەم، مام برایمی خاڵ مراد موختاری دێیەکەمان بوو، موختاری مام برایمی خاڵ مراد بۆ ساڵانی پەنجاکان دەگەڕایەوە، کە ئەوسا شیوعییەکان بە دەسەڵات بوون لە سەردەمی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم، مام برایم مۆری موختاری ئەوسای هەر مابوو، هەر بۆیە حکومەتەکانی دواتریش مۆری موختاری سەردەمی(عەبدولکەریم)یان قبول بوو، مام برایم لە دوو ڕووەوە چاوپۆشی لە من دەکرد، لە لایەك لەبەرئەوەی خزمایەتیمان لەگەڵ بنەماڵەی خاڵ مراددا هەبوو و ئێمە هەمیشە خاڵ مرادی باوکی ئەومان وەکو ریش سپی و برا گەورەی خۆمان قبوڵ دەکرد، لە لایەکی ترەوە مام برایمی موختار هاوڕێ بوو، واتا پەیوەندیی بە حزبی شیوعییەوە هەبوو، هەر بۆیە هەر جارە بە جۆرێك وەڵامی دائیرەی( ئەمن)ی سەنگەسەری دەدایەوە، بەڵام پێدەچوو مام(برایم)یان زۆر سەغڵەت کردبێ، ڕۆژێك هات وتی هیچی تر چاوپۆشیم پێ ناکرێت، یا بڕۆ سەردانی دائیرەی( ئەمن) بکە یا بڕیارێك بدە، بە مام برایمم وت پێیان بڵێ ئاگادارم کردووە، وتی ئەوەیە پێت بڵێم فەرمانی گرتنت دەرکراوە بەدواتدا دەگەڕێن و دەستگیرت دەکەن، بە مام برایمی موختارم ڕاگەیاند بەلامەوە گرفت نییە، چونکە نیازم نییە پاکانە لە( حزب) بکەم. هەر بۆیە کەوتمە سۆراغی هاوڕێیان بۆ ئەوەی هەڵوێستی بەرپرسەکانی( حزب) بزانم، چووم بۆ قەڵادزێ سەردانی دوکانی هاوڕێ(محەمەدی حەمەد ئالا) بکەم، کە دوکانێکی خەیاتی هەبوو، لە ڕووی حزبییەوە ئەندامی لیژنەی( قەزای) حزبی شیوعی بوو لەپشدەر لێم پرسی و دەمم هەڵبڕی قسە بکەم بە چاو تێی گەیاندم، کە دوکانەکەی خراوەتە ژێر چاودێری ئەمنەکانەوە، هەر بۆیە ئەوێم بەجێهێشت، تاوێك بەرامبەر بە دوکانی هاوڕێ مەحمودی حاجی فەقێ خدر ڕاوەستام لەوێش نەموێرا لێی نزیکببمەوە، چونکە پێیم وابوو دوکانەکەی ئەویش هەر لەژێر چاودێریدا، ناچار چووم بۆ ماڵی هاوڕێ(حەسەن)ی موختار، کە ئەویش ئەندامی( قەزا) بوو لە لیژنەی ناوچەی حزبی شیوعی قەڵادزێ، کە لە دەرگاکەیانم دا خێزانەکەی هاتە پێشوازیم، پێی گوتم کێتان دەوێت، وتم دەمەوێت هاوڕێ(حەسەن) ببینم بە تووڕەیی وتی(حەسەن) لە ماڵ نییە، بۆچی دێنە ماڵەوە؟ حەسەن هیچ پەیوەندی بە حزبی شیوعییەوە نەماوە، لە ڕاستیدا ناهەقی نەبوو وا بڵێ، چونکە دەسەڵاتی بەعس لەوپەڕی بەهێزیدا بوو، سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراقی

هیچ پلانێکیان نەبوو بۆ ئۆرگانەکانی(حزب) لە کاتی لێدان و ڕاوەدوونانداا، نەیاندەزانی پەنا بۆ کوێ بەرن و چی بکەن؟ تەنها هەر پێیان دەوتین بڵێن شیوعی نەماوین، کە بە هیچ جۆرێك قبوڵ نەدەکرا لە لایەن دائیرەی(ئەمن) بڵێی شیوعی نەبووین پێیان دەوتی فەرموو پاکانە بنووسە بڵێ شیوعی نابین...

هەندیك لە ئەندامانی لیژنەی (قەزای)ی قەڵادزێی حزبی شیوعی، چوبوون بۆ دائیرەی (ئەمن) بە دزییەوە پاکانەیان لە حزب کردبوو و دەنگیان نەدەکرد، بەڵام دائیرەی ئەمن خۆیان ڕایاندەگەیاند، کە فلان کەس پاکانەی لە حزب کردووە، هاوڕێ مەحمود حاجی فەقێ خدر کە ئەندامی ئەنجومەنی تەشریعی ناوچەی بەناو ئۆتۆنۆمی بوو، سیانەی یاسایی هەبوو نەیاندەگرت، بەڵام لە ناو خەڵك و شەقام داوایان بڵاودەکردەوە، کە هاوڕێ مەحمود هیچی پێ ناگوترێت دیارە شتێك هەیە، بەڵام کاتێك هاوڕێ مەحمود حاجی فەقێ خدر چوو بۆ شاخ و پەیوەندیکرد بە هاوڕێیانی پێشمەرگە لە(ناوزەنگ) ئەو پروپاگەندانە هەمووی پوچەڵبوونەوە، هاوڕێ مەحمود یەکێك بوو لەو هاوڕێ تێکۆشەرانە، ئەو چەکەی لە لایەن(ڕژێم)ەوە وەریگرتبوو بۆ حیمایەی خۆی پێش ئەوەی پەیوەندی بە هاوڕێیانەوە بکات ناردی بۆ هاوڕێیان لە خڕی ناوزەنگ.

## یەکەم بنکەی پێشمەرگە شیوعییەکان:

ئەو هاوڕێیانەی خوارەوە بەردی بناغەی یەکەم بنکەی پێشمەرگە شیوعییەکانیان دانا، هاوڕێ ڕەسوڵ صۆفی ناسراو بە ڕەسوە سوور، سەلیم حەسەن ناسراو بە سەلیمە سوور، حەسەن خدر، حەمە یوسف، وەستا ڕەسوڵ، ئیبراهیم مستەفا، حەمەئەمین ئیبراهیم ناسراو بە مینەی برایمی، مام خدری سمایلی، دواتر پەیتا پەیتا هاوڕێیان پەیوەندییان بە شاخەوە کرد، یەکەم بنکەی پێشمەرگایەتی لە لایەن هاوڕێیانی پشدەری دانرا، هەر هاوڕێیانی پشدەری بوون شاندێکیان پێکهێنا وەکو بەدیلێك بۆ لیژنەی(قەزا)ی پشدەر، سەردانی ناوچە جیاجیاکانی دەڤەری پشدەریان دەکرد تا سەرلەنوێ ڕێکخستنەکان بە یەکەوە گرێبدەنەوە و پروپاگەندە بۆ خەباتی چەکداری بکەن، لە شەوێکی ئەنگوستە چاوی ٢٥/٢٤ مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٨ هاوڕێ ڕەسوڵ خدر ناسراو بە وەستا ڕەسوڵ و ژمارەیەك هاوڕێی تر لە(بەستەستێنی سەرێ) لە ماڵی مامم واتا مام برایم یەکترمان بینی، هاوڕێ پێی ڕاگەیاندم کە ڕێکخستنەکان

دروست و ئامادەبکەینەوە بۆ ئەوەی بە پێیی سیاسەتی شۆڕشگێڕانە ڕووبەڕووی شالاْوی بەعس ببینەوە، وتی پێویستە پلان دابڕێژین بەرامبەر بە ڕژێم، وەکو پرسیارێك بە هاوڕێ وەستا(ڕەسوڵ)م وت: سەرکردایەتی گەیشتۆتە شاخ؟ وتی هێشتا نەگەیشتوون، بەلاْم زۆر دڵخۆش بوون کە زانیویانە بنکەیەکی پێشمەرگایەتیمان لە خڕی (ناوەزنگ) دامەزراندووە..

لە دوای ئەو دیدارە وەکو پێشمەرگەیەك لە ناوەوە هەڵسوکەوتم دەکرد، هەموو کاتەکانی خۆم تەرخانکردبوو بۆ ڕێکخستنەوەی هاوڕێیان لە سنووری ئۆردووگای بەستەستێن و گوندەکانی دەوروبەری، دەنگۆی خەباتی چەکداری هاوڕێیان زۆر بە خێرایی بەناو خەڵکدا بلاْوبۆوە، زۆر دەمێك بوو هاوڕێیان چاوەڕوانیان دەکرد حزبی شیوعی عێراقی بیر لە خەباتی چەکداری بکاتەوە، چونکە زۆر دەمێك بوو خەڵکێك پێی وابوو(ح.ش.ع) سیاسەتێکی ئاشتیانە پەیڕەودەکات، هەرگیز بڕوای بە خەباتی چەکداری نییە، ئەوەندە دڵخۆش بوون هەر هاوڕێیەکمان دەدواند بۆ ئەوەی بزانین ئامادەیە لەناو ڕێکخستنەکاندا کاربکات، ڕاستەوخۆ ئامادەیی خۆی دەردەبڕی، نەك هەر وەکو ڕێکخستن بەڵکو وەکو پێشمەرگایەتیش حەزی دەکرد چەك هەڵبگرێ و بەرەو شاخ بچێ، ئەو دڵسۆزی و فیداکارییەی هاوڕێیان هانیدام، کە شەوو ڕۆژ بخەمە سەر یەك بۆئەوەی ڕێکخستنەکانمان فراوانتر بکەین...

## پێکهێنانی (٣) وێستگە:

وەرگرتنی هاوڕێیانی خوارو، ناوەراست، پارێزگاکانی کوردستان بۆ ئەوەی لە وێستگەکانی ئێمەوە پەیوەندی بکەن بە هاوڕێیانی پێشمەرگە لە خڕی (ناو زەنگ) بۆ ئەو مەبەستەش ماڵی سێ لە هاوڕێیانمان دەست نیشان کرد، کە بریتی بوون لە ماڵی هاوڕێ خەلیفە پیرۆت واتا مام پیرۆت لە ئۆردووگای بەستەستێن، ماڵی مام برایمی مامم لە گوندی بەستەستێنی سەرێ، ماڵی سێیەم ماڵی مام پیرۆتی سپێرۆیی بوو لە ئۆردووگای بەستەستێن. مام پیرۆت واتا(خەلیفە) هەم ماڵەکەی وەکو بنکەیەکی حزبی بەکاردەهات بۆ شاردنەوەی هاوڕێیان، هەم خۆیشی تەتەر بوو هاوڕێیانی ناو شاری دەگەیاندە بنکەی شاخ لە خڕی(ناو زەنگ و زەڵێ)، هاوڕێ(خەلیفە) پیرۆت هەتا دڵ بخوازێت پیاوێکی لەبەر دلاْن بوو، پیاوێکی بوێر و لەخۆبوردوو بوو، بە درێژایی ئەو ماوەیە بۆ چرکەیەك مردن و تێداچوون لە خۆی و خێزانەکەی دوور نەبوو، بەلاْم ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕووی گرژی نیشانی ئێمە و هاوڕێیان نەدا، (خەلیفە) لەناو هاوڕێیان و

خزمان و تەنانەت خەڵکی ناوچەکەش ناسراو بوو، زۆر جنێوفرۆش بوو، جنێوەکانی خەلیفە وەکو نوقلآنە و موتفەرکی مەلازادەکان وابوو، ئەوەی خۆشی نەویستبا جوێنی پێنەدەدا، نووسین لەسەر(خەلیفە) زۆری دەوێت جارێکی تر دەگەڕێمەوە سەری. وێستگەکەی تر مام پیرۆتی سپێرۆیی بوو، مام پیرۆت وەکو ریش سپی و پیاوماقووڵی عەشیرەتی مەنگوڕایەتی لە گوندەکەی خۆیان و دەوروبەری سەیردەکرا، دۆستایەتی لەگەڵ هاوڕێ مەحمودی حاجی فەقێ خدر هەبوو، کە پێم وت ماڵەکەت بکەینە وێستگە وتی بەسەر چاو کاك مەحمودیش پێی وتوم، ئەوسا دڵنیابووم کە کاك مەحمود نەگۆڕاوە ئەوەی بڵاودەکرێتەوە پڕوپاگەندەی دەزگاکانی(ڕژێم)ە. مام پیرۆتی سپێرۆیش بە هەڵسوکەوت و بە مەشرەب خۆشی زۆر لە(خەلیفە) دەچێ، ئەویش وەکو خەلیفە جنێوفرۆشە، جوێندان و گاڵتە و گەپ لە پشدەر بە گشتی و لەناو عەشیرەتی مەنگوڕایەتی بەتایبەتی زۆر باوە، کۆڕو کۆبوونەوە و دیوەخانی پشدەری و مەنگوڕایەتی زۆر تەرو تۆڵ و پڕن لە نەریتی ڕەسەن و باوی موکریان، هەرگیز بەدەگمەنیش مرۆڤێکی خەمۆکی و مرچ و مۆن نابینی، هەر بۆیە هەردوو مام پیرۆت لەو تەرزە خەڵکانە بوون، وێستگەکەی تر ماڵی مامم مام برایم بوو، مام برایم بنیاتنەری فیکری حزبی شیوعی بووە لەناو خێزانەکەماندا، مام برایم لە پەنجاکان چوو بوو بۆ سەربازی، لەوێ پەیوەندی بە هاوڕێیانەوە کردبوو، کاری لەگەڵ کردبوون، زۆرجار کە بە هۆی حزبی شیوعییەوە تەنگاو دەکراین، دایکم دەیکردە هەرا لەگەڵ مامما پێی دەگوت تۆو مەحمودی حاجی حەمەڕەشی بوون بەهۆی ئەوەی محەمەدی کوڕم ببێتە شیوعی و بە سیاسەت بچێ، لە شەستەکان کاك مەحمودی حاجی حەمەڕەش کادرێکی پێشکەوتووی حزبی شیوعی بوو لە دەڤەری(پشدەر) زۆرجار دەهاتە ماڵی ئێمە لە گوندی بەستەستێنی سەرێ کۆبوونەوەی بە هاوڕێیان دەکرد، منیش ئەوسا ئەگەرچی منداڵ بووم، بەڵام بۆ کۆبوونەوەکان بانگیان دەکردم و لەگەڵ هاوڕێیان دادەنیشتم، دایکم هەقی بوو هەر ئەو کۆبوونەوانە بوون بەهۆی ئەوەی شیوعییەکی بیست و چوار عەیارم لێ دەرچێ. مام برایم ئەگەرچی نەخوێندەوارە، بەڵام بە هۆی ئەوەی تێکەڵی لەگەڵ هاوڕێیان هەبوو ئاگایی سیاسی زۆر بوو، پێم وایە یەکەم ماڵ بووین لە گوندەکەی خۆمان کە مام برایم ڕادیۆی کڕی و ئالیارێکی سێ مەتری وایەر، بە دارسپیدارێکدا هەڵواسی بوو، زۆر حەزی لە گۆرانی عەرەبیە بەتایبەتی (داخل حەسەن). مام برایم مرۆڤێکی ورە بەرز و بە بیروباوەڕە، بە هەڵوێست و نەفس بەرزە. زۆرجار ژیانی پڕ لە

برسێتی و نەبوونی شپرزەی دەکردین، بەڵام هەرگیز پێمانەوە دیار نەبوو، بە درێژایی تەمەنی خۆم رۆژێك لە رۆژان لە مامم نەبیستووە ملکەچ بکات بۆ سەروەت و سامان، رۆژێك لە رۆژان بۆ چرکەیەکیش چەکی خیانەت تەنانەت بۆ وێنەگرتنیش نەچۆتە سەر شانی مامم و ئەندامانی خێزانەکەمان، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ نەفس بەرزی و نیشتمانپەروەری مام برایم، کە هەمیشە ڕقی لە خیانەت و مرۆڤی خوارو موخەننەت بووە. ماڵی مام برایم وێستگەی کۆتایی بوو بەرەو شاخ، چونکە گوندی بەستەستێنی سەرێ بە پیادەڕۆ(٢٠) دەقیقە بۆ نیوکاتژمێر لە ئۆردووگای بەستەستێن دوور بوو، زۆرجار بە رۆژ هاوڕێیانمان دەنارده ماڵی مام برایم شەوانەش(تەتەر) دەلیل هەڵیدەگرتن، ئەوانەی توانای ڕۆیشتنیان هەبوو بە پێی خۆیان دەڕۆیشتن، ئەگەر هاوڕێیەك توانای ڕۆیشتنی نەدەبوو هێسترمان بۆ بەکرێ دەگرت. وڵاغدارەکانیش واتا قاچاخچییەکان هەر هاوڕێی خۆمان بوون، کە زیاتر هاوڕێ(حوسێن)ە گۆج، کاك عەبدوڵڵا ناسراو بە عەبدوڵڵا کوێر، خوا لێیان خۆش بێ هەردووکیان مردوون و لە ژیاندا نەماون. کاروانچی سێیەم کاك ڕەسوڵ مام بابەکر بوو، برای هاوڕێ(کاروان)، زۆر دۆستی تریش هەبوون بارەبەریان هەبوو، هاوڕێیانیان بە کرێ سوار دەکرد بۆ شاخ، مام برایم سەرەڕای ئەوەی ماڵەکەی وێستگەیەك بوو، خۆیشی و گوێدرێژە بۆزەکەیشی وەکو تەتەرێکی هەمیشەیی و ئامادە وا بوون، بەکارمان دەهێنان بۆ هێنانی بەریدی حزبی لەو وێستگەیە بۆ ئەو وێستگەی تر، کورتانەکەی کەرەبۆز بە(١٠) جێگا جێسازی تێدا کرابوو، زۆرجار دەمانچە و کلاشینکۆفی مزەلیشیمان لەناو کورتانی کەرەبۆزدا دەشاردەوە. بە درێژایی ساڵانی خەباتی چەکداری حزبی شیوعی لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٨ بۆ ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ ماڵی مامم وەکو بنکەیەکی هاوڕێیانی پێشمەرگە وابوو، مام برایم و کەرەبۆزکەیشی هەتا ساڵانی (ڕاگواستن) تەتەرێکی هەمیشەیی و ئامادەبوون بۆ(حزب). لەراستیدا ماڵی مام برایم نەك هەر بۆ هاوڕێیانی خۆمان جێگایەکی ئەمین بووە و خزمەتیان کراوە، بەڵکو پێشمەرگەی لایەنەکانی تریش هەروەکو هاوڕێیان لە ماڵی مامم داڵدەدەدران و خزمەتیان دەکرا، بۆ ئەو برادەرانەی کە پێشمەرگە بوون، لە گوندەکەی خۆمان، بە رۆژ لە ماڵی خۆیان و خزمەکانیان نەدەبوون، بەڵکو دەهاتن بۆ ماڵی مام برایم، شەهید (لەتیف ئیبراهیم) کە کادرێکی کاراو دیاری (ی.ن.ك) بوو چەندان جار لە لایەن دایکم شاردراوەتەوە و خزمەتی کراوە...

## دایکم و ڕۆژانی سەخت:

نازانم چۆن وەسفی دایکم بکەم، هەرگیز بڕواناکەم وشەیەك بدۆزمەوە بارتەقای سۆزو خۆشەویستی و فیداکاری دایکم بیّ، تەنها ئەوەندەم پیّ دەکریّت داوای لیّبوردنی لیّ بکەم و سەرم بخەمەوە ناو بەرکۆژەکەی جارانی کە لە کەمەری دەبەست، بەرهەڵبیّنە خام حەلاوەکەی دایکم بە بەرکۆژەوە بوو لە سینگ و ملّی کابانان دەپیّچرا، بەتایبەتی لەکاتی مانگادۆشین و کادیّن و غەڵ ماشتن و خاویّنکردنەوەدا، دایکم هەمیشە ئەو بەرهەڵبیّنەیە و چارۆکەیەکی خام حەلاوەی دەپۆشی، جار جارەش پیّی وابوو ڕەنگی زۆر زەقە بەرهەڵبیّنەکەی لە(خم)ی ڕەشی دەگرت، ئای ئای چەند جوان بووی دایە گیان، کە لەبەر گاواندیّنی مانگە زەردیّدا هەڵدەتوتەکایت، ئەگەر مانگا زەرد ستڵەکەی پڕ لە شیر دەکرد بە زەردەخەنەیەکەوە پیّتدەگوت بەرەکەت لیّ بیّ، ئەگەر ستڵەکەیشی پڕ نەکردبایە لە شیر دوو سیّ جویّنت تیّ دەسرەواند، لەبیرمە جاریّکیان هەر مانگا زەرد بوو سەریّکی لەدەم و ددانی دایت و ددانیّکی پیّشەوەی شکاندی، تۆش نەتکردە نامەردی بەرچیخیّکت هیّناو دارکارییەکی باشت کرد...

دایکم ئەگەرچی ڕۆژیّك لە ڕۆژان حەزی نەدەکرد لیّی دووربکەومەوە، بەڵام هەرگیز لە دایکم نەبیستووە پیّم بڵیّ خۆت تەسلیمی ڕژیّم بکەوە و واز لە پیّشمەرگایەتی بهیّنە، هەمیشە پیّی وتوم بە سەربەرزی بمرە، بەڵام سەرت بۆ دوژمن و ناحەزان شۆڕمەکە، لە ڕۆژانی سەخت و پڕ مەترسیدا کە ستەمی ڕژیّمی(بەعس) بەوپەڕی گەیشتبوو، بەتایبەتی لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٨، بۆ ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ بڕواناکەم دایکم بۆ تەنها شەویّکیش بە ئاسوودەیی سەری خستبیّتە سەر سەرین، هەر شەویّك کە چوومەتەوە ماڵەوە وەرز هەر وەرزیّك بووبیّت، کات هەر کاتیّك بووبیّت، دایکم هەر بەخەبەر بووە، پەنجەرەیەکی بەرزمان هەبوو، کە بە نایلۆن گیرابوو، خانووە گلەکەمان کەوتبووە سەر کۆڵانی نیّوان ماڵی ئیّمەو کاك ئیبراهیم سەعیدی دراوسیّمانەوە هەموو جاریّ بە چیلکەداریّك سیّ جار لە نایلۆنی پەنجەرەکەم دەدا، ئەو سیّ جارە هیّماو ئاماژەی من بوو بۆ ئەوەی دایکم بزانیّ خۆمانین، بەڵام کە هاوڕیّ هەمزە سوور دەچوو دەبوایە دوو جار لە پەنجەرەکە بدریّت، ئەوەیان هیّماو ئاماژەی هاوڕیّ هەمزە سوور بوو، من و هاوڕیّ هەمزە جگە لە هاوڕێیەتی وەکو دوو برای جوپلانە وابووین، ئەوەندە بەیەکەوە بووین وەکو ئەندامی خیّزانیّکمان لیّهاتبوو، دایکم هەمیشە بە هەردووکمانی دەوت ڕۆڵە ئاگاداری یەکتربن، دایکم نویّژدەکات نویّژی دایکم لەگەڵ نویّژی خەڵکی ئاسایی جیاوازە،

که دایکم نوێژی دەکردو دەکات، بە دەنگێکی بەرز نزادەکا لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە لە گوناهەکانی خۆشی بێت، دواتر لە ماوەی نوێژەکە پتر بە خوێندنی دوعاوە خەریك دەبێ، لە بیرمە هەموو جارێك کە نزای دەکرد دەیگوت: خوایە منداڵەکانم بپارێزە، خوایە کوڕەکانم لە دەردوبەڵای دنیایە بپارێزە، هەموو جارێ کە دەگەڕامەوە لای دایکم چەند جارێك دەهاتە بەردەمم و هەڵدەتورشکا، پێی دەگوتم دە ڕۆڵە پێم بڵێ چۆن هاتوویت و چۆن دەچیتەوە؟ بە کوێدا دەڕۆی، چەند چۆم و ڕووبارت دێتە سەر ڕێگا، ئەدی جگە لە هەمزە کێی ترت لەگەڵدایە، دەکوڕی خۆم پێم بڵێ کە لێرە ڕۆیشتی یەکسەر دەچیتەوە شاخ یا دەچیتە جێگایەکی تر، توخوا کە ناگەڕێتەوە هەر لەکن دایکی خۆت بە باشتر ئاگادارت دەبم، ئەو رستانەو چەندان وتەو هەست و سۆزی دایکانەی تر لە دایکم بە خێرایی دەبیستران، هەموو جارێ کە دەگەیشتمەوە لای دایکم، دایکم واباوەشی پێدا دەکردم توند لە باوەشی دەگرتم، ئینجا شینێکی زۆری لەسەر دەکردم. ئێستاش هەروایە بۆ من شین و باوەش پێدا کردنی جارانی هەرماوە...

لە بۆنەکانی تر دەگەڕێمەوە سەر خەبات و فیداکاری دایکم، بۆ ئەوەی لە بابەتەکە دوورنەکەومەوە، کە باس باسی سێ وێستگەکەیە، ئەو سێ وێستگەیە هەفتەی(٣) تا (٤) وەجبە لە هاوڕێیانی پارێزگاکانی خواروو، ناوەڕاست و کوردستانی پێدەگەیشت، هەر وەجبەیەك دوو تا سێ هاوڕێ بەیەکەوە دەهاتن، زۆرجار دوو ڕۆژو دوو شەو لە وێستگەکان دەمانەوە، هەر سێ وێستگەکە بێ بەرامبەر خزمەتی هاوڕێیانیان دەکرد، ڕۆژێك لە ڕۆژان چاوەڕوان نەبوون پاداشتێکی مادی بکرێن، هەرچەند هاوڕێیان مام برایم و مام پیرۆت زۆر ماندوو و هیلاك دەبوون، بەڵام هونەری سەرکەوتنی ئەرکی خزمەتکردن و چاودێری پتر بۆ دایکم و خەلیفە ژن و خوشکە خەیاڵی مام پیرۆت دەگەڕایەوە، کە هەمیشە لە ماڵەوە سەرقاڵی ئیش و کاری ماڵەوە بوون و خزمەتی هاوڕێیانیان دەکرد، بەتایبەتی لەو ڕۆژگارانەدا کە ڕژێم بەدەیان سیخوڕی هەبوو چاودێری جموجۆڵی لایەنە سیاسییە بەرهەڵستکارەکانیان دەکرد.

تەتەرێکی تری ماندوونەناس مام خدر بوو، مام خدر خەڵکی گوندی سپێروو بوو خزمایەتی لەگەڵ مام پیرۆتی سپێروویی هەبوو، مام پیرۆت و مام خدر و کاك وەتمانی برای مام خدر لەگەڵ خزمەکانیان، هەموویان یەك لەیەك زیاتر دڵسۆز بوون بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی

حزبی لە ناردن و یاوەریکردنی هاوڕێیان بەرەو بنکەو بارەگاکانی شاخ، مام خدر هەمیشە خۆی و گۆچانەکەی ئامادەبوو وەپێش هاوڕێیان بکەوێت، شەوی واهەبوو چوار پێنج کەمینی جاش و سوپای ڕژێم لەسەر ڕێگاکان هەبوو، بەڵام مام خدر بە شارەزایی خۆی هاوڕێیانی هەتڵدەدەکرد. قسەیەکی خۆش لە مام خدر دەگێڕنەوە، گوایە جارێك هاوڕێیەکی عەرەبی سواری هێستر کردووە، لە سەرەوژێرێك شۆڕبوونەتەوە، برادەرە عەرەبەکە بە مام خدری وتووە: (لێش ماترکب) مام خدریش وای زانیوە دەڵێ ڕێگاکە سەرەوژێرە، مام خدر وتویەتی مەبەستم لێژی نییە هەر حەزناکەم سواری هێستر بم، ئەو برادەرە عەرەبانەی لە ناوەڕاست و خوارووی عێراقەوە دەهاتن، زۆر دەست و پێی سپی بوون، واتا شاریانە ژیابوون، دەبوو جلێکی کوردیان بۆ پەیدابکەین یا بکڕین. ئینجا کێشە گەورەکە دۆخین بەستنەوە بوو، هەموو جارێ دەبوایە کەسێکی شارەزا دۆخینیان بۆ ببەستێتەوە. زۆرجار ناچاردەبووین دۆخینەکانیان بکەینە(جیرە) تا بە ئاسانی هەڵکێش و داکێشی پێ بکرێت.

بۆ ماوەی پێنج مانگ بە شێوەی نیمچە نهێنی و ئاشکرا لە ئۆردووگای بەستەستێن و گوندی بەستەستێنی سەرێ دەمامەوە، شەوی ١٤:١٥ /١٩٧٩/١ هاوڕێ وەستا ڕەسوڵ و شەهید ئەحمەد حەساری و برایم مستەفا لە شاخەوە دابەزیبوون بۆ ئەنجامدانی کارێکی حزبی. لە گوندی(سۆڵتانەدێ) یەکترمان بینی، ئەو شەوە پێم ڕاگەیاندن کەوا هیچی تر ناتوانم لە ناوەوە بمێنمەوە، چونکە چەند جارێك لە لایەن ئەمنەکانەوە هەوڵی دەستگیرکردنم درابوو، بەڵام سەرکەوتوونەبوون. ڕۆژانە لە جوڵەی بەردەوام و جێگۆڕکێ دابووم. هاوڕێ وەستا ڕەسوڵ کە ئەوسا بەرپرسی ڕێکخراوی حزبی شیوعی بوو لە ناحیەی(سەنگەسەر)، لە وەڵامدا وتی هەرکاتی پەیوەندی دەکەیت بە هاوڕێیانی شاخەوە پەیوەندی بکە، بەڵام هەر سێ وێستگەکە ڕۆڵێکی گرینگ دەگێڕن، بە باشی ڕێك بخرێن باشە، ئەوە بوو دواتر ژمارەیەکی تر هاوڕێ و دۆستی نوێ پەیوەندییان بە ڕێکخستنەکانەوە کرد، ژمارەیەکی تریش لە هاوڕێی جەربەزەو ئازای وڵاخدار هەبوون شەوو ڕۆژیان دەخستە سەریەك، لە هاتوچۆ دابوون، بۆ بردنی ئەو هاوڕێیانەی دەگەیەنرانە هەرسێك (وێستگەکە)...

لە کاتێکدا چەندان ساڵ بەسەر ئەرك و خەباتی ئەو سێ وێستگەیە ڕەتدەبێ، سەری ڕێزو نەوازش بۆ مەزارو گڵکۆی هاوڕێ خەلیفە پیرۆت و مام خدر دادەنوێنم، دەستی ڕێزو وەفایان بۆ بە سینگەوە دەنێم بۆ دایکی خۆشەویستم و مام برایمی مامم، ئەگەرچی تەمەن و نەخۆشی

کەنەفتی کردوون، بەڵام هێشتا وەکو جاران هەر بە ورەو ئیرادەوە دەژین. هەروەها هیوای لەشساخی و تەمەن درێژی بۆ مام پیرۆتی سپێروویی دەخوازم، دەستی هەموو ئەو هاوڕێ و خۆشەویستانە ماچ دەکەم، کە هاوکارو یارمەتیدەرمان بوون، بەتایبەتی پوور ئایشێ مام خدری سپێرۆیی، پوور ئامانی ڕەحەمەتی خوشکی مام خەلیفە پیرۆت، ئەوێ ڕۆژێ ڕۆژگارێك بوو کەڵ بە موو بەند بوو، (ڕژێم) لەوپەڕی لە خۆبایی بووندابوو دەزگا سەرکوتکەرەکانیان هەموو دەسەڵاتێکیان پێدرابوو، کە سووکایەتی بە خەڵکانی شۆڕشگێڕو خاوەن هەڵوێست بکەن، بەڵام سەرەڕای ئەو زەبرو زەنگەش خەڵکی شۆڕشگێڕ بە شانازییەوە ڕێگای بەرەنگاربوونەوەی ستەمی ڕژێمی دیکتاتۆریان هەڵدەبژارد، شانازیان بە پێشمەرگەو ئەرکەکانی شۆڕشی چەکدارییەوە دەکرد، قوربانیان بە هەموو خێرو خۆشییەکی خۆیان و خێزانەکانیان دەدا...

## هاوڕێ عەلی حاجی نادر و فیداکاری:

دەزگاکانی(ڕژێم) ڕۆژانە پەلاماری هاوڕێیانیان دەدا، لە شارۆچکەی چوارقوڕنەش ئەمنەکان دەچنە سەر ماڵی حاجی نادری بۆ دەستگیرکردنی هەرسێك کوڕەکەی کاك عەلی و مەحمود و کاك عەبدولڕەحمان، ئەمنەکان جاری یەکەم دەچنە سەر ماڵی مام حاجی نادری باوکی کاك عەلی، هەواڵەکە بە هاوڕێ عەلی دەگات، کە ئەمنەکان وا خەریکە عەبدولڕەحمان دەستگیردەکەن، کاك عەلی چەکێکی بڕنەوی دەبێ کە لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلول شاردبوویەوە، لەو کاتەدا دەستوبرد بڕنەوەکە لەژێر زەوی دەردەهێنی و بەرەنگاری ئەمنەکان دەبێتەوە، لەناو ماڵی باوکیدا عەبدولڕەحمانی برای لە ئەمنەکان دەستێنێتەوە، هەر بە ئەوەندەش لە ئەمنەکان خۆش نابێت بەدەم تەقە لە چوارقوڕنەش وەدەریان دەنێ، ئەو مەفرەزەیەی چوو بوو بۆ سەر ماڵی باوکی هاوڕێ عەلی حاجی زانیبوویان چۆن چوون، بەڵام نەیانزانیبوو چۆن گەڕاونەتەوە. لە دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول، ئەوە یەکەم جار بوو بە ڕۆژی نیوەڕۆ دەنگی تفەنگی بڕنەو ببیسرێت. ئەو ئازایەتی و وەدەست هاتنەی کاك عەلی لە سەرانسەری ناوچەکەدا دەنگی دایەوە. ئەوسا دەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێم لەسەر قاوەنە فیشەکێکی بە تاڵ، کە لە ماڵاندا دەدۆزرایەوە خەڵکی لە سێدارە دەدا، کەچی کاك عەلی کۆڵان بە کۆڵان بە تفەنگ ئەمنەکانی ڕاودەنا، ئەو چالاکییە ورەی بە هاوڕێیان بەخشی و

هاوڕێ عەلی شۆڕشگێڕیی خۆی و هاوڕێیانی بۆ خەڵکی ناوچەکە سەلماند، ئەو چالاکییە بۆ ماوەیەکی زۆر بوو بە وێردی سەر زمانی خەڵك. هەر ئەو رۆژە هاوڕێ عەلی حاجی نادری و ژمارەیەك لە هاوڕێیانی تر بەرەو چیای کۆسرەت رێگایان گرتەبەر. لە چیای کۆسرەت یەکەم مەفرەزەی چەکداری حزبی شیوعی لە بناری کۆسرەت پێکهات هەر ئەو مەفرەزەیە لە دوای ماوەیەك دەگەڕێتەوە ناو شارۆچکەی چوارقوڕنە لە لایەن سیخوڕێك خەبەریان لێ دەدرێت و، هێزێکی گەورە لە سوپای ڕژێم گەمارۆی شارۆچکەی چوارقوڕنە دەدات. لەکاتی گەڕانەوەی مەفرەزەکەدا جەنگێکی سەخت لە نێوان هاوڕێیان و سوپا دروستدەبێ، لەو جەنگەدا هاوڕێ شێخە خەرتەل و هاوڕێ عەلی بچکۆل شەهیدبوون. ئەو شەهیدانە یەکەم شەهیدی حزبی شیوعی بوون لە دەڤەری پشدەرو بیتوێن. لەدوای ئەو جەنگە هەمان مەفرەزە بەرەو خڕی ناوزەنگ دەڕوات و پەیوەندی دەکات بە هاوڕێیانی ئەوێ، هەر ئەو هاوڕێیانە بارەگای لقی بیتوێنی حزبی شیوعی دادەمەزرێنن...

پیویستە بگوترێت هاوڕێ عەلی حاجی نادری یەکێك بوو لەو فەرماندە عەسکەریانە، کە لەسەر ئاستی کوردستان ناسراو بوو، فەرماندەیەکی ئازاو رەوشت بەرزو بەشکۆبوو، هەر جەنگو داستانێك هاوڕێ عەلی حاجی رابەرایەتی بکردایە سەرکەوتوو دەبوو. دیارترین داستان کە لە هەموو کوردستاندا دەنگی دایەوە داستانی گوندی هەنارە بوو کەلەساڵی ١٩٨٦ لە لایەن هاوڕێ عەلی حاجی یەوە سەرپەرشتی و سەرکردایەتی کرا. گوندی (هەنارە) هەوارگەو سەیرانگایەکە کەوتۆتە داوێنی چیای سەفین. چەند کلیۆمەترێك لە شاری هەولێر دوورە کەوتۆتە باکووری شاری هەولێر. لەو داستانەدا بەدەیان جاش و سەرباز کوژران. بەداخەوە ئەو تێکۆشەرو پیاوە ئازایە لەساڵی ١٩٨٧ لە جەنگێکی ناوخۆدا لە نزیك شارۆچکەی پیرمام لە بەرزاییەکانی شێرەسوار شەهیدکرا...

## سەرەتای ژیانی پێشمەرگایەتی:

پێش ئەوەی بڕیاربدەم ببم بە پێشمەرگە زۆر بیرم لە ئایندەی خێزانەکەم دەکردەوە، ئەوسا هەر دایکی(سۆران) بوو منداڵمان نەبوو. ئەگەر بڕیارم دابا لەگەڵ خۆمدا بیبەم بۆ شاخ بڕیارێکی زۆر گران بوو، چونکە بارودۆخی خەباتی چەکداری زۆر ئاڵۆزو دژوار بوو، هەڵگرتنی ئەرکی خێزان زەحمەت بوو شان بە شانی ئەرکی پێشمەرگایەتی، ئەو جەنگە دەروونییە لە

مانگی کانوونی دووەمی ١٩٧٨ بۆ سەرەتای ساڵی ١٩٧٩ بەردەوام بوو، لە سەرەتای مانگی دووەمی ئەو ساڵە خۆم ساغکردەوە، کە خێزانەکەم بە جێ بهێڵم وەکو هاوڕێیانی تر کە خێزانەکانیان جێهێشتووە، ئەوە بوو لەگەڵ بەریدی حزبیدا(٦٠) دیناری عێراقی ئابوونەی مانگانەم بەڕێ کرد. نامەیەکی تایبەتیشم نووسی لە نامەکەدا داوام کردبوو هەرکاتێ هاوڕێیان دابەزین ئاگادارم بکەنەوە لە گەڵیان دێم و پەیوەندی دەکەم بە هاوڕێیانی شاخەوە، لە وەڵامدا داوایەکەم پەسندکرابوو، بەریدێکی حزبی بۆ هاوڕێیانی سلێمانی رەوانەکرابوو کە بیگەیەنین، بە گەیشتنی بەریدی سلێمانی خۆم و خێزانم بەریدەکەمان گەیاندە سلێمانی و تەسلیمی هاوڕێ(عەتا) سوورمان کرد، هەر ئەو رۆژەش گەڕاینەوە. بۆ ئەوەی بەریدەکە بە سەلامەتی بگات، خێزانم لەگەڵ خۆمدا بردە سلێمانی تا بەریدەکە بشارێتەوەو ئەمنەکان هەستی پێ نەکەن. ئەگەر ئافرەتێکی ئەمن لە یەکێك لە سەیتەرەکان بووایە هەر ئەو رۆژە خێزانم دەستگیردەکرا، خۆیشم هەر بە قاچاخی چووبووم لە جیاتی هەویە بەرگەیەکی(عایدون)م بردبوو، کە ناوی بابمی تێدا گۆڕا بوو بە(مام برایم)، چونکە خەڵك بە ئاسایی هەر بەناوی(مامم) بانگیان دەکردم. کە گەڕاینەوە لە سلێمانی خەبەریان پێدام مەفرەزەیەکی هاوڕێیان لە گوندی (زورکان)ە و چاوەڕوانم دەکەن. کە چووم مەفرەزەکەم بینی بە فەرماندەیی هاوڕێ سەلیم حەسەن بوو، کە ناسراوە بە(سەلیمە سوور) لە ماڵی هاوڕێ کاکەمین ئیبراهیم بوون. کاکەمین خۆیشی پێشمەرگە بوو، چەند هاوڕێیەکی تریش لەگەڵ هاوڕێ سەلیم و کاکەمیندا هاتبوون، بەڵام ناوەکانیانم لەبیرچۆتەوە، بەداخەوە یاداشتم نەکردوون. ئەو شەوە واتە شەوی ١٠:٩/٢/١٩٧٩، هەرئەو شەوە سەید کاکە خۆی و مەفرەزەیەك لە پێشمەرگەکانی حزبی سۆشیالیستی کوردستان گەیشتنە هەمان ماڵی کاکەمین. ماڵی کاکەمین لە داوێنی گوندی زورکانی سەرێ بوو، هەربۆیە زۆرجار کە پێشمەرگە هاتوچۆیان دەکرد و دەپەڕییەوە بەرەو دێهاتەکانی گرتك و دووگۆمان لەوێ لایان دەدا. مەفرەزەکەیان ئەفسەرێکی سوپای عێراقیان لە دەشتی(هەولێر) بەدیل گرتبوو. ئەفسەرەکە تکریتی بوو، کە خاڵە سەید کاکەو مەفرەزەکەیان لەگەڵ هاوڕێ سەلیمە سوورو هاوڕێیانی تر دەدوان، ئەفسەرەکە پێی سەیر بوو، وتی حزبی شیوعی عێراقی کەی خەباتی چەکداری راگەیاندووە؟ ئەفسەرەکە زۆر بە توندی دیفاعی لە حزبی بەعس و سیاسەتی ڕژێم دەکرد، لەگەڵ هاوڕێ سەلیمدا بەقسە لێك هەڵبەزینەوە...

ئەو ئەفسەرە لە زیندانێکی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا زیندانی کرابوو، دوای چەند مانگێك لەلایەن خدر ناوێك خەڵکی شارۆچکەی سەنگەسەر، کە پاسەوانی زیندانەکە بوو ڕفێنراو ڕادەستی ڕژێم کرایەوە. تەسلیمکرانەوەی ئەو ئەفسەرە، کە خزمی(سەدام حوسێن) بوو قسەو قسەلۆك و گومانێکی زۆری بەرامبەر یەکێتی لیّ کەوتەوە، هەندێك دەیان وت بە پارە فرۆشراوە، هەندێکی تر دەیانگوت گۆڕدراوەتەوە، لەهەموو حاڵاتێکدا گومانەکە لە جێگای خۆی بوو. چونکە ئەو کەسەی ئەفسەرەکەی تەسلیمکردەوە بەرژێم یەکێتی هیچی لیّ نەکرد، کە هەمیشە لە بەردەستیاندا بوو، ئەو جۆرە سازشانە لە شۆڕشی چەکداری هەشتاکاندا زۆر باوبوو، وەکو مفاوەزاتی محەلی و دیل فرۆشتنەوەو ئاڵوگۆڕ پێکردن...

ئەو شەوە لەگەڵ هاوڕێیان نەڕۆیشتم. ئەوسا حزب زۆر پێویستی بە چەك هەبوو. منیش هەستم کردبوو خزمێکمان بەناوی(حاجی ئەزدین) چەکێکی برنەوی شاردۆتەوە، کە لەسەردەمی نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ی شۆڕشی ئەیلول دا بە(١٥٠)ە فیشەکەوە هەڵیگرتبوو، لە ژێر زەوی شاردبۆوە. ئەوکاتە برنەوەکە لەبەر دەستدا نەبوو. ئەو برنەوەش بۆ خۆی ببوو بە نوکتە، چونکە لە ژێر زەوی خۆرکە لێیدابوو و ژەنگاوی ببوو. ڕۆژێك هاوڕێ(سابیر) کە کادرێکی دڵسۆزی حزب بوو بەهۆی ئەوەی دەستگیرکرابوو لە لایەن دائیرەی ئەمنی قەڵادزیّ،( حزب) هەڵی پەساردبوو، پلەی ئەندامییەتی(قەزا)ی لیّ وەرگرتبۆوە لەبارەگای(لق) دانرابوو، کە هاوڕێیان ڕێکخراوی حزبیان لەناو لقی پشدەر دروستکرد، هاوڕیّ (سابیر) خرایە ئەو شانەیەی، کە من سەرپەرشتیم دەکرد، لە ڕاستیدا پێم شەرم بوو هاوڕیّ سابیر دابنیشیّ و منیش بەرپرسی حزبی بم، چونکە ئەوسا تەمەنی من(٢٤) ساڵ بوو و ئاستی ڕۆشنبیری من و هاوڕیّ سابیر زۆر جیاواز بوو، هەربۆیە هەرگیز خۆم بە بەرپرسی هاوڕیّ سابیر نەدەزانی و ناوبراو سەرپەرشتی کۆبوونەوەکانی دەکرد. پەیوەندیم زۆر خۆش بوو لەگەڵیدا، ڕۆژێك هاوڕیّ سابیر دەیەوێت باسی من بکات، دەڵیّ هاوڕیّ(حەمە)، برادەرانیش حاڵی نابن مەبەستی کام حەمەیە، چونکە محەمەد ناومان زۆر بوون، وەك: هاوڕیّ محەمەد دەڵگەیی، محەمەد ڕەسوڵ، حەمە یوسف...هتد، هاوڕیّ سابیریش دەڵیّ ماڵتان نەشێویّ مەبەستم محەمەدی تفەنگە قۆڕەیە... بەداخەوە ئەو هاوڕیّ تێکۆشەرە لە هاوینی ساڵی ١٩٨٢ بەهۆی نەخۆشی شێرپەنجەی سییەکانی کۆچی دوایی کرد...

ئەو شەوە لەگەڵ هاوڕێ سەلیم و هاوڕێیانی تر نەچووم، تاکو مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٩ لەگەڵ هاوڕێیانی ناوەوە بە نیمچە ئاشکراو نهێنی گوزەراندم، بەڵام نەدەکرا هیچی تر بە قاچاغی بمێنمەوە، یا دەبوو بچم پاکانە لە(حزب) بکەم یا بەرەو چیا بڕۆم و ببم بە پێشمەرگە، بێگومان خۆمم یەکلاکردەوە، کە ڕێگای پێشمەرگایەتی بگرمەبەر، نەك پاکانە لە(حزب)...

## ئەو شەوەی بووم بە پێشمەرگە:

ڕۆژی ١٩٧٩/٤/٢٣ بە هاوڕێ(خەلیفە واتە مام پیرۆتم وت ئەم شەو بڕیارم داوە بە یەکجاری شارو ژیانی ناوەوە جێ بهێڵم و بڕۆم بەرەو پێشمەرگایەتی، خەلیفە وتی هەرچەند حەزمان دەکرد هەر لێرە بیت، بەڵام کە سووری لەسەر ڕۆیشتن وەکو هاوڕێیانی تر یاوەری تۆش دەکەم..خەلیفە وێڕای پێکەنین و گاڵتە و گەپ جنێویکشی حەواڵەکردم، ئەو ئێوارەیە لە ماڵی ئێمە لە ئۆردووگای بەستەستێن نانمان خوارد. بۆ ئەوەی دایکی سۆران نیگەران نەبێ، بەردەوام (خەلیفە) بە پێکەنین و قسەی خۆش کاتەکانی بەڕێدەکرد، ئەو چرکەساتەی دایکی سۆرانم بەجێهێشت، چرکە ساتێکی زۆر ناخۆش بوو، هەرگیز وەسف ناکرێت. سەرەڕای ئەو نیگەرانییەش بەسەر هەست و سۆزی خۆم زاڵبووم. منیش وێڕای(خەلیفە)پیرۆت لەگەڵ خێزانم کردمە گاڵتەو پێکەنین، بەڵام چ پێکەنینێك لە ناخەوە دەگریام...

لەماڵی خۆمان خواحافیزەم لە خێزانم کرد، بەرەو گوندی بەستەستێنی سەرێ کەوتینەرێ، کە بە پێڕۆ تەنیا (٢٥_٣٠) خولەك دەبوو. دوو شەو پێشتر تفەنگە بڕنەوەکەی (مام حاجی ئەزدین)مان بردبوو لە ماڵی(مام برایم)م شاردبۆوە تا ئامادەی بکەم بۆ شەوی ڕۆیشتن بەرەو شاخ... دایکم کە زانی واخەریکە دەڕۆم، بە درێژایی ئەو ساتانەی لەوێ بووین فرمێسکی چاوەکانی وشك نەبوونەوە، دایکم وەکو پەروانە بەدەوروبەرمدا دەسوڕایەوەو باوەشی پێدا دەکردم پێی دەگوتم ڕۆڵە ناکرێ نەڕۆی؟ هیچ چارەسەرێك نادۆزیتەوە؟ پێم وت دایە لە دوو ڕێگا دەبێ ڕێگایەك هەڵبژێرم. بە قەناعەتەوە ئەو ڕێگایەم پەسندکردووە، کە ڕێگای پێشمەرگایەتییە، ئێمە هەر لەو قسەو باسانەدا بووین لەگەڵ دایکم(خەلیفە و مام برایم) یش دەتریقانەوە بە پێکەنین. کۆڕو مەجلیسی خەلیفە پیرۆت هەموو کەسی دەهێنایە پێکەنین...

لەدوای خواردنی ژەمی ئێوارە ساتەکانی ماڵئاوایی و گریانی دایکم ماتەمی بەسەر ماڵەکەماندا هێنا، هەرچەند هەوڵم دەدا دایکم لە خۆم بپچڕمەوە نەدەکرا، دایکم بەتوندی لە

باوەشی گرتبووم، شینێکی دەکرد هیچ سنوورێکی نەبوو، هەروەکو مردبم و شینگێڕی سەر لاشەکەم بێت. چەند جارێك خەیاڵی وا بەدڵمدا دەهات، کە واز لە حزب بهێنم و بەیانی بڕۆم پاکانەبکەم، بەڵام خۆشەویستیم بۆ(حزب) و بیروباوەڕەکەم، زاڵتر بوو بەسەر خۆشەویستی نێوان کوڕو دایکە هەژارو خێرلەخۆنەدیوەکەم، من و دایکم هەر لە باوەشی یەکتردا بووین، خەلیفە کردی بە هەڵڵا و لە دایکم تووڕەبوو، وتی خۆ کوڕەکە نەمردووە بۆ وا دەکەی؟ کێ دەڵێ پاش ماوەیەکی دیکە نایەتەوە، خۆ ئەو زروفە هەروا نابێ! بەو قسە ئارامبەخشانەی خەلیفە دایکم هەندێك هێوربۆوە. دوای قسەکانی خەلیفە خواحافیزیم لە دایکم و مامم کرد، دایکم زۆر بە کوڵ دەگریا، هاتە بەردەرگا هەتا لە کۆڵانە تەنگەبەرەکەی باخچەی خۆمان و کاك خدری مام سەعیدی دەرچووین، دایکم بە دوامانەوە بوو، پەرژینی باخچەی خۆمانم لادرِ کردو پێیدا ڕەتبووین بەرەو باکووری گوند ڕۆیشتین. کە گەیشتنە سەر جۆگای(سیفۆن) ئەو پرۆژەیەی مڵکایەتی جووتیارانی بەستەستێن و بەستەستێن و سوڵتانەدێ و بەشێکی خەندەکەو بارەپانێ بەراودەکات، لەوێش وێستاین و من لوێچێك ئاوی جۆگای سیفۆنم خواردەوە، هەموو ڕۆژگارەکانی کاتی منداڵیم وەبیرهاتەوە، کە لەگەڵ برادەرەکانم لەو جۆگایە دڵگیرەدا مەلەمان دەکرد. تاکە شوێنك کە شیاو بوو بۆ مەلەکردن هەر ئەو جۆگایە بوو، بەتایبەتی لە وەرزی هاویناندا...

ئەگەر بە هەڵە نەچووبووم کات(٩)ی شەو بوو، کە لەسەر جۆگای سیفۆن بووین، لەوێوە من تفەنگە برنەوەکەم هەڵگرتبوو، خەلیفەش فیشەکەکانی لە کۆڵ نابوو، کە بریتی بوون لە(١٥٠ ) فیشەك، زۆربەیان ژەنگاوی ببوون، بۆ ئەوسا فیشەکی ژەنگاویش نیعمەت بوو. بە دۆڵێ ڕەسویدا دەڕۆیشتین لە بەرامبەر دەروەکەی کونێ (پیرە ژنێ) دا، خەلیفە بە قسەیەکی خۆش و جوێن ئامێزەوە وتی بە وێتدا شۆڕوەکەمەوە، جا بەوبەریدا بڕۆین یا ئەمبەرە؟ وتم کامەیان باشە وتی بەلای پیرە ژندا ناڕۆین، بە باریکە ڕێگاکەی ئەوبەری (ڕەبیبەی موسا جۆلا) یدا ڕۆیشتین، بۆ سیوادی بەیانی گەیشتینە بن چیای (بێدێو). لەبن هەورازی چیای (بێدێو)دا پڕێسکەکەی دایکم کردەوە، سەیریم کرد پڕە لە پەنیر، هێلکەی کوڵاو و خورما، من زۆر هیلاك بووم، چونکە یەکەمجار بوو بەو جۆرە بە پێیان بە ڕێگادا بڕۆم، ئەوسا پێڵاوێك هەبوو پێیان دەگوت: (شەوڕۆ). پێشمەرگە زۆر لە پێیاندابوو، ئەو پێڵاوەم لە پێدابوو لە ئاستی سەرپەنجەکانم تەنگ بوو سەرپەنجەکانم بلۆقیان دەرکردبوو، بەڵام زۆر خۆم تێکنەدا.

خەلیفە وتی ئەو سەفەرە بۆ تۆ سەنگی مەحەکە... لە تاقیکردنەوە دەرچوویت، پەسندت دەکەم. لە ڕێگای نێوان دێهاتە ڕاگوازراوەکانی بناری(قەندیل) بەرەو خڕی ناوزەنگ، زۆر ماندوو کەنەفت و شپرزە ببووم، بەڵام لە دڵی خۆمدا دەمگوت دەبێ لەو تاقیکردنەوەی خەلیفە دەربچم، هەر بۆیە هەرکاتی(خەلیفە) ئاوڕێ وێدەدام و بە پێکەنینەوە پێی دەگوتم چ دەڵێی کامەیان تۆماربکەم: سەرکەوتن یا شکست، بەدەست ئاماژەم بۆ دەکرد و پێم دەوت بنووسە سەرکەوتن، چەند فرسەخێك لە من دوور بوو، لەسەرم ڕاوەستا تاکو گەیشتمە لای، خەلیفە جگەرەیەکی پێکردو دەستی کرد بە جوێندان و قسەی خۆش و نەستەق. کە سەیری مژی جگەرەی خەلیفەم دەکرد پڕ بەدڵ ئارەزووم دەکرد بگەڕێمەوە سەر جگەرەکێشان و جگەرەیەك لە خەلیفە وەربگرم، بەڵام لەمەشیاندا دانم بەخۆم داگرت، وتم دەبێ لە تاقیکردنەوەی جگەرەشدا سەرکەوم کە هەفتەیەك بوو وازم لێهێنابوو. (خەلیفە) بەدەم فڕێدانی قونکە جگەرەکەیەوە چاوێکی قیچاندو شانێکی هەڵتەکاند، وتی: بڕۆین؟ پێم وت: فەرموو با بڕۆین. بەدەم هەڵسانەوە ئاماژەی بۆ باسکێکی نێوان گوندە رووخاوەکەی بەستێ و ئاڵیەڕەش کرد، وتی ئەو بستووە ببڕین بە کاتژمێرێك دەگەینە گوندی(بێدەلان)، کە بارەگایەکی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانی لێ بوو، بۆ سەر چۆمی گوندی(مارەدوە و سوورەگلە) شۆڕبووینەوە، ئەو کاتە کاتژمێر(٩)ی بەیانی بوو گیای سەوزو جوان دەرختی هەمەجۆر چرۆی کردبوو، لارەی گەڵاو لقوپۆپی دار بەڕوو، دار مازووی لێرەواری گردی رەمکان، مرۆڤی مەست و حەیران دەکرد، بەژن و باڵای کێوی (قەندیل) تابڵێی جوان بوو، وەکو شۆڕە ژنێکی دڵ تەڕو باڵا بەرزو شوخ و شەنگ دەچوو، لەو کاتەدا شیعری مام هێمنی پایەبەرزم هاتەوە یاد، کە لە هۆنراوەی بەهاری کوردستاندا وەسفی سروشتی جوانی کوێستانەکانی قەندیل و کوردستان دەکات، هەر لەخۆمەوە لەگەڵ خۆم دەدوام و دەمگوت ئەو دێهاتە ڕووخاوانە ئەو کوێستان و شاخە سەختەو قایمانەی زنجیرە چیای(قەندیل) چۆن بەبێ پێشمەرگە هەڵدەکەن. ئاخر چۆن دەبێ مرۆڤ رووی بێت بەسەر لاشەی گوندو کانیاو و گۆڕستانە وێرانبووەکاندا بڕوا و لەخۆی نەپرسێت بۆچی نابێتە پێشمەرگە، تا ئەرکی سەر شانی خۆت بەرامبەر بە کوردستانی داگیر کراو بەجێ بهێنێت. هەر بەدەم ئەو دالغانەوە دەڕۆیشتم، کە سەرم هەڵبڕی (خەلیفە) پانتۆڵی دادەماڵی، رووی تێکردم و وتی تۆش پانتۆڵەکەت داکەنە، لێرە قوونی رەش و سپی دەردەکەوێت. چۆمی(مارەدوو) زۆر بوو، بە ئەستەم بواری دەدا مرۆڤ پێدا بپەڕێتەوە،(خەلیفە)

پیاوێکی دنیادیتەو بە ئەزموون بوو، وتی کە لە چۆمی ڕێژەو شلوێ بپەڕیتەوە دەبێ لاونیو لێیدەیت، بۆ ئەوەی نەکەویتە بەر نیرەی شەپۆلەکان، دەنا ئاومالێ دەبی، ڕووبارەکە وەکو هێڵێکی لاکێشەیی مەزندە بکەو بپەڕەوە، کە ئاواتکرد چۆم زۆریش بێت زەفەرت پێ نابات. کە لە چۆمی پەڕینەوە سەیری دیمەنی دەشتی (تاقێ) م کرد، کە کەوتۆتە پێدەشتی نێوان گوندی مارەدووە، بەستێ و سوورەگڵە، هەتا دڵ بخوازێت ڕەنگین و دڵڕفێن بوو. تازە واخەریکبوو ئاونگی گەردی بەیانی سەرو سیمای گیای سێوەڕەو گوڵ و زەمەندی ئەو ناوەی بەردەدا. شنە بایێکی فێنك وخۆش بۆن و بەرامی ئەو پێدەشتە دڵگیرەی دەگواستەوە. هەندێك هەڵکشاین بەرەو گوندە کاولکراوەکەی مارەدووە، ئەو گوندە شینایی وەکو توتن و تەماتەو پێداویستی تری خەڵکەکەی لێ ڕەنێو دەهات. توتنی گوندی مارەدووە لە(پشدەر) بەناوبانگ بوو. توتنەوانەکان زۆربەیان هێرۆیی بوون، لە دوای شۆڕشی(١٤)ی تەمووز کە جەنگ و ناکۆکی کەوتە نێوان ئاغا میراودەلییەکان و جووتیاران، پتر لە(٤٥) بنەماڵەی جووتیار لە گوندەکانی ماردووەو سوورەگڵە جێگیربوون، بەباشترین شێواز کشتوکاڵیان وەبەرهەم دەهێنا. عەشیرەتی مەنگوڕ کەمتر بیریان لە کاری کشتوکاڵی دەکردەوە، چونکە پتر بەبەخێوکردنی مەڕوماڵاتەوە خەریکبوون، ساڵانەش گەرمێن و کوێستانیان دەکرد...

بەدەم ئەو داڵغانەوە دەڕۆیشتم لەپڕ بە قسەی (خەلیفە) لە داڵغەکەم دابڕام، خەلیفە وتی وێدەچێ لە تاقیکردنەوەکە دەرچی، وتم چۆن دەزانی؟ وتی ها......ها......گامان گوروە کلکی ماوە. ئەو بنارەی ئەوبەر دەبینی؟ ئەوە گوندی (سونێی)ە، ئەوی تر (شیوەڕەز) ەو خوارتریش (بەردقەسل)ە، کە چەند ماڵێکی لێیە دوای شالاوی ڕاگواستن ماڵەکانیان بردۆتەوە سەر خانوو و زێدی خۆیان. گوندی (سونێ) وەبەر شالاوی ڕاگواستن کەوتووە، بەڵام بەهۆی بەرگری هێزی پێشمەرگەو سەرسەختی کوێستانەکانی مامەندەو هەرمێن و بارینی بەفرێکی زۆر، سوپایەکی زۆری بەعس لە سەرمان ڕەقبوونەوە، خەڵکی ناوچەکە دوای توانەوەی بەفرەکە چەکێکی زۆریان بە غەنیمەت دەستکەوت. بەدەم ئەم قسانەوە لە چۆمی (سوێسنێ) پەڕینەوە. ئاوی ئەو چۆمە لەبەر ئەوەی سەرچاوەکەی لە کوێستانەکانی قەندیلە، زۆر بەخوڕ و پڕ تەووژمە، بەتایبەتی ئاوەڕۆیی هەوارگەکانی (گوێزێی سەرێ و خوارێ، کە شۆردەبێتەوە بۆ تەنگەی (دۆڵە کۆگە)، لەوێشەوە دێتەوە گوندی سۆڤیانی(سیکەنە و سەرخان) و لەگەڵ چۆمی ناوزەنگ و نۆکان تێکەڵدەبێت. کاتێ گەیشتینە گوندی(بێدەلان) بارەگایەکی شەهید

عەبدولڕەحیم لەوێ بوو، بەڵام لامان نەدا. لەسەر کانی بێدەلان ئاوێکمان خواردەوە، خەلیفەش خێرا چوو هەندێك چڕوچیلکەی هێنا ئاگری کردەوەو چای لێنا... ئەو تامەی لەو چایەم کرد تائێستا لە هیچ خواردنەوەیەکی ترم نەکردووە. بەدەم چا خواردنەوە خەلیفە ئاماژەی بە زنجیرە ڕەبیەی بەرزاییەکانی (بەردقەلشیو) کرد و وتی: لێرەوە هەتا دەگەیە قەڵاتوکان و ئەبوبەکرە ئەو ڕەبیانە لەچاو بزرنابن، لەهەر کوێیەك ئاگر بکرێتەوە ڕەسەدی ئەو ڕەبیانە دەیبینێ، زۆرجار تۆپ لە ڕێبواران دەگرن، خەلیفە وتی ئەگەر لەبەر ئەو مەترسییە نەبوایە لەسەر چۆمی (مارەدووە) (چا)مان لێدەنا. خەلیفە راستی دەگوت چەندان ڕێبوار بەهۆی بۆردومانی تۆپخانەی ڕەبیەکانی سەری بەردقەلشیو و تەپۆلکەی قوچی (پیرسوار) شەهیدبوون، لەوانە شەهید (خەلیل)، کە کادرێکی پێشکەوتووی (ی.ن.ك) بوو لە نزیك گۆڕستانی قونەبانی کێلێ بە دووره تۆپێك لەگەڵ کاروانچییێکی هاورێبواریدا شەهیدکران...

کە گەیشتینە (خڕی ناوزەنگ) عەسرێکی درەنگ بوو، یەکەم کەس لە هاوڕێیان کە چاوم پێی کەوت هاوڕێ دکتۆر (ئازاد سەرسۆر) بوو، کە معاون طبی بوو. ناوبراو وەك پزیشکی فرۆشگای ناوزەنگ وابوو لە ژوورێکی بچووکی قوڕو بەرددا، دەرمان و پێداویستی برینپێچی دانابوو، رۆژانە بەدەیان کەس لە هاووڵاتیانی کاروانچی وێڕای پێشمەرگە سەردانیان دەکرد. دکتۆر ئازاد زۆر بە خولق و ڕەونەقەوە بەخێرهاتنی کردین، دکتۆر ئازاد هاوڕێیەکی زۆر کراوەو کۆمەڵایەتی بوو، پێی وتم: هاوڕێ ئەوە یەکەم رۆژە پەیوەندی دەکەیت؟ وتم: بەڵێ. وتی: دەزانم دڵتەنگی بۆ ژن و منداڵت. وتم: ژنم هەیە بەڵام منداڵمان نییە. وتی: مرۆڤی شۆڕشگێڕ نابێ زۆر بیر لەو حاڵەتانە بکاتەوە. وتی: منیش دەزگیرانم مارەکردوە، بەڵام نەمگواستۆتەوە، حەوت خوشکم هەیە، تەنیا تاقانەی **ئەو خوشکانەم. بەڵام بیروباوەڕەکەم بەلاوە پیرۆزو گرینگترە...وەرە چایەکتان بۆ لێدەنێم. چووینەژووره بچووکەکەی لە قوژبنی ژوورەکەدا قتووییێکی بچووکی غازی دەرهێنا هەر بەقەدەر ژێر جگەرەیەك دەبوو. یەکەم جار بوو شتی ئاوا ببینم. چایەکەی لەسەر دەم کرد، لەدوای چاخواردنەوە لەگەڵ(خەلیفە) بەرەو ئانیشکە دۆڵی خڕی نازەنگ هەڵکشاین، لە بەرزایی دۆڵەکەدا لەناو ڕەوەزە شاخێکی داوێن گاکێڵ بارەگای مام جەلال دیاربوو. خانوویێکی بە قوڕو بەردی ئاسایی بوو، دەوروبەری بارەگای مام جەلال ژمارەیەك بارەگای تری لێ دەبینران، کە حیمایەی(مام جەلال)یان دەکرد. لە سەری ئانیشکە دۆڵەکەشدا لەبن تاشە بەردێکی گەورە خانوویێکی بچووك هەبوو بە بەردو قوڕ**

**هەڵچنرابوو هەر لە وشکە کەڵەکە دەچوو، ئەو خانووە یەکەم بارەگای** چەکداری هاوڕێیان بوو، کە هاوڕێیانی پشدەر بەردی بناغەیان دانابوو. کاتێك گەیشتینە ئەوێ، چاوم بە هاوڕێ مەحمود دیکتارۆف کەوت، بەرەو روومان هات و بە گەرمی بەخێرهاتنی کردین. هەر ئەو ئێوارەیە رەوانەی کردم بۆ (توژەڵە)، کە بارەگای هاوڕێیانی پشدەر و بیتوێنی لێ بوو، هەر لە خڕی(ناوزەنگ) خواحافیزیم لە هاوڕێ و برای خۆشەویستم خەلیفە پیرۆت کرد. زۆر نیگەران بووم کە لە(خەلیفە) پیرۆت دابڕام، چونکە زۆردەمێك بوو بەشەو رۆژ بەتایبەتی لەو چەند مانگانەی، کە قاچاخ ببووم هەر بەیەکەوە بووین، ئەوە بوو خەلیفە گەڕایەوە بەرەو فرۆشگای ناوزەنگ، منیش بەرەو(توژەڵە) ڕۆیشتم، کە تەنیا گردە باسکێکی درێژیان نێوانە. ئێوارێ بە درەنگەوە گەیشتمە بارەگای(توژەڵێ)، هاوڕێیان بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردم، هەموو دەورەیان دام و بە پرسیاری هەمەجۆر سەرگەرمیان کردم، بەتایبەتی سەبارەت بە دەنگوباسی هاوڕێیانی ناوەوەو هەڵوێستی ڕژێم سەبارەت بە دەست پێکردنی خەباتی چەکداری(حزب)...

ئەو شەوە زۆر بە قووڵی خەوتم. یەکەم رۆژی پێشمەرگایەتیم، ئەرکی رۆژانەو چۆنییەتی هەڵسوکەوتم بە چەند دێڕێك لە هاوڕێ (رەسووە سوور) بیست. پێی وتم ئەمشەو وەك بەرخی تێرە شیر وابووی، کە خەوتی خەبەرت نەبۆوە. سبەی شەو لە لیستی حراسەت و خەفەریاتدا ناوت تۆماردەکەین. بۆ ژەمی ئەو بەیانییە تەنها(٥) پێنج گوێزیان پێدام، کە تەنیا سیانیان ساغ بوون. ژیانی پێشمەرگایەتی ژیانێکی زۆر سەخت و دژوار بوو. زۆر بیرم لە ژیان و ئایندەی خێزانم دەکردەوە، کە بە تەنها لەگەڵ عەلی برامدا بەجێم هێشتبوو. خاڵ عەولاش هەر لەگەڵ خێزانم و عەلیدا دەژیا، ئەگەرچی خاڵ عەولا خانووی خۆی هەبوو، هەندێ پەڕۆ و پریاسکەی پێکەوە نابوو، بەڵام هەر لەماڵی ئێمەدا ژیانی بەسەردەبرد. چیرۆکی خاڵ عەولا شێتە چیرۆکێکی دوورو درێژە، دواتر بە درێژی باسی دەکەم...

پەیتا پەیتا رێژەی هاوڕێیان زیادی دەکرد، رۆژانە لە وێستگەکانی خۆمان لە بەستەستێن، پۆل پۆل هاوڕێیان دەگەیەنرانە بنکەو بارەگاکانی(حزب). رێژەی هاوڕێیان بە ئەندازەیەك زۆربوو، کە پێویستی دەکرد تەشکیلاتی نوێ پێك بێت، هەروەها ئیدارەدانی ئەو هێزانە پێویستی بە خۆراك و پێداویستی تری بارەگا هەبوو. لە سەرەتای دامەزراندنی بارەگای بنکە سەرەتاییەکاندا، یەکێتی نیشتمانی کوردستان هاوکاری هاوڕێیانی کردبوو بە (١٠تا١٥) پارچە چەکێ سوك، هەروەها هەندێك پێداویستی ئیداری بۆ هاوڕێیان دابینکردبوو، بەڵام

بنکەو بارەگاکانی(حزب) زیادیان کردبوو، دەبوایە هەوڵێکی پتر بدرێت. هاوڕێیانی پشدەر هاوڕێ (مەحمودی حاجی فەقێ خدر) یان  بە نوێنەری حزب نارده ئێران کە تازە ڕژێمی شا ڕووخابوو، بۆ ئەوەی هاوڕێیانی حزبی تودەی ئێرانی هاوکاری حزب بکەن. ماوەیەك هاوڕێ مەحمود لە شاری سەردەشت و مهاباد مایەوە. لەو ماوەیەدا حزبی(تودە) بە پێی توانا هاوکاری دارایی حزبی شیوعی عێراقی کرد، بەڵام ئەو هاوکارییە نەیتوانی وەك پێویست گرفتەکانی حزب چارەسەر بکات. سەرەڕای ئەو بارە نالەبارە ئابوورییە، حزب لیژنەیەکی ئیداری زۆر بە ئەزموون و سەرکەوتووی دامەزراند کە بە شێوازێکی سەرکەوتوو خواردەمەنی پێویستیان دابەشدەکرد. دوو هاوڕێی(عەرەب) سەرپەرشتی ئیدارەیان دەکرد بەناوەکانی (ئەبو ئەحمەد و ئەبو عەلی) کە دواتر بەدەیان کادری ئیداریان پێگەیاند، بەباشترین شێوە کاروباری ئیداری(حزب) بەڕێوەدەچوو...

گۆڕانی ژیانی ئاسایی ناو شار بۆ ژیانی پێشمەرگایەتی شاخ زۆر کارێکی سەخت بوو، بەتایبەتی لە هەلومەرجی سیاسی هەفتاکان. هەفتەی یەکەم وەکو مرۆڤێکی(هەوت) وابووم، بەڵام هێدی هێدی لەگەڵ ژیانی پێشمەرگایەتی ڕاهاتم، ڕۆژ بە ڕۆژ خۆشەویستی(حزب) و هاوڕێیان لە دڵ و دەروونمدا بەهێزتر دەبوو، هەر ئەو بیروباوەڕە بوو بە هۆی ئەوەی بەرگەی دووری خێزان و دایك و کەسوکارم بگرم. ژمارەی هاوڕێیانی لقی پشدەر گەیشتە(٧٠) هاوڕێ بۆ ئەو سەردەمە هێزێکی زۆر بوو، لقەکانی تریش بە هەمان شێوە ژمارەیان زیادی دەکرد. ئەوسا هاوڕێ کەریم ئەحمەد، فاتح ڕەسوڵ (ئەبو ئاسۆس) ئەبوحیکمەت، ئەبو جەمیل لە خڕی ناوزەنگ سەرکردایەتی (حزبی شیوعی عێراقی)یان دەکرد. لە کۆبوونەوەیەکدا کە هاوڕێ کەریم ئەحمەد سەرکردایەتی دەکرد، بەڵێنی بە هاوڕێیانی پێشمەرگەی حزبدا، کە بە زووترین کات چەك و پێداویستی خەباتی چەکداری پەیدابکەن، بەڵام ئەو بەڵێنە زۆر بە درەنگەوە جێبەجێکرا، زیاتر لە ساڵێك بوو زۆربەی هاوڕێیان لە جیاتی تفەنگ هەر یەکەیان گۆچانێکی بەدەستەوە بوو. هەر بۆ گاڵتەکردن، کە ناوی ئەو هاوڕێیانەیان دەهێنا،دەیانگوت فلان هاوڕێیەی دارینۆفی پێیە. بێ چەکی و ئاڵۆزبوونی بارودۆخی سیاسی و گوشاری سەربازی هەردوو دەوڵەتی عێراق و ئێران و هاوڕێیانی بێزارکردبوو. غەریبی و دووری لە ژن و منداڵ بۆ ئەو هاوڕێیانەی خێزاندار بوون، ئەوەندەی تر گوشاری دەروونی بۆ ئەو جۆرە هاوڕێیانە دروستکردبوو. هاوڕێیەك هەبوو بەناوی ئەبو بەشدار ڕۆژانە داوای لە هاوڕێ مستەفا غەفوور دەکرد، کە نامەی بۆ بنووسێت بۆ دایکی

بەشدار، چونکە خۆی خوێندەوارییەکەی هی ئەوە نەبوو نامەی پێ بنووسرێت. هاوڕێ مستەفا زۆرجار بێزاردەبوو و خۆی لە نامە نووسینەکە دەبوارد. هاوڕێ برایم مستەفا ڕۆژێك بە هاوڕێ ئەحمەد قەڵادزەیی وت کەی هەچە نامە دەنووسێت، بە هاوڕێ(برایم)م وت هەچە نامە چییە؟ وتی نامەی واز هێنانە لە (حزب). ماوەی(٦) شەش مانگ بوو هاوڕێیان چاوەڕوان بوون چەك بگاتە دەستیان، بۆ ئەوەی جەولە بکەن یا لانی کەم هەست بکەن کە ئومێدێك هەیە، کەچی چەك هەر نەگەیشت. بەشێکی زۆر لەو هاوڕێیانەی بێزاربوون یا خۆیان تەسلیم بە ڕژێم دەکردەوە یا بەرەو ئێران سەری خۆیان هەڵدەگرت...

## ڕۆژهەڵاتی کوردستان:

کە ڕژێمی شاهنشایی ئێران رووخا، کۆماری ئیسلامی ئێران جێگای گرتەوە، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش وەکو تەواوی شارەکانی تری ئێران ڕۆژانە کۆڕو کۆبوونەوە لە سەر شەقام و شوێنە گشتییەکانی شار ئەنجام دەدرا. ئەمەش دیاردەیەکی تایبەت بوو بە شۆڕشی ئیسلامی ئێران، کە من لە هیچ شوێنێ نەمدیوە و نەمبیستووە. گفتوگۆ لە نیوان دوو کەس یا پتر دەهاتە ئاراوە و دوور لە توندوتیژی بیروڕاکان دەخرایەروو. وەك کۆڕگێڕانی جەماوەری وابوو، لە چرکە ساتێکدا بەدەیان کەس کۆدەبوونەوە، هاوکات بەیاننامەی هەر لایەك بلاودەکرایەوە، لەمەر پرسەکان رای هەر لایەك بە روونی بە ئاگایی جەماوەرەکە دەگەیشت و، بانگەوازی هەمەجۆرە دەبیستران. حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی بەهێزترین لایەنی سیاسی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو. حزبی تودەی ئێرانی وەکو لایەنێکی سیاسی هاوبیروباوەڕ بوو، لەگەڵ حزبی شیوعی عێراقی هاریکاری یەکتریان دەکرد، حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە رێگای شاندێکی باڵاوە سەرقاڵی گفتوگۆ بوون لە(تاران)، بەڵام رۆژ بەرۆژ بارودۆخەکە بەرەو گرژی و ئاڵۆزی دەڕۆیشت، ئەو بەندانەی کە خواستی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوون، کۆماری ئیسلامی ئێران قبوڵی نەدەکرد، سروشتی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ سەرەتاکانی دیموکراسی و مافی گەلاندا ناکۆك بوو، هەربۆیە ڕابەری کۆماری ئیسلامی ئیمام خومەینی فتوای دا، کە جیهاد بەرامبەر بە گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەست پێ بکات. جەنگێکی کراوە لە نێوان ڕژێمی کۆماری ئیسلامی و بزووتنەوەی سیاسی نیشتمانی رزگاریخوازی گەلی کوردستان لە رۆژهەڵات دەستی پێکرد...

پەیوەندی نێوان حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و حزبی شیوعی عێراقی زۆر باش بوو. تەنانەت حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران داوای لە حزبی شیوعی عێراقی کردبوو، کە ژمارەیەك کادری عەسکەری بنێرێت بۆ ئەوەی سوودیان لیَ وەربگرن، کە ڕابەرایەتی بەرەکانی هێڵی بەرگری ڕۆژهەڵاتی کوردستان بکەن بەرامبەر بە لەشکرکێشی سوپای پاسداران. ئەوە بوو حزبی شیوعی عێراقی ژمارەیەك کادری بە ئەزموونیان نارد، کە هاوکاری هێزی پێشمەرگەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بکەن بە ڕابەرایەتی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، یەکێك لەو هاوڕێیانەی کە وەکو بەرپرسێکی باڵا لەسەر ئاستی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەناسرا، بەتایبەتی لە جەنگی سێ مانگەدا لە شاری سنە هاوڕێ مەلا محەمەد جوانڕۆیی بوو. ناوبراو لە جەنگی بەرگری لە شاری سنەو سەقز بە خەستی برینداربوو لاقێکی سەقەت بوو. هاوڕێ مەلا محەمەد واتا ئیبراهیم صۆفی ڕۆڵێکی گرینگی هەبوو...

ژمارەیەك هاوڕێی تریش هەر لەو جەنگەدا برینداربوون، حزبی شیوعی عێراقی پەیتا پەیتا هاوڕێیانی خۆی دەنارد بۆ هاریکاری حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و حزبی تودەی ئێران، حزبی(تودە)ی ئێران، ئەگەرچی دروشمی خەباتی چەکداری بەرزنەکردبۆوە، بەڵام پشتگیری بزووتنەوەی چەکداری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی دەکرد. لە ڕێکەوتی ١٩٧٩/٧/١٨ منیش ئاگادارکرام، کە بچم بۆ جەولەیەکی سەربازی بۆ سنووری دێهاتەکانی سەردەشت و مهاباد، بەرپرسی مەفرەزەکەمان هاوڕێ خدر حوسێن بەرپرسی سەربازی بوو، هاوڕێ ئەحمەدی سەفایی کە ئەندامێکی کارای تودەی ئێران بوو وەکو رابەری سیاسی مەفرەزەکە لە کاتی جەولەکردندا لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا ئەو قسەی بۆ خەڵکەکە دەکرد. لە پڕوپاگەندەکاندا هێرش دەکرایە سەر کۆماری ئیسلامی ئێران، کە بە ناڕەوا فتوای جیهادیان داوە بەرامبەر بەگەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان....

ڕۆژگارەکانی جەنگی سێ مانگە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ڕۆژگارێکی زوو تێپەڕ و سەرسوڕهێنەربوون. خەڵکی شۆڕشگێڕی دێهاتەکان زۆر بە دڵسۆزییەوە پێشوازیان لە پێشمەرگە دەکرد. ڕۆژێك لەسەر ڕێگای(سەردەشت-مهاباد) سەیتەرەیەکمان واتا(کەمین) دانابوو، پاسێك لە مهابادەوە دەڕۆیشت بەرەو شاری سەردەشت، ژنێکی سەرنشینی پاسەکە بە چاو ئاماژەی دا بە ئێمە، کە لەناو پاسەکەدا پاسدارێك هەیە، هاوڕێیەك سەر پاسەکە کەوت ژنەکە بە تیلەچاو هاوڕێیەکەی تێگەیاند کە ئاماژە بوو بۆ کابرای پاسدار. ئەوە بوو کابرای

پاسدار دەستگیرکرا، کە پیاوێکی تەمەن (٤٠) ساڵەی عەجەم بوو، هیچ نەدەترسا بە ڕاشکاوی دیفاعی لە کۆماری ئیسلامی ئێران دەکرد. ئەوکاتە لیژنەیەك هەبوو لێکۆڵینەوەی لە کابرای عەجەم دەکرد، نازانم دواتر کابرا چی بەسەرهات...چوین بۆ گوندی(کیتکە) شەوێ لەوێ ماینەوە، لەوێش ئاغای گوندەکە گوایە پەیوەندیی بە ڕژێمەوە هەبووە چەکێکی(ژ-٣)ی هەبوو لە ماڵەوە بوو هاوڕێیان لێیان سەند، ئەو مەفرەزەیە (١٥) ڕۆژ درێژەی کێشا دواتر گەڕاینەوە (توژەڵە)، کە بارەگای هەمیشەیی (حزب) لەوێ بوو. ئەو چەکانەی بۆ ئەو مەفرەزەیە پێمان درابوو لێیان وەرگرتینەوە، من (ژ-٣)یەکم پێدرابوو، لە مەفرەزەکە هاوڕێیان فێریان کردین چۆن تفەنگی(ژ-٣) بەکاربێنین...

## پێکهێنانی لیژنەی ڕێکخستن:

ڕێکەوتی ١٩٧٩/٨/٩ کاتی کۆبوونەوەی لیژنەی حزبی دیاریکرابوو لە لایەن هاوڕێ مەحمود حاجی فەقێ خدر کۆبوونەوەکە لە ژێر داربەڕووە گەورەکانی گۆڕستانی (زەڵێ) پێکهات، تازە بارەگای لقی پشدەر چووبوو بۆ ئەوێ. ئەو شوێنە پێشتر بارەگای کاك حاجی حاجی برایم بوو، بەڵام بەهۆی جیابوونەوەیان لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان وەکو بزووتنەوەی سوشیالیست باریان کردبوو بۆ بەری گوندی(بێدەلان) زۆربەی بارەگای د. مەحمود عوسمانیش لەوێ بوو.

کۆبوونەوەکە بۆ سەرپەرشتی کاری ڕێکخراوەکانی ناوەوە بوو، من و هاوڕێ سەلیمە سور و ئەحمەدی کاکی بەکر و مستەفا غەفور بووین کاك مەحمودیش وەکو بەرپرسی هەموومان سەرپەرشتی کۆبوونەوەکەی کرد، لەوێ بڕیاردرا پێشنیاربکرێت بۆ(حزب) کە من و هاوڕێ ئەحمەدی کاکی بەکر سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی سەنگەسەرو گوندو ئۆردووگاکانی بکەین، بۆ قەڵادزێ هاوڕێ مستەفا غەفورو هاوڕێ سەلیم و هاوڕێ مەحمود خۆیشی سەرپەرشتی سنووری قەڵادزێ و دەوروبەری بکەن، دوای کۆبوونەوەکە بە ماوەیەك، (حزب) ڕەزامەندی نیشاندا، کە دەست بەکاربین بە مەبەستی گەشەپێدان و بەهێزکردنەوەی ڕێکخستنەکان لە سنووری پشدەر...

## قەندیل و دەشتی بەهەشت:

پێش ئەوەی هاوڕێیان بۆ نان خواردنی بەیانی بانگ بکرێن هاوڕێ ڕەسووە سوور بە زەردەخەنەیەکەوە وتی هاوڕێ رات چییە بەرەو(قەندیل) سەفەرێك بکەین؟ زۆر حەزم دەکرد سەفەر بکەین، چونکە زۆر غەریبی ماڵەوەم کردبوو، پێم عەیب بوو بە هاوڕێیان بڵێم مۆڵەتم بدەنێ، زۆر لەو هاوڕێیانەی بە مۆڵەت دەگەڕانەوە ماڵەوە خۆیان تەسلیم بە ڕژێم دەکردەوە، هەربۆیە هاوڕێیانی بەرپرس بە گومانەوە لەو هاوڕێیانەیان دەڕوانی، کە داوای مۆڵەتیان دەکرد بۆ ناوەوە. لە وەڵامی هاوڕێ ڕەسوڵدا وتم کوا هاوڕێیان مۆڵەتمان دەدەن، وتی سووکە ڕەزامەندییەکم وەرگرتووە، وتم هیچ لەوە خۆشتر نییە سەفەری(قەندیل) بکەین، بۆ رۆژی دواتر هاوڕێ ڕەسوڵ وتی مۆڵەتی سەفەرەکەم بۆ تۆو هاوڕێ حەسەن خدرو مەلای سۆفی عەولا وەرگرتووە، بەیانی دەڕۆین. لە رۆژی ١٩٧٩/٨/١٢ بەرەو دەشتی(وەزنێ)ی کونە مشکێی بناری(قەندیل) بەرێکەوتین. بۆ ژەمی نیوەڕۆ گەیشتینە دەشتی وەزنێ. یەکەم جار بوو دەشتی وەزنێ ببینم، دەشتی بەهەشتی ڕاستەقینە دەشتی وەزنێیە، هەتا خوا حەزبکات جوان و ڕەنگینە بەو هاوینە لە مانگی نیسان دەچوو، هەتا چاوبڕدەکات سەوزایی بوو، لەم لا حیلەی ئەسپ و ڕاکەڕاکی ڕەوە بوو، لەملای تر مێگەلە مەڕ بوو، لە ئانیشکە دۆڵەکان دەنگی کاریلەو بەرخەل بوو، لەو کاتەدا هۆنراوەی شاعیری گەورەی موکریان ماموستا هێمنم هاتەوە بیر، وتم هێمن گیان هەقت هەبوو شین بۆ ژوانگەو ژیانی کوێستانەکانی کوردستان بکەی، دیمەنی ئەوێ رۆژێ وا لە مێشکمدا چەسپیوەو چاپ بووە. زۆرجار کە خەونی خۆش دەبینم، بێگومان دیمەنێکی دەشتی وەزنێی تێدایە...

هاوڕێ مام ڕەسوڵ وتی دەڕۆین بۆ ماڵی کاك (حەمەدی پوور بێری). ناوبراو خەڵکی گوندی کونە مشکە بوو، دۆستایەتیان لەگەڵ کاك ڕەسوڵ و هاوڕێ حەسەن خدردا هەبوو. زۆر بە گەرمی پێشوازیان لێکردین، خەڵکی ناوچەی موکریان زۆر خوان چاك و دڵگەورەو خوان ئاوەڵەن بۆ میوانداری، ئەوەندە بە لوتف و خۆش مەشرەب بوون، لەزەتی ماڵی بابە گەورەو دایە گەورەم لێ دەکردن، بەدڵ حەزم دەکرد ببم بەشوانی ماڵی کاکە حەمەد بۆ ئەوەی لە دەشتی بەهەشت لە دەشتی وەزنێ بژیم، چاوم بڕیبووە هاوڕێ ڕەسوڵ دەمگوت خوایە کاك ڕەسوڵ بڵێ ئەم شەو لێرە دەبین، هەتا نانمان خوارد رۆژ لەدوندە چیاکانی رۆژئاوای دەشتی وەزنێ، کە دەڕوانێتە دۆڵەکۆگە بەرەو ئاوابوون دەچوو، هاوڕێ ڕەسوڵ وتی هاوڕێیان دەڵێن چی

شەوێ لێرە بین؟ نەمهێشت قسەکەی تەواوبکات یەکسەر وتم بەڵێ با لێرە بین، ئەوشەوە لەوێ بووین، ئای چ شەوێکی خۆش و فێنك و ئارام بوو، ئەوشەوە لە بەهەشت بووم...بەیانی بەدەنگ و جریوەی ڕەوە تەیری هەمەجۆرو حیلەی ئەسپ و زیڕەی ماینی فالگر خەبەرم بۆوە، چەند دیمەنێکی جوان بوو دەشتی وەزنێ، بەو هاوینە ئاوەنگ ڕوومەتی سێوەڕەو گیادا سولکەی پوشی بوو، دیمەنی گولاڵەو بیبوون، وەنەوشەی جوان گوڵی تر وەکو فەرشی کاشان دەچوو، ڕووی دەشتی وەزنێی پۆشی بوو. نانی بەیانی ئەو ڕۆژەمان بە ڕۆنەکەرەو هەنگوین خوارد ئای چ ژەمێکی بە لەزەت بوو، کە نان خورا، هاوڕێ ڕەسوڵ وتی هاوڕێیان با بڕۆین، خۆزگەم دەخواست هەموو تەمەنم لەو ناوچەیە بەڕێ بکەم، بەڵام خۆزگە شتێکەو واقیع شتێکی ترە، کە بەرەو ڕێگای (قەندیل) هەڵدەکشاین لە ڕێگادا هەندێ تیرەماری ڕوکار سوور و تیژڕۆی جوانمان دەبینی لەمبەر بۆ ئەوبەری ڕێگا خۆیان لەناو گیاو زەمەندی دەشتی وەزنێدا بزردەکرد، کە من پێشتر ئەم جۆرە مارانەم نەبینی بوو. تا پتر بەرەو دۆڵەکۆگە و هەوارگەکانی(قەندیل) هەڵدەکشاین، دەشتی وەزنێ جوانتر دەبوو، لەسەر ڕێگادا چەندان کانی بە خوڕو چۆمۆکەی پڕ لە سەهۆڵاوی ساردمان بینی، کە هەر یەکەیان هەوارگەیەك بوو بۆ خۆی...

کە وەسوێی هەوارگەی (خوار) و (کۆترەل) کەوتین، ئەویش بەهەشتێکی تر بوو، بەڵام جێگای دەشتی وەزنێ ناگرێتەوە. لە هەوارگەی خوار و کۆترەل میوانی ماڵی کاك حەمەدێکی تر بووین بەناوی کاك (حەمەدی شینەی سپێرۆیی)، کە دواتر بووین بە دۆست و زۆرجاری تر لە ساڵانی پێشمەرگایەتیدا میوانداری کردووین. ماڵێکی خانەدان و دڵ فراوان و خوان چاکەو دڵ ئاوەدان بوون، هەوارگە بە هەوارگە بەناو دڵی (قەندیل)دا تێپەڕین هەتا گەیشتینە هەوارگەکانی (مێرگژان) و (ئاغاسەر) و (سەرشاخان) کە بە سەر هەوارگەکانی (تاتی دۆی) و (چۆمەی) دا دەڕوانن. لەسەر هەوارگەی سەرشاخان هاوڕێ ڕەسوڵ وتی کێ دەتوانێ یەك دەقیقە پەنجە بخاتە ئەو کانییەوە فرمێسك لەچاوی نەیەت؟ وتی هەرچی فرمێسکی لەچاو نەیەت دیارییەك لەمن وەردەگرێت. هەرسێکمان من و حەسەن خدرو مەلا خۆمان تاقی کردەوە، گرەوەکەمان لە هاوڕێ ڕەسوڵ نەبردەوە. کاك ڕەسوڵ زۆر شارەزا بوو لە کوێستانەکان یەك بەیەکی کانیاوو هەوارگەکانی دەناسین، کە سەیری دیمەنی هەوارگەکانی قەندیل و سیمای هاوڕێ(ڕەسوڵ)م دەکرد وا سەرسام بوو بوو هەزاران یادەواری لەو داڵغەو تێفکرینە قوڵانەی

هاوڕێ ڕەسوڵ دا بەدی دەکران کە ئەستەم بوو بیری مرۆڤ دەرك بە نهێنییەکانی بکات... قەندیل چەند جوان و دڵگیریت، کە لەسەر زنجیرە شاخی سەرشاخان و دوندە هەوارگەکانی(سەوە)و هەورازی خیزی سەیر قەندیل دەکرێت مرۆڤ سەرسام دەکات، قەندیل هەر هەوارگەو مەڕلەوەڕ نییە بۆ شوانکارەکانی کوردستان، بەڵکو نیشتمانێکە سەر بەخۆ بۆ هەر رۆڵەیەکی کورد لەهەر چوار پارچەی کوردستان هەر کەسێك، یا هەر حزبێك، هەر عەشیرەتێك یاخی بووبێت لە داگیرکەران، قەندیل بگرەو هاتم...قەندیل بووە بە مەکۆی مەنزڵگای ئارامی بۆ هەر مرۆڤ و زیندەوەرێك کە رووی تێ بکات...

(قەندیل) بۆ هەموو وەرزێك نابێ، ئەوەی رێگای کەوتبێتە قەندیل دەزانێ(قەندیل)مرۆڤی هەڵکەوت و ئازاو بە ئەزموونی دەوێ کە لە وەرزی زستانانددا پێیدا بڕوات...هەوارگەکانی قەندیل لە جیاتی دکتۆر سوودیان لێ وەرگیراوە، لە دەڤەری پشدەر ئەوانەی بە تەمەنن لە یادیانە ساڵانی ڕابردوو هەر کەسێك نەخۆش دەکەوت لە گەرمیان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی دەیاننارده کوێستان بۆ ئەوەی بە کەش و هەوای کوێستانەکانی(قەندیل) لە نەخۆشییەکە باش بێتەوە، زۆر بە دەگمەن هەبوو باش نەبێتەوە چونکە ئەوەندەی گیاو خۆراکی سروشتی هەمەجۆری دەخوارد نەخۆشییەکەی دەپەڕاند، کوێستانەکانی کوردستان بە گشتی و قەندیل بەتایبەتی سەرەڕای سەختی و ئەستەمی چیاکانی باشترین ژینگەیان هەیە بۆ ساغلەمی مرۆڤ و زیندەوار، ئەوەی رۆژێك لە رۆژان رێگای کەوتبێتە بناری قەندیل و هەوارگە و کوێستانەکانی، هەرگیز ئەو رۆژگارانەو یادەوەریانە لە ژیانی خۆیدا لەبیرناکات...

هاوڕێ ڕەسوڵ شارەزا بوو، پێشمان کەوت بەناو تیشە شاخەکانی سەرشاخاندا شۆڕبووینەوە بەرەو هەوارگەیەکی تر، کە پێیان دەگوت مالوچکێ (ئەسلانێ)، لەوێشەوە داکشاین بەرەو هەوارگە دڵگیرەکەی (کەولان)، کە لە سەرەتای دۆڵەکەدا هۆبەی ماڵی (خاڵە سەید ڕەسوڵ)ێکی لێ هەڵدرابوو، کە خەڵکی دێهاتەکانی (ترکەش) و (کەوپەڕی) رۆژهەڵاتی کوردستان بوو. شایانی باسە خێڵاتی رۆژهەڵاتی کوردستان و باشووری کوردستان لە کوێستانەکانی قەندیل تێکەڵ یەکتری دەبن و خێزانێکی گەورەی خێڵاتی قەندیل پێکدەهێنن، سەرەڕای زەبروزەنگ و گوشاری داگیرکەران، بەڵام لە دەستیان نەهاتووە ئەو ئاوێتەبوونە، کە ریشەیەکی مێژوویی هەیە لەبەر یەك بترازێنن...

هەر کە گەیشتینە هۆبەی خاڵ سەید تەڕدەستی چا سازکراو خواردن هێنرا، خاڵە سەید بووك و کچێکی گەنجی هەبوو خەریکی مەشکەژان بوون، ناوی کچەکەیان کوبرا بوو، هەتا دڵ بخوازێت بە لوتف و رەنگ و رووخۆش بوون، کاك (ڕەسوڵ) یان دەناسی زۆر ریزیان لێگرتین، دواتر بەرەو هەوارگەی ئاوی سپی ڕۆیشتین، کە ناوی خۆی بەخۆوەیە، شەتە ئاوێکی سپی و جوان لە سینگە شاخەکە دێتەدەرێ جوانییەکەی مرۆڤ سەرسام دەکات. کە گەیشتینە هەوارگەی ئاوی سپی هۆبەی خزمانی خۆمان بوو لە عەشیرەتی (خدر مامەسێنە) لەوێ چادریان هەڵدابوو، کە بریتی بوون لە براکانی هاوڕێ مام ڕەسوڵ وەکو مام خدرو خاڵ مەحمود، مامەکانی هاوڕێ حەسەن خدر، مام موسا، کاك ڕەسوڵ، هەروەها کۆمەڵێك خزم و ئاشنای تریش لەو هەوارگەو لە هەوارگەی چوومەی هەبوون کە هەوارگەکان بە سەر یەکەوە دراوسێن. مرۆڤ کە ماوەیەك لە خزم و کەسی دووردەکەوێتەوە زۆر غەریبی خزم و دۆستانی خۆی دەکات، کاك ڕەسوڵ هەر ژەمە پێشنیاری جۆرە ژەمێکی خۆشی دەکرد، گۆشت بە برژاوی بە (قوڕاو) کە رۆژهەڵاتی کوردستان پێی دەڵێن (بەربەسێڵ)، هەموو ژەمێك ئامادەبوو. یەکەم جار بوو لە ژیانمدا بچم بۆ کوێستان، پێم سەیر بوو، نە تێرخواردن هەبوو نە شەکەتی و ماندووبوون، بەڵام زۆر خەمی دایکم و خێزانم و ماڵەوەم هەبوو، ماوەی (٤) چوار مانگ بوو لێیان دوورکەوتبوومەوە، پڕ بەدڵ ئارەزووم دەکرد، منیش خزمانی خۆم ببینم، زۆرجار بە بیرمدا دەهات کە بە هاوڕێ ڕەسوڵ بڵێم لەو چەند رۆژانەی لێرە لە کوێستان دەمێنینەوە مۆڵەتم بدەن سەردانی خوارەوە بکەم، بەڵام ئەوانەی دەڕۆیشتن بە مۆڵەت و نەدەگەڕانەوە، ببوو بە دیاردەیەکی پڕ لە گومان بۆ ئەوانەی مۆڵەتیان وەردەگرت، لەبەر ئەوە باسم نەکرد... ئەو چەند رۆژانەی لە کوێستان بووین خۆشترین رۆژگاری ژیانی پێشمەرگایەتی من بوو، سەفەرو مەجلیسی هاوڕێ ڕەسوڵ ئەوەندە خۆش و ئاوەدان بوو هەستم بە بێزاری نەدەکرد...

## مەفرەزەیەکی سەیر:

لە ١٩٧٩/٨/٢٨ لقی پشدەر بڕیاریاندا کە مەفرەزەیەك دابەزین بەرەو خوارەوە بە مەبەستی ئەنجامدانی چالاکی سەربازی و رێکخراوەیی و ڕاگەیاندن، ئەو هاوڕێیانەی خوارەوە لە مەفرەزەکە بەشداربووین: مام خدر ئیسماعیل بە ئامر مەفرەزە دەست نیشانکرابوو، هاوڕێ محەمەد دەڵگەیی، حەسەن خدر، محەمەد سۆفی عەولا(فیدایی)، مستەفا غەفور، هەمزە سوور،

بەندە، هاوڕێ خدر بەو پێیەی لە هەمووممان بە تەمەنتر بوو لە شۆڕشی (ئەیلول) پێشمەرگایەتی کردبوو کرابوو بە بەرپرس. ئێمە زۆربەمان لە رووی شێوازو ئەرك و کاری پێشمەرگایەتی پارتیزانی کەم ئەزموون بووین. ئەو رۆژەی کە لە ناوزەنگ بەرێکەوتین تەنها توانیمان بگەینە بناری گردی ڕەمکان، لە ڕێگای نێوان گوندی سونێ و سەرخان و ئالێیەڕەش، هاوڕێ خدر زۆری ترساندین پێی دەگوتین پیویستە خڕەو خڕ بن، دار بۆ بن دار بڕۆین نابێ ڕەبییەکانی سەری بەردقەڵشیو بمان بینن، زۆربەمان پرتەو بۆڵەمان بوو پێمان وابوو هاوڕێ خدر دەترسێت، بەڵام وێ دەچوو هاوڕێ خدریش هیچ ئەزموونێکی ئەوتۆی نەبێ لە پێشمەرگایەتی پارتیزانی، چونکە لە شۆڕشی ئەیلولدا پتر پشت بە جەنگی بەرەیی(جەبهە) دەبەسترا، نەك پارتیزانی، ئێوارەیەکی درەنگ شۆڕبووینەوە بۆ تەپۆلکەکانی نێوان گوندی شەروێت و سپێرۆ ڕێگایەکی خاکی هەبوو تانکەری سەربازی و سەیارەی ڕەبیەکانی ئەو تەپۆلکانە بەم ڕێگایەدا دەهاتن و دەڕۆیشتن. ساروخێکی سێ بۆ سەونێومان پێ بوو، کە هاوڕێ(حەسەن خدر) لەگەڵ کۆڵە پشتەکەی هەڵیگرتبوو، هاوڕێ مستەفا غەفور خولی هەڵگرتنەوەی مین و دانانی (مین)ی دیبوو. هاوڕێ محەمەد فیدایی و مام خدر لەسەر جێگای دانانی ساروخەکە لە یەکتر تووڕەبوون، بەو شەوەی لەوێ بوو بە تەلاق خواردن. محەمەد دەیگوت دەبێ لێرە دابنرێت، مام خدریش دەیگوت نابێ لێرە دابنرێت. دواتر هاوڕێ حەسەن خدر وتی با لێرەی دابنێین و ببڕێتەوە، رۆژی ئەورۆ هەمووی ئەو ساروخە بە کۆڵی منەوە بووە، هاوڕێ خدر لە هاوڕێ(حەسەن)یش تووڕەبوو پێی وت ئەوە بڕیاری حزبە پێویستە ساروخەکە هەڵبگریت، هاوڕێ حەسەن خدریش وتی بۆ هەر من...!!

هاوڕێ خدر وتی زیاتر لەسەری مەڕۆ؟! هاوڕێ حەسەن هاوڕێیەکی گوێڕایەڵ و زۆر تەبابوو، دەیزانی هاوڕێ خدر پیاوێکی تووڕەیە، بێدەنگ بوو. دواتر قسەی هاوڕێ محەمەد فیدا سەرکەوت، هاوڕێ مستەفا غەفور ساروخەکەی بە(تەڵە) نایەوە، بەڵام پێش ئەوەی سەیارە بەو شوێنەدا بڕوات لە ڕێگای ئامێری تایبەتییەوە ڕێگاکە دەپشکێنرا، هەر بۆیە ساروخەکە لە لایەن سەربازەکان هەڵگیرایەوە...

هەر ئەو شەوە چووین بۆ ئۆردووگای بەستەستێن، دابەشبووین بەسەر چەند ماڵێکدا من و هاوڕێ محەمەد دەڵگەیی و هەمزە سوور لە ماڵی خدری پوور ئایشێ بووین، بۆئەوەی گلەییم لێ نەکرێت بەدوای خێزانمدا نەنارد ببینم، تەنانەت ئێوارەکەی خێزانم هاتە ماڵی پوورم چونکە

بڕیارِ نەبوو خێزانم ببینم نەمبینی، پێم وابوو سەرپێچییەکە لە مەزەزەکە دووربکەومەوە، لەڕاستیدا لە هاوڕێ خدرم ڕانەدەبینی کە مۆڵەتی لێ وەربگرم و سەردانی خێزانم و دایکم و براکانم بکەم، کە (٥) پێنج مانگ بوو نەمدیتبوون. ئەو ئێوارەیەی کە بڕیارِ بوو ئۆردووگای بەستەستێن بەجێ بهێڵین خێزانم هاتبوو بۆ ئۆردووگای بەستەستێن، نازانم هەستیان کردبوو کە ئێمە لەوێین یا نا؟ بەڵام لەبەرئەوەی مەفرەزەکەی ئێمە مۆڵەتی تێدا نەبوو، ڕێگام بە خۆم نەدا داوا لە هاوڕێیان بکەم بۆ کاتژمێرێك مۆڵەت وەربگرم سەردانی خێزانم و دایکم و مامم و براکانم بکەم... هاوڕێ مستەفا غەفور سەردانی ماڵی هاوڕێ خەلیفەی کردبوو لەوێ هاوڕێیەکی عەرەب هەبوو، کە نیازی وابوو پەیوەندی بکات بە بارەگاکانی حزبەوە بە ناوی (ئەبو هەیمە)، کە کادرێکی سەرکردایەتی هەرێم بوو، خەلیفە وتی فرسەتە ئەو هاوڕێیە لەگەڵ خۆتاندا ببەن، ئەو هاوڕێیە ئەگەرچی عەرەب بوو تازە پەیوەندی کردبوو، بەڵام لە ڕێگا زۆر گورج و توندوتۆڵ بوو. هاوڕێ خدر هەر لەناو ئۆردووگادا لەگەڵ هاوڕێ مستەفا غەفور کردی بە هەرا، بەهۆی سەیارەیەکی کاك عەزیزی فەقێی کاحوسێنی، کە بنەماڵەیەکی ناسراون لە عەشیرەتی مامەش، چووین بۆ سەر ڕێگای گوندی سوڵتانەدێ، کە بەرەو چیای ئاسۆس دەپەڕێتەوە...کاك عەزیز گەڕایەوە ئێمەش ڕۆیشتین. لە نزیك گوندی سوڵتانەدێ مام خدر لەگەڵ منیشدا کردی بەهەرا، بە کورتی مام خدر لەگەڵ زۆربەمان هەرای سازکردو تووڕەبوو، هەر بەم لێك تووڕەبوونەوە بە ڕێگادا دەڕۆیشتین، کاتێ لە ڕووباری(سندۆڵان) دەپەڕینەوە، واتا لەسەر زێی بچووك هاوڕێ خدرو محەمەد فیدایی لە پێشەوە لە ڕووبارەکە پەڕینەوە، ئێمە کە لە دواوەیان بووین ئەوانمان لێ بزربوو، هاوڕێ خدر بە دەم جوێندانەوە بە هاوڕێ محەمەد فیدایی وتبووی لێیان گەڕێ، واتا وازیان لێ بێنە کێ دەخنکێ با بخنکێ! ئێمەش لەناو چۆمەکەدا بووین هاوڕێ حەسەن خدر لە دوای من و هاوڕێ مستەفا غەفور دەڕۆیشت، ئاوەکە زۆر قووڵ بوو هەتا بنهەنگلانی من و مستەفا دەهات، کە کورتە باڵا بووین، هاوڕێ حەسەن ئەگەرچی باڵای بەرزە هێشتا ئاوەکە لە کەمەری بوو، بەڵام زۆر دەترسا، دەستی لە شانی مندا وتی ئەوە بۆ کوێ هەر مل پێوە دەنێن، کوڕە ئەوە ڕووبارە دەخنکێین، ڕاوەستن هیچی تر مەڕۆن... هاوڕێ مستەفا پێکەنی وتی خۆ کۆبوونەوەی ناوێ، دەڕۆین یا دەخنکێین یا دەردەچین، بەڵام لەبەرئەوەی ئاوەکە مەندبوو جێگای مەترسی نەبوو، پەڕینەوە...

هاوڕێ حەسەن خدر بۆ دۆزینەوەی کوێرەڕێگا، بەتایبەتی شەوانە زۆر زەین کوێرە هەر لەو مەفرەزەیەدا لە دەشتی سەنگەسەر گەیشتبووینە ناو ملکی باوکی هاوڕێ حەسەن خدر. هاوڕێ هەمزە سوور زۆر وریاو شارەزا بوو لە نێوانی ملکایەتی خەلکی ناوچەکە، بە هاوڕێ (حەسەن)ی وت:

- ئەو ملکە هی کێیە کە لە ناویدا وەستاوین؟ حەسەن وتی:

- سنووری ملکایەتی سەنگەسەرە!

هاوڕێ هەمزە سوور جرتێکی بۆ لێدا، وتی:

ئێرە رەقەمی خۆتانە...

هاوڕێ مستەفا غەفوریش بە حەسەنی وت:

ئافەرین پالەوانی خەنجەر بەکەمەر زوورکانت لێ بووە بە سەنگەسەر لە راستیدا حەسەن خدر ئەو سالانەی پێشمەرگایەتی وەك سومبولی عەشایری، جارجارە خەنجەرێکی جەوهەرداری دەسك سپی روونی بەکەلەکەیەوە بوو، کە قوبەیەکی ئالتوونی پێوە خستبوو. بۆ یەکەم جار بوو حەسەن لەو مەفرەزەیەدا تووڕەبێت. دواتر بوو بە پێکەنین، ئێمە لە لای یەکتر زۆر خۆشەویست بووین، کە لە یەکتریش تووڕەدەبووین دوای چەند چرکەیەك ئاشتدەبووینەوە...

کاتێك کە مەفرەزەکەمان گەیشتە گوندی (گەرمکان) جووتیارێکی گوندەکە کە توتنەوان بوو هات بۆ لامان. ئەو جووتیارە دز هاتبوونە سەر مالەکەی و پارەیان لێ ساندبوو. وەکو باسدەکرا هەندێ چەکداری سەر بە ڕژێم شەوانە رێگری و دزیان دەکرد، ئەم کارەش هەر دەستکێشی ئەو چەکدارانەش بوو بۆئەوەی پێشمەرگە تومەتباربکەن. هاوڕێ خدر لە چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەش نەشارەزابوو، خەریکبوو لەو گۆڕە کردارەکە بە لاڕێدا بباو گومانی جووتیارەکە بگۆڕێت بۆسەر خۆمان، چونکە ئاغاکان وتبوویان شیوعییەکان مەفرەزەیان لەو ناوچەیە هەیە، ناچاربووین بۆ دلنیابوونی برا جووتیارەکە ئەو کەسە بهێنینەڕوو، کە لەو کاتەدا کە دزی لەو جووتیارە کراوە ئێمە لە مالی ئەو کابرایە لە سنووری ئەوبەری زێیەکە بووین، نەك لەمبەری گوندی (گەرمکان)...

پێشمەرگە و پێشمەرگایەتی هەر تەنیا دوژمنێکیان نەبوو، بەلکو سەدان کێشەی تر ڕووبەڕووی دەبۆوە، کە ناحەزو دوژمنان بۆیان دروستدەکرد. مەفرەزەکە ماوەی(١٠) رۆژ درێژەی هەبوو، بەلام لەسەر نەشارەزایی و کەم ئەزموونی خۆمان دەیان کێشەی پوچ و

لابەلامان بۆ دروست بوو... کاتێ گەڕاینەوە گلەییمان لە هاوڕێ خدر کرد، کە وەکو پیویست نەبووە لە سەرکردایەتی کردنی مەفرەزەکە، بەڵام وەکو ئەزموونی پێشمەرگایەتی، هیچ کاتێك یادەوەری ئەو مەفرەزەیە لەبیرناکەم...

## پایزێکی سەخت:

پایزی ساڵی ١٩٧٩ پایزە وەرزێکی سەخت بوو. لقی پشدەر لە(٧٠) هاوڕێی پێشمەرگەوە مابووینەوە (١٨) هاوڕێ. لە وەرزی بەهاری ئەو ساڵەوە بۆ کۆتایی مانگی تشرینی یەکەم(٥٨ ) هاوڕێی لقی پشدەر وازیان لە پێشمەرگایەتی هێنا، یا خۆیان ڕادەستی ڕژێم دەکردەوە، یا بە لایەکی تردا پەرت و بڵاودەبوون. ئەو وەرزە لەهەموو ڕوویێکەوە هەر گەڵاڕێزان بوو، ئەوسا حزبی شیوعی عێراقی بە گشتی و لقی پشدەر بەتایبەتی زۆر بە توندی ڕووبەڕووی ئەو هاوڕێیانە دەبووینەوە، کە خۆیان رادەستی ڕژێم دەکردەوە. هاوڕێی وا هەبوو شەرمی دەکرد داوا بکات و بڵێ تەسلیم دەبمەوە، ناچار بە دزییەوە ڕای دەکرد، هاوڕێ بایز مەولود خۆی تەسلیم کردەوە، هاوڕێیان پێیان زانی بە دوایدا ڕۆیشتن لە ڕێگای گوندی شێنێ و سونێدا دوور بە دوور دەیبینن تەقەیەکی زۆری لێ دەکەن، باش بوو وەبەرنەهات و دەربازبوو، هەر ئەو هاوڕێیە ساڵی ١٩٨٢ جارێکی تر هاتەوە ریزی پێشمەرگایەتی و پەیوەندی بە حزبەوە کردەوە و بوو بە پێشمەرگەیەکی ئازا. لە کاتی جەنگی پشت ئاشان، کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان هێرشی کردە سەر سەرکردایەتی حزبی شیوعی و (٦٥) کادری حزبی شیوعی شەهیدبوون، هاوڕێ بایز ناوی بە شەهید گەڕایەوە لای بنەماڵەکەیان، تەنانەت تەرمەکەشیان ناشتبوو. دواتر زانرا ناوبراو شەهید نەبووە، تەرمە نێژراوەکە تەرمی هاوڕێیەکی(عەرەب) بووە شێوەی لە هاوڕێ بایز چووە... کاك بایز هێشتا شوکر لە ژیاندا ماوەو خاوەنی دوو خێزانە و لە ناحیەی (حاجیاوا) ژیان بەسەر دەبات...

ئەرکی ڕۆژانەی بارەگا بریتی بوو لە خەفەریات لەناو بارەگا، هەروەها پێویست بوو(لقەکان) مانگی هەفتەیەك، دوو هاوڕێ بنێرن بۆ ئیدارەی گشتی حزب لە خڕی ناوزەنگ تا خزمەتی هێستران بکەن، بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکەش فەرق و جیاوازی بە هیچ هاوڕێیەك نەدەکرا، تەمەن و پلەی حزبی بۆ ئەرکی ڕۆژانە هەڵاوێردنی تێدا نەبوو، بە پێچەوانەوە چەندە پلەی حزبی هاوڕێیان بەرزتربا پتر پابەنددەبووین بە ئەرکی سەخت و خزمەتی زیاتر. ئەو

ماوەیە کە لە بارەگا بووم دوو جار وەبەر خەفەریاتی خزمەتی (هێستران) کەوتم هەردوو جارەکە لەگەڵ هاوڕێیەکدا دەبووم بە خەفەر بەناوی ئەحمەد(عەرەب). هاوڕێ ئەحمەد(عەرەب) دەیگوت لە ژیانمدا خزمەتی وڵاخم نەکردووە، هیچی لێ نازانم، منیش پێم گوت هاوڕێ رەنگە من خەربەندە بووبم! منیش وەکو تۆ لە ژیانمدا خزمەتی هێسترو وڵاخە بەرزەم نەکردووە، بەڵام ئەوەیان ئەرکی حزبە دەبێ فێربین، ئەو هەفتەیە کە لەگەڵ هاوڕێ ئەحمەد(عەرەب) خەفەربووم، ئەگەرچی ماندووبووین بەڵام خۆشترین کاتمان بەسەردەبرد، کاتێ کە ئالیکمان دەدا بە هێسترەکان و غەلەکەمان خاوێن دەکردەوە بەزمێکی سەیر بوو، پێم دەگوت یا ئالیك بدە بە هێسترەکان یا بە(سەوە)زبڵی غەلەکە فرێبدە، هەموو جارێ زبڵ فرێدانەکەی هەڵدەبژارد، چونکە نەیدەوێرا لە هێسترەکان نزیك بکەوێتەوە، کاتێ کە(سەوە) زبڵەکەیم بە کۆڵدادەدا نقەیەکی سەیری لێ دەهات و جوێنێکی دەدا پێی دەگوتم (بخرب بێتك)، ئێستا باوك و دایکم وادەزانن کوڕەکەیان سەرکردەیە، نازانن وا پشدەری وەکو(کەر) باری دەکەن، باریش چ بارێك زبڵ فرێدان؟!

هاوڕێ ئەحمەد(عەرەب) دەرچووی زانکۆ بوو بەشی (کیمیا). ئەسمەرێکی خرپنەی ئێسك سووك بوو. کاتێك بێکاردەبووین لە بارەگا بەزمی سەیرمان سازدەکردن، لە وەرزی زستانی ساڵی ١٩٧٩ زۆربەمان سەرمان بە گوێزان تاشیبوو. هاوڕێ ئەحمەد(عەرەب) زۆر ڕقی لەسەر تاشین بوو، ئێمەش هەموو رۆژێ تەشقەڵەیەکمان بە هاوڕێ ئەحمەد عەرەب دەکرد بۆ ئەوەی سەری بتراشێ، کەچی هەموو جارێ ڕەتی دەکردەوە، رۆژێك من و هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ و هاوڕێ قادر دەڵگەیی بەزۆر پەلاماری هاوڕێ ئەحمەد(عەرەب)مان دا، دەست و لاقیمان بەستەوەو جوان جوان سەریمان بە گوێزان پاك تاشی، پڕ بە ژوورەکە هاواری دەکرد، هەر بەرمان نەدا هەتاکو سەرمان تراشی... دواتر کە سەیری خۆی دەکرد بە عەرەبی وتی: (بشدەری صدق انتم وحوش)... ئەو زستانە زستانێکی سەخت بوو، بەڵام پەیوەندیی نێوان هاوڕێیان ئەوەندە بەهێزبوو وەکو خێزانێك وابووین بیرمان هەر لە(حزب) دەکردەوە، هەموو شتێکی ترمان وەلا نابوو...

## خوارزام له ژوورێدایه ئەوەی باسی بکات:

دەمێك بوو ئارەزووم دەکرد مۆڵەتێك وەربگرم و سەردانیماڵەوە بکەم، ئەوە بوو له ١٩٧٩/١٢/٢٥ مۆڵەتم وەرگرت بێمەوە لای خێزانم، که گەڕامەوە شەو درەنگ بوو، کاتژمێر دووی شەو بوو، خێزانم و عەلی برام و خاڵ عەولا بەیەکەوە له ژوورەوە خەوتبوون، خاڵ عەولا له ساڵانی شەستەکانەوە ببوو به دەروێش، واتا مریدی شێخ و وەجاخزادەگان، له شەستەکان شێخ و مرید گوند بەگوند دەگەڕان، مریدەکان ئاڵایەکی کەسکیان هەڵدەگرت به زیکرکردن وەپێش شێخ دەکەوتن، لەناو گوندەکان زەرگبازیان دەکرد، شێوازی زەرگبازییەکە جۆرێك بوو خەڵکی سادەی دێهاتەکانی سەرسام دەکرد. مریدەکان سەدان نوکتەیان به دواوە بوو، پێش ئەوەی بگەنە گوندەکان پێشتر خەبەردەهات که شێخ میوانی فلان ماڵەیە، هەر جارە ماڵە دەوڵەمەندێك هەڵدەبژێردرا، دەروێشەکان بەدەم زیکرکردنەوە خۆیان له مەنجەڵی چێشت نزیك دەکردەوە، بەتایبەتی له وەرزی بەهاراندا بۆ ئەوەی بزانن چی تێدایە، که گۆشتی بزن یا گیسگ بوایە لەسەر ئاوازی زیکرکردنەکە به یەکتریان دەگوت... بزنە...بزنە... خاڵم لەو دەروێشایەتییەشدا شێتبوو، شێتبوونەکەی به وەرز بوو، کات هەبوو بەتایبەتی بەهاران حاڵاتی تێکدەچوو، کاری سەیری دەکرد، شەوێکیان دەرگای لەسەر پتر له(٣٠٠) ماڵی(سەنگەسەر)ی قفڵ دابوو، ئەو(٣٠٠) خێزانە به ناچاری قفڵی ماڵەکانیان شکاند... خاڵ عەولا، ئەگەرچی وەکو شێت دەناسرا، بەڵام له هەندێك هەڵسوکەتیدا له مرۆڤێکی ئاسایی دەچوو، هەر بۆ نموونە کاتێ خانوو له ئۆردووگای بەستەستێن دابەشدەکران، ڕەقەمی خانوویان نەدابوو به خاڵ(عەولا)، لەبەرئەوەی پێیان شێتبوو، خاڵ عەولا چوو بۆ بەغدا نووسراوێکیدا به دیوانی سەرۆك کۆماری عێراق، که خانووی بدرێتێ، ئەوە بوو ڕەزامەندیان لەسەر داواکەی نیشانداو خانوویان دا به خاڵە شێتە...

خاڵ عەولا خانووەکەی دراوسێی خانووی من بوو، که خاڵم له خەو هەڵسا منی چاو پێکەوت به تاقم و تفەنگەوە دانیشتووم زۆر پێی سەیر بوو، وتی ئەوە چەند وەختە له کوێی؟ ئەو چەکە چییە؟ وتم بۆ نازانی بووم به پێشمەرگە؟ وتی بۆچی بوویت به پێشمەرگە خوا لێ گۆڕیویت؟ بۆچی ماڵ و خێزانی خۆت بەجێدەهێڵی! له دڵی خۆمدا دەمگوت دەبێ کامەمان شێت بین خاڵ یا خوارزا؟!...

وتم بەیانی لەناو خانووەکەی تۆدا خۆم دەشارمەوە، وتی بۆچی خۆت دەشارییەوە، گوتم خالّە حکومەت پێ بزانێ من دەکوژرێم یا دەگیرێم دواتر لە سێدارەم دەدەن، خانووەکەی تۆش دەڕوخێنن، هەستم کرد خالّم زۆر دلّتەنگ و خەمبار بوو، لای بەیانی بوو پێش ئەوەی خەلّك وەخەبەر بێت چووم بۆ خانووی خالّم، مالّی خالّە شێتە دوو سێ شڕە بەتانی و لێفەیەك بوو، لەوێ خەوتم. کاتژمێر(١٠) بەیانی بوو کاك عەولّا خدر برادەرێکی خۆم بوو هات وتی هەستە وەرەدەرێ بڕۆ شوێنێکی تر، خالّت هەموو بازاڕی بەستەستێنی تێکەیاندووە، دەلّێ ئەوە محەمەدی خوارزام لە ژوورییە دایکی ئەوە (....) بە حکومەت دەلّێ، کاك عەولّای برادەرم زۆر بۆ من بە پەرۆش بوو بە ناچاری مالّی خالّە شێتەم جێهێشت، خالّە شێتە شێتتر بوو، خالّ(عەولّا) لەم سەری بازاڕ بۆ ئەو سەری بازاڕ دەگەڕێت و جوێن دەدات... ئەوجارە هەر سێ رۆژ لە خوارەوە بووم مۆلّەتەکەم تەواوبوو، نەك ئیرادەم لاواز نەبوو، بەلّکو بە بیروباوەڕێکی بەهێزترەوە گەڕامەوە، تەنها شتێك کە زۆر نیگەرانی دەکردم بەجێهێشتنی خێزانم بوو، بەلّام لەگەلّ خێزانیشم جۆرێك لەیەك تێگەیشتن هەبوو، دەیزانی بردنی خێزان کارێکی زۆر سەختە بەتایبەتی لەو سەردەمانەدا، کە رۆژانە بوردومانی بنکەو بارەگای پێشمەرگە دەکرا.

## مەفرەزەیەکی فراوان:

لقی پشدەرو بیتوێن بە ژمارەیەکی زۆرەوە لە کۆتایی تشرینی دووەمی سالّی (١٩٧٩) گەشتێکمان سازکرد بەرەو بناری(کۆسرەت). مەفرەزەکە پتر بۆ پڕوپاگەندەی خەباتی چەکداری سازکرابوو، لە زۆربەی گوندەکانی بناری کۆسرەت هاوڕێ (کاوە) رەفیق سابیر سەرپەرشتی کۆڕو کۆبوونەوەکانی بەڕێوەدەبرد و قسەی بۆ خەلّکەکە دەکرد. ئەو رۆژانەی رۆژەکە سامالّ دەبوو خۆمان خەریکدەکرد بە خۆشووشتن. دێهاتەکان ئەسپێیان زۆر بوو، پێشمەرگە لە کاتی کۆلّ و کانیدا راوە ئەسپێیان دەکرد. هەر پێشمەرگە بوو خەریکی دۆزینی ژێر کراس و جلّی ناوەوە بوو. هاوڕێ هەمزە سوور هۆنراوەکەی هاوڕێ رەفیق سابیری هەلّگێڕابۆوە، کە لەسەر هاوڕێ(فەهد) نووسرابوو دواتر کرابوو بە سروودی حزب بەناوی هۆ...هۆ...هاوڕێ(فەهد)...هاوڕێ هەمزە رستەیەکی ئەسپێی خستبووەسەر هۆنراوەکە، بەلّام رستەکەیم لە بیر نەماوە...

لە کاتێکدا لە بناری کۆسرەت دەپەڕینەوە بەرەو دۆڵی (شاوریێ) واتا دۆڵە(ڕەقە) بە گوندەکانی گردجان و کانیماراندا ڕەتبووین، دۆڵە ڕەقە یا دۆڵی شاوریێ، میوانداری هەموو لایەنە سیاسییەکانیان دەکرد، دۆڵی  شاوریێ لە شۆڕشی ئەیلولیشدا جێگاو شوێنی میوانداری لایەنە سیاسییەکان بووە، عەباسی مامەند ئاغای ئاکو پیاوێکی بیرمەندو وریا بوو، لەگەڵ زۆربەی لایەنە سیاسییەکان دۆست و ئاشنا بوو، مام هەژاری موکریانی زۆر لەسەر خوان چاکی و زیرەکی عەباس ئاغا دواوە، لە سەردەمی خەباتی چەکداری جۆرێك لە مفاوەزاتی محەلی هەبوو لە نێوان حکومەتی عێراق و خەڵکی ناوچەکە، هەر پێشمەرگەیەك یا هەر کەسێك ویستبای خێزان یا خزم و کەسە نزیکەکانی ببینیێ دەیتوانی لە دۆڵی(شاوریێ) میوانداری بکات، هاوڕێ حەمە یوسف یەکێك بوو لە هاوڕێیانی لقی بیتوێن، ئەگەرچی خەڵکی پشدەر بوو، بەڵام چەند ساڵێك بوو ماڵەکەی بردبوو بۆ(بیتوێن)، خێزانەکەی هاتبوو لە دۆڵی شاوریێ، هەر زوو بەڕێی کردبوو لیێ نەگەڕابوو شەوێ لە لای بمێنێتەوە، پێی ی وتبوو با بۆ چەلێکی دیکە بێت... هاوڕێیان ئەو قسەیەی هاوڕێ(حەمە یوسف) یان کردبوو بە وێردی سەر زاریان، هەر کە هاوڕێیەك خێزانی دەهات بە هاوڕێیەکەیان دەگوت چی بوو! بۆ چەلێکی دیکە بوو یا(...)... چەند ڕۆژێك لە دۆڵە ڕەقە بووین...هاوڕێ عارف کە قسەی دەکرد زۆرجار دەستەواژەی(تناقض) واتا ناکۆکی بەکاردەهێنا، هاوڕێ عارف لە ماڵی جووتیارێکی گوندی (پڵینگان) میوان دەبیێ، لەو ماڵە باسی سیاسەتی(حزب) دەکات وشەی(تناقض) زۆر بەکاردەهێنیێ. لە دوای هاوڕێ عارف من و هاوڕێ ڕەحیم عەزیز لە کاتی دابەشبوونمان لە ماڵان چووین بۆ هەمان ماڵی عارف لێی میوان بوو، خاوەن ماڵەکە زۆر ڕێزی لێگرتین دواتر وتی دوێنیێ هاوڕێیەکی ئێوەم میوان بوو کادرێکی زۆر زیرەك بوو، بەڵام لەناو قسەکانیدا هەندێ جار عەیب نەبیێ باسی لە عەیبی ژنان دەکرد!! منیش یەکسەر قسەی هاوڕێ(عارف)م هاتەوە بیر کە(تناقض)ەکەیە، خانەخویێ خراپ لێی حاڵیبووە، کە مانای وشەی(تناقض)مان بۆ خانەخوێیەکەمان ڕوونکردەوە زۆر پێکەنی، بە شێوە زاراوەی خۆی وتی براله لۆ بە کوردی ناڵیێ!...ئەو شەوەی کە بریارماندا بگەڕێینەوە ئەودیوی کێوە ڕەش، واتا دێهاتەکانی پشدەرە ڕەقە وەکو گوندی (پیرانە ڕەشان، دوپان، زەنگڵان، ماخۆ بزنان)، هەر ئەو شەوە مەفرەزەیەکی هاوبەش لەهەر دوو لقی پشدەرو بیتوێن پێکهات بە فەرماندەیی هاوڕێ مەحمود حاجی نادرو هاوڕێ سەلیمە سوور بە (R.B.G)ی و چەکی سووك لە بارەگای عەباسی باڵوڵ ئاغایاندا، کە

ئەوکاتە ئامر مەفرەزەی ئیستخبارات بوو لە(رانیە)، ئەگەرچی چالاکییەکە بچووك بوو هیچ زیانی بە جاشەکان نەگەیاند، تەنها چەند بەرمیلێکی سووتەمەنی ئاگریان تێبەربوو، بەڵام بۆ ئەو سەردەمە دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو، هەر لەو گەشتەدا لقی پشدەر خۆی کۆمەڵێك چالاکی تری ئەنجامدا وەکو بەسەرکردنەوەی رێکخستنەکان و پڕوپاگەندە بۆ دروشمی حزب، کە دروشمی خەباتی چەکداری بوو، وەکو شێوازی خەباتی سەرەکی... لە گوندی(ماخۆ بزنان) لە مزگەوتەکە میوان بووین بۆ کاتی نان خواردن دابەشدەکراین لە لایەن موختار یا ئەنجومەنی پیاوماقوڵانی گوندەکە، شەوانەش حەراسەتێکی زۆر رێکو پێکمان هەبوو، بە دوو جێگا کەمینمان دەردەکرد، شەوێك من و هاوڕێ سەلیمە سوور بە یەکەوە کەمین بووین لە تیشە شاخی رۆژئاوای گوندی(ماخۆ بزنان)، من هەر بڕنەوەکەی خۆم پێ بوو، کە لە خاڵ حاجی ئەزدین بە ئەمانەت وەرمگرتبوو، هاوڕێ سەلیم کلاشینکۆفی پێ بوو، هێشتا شەو بوو بێدەنگ پاڵمان وە تاشەبەردەکاندابوو، هاوڕێ سەلیم وتی: ئەو دوو تارماییە دەبینی وتم بەڵێ: وتی بە هێمنی خۆت ئامادەبکە، کە نزیکبوونەوە دەنگدان و تەقەکردنمان یەك بوو، هاواریان کرد وتیان جەماعەتی سوارا ئاغاین، پێم سەیر بوو هیچیان وەبەر فیشەکەکانی ئێمە نەکەوتن، کە لێمان نزیکبوونەوە وتیان بۆچی تەقەتان کرد؟ ئەوە چ کاتێك هاتوون بۆ کەمین؟ وتمان پێمان وابوو جاشەکانی عەباسی بالوڵ ئاغان... هەر ئەو ئێوارەیە مەفرەزەکەمان گەڕایەوە (دۆڵی رەسو) ئەو دۆڵە کەوتۆتە باکووری رۆژهەڵاتی گوندی (زورکان) هاوڕێ ڕەسوڵ وتی هیچ ڕەسوڵ ناوێکم نەدیوە ناوبانگی هەبێ جگە لەو دۆڵە...

## سەردانی تەنیایی:

زستانی ساڵانی ١٩٧٩-١٩٨٠ زۆربەی ئەرکەکانم بە تەنیا بەڕێوەدەبرد. لە رۆژی ١٩٨٠/١/٢٥ بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی (حزب) بە تەنها بەرەو ناوەوە واتا ئۆردووگای بەستەستێن ڕۆیشتم. ئەو رۆژە رۆژێکی تووش و باران بوو، لە کوێستانەکان بەفر دەباری تەمومژ بوو، ڕێگا چۆڵ بوو، چەکەکەم لە شانم داگرت کە(ژ-٣)ێکی مزەلی بوو بۆ ئەوەی فیشەکی وەبەردەم، چونکە مەترسی هەبوو لە رێگادا تووشی کەمینی دوژمن بم، کە میلی (ژ-٣)یەکەم ڕاکێشا قۆنداغەکەیم بە دەستەوە هات، سەیرمکرد کاتێ لە بارەگا خاوێنم کردۆتەوەو چەورم کردووە لە بیرم چووە پیمەکەی بخەمەوە ناو، زۆر دڵتەنگ و نیگەران بووم،

چونکە پێشمەرگە تەنها میلی چەکەکەی هەبوو، کەچی چەکدار بێ و چەك تەققە نەکات!! زۆر بیرم کردەوە چی بکەم؟ بیرم بۆ شورکێکی داربەڕوو چوو، بە چەقۆ جوان تراشیم و لە جێگای پیمە ئاسنەکە پیمێکی داربەڕووم بۆ دروستکردو تێمبڕی... دڵنیابووم لەگەڵ تەقاندنی یەکەم فیشەك(ژ-٣)یەکە لە باریەك هەڵدەوەشێت، بەڵام گەیشتبوومە چۆمی گوندی سوێسنێ، پێم شەرم بوو بگەڕێمەوە. چۆمی(مارەدوێ)ش ئەوەندە زۆر و بە خوڕ بوو سامدار سامی لێدەکرد. لەسەر لێواری چۆمەکە (٣) جار ئەوسەرو ئەمسەری رووبارەکەم کرد هی ئەوە نەبوو خۆمی لێبدەم، دیسان کەوتمەوە بیرکردنەوە: بگەڕێمەوە یا بڕۆم...کورە گەڕانەوەی چی چۆن ڕووم دێت بە هاوڕێیان بڵێیم لە ترسی چۆم گەڕاومەتەوە. هاوڕێیان دەڵێن ترسنۆك بووە نەیوێراوە بۆ خوارەوە بڕوات، جلەکانم داکەندن خۆم ڕووتکردەوە بارانیش بەخوڕ دەباری، وەکو هاوڕێ مام ڕەسوڵ دەیگوت، خۆم(مثقف) کرد خۆ مسەقەف کردن هێمای خۆ ڕووتکردنەوە بوو، هاوڕێ ڕەسوڵ وتبووی هەر کەس خۆی ڕووت کردەوە واتا مسەقەفە. لاو نیو واتا لاکێشی خۆم فرێدایە ناو نێڵەی ڕێژەوی چۆمەکە ئیستاش نازانم چۆن لە بەری ئەوبەری چۆمەکە خۆم دۆزییەوە، سەیرمکرد کیلۆ مەترێك پتر بوو، بە چۆمەکەدا چووبووم، بواری چۆمەکە شارەزا بووم دەمزانی نقوم دەبم، بەڵام لە پەرچ و دەوەنان دوور بووم، جلەکانم خستبووە ناو جەمەدانەکەمەوە توند لە سەری خۆم پێچابوو بۆ ئەوەی تەڕ نەبن... کاتێك دەرچووم خوشحاڵ بووم، وامدەزانی لە چالاکییەکی سەربازی خەڵاتکراوم...

شەوێ گەیشتمەماڵی مامم، خێزانم لەوێ بوو، سەرەڕای ماندووبوون و شەکەتی، زۆر ئاسوودەبووم، کە دیداری دایك و خێزان و براکانم کردووە، لە باوەشی گەورەیی و مهرەبانی دایکمدا خەوتم ئەمما خەوتن. لەسەر ماندوویێتی خەو زۆر خۆشە بەتایبەتی لە وەرزی زستان... بۆ شەوی دواتر ٢٦\٢٧ / ١/ ١٩٨٠ ڕۆیشتم بۆ سەردانی هاوڕێیانی رێکخستنی ئۆردووگای (بەستەستێن) هەر ئەو کاتە وێستگەیەکی پەیوەندیمان گۆڕی لە ماڵی مام پیرۆت سپیرۆییەوە بۆ ماڵی هاوڕێ(حوسێن)ە گۆج، کە کاروانچی بوو، زۆربەی جار خۆی و هاوڕێ ڕەسوڵی مام حاجی بابەکری ئامۆزای هاوڕێیانیان بەرەو شاخ دەبرد، کە لە شارەکانەوە دەهێنرانە وێستگەکان...

تەنها(٣) شەوو رۆژ لە خوارەوە بووم گەڕامەوە. کە گەڕامەوە هەستم کرد هاوڕێیان لە سەردانەکەم زۆر رازی بوون. هاوڕێ مەحمودی حاجی فەقێ خدر وتی حەزدەکەم ڕاپۆرتێك

لەسەر سەردانەکەت بنووسیت، منیش هیچ کاتێك ڕاپۆرتم بۆ لیژنەی باڵای(حزب) نەنووسیبوو، حەزم دەکرد بە زارەکی (شفهی) ڕاپۆرتەکە بۆ هاوڕێ مەحمود باس بکەم، بەڵام هاوڕێ مەحمود قبوڵی نەکرد، ئەوە بوو ڕاپۆرتێکم نووسی، هاوڕێ مەحمود وتی هیچ عەیبی نییە، هەندێك ئامۆژگاریشی کردم بۆ جارێکی تر، کە ڕاپۆرتم نووسی کەڵکی لێ وەربگرم... هەڵبەت بۆ هەموو چالاکییەك دەبوایە ڕاپۆرت ئامادەبکرێت، خاڵە باش و خراپەکانی بۆ(حزب) بخرێتەڕوو، بەڵام من پێشتر ڕاپۆرتم بۆ ئۆرگانە باڵاکان نەناردبوو...

لە ڕێکەوتی ١٩٨٠/٢/٢٥ جارێکی تر بە تەنها بەرەو ناوەوە چووم، ئەو سەردانەش هەر لە وەرزی زستاندا بوو، ئەمجارەیان کلاشینکۆفێکی قۆنداغدارم پێ بوو خۆم پێ گرینگ بوو، چونکە چەکی کلاشینکۆف بۆ ئەو سەردەمە چەکێکی شایستە بوو، ئەمجارەیان بە ڕێگای گوندە ڕووخاوەکەی (بەلکی) دا ڕۆیشتم چۆمی (بەلك) یش کلۆی دەکردن، زۆر بە خوڕو ڕێژەو بوو، بەڵام ترسم لە پەڕینەوەی ئاوی بەخوڕ شکابوو. بە هەمان شێوازی چۆمی(مارەدوە) خۆم ڕووت کردەوەو ملم لێنا، تەنیا ملم بەدەرەوە بوو خوا کردی ئەمجارەش دەربازبووم، دەربازبوون لە چۆمی بەخوڕو شلوێ وەکو دەربازبوون بوو لە کەمینێکی مەترسیداری دوژمن بەتایبەتیش کە مرۆڤ بە تەنیا بێت... شەوێکی زۆر درەنگ گەیشتمە گوندە خنجیلانەکەی بەستەستێن، بە چیلکە دارێك لە پەنجەرە بڵندە نایلۆنەکەی ماڵی مامم دا، یەکسەر دایکم هەستی کردو وتی ڕۆڵە واهاتم، کە دەرگای کردەوە بەبێ ئەوەی بپرسێ کێیە؟ باوەشی پێداکردم، وتم دایە چۆنت زانی من بووم، وتی ڕۆڵە دڵم خەبەری پێدام، کە ئەوشەو دێیەوە. خۆ ڕۆڵە لە ئێوارێوە هەر بەخەبەرم، شەوانە کەمتر دەخەوم... ئەو جارە دوو شەوو دوو ڕۆژ لە ماڵی دایکم بووم، خێزانیشم هەر لەوێ بوو. ئەو شەوانە وەکو خۆشترین کاتەکانی ژیانم دەگوزەران...دیدار و گفتوگۆی خێزانی زۆر لەزەت و چێژ دەدات بە مرۆڤ، کە هیچ خۆشییەك جێگای ئەو لایەنە روحیەی ناگرێتەوە... لەم سەردانەشدا وێستگەیەکی ترمان گۆڕی بۆ ماڵی هاوڕێیەکی تر بە ناوی هاوڕێ (مەلا کەریم) هاوڕێ مەلا کەریم مەلا بوو، بەڵام مەلایەکی چەپ، خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو لەمێژ ساڵ بوو لە سەردەمی ڕژێمی ڕەزاشاوە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان قاچاغ ببوو. تەنها(٣) وەجبە لە هاوڕێیان بۆ ماڵی هاوڕێ کەریم چووبوون، دواتر هاوڕێ کەریم داوای کرد ئەو ئەرکەی لێ وەربگرنەوە، گوایە ئاشکرابووەو ناتوانێ درێژە بە ئەرکی خۆی بدات، کە وەرگرتنی هاوڕێیانە لە شارەکانی خواروو و ناوەڕاستی عێراق. دواتر

ژمارەیەك هاوڕێی ترم بەسەرکردەوەو دابەشمکردن بەسەر دوو هێڵی ڕێکخستندا، یەکێك لە هێڵەکان سەرپەرشتی وێستگەکانی دەکرد بۆ بەڕێکردنی هاوڕێیان بەرەو بنکەکانی پێشمەرگە. دوای سێ شەو گەڕامەوە بەرەو بارەگا، ئەو شەوە شەوێکی زۆر ساردو باران و تاریك تەمومژ بوو بەرپێی خۆمم نەدەدیت، ڕەشهاوێژ هەنگاوم دەنا، لەپڕ هەڵدێرام، هەر ئەوەندەم زانی خۆم لە ژێر گۆمە ئاوێکدا دۆزییەوە. ئەو گۆمە ئاوە چۆمی(شەروێت) بوو، کە بە کۆنە ئاشی مەلا ئالێدا شۆڕدەبێتەوەو دێتەوە گوندەکانی بارەپانە،خەندەکە، دۆڵە بەفرە، لەوێشەوە دەڕژێتە ناو زێی گچکە، ئەو چۆمە بە هاوینان ساردە و بە زستانان گەرم. ئەو جێگایەی کە من لێی هەڵدێرام ڕاست قەبرەوردان بوو نزیك گوندی بارەپانێ، بەڵام زۆر لام سەیر بوو کە هیچم لێنەهات...

لە ڕۆژی ١٩٨٠/٤/١ هەر بە تەنها بە مەبەستی بەسەرکردنەوەی هێڵەکانی ڕێکخستن بەرەو ناوەوە هاتم، ئەمجارەش هەر بۆ بەسەرکردنەوەی وێستگەکان بوو، ژمارەیەك هاوڕێی تر پەیوەندیان کردبوو بە هێڵەکانی ڕێکخستنەوە، چەند شانەیەکی ترمان پێکهێنا کە شانەکان ژمارەیان سێ بۆ چوار هاوڕێ دەبوو... سەردانەکەم کورت بوو، لە هەموو سەردانەکاندا هەوڵمدەدا زۆر نەمێنمەوە. هاوڕێیان پێیان باش بوو بە ڕۆژ بگەڕێمەوە، سەیارەی کاك (فەقێ ئەحمەدی مام وسومەیز) یان بۆ بەکرێ گرتم، کە ئەویش هاوڕێی خۆمان بوو لە ڕێکخستنەکانی ئۆردووگای بەستەستێن. لە ڕێگای نێوان ئۆردووگای بەستەستێن و گوندی(سرێجێ) هیچ بازگەیەك واتا سەیتەرەی ڕژێمی لێ نەبوو، لە کاتی گەڕانەوەدا هاوڕێیەکی(عەرەب) بەناوی(مەجید) لە یەکێك لە وێستگەکان بوو، هەر لە گوندی(سرێجێ) وڵاخێکم بۆ بەکرێ گرت، چونکە نەیدەتوانی بە پێیی من بە ڕێگادا بڕوات...

## پێکهێنانی لیژنەیەکی ڕێکخستن:

بەهۆی فراوانبوونی هێڵەکانی ڕێکخستن وا بەباش زانرا، کە لیژنەیەکی ڕێکخستن دروست بکرێت لە ڕووی مەیدانییەوە سەرکردایەتی ڕێکخستنەکان بکات، لەگەڵ هاوڕێ مەحمود حاجی فەقێ خدر لە ڕۆژی ١٩٨٠/٥/١٢ لە ژێر داربەڕووەکانی گۆڕستانی(زەڵێ)کۆبووینەوە، ئەم هاوڕێیانە بەشداربووین: مستەفا غەفور، ئەحمەد ئەبوبەکر، محەمەد خدر. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیاڕدرا، هاوڕێ مستەفا غەفور و هاوڕێ سەلیمە سوور سەرپەرشتی

ڕێکخستنەکانی قەڵادزێ بکەن. ئەحمەد ئەبوبەکر، محەمەد خدریش سەرپەرشتی هێڵەکانی ڕێکخستنی ئۆردووگای بەستەستێن و سەنگەسەرو دەوروبەری بکەن. هەر لەو کۆبوونەوەیەشدا بڕیاردرا بەندە و هاوڕێ ئەحمەد ئەبوبەکر سەردانی ڕێکخستنەکان بکەین.

لە ڕۆژی ١٩٨٠/٥/٢٥ لەگەڵ هاوڕێ ئەحمەد چووینە خوارەوە ڕێکخستنەکانمان بەسەرکردەوە. لە ئۆردووگای بەستەستێن چووین بۆ ماڵی مام مینە مەشهور بە مینە سوور، کە هەم وەکو عەشیرەت خزم بووین، هەم دۆستایەتی لەگەڵ (حزب)دا هەبوو، مام مینە خەڵکی گوندی(مێرتکە) بوو، ئەو گوندە چەند جار لە لایەن ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق سووتاوەو کاولکراوە، سێ جاریش لە لایەن ئاغا میراودەلییەکانەوە سووتێنراوە. هەر لەبەر ئەو زوڵم و زۆرییە بوو زۆربەی عەشیرەتی(مامەش) یا شیوعی بوون یا دۆستی حزبی شیوعی بوون، دژایەتی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی هۆکارێکی زۆر کاریگەر بوو بۆ ئەوەی خەڵکی هەژارو ستەملێکراوی جووتیار لە دەوری حزبی شیوعی کۆببێتەوە.

## ئەنگۆرە گۆنگەڵی نایەوە:

ئەو ڕۆژەی لە ماڵی خاڵە مینە سووری بووین، کاتژمێر نزیکەی (١٠) بەیانی بوو، خاڵە مینە کچێکی گەنجی هەبوو بە ناوی: (بەسێ). لەناکاو هاواریکرد وتی ماڵمان وێران بوو ئێوەش تێدا دەچن. پێمان وت چی بووە؟ وتی هەر چوار دەورەی ماڵەوەمان بە عەسکەری تەنراوە. پێمان وت خۆت تێکمەدە، چاودێریان بکە نەوەکو بۆ کارێکی تر هاتبن. بەسێ زۆر شپرزە ببوو، هەر دەیگوت ئێوە(ئیخبار)کراون، واتا لەسەرتان دواون. ئێمەش دڵنیابووین کە تازە کارلەکارترازاوە، دەبێ خۆمان بۆ جەنگ ئامادەبکەین، تاقم و چەکەکانمان ئامادەکرد، چاوەڕوان بووین سەربازەکان خۆیان بخەنە ناو حەوشەی ماڵی خاڵە مینەو ئێمەش تەقەیان لێ بکەین. خەڵکی دەوروبەر هەستیان کردبوو کە ماڵی خاڵە مینە ئاسایی نییە، دراوسێکانیان لە دەوری ماڵێ خاڵە مینە کۆبوونەوە کە زۆربەیان خزم و عەشیرەتی خاڵە مینەبوون واتا مامەش بوون. کە خەڵکەکە هاتە ناو حەوشەی ماڵی خاڵە مینە، ئێمەیان بینی، بەڵام هیچ قسەیەکیان نەکرد. بە (بەسێ) یان گوتبوو خۆتان تێکمەدەن، هەر شتێك بوو ئێمەش وێڕای ئەوان شەڕدەکەین، لێناگەڕێن دەستگیریان بکەن. مێژوو شایەتی ئازایەتی و بوێری خەڵکی ئۆردووگای بەستەستێنە. لە ساڵی ١٩٨٧ پێشمەرگەیەکیان لەناو سەیارەیەکی عەسکەری

دەرهێنایەوە، ژنەکان بە شەنەو تێلاّ کەوتنە گیانی سەربازەکان تا توانیان پێشمەرگەکە دەربازبکەن. ئەو کاتانەی مرۆڤ بیر لە مردن دەکاتەوە زۆر شتی سەیری بە بیردا دێت، من ئەو کاتەی دەستم لەسەر پەلاپیتکەی چەکەکەم بوو، تەنها بیرم لەوە دەکردەوە، کە کوژرام دایکم چەند ئازار دەکێشێ...

ئەو هەموو بێنەو بگرەیە نزیکەی بیست خولەکی خایاند. هەر ئەوەندەمان زانی سەربازەکان دەوروبەری ماڵی خاڵە مینەیان بەجێهێشت و ڕۆیشتن. دواتر دەرکەوت کە ئامر لیوایەکی عەسکەری هاتووە بۆ کڕینی قوماشی(ئەنگۆرە)، ئێمەش لەبەر چاوی خەڵکی دەرودراوسێی لە ماڵی خاڵ مینە ڕۆیشتین بۆ ماڵی هاوڕێیەکی تر بەناوی(حوسێن)ە گۆچ، دایکێکی هەبوو نیمچە شێت بوو. پێی گوتین ئێوە پێشمەرگەن؟ پێمان گوت نەخێر، وتی ئەدی بۆچی دەچنە ئەو ژوورە تاریکە؟ پێمان گوت هەتا کاك حوسێن دێتەوە لەو ژوورە دەبین، وتی بە خوای عەسکەر بێن درۆناکەم دەڵێم ئەوانە پێشمەرگەن!... ئۆردووگای بەستەستێن بەتایبەتی لە سەرەتای هەشتاکان وەکو پایەگایەکی عەسکەری پێشمەرگە وابوو، هەر کەسێك قاچاخ دەبوو خۆی دەگەیاندە ئەو ئۆردووگایە. ئەو ڕۆژە ناچاربووین بچین بۆ ماڵی هاوڕێیەکی تر، کە لە هاوڕێیەکە وەژوورکەوتین زۆر سەرسام بوو. لەو ماڵەش کابرایەك پەیدابوو، خەڵك پێیوا بوو، کە جاشی عەباسی بایز بالوئاغایە کە سەرۆك جاشێکی بە دەسەلاّت و دەستڕۆیشتوو بوو لە ناوچەکە. ڕۆژی دواتر چووین بۆ (سەنگەسەر). ڕێکخراوەکان پەرش و بڵاوبوون، هاوڕێ(سوورە) کە کادرێکی کارامەو زۆر چالاکی(حزب) بوو، بڕیاڕی دا سەرپەرشتی هێڵەکانی ڕێکخستن بکات. لەو ڕۆژەوە کە هاوڕێ(سوورە) ئەرکی سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی وەرگرت، گۆڕانکارییەکی چەندایەتی و چۆنایەتی بەسەر هەیکەلی ڕێکخستنەکانماندا هات، لە بوارێکی تردا پتر لەسەر ڕۆڵ و کاریگەری کەسایەتی هاوڕێ(سوورە) دەدوێم... کە گەڕاینەوە وەکو جارانی ڕابردوو ڕاپۆرتێکی هاوبەشمان بەرزکردەوە لەسەر بوارەکانی ڕێکخستن و هەلومەرجی ناوەوە... هاوڕێ مەحمودی حاجی فەقێ خدر لە کۆبوونەوەیەکدا زۆر ستایشی کردین، کە توانیومانە سەرکەوتوانە کارەکانمان ئەنجام بدەین...

## بنكەی بێتووش:

لە سەرەتای ساڵی١٩٨٠ ڕۆژبەرۆژ پەیوەندیی نێوان عێراق و ئێران بەرەو ئاڵۆزی دەڕۆیشت، ڕژێمی عێراق لە ڕێگای کەناڵەکانی راگەیاندن بە ئاشکرا هەڕەشەی لە کۆماری ئیسلامی ئێران دەکرد. ڕۆژێك تۆپخانەی(حزب) بە تۆپی عەیار(١٢٠) ملم بۆردومانی مەعەسکەرێکی هەلشۆی کرد. ڕژێمی عێراق بە تۆپخانەی ئێرانی لە قەڵەمدا. لەڕاستیدا ئەو تۆپانە هی حزبی شیوعی بوون، لە دوای ڕووخانی ڕژێمی (ڕەزاشا) لە پایەگاکانی سوپای ئێران بە غەنیمەت گیرابوون، دواتر بەردەستی حزبی شیوعی و لایەنەکانی تر کەوتبوون... ئەو هاوڕێیانەی دەسست نیشان کرابووین لە لقی پشدەر بۆ ئەوەی پەیوەندی بکەین بە بارەگای بێتووش بریتی بووین لە هاوڕێ: محەمەد ڕەسوڵ، بابەکر مەحمود، حەمە یوسف، خدر ئیسماعیل، محەمەد خدر... لە سەرەتای مانگی تەموزی ساڵی ١٩٨٠ ڕۆیشتین بۆ بارەگای(بێتووش). بارەگای(بێتووش) لە لایەن هاوڕێ بەهادین نوری سەرکردایەتی دەکرا. سەرەتا لە نزیك بنکەی (بێتووش) خیوەتمان هەڵدابوو، ڕۆژانە سەرقاڵی کاری ڕۆژانەی بارەگا بووین. دەبوایە هەموو ڕۆژێ جارێك بڕۆین بۆ حەملەی دارکردن، حەملەی دارهێنان زۆر سەخت بوو، دەبوو ماوەیەك بڕۆین تا لەسەر سنووری (عێراق-ئێران) لقە دارێك ببڕین، چونکە لەناو سنووری ئێراندا داربڕین قەدەغە بوو، سنووری(عێراق- ئێران)یش (٤٥) خولەك لێمانەوە دوور بوو. بە شەو و ڕۆژ بۆ پاراستنی بارەگاکەمان پاسەوانمان هەبوو. زۆربەی کات بۆ (شوناسایی) دەوروبەری بارەگا، بە مەفرەزە دەردەچووین. وەك هێزێکی تایبەت دیاریکرابووین بۆ پارێزگاری(رادیۆ) کە تازە دانرابوو. رادیۆکە لە مۆدیلە هەرە کۆنەکان بوو. نیوکاتژمێر پتر کاری کردبا گەرم دادەهات دەبوو باوەشێنی بکەین. ماوەیەك چەند هاوڕێ لەسەر رادیۆکە کاریان دەکرد وەك: هاوڕێ ئەبو دلشاد، هاوڕێ سەربەست کە هاوڕێیەکی مەسیحی بوو، هاوڕێ ئەبو سەلام واتا بەهادین نوری، کە بەرپرسی رادیۆکە بوو. رادیۆکە لە بەرزاییەکی چیای بێتووش دانرابوو بەزەحەمەت لەناو شارەدێی(بێتووش) وەردەگیرا. لەبەرئەوەی ئەو رادیۆیە وەك پێویست نەبوو، رادیۆیەکی تر پەیدابوو...

شەوێك هاوڕێ (حەمە یوسف) نۆرەی حەراسەتی دەبێ، پێش ئەو هاوڕێیەکی عەرەب حەراسەتی دەبێ، دەیەوێت هاوڕێ حەمە یوسف لە خەو هەڵسێنێ، کە نۆرە حەراسەتی بووە، بانگی دەکات هاوڕێ حەرەس کەچی هاوڕێ حەمە یوسف لەخەو هەڵناستێ، ناویشی نازانێ

بەناوی خۆی بانگی بکات، چونکە ئەو هێزەی کە بۆ بارەگای (بێتووش) کۆکرابۆوە لە هەموو لقەکان پێکهاتبوو، زۆربەمان یەکترمان نەدەناسی. ئەو هاوڕێیە بانگی هاوڕێ حەمە دەکات هیچ وەلامی ناداتەوە. ئەویش دەڵێ هاوڕێ پت پت، هاوڕێ پت پت، هەستە نۆرەی حەراسەتی تۆیە. هاوڕێ(حەمە یوسف) بارەکەوی کەوی راگرتبوون، رۆژانە کە دانی پێدەدان بانگی دەکردن(پت، پت، پت). ئەو هاوڕێ(عەرەب)ەش پێی وابوو هاوڕێ حەمە یوسف ناوی(پت، پت)ە. کە هاوڕێ حەمە یوسف هەڵدەستێ بەسەر برادەرە عەرەبەکەدا هاواردەکات و دەڵێ بەکێ دەڵێی پت، پت، هەی دایکی هەزار... . هاوڕێ(حەمە یوسف) هاوڕێیەکی بە تەمەن بوو، برادەران زۆر رێزیان دەگرت، بەلام هەمیشە تووڕەبوو، بە شێوازی پشدەریان جوێنی زۆر سەیری دەدا...هتد.

(بێتووش) شارەدێیەکی زۆر قەرەباڵغ بوو، لایەنە سیاسییەکانی باشووری کوردستان و رۆژهەلات وەك حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی زەحەمەتکێشانی کوردستانی ئێران و یەکێتی نیشتمانی و حزبی شیوعی عێراقی و حزبی سۆشیالیستی کوردستان بارەگایان لە بێتووش بوو. بێتووش وەك دەروازەیەك وابوو بەرەو سنووری شارباژێڕو شارەزوور...

لە ۱۹۸۰/۹/۲۲ ڕژێمی عێراق بە فەرمی جەنگی بەرامبەر بە کۆماری ئیسلامی ئێران راگەیاند. بە هەڵگیرسانی(جەنگی عێراق- ئێران) قۆناغێکی نوێی سیاسی دەستی پێکرد. دەرفەتێکی باش دروست بوو بۆ بزووتنەوەی چەکداری و لایەنەکانی کوردستان. گوشار لەسەر هێزی پێشمەرگە کەمتربۆوە، کە بەر لە جەنگەکە سوپای عێراق هەموو توانایەکی سەربازی و ئاسمانی و زەوی تەرخانکردبوو بۆ راوەدوونان و کوشتاری پێشمەرگە پارتیزانەکان. بەلام کە جەنگەکە دەستی پێکرد بارودۆخەکە پێچەوانەوە بۆوە، دەرفەتێکی باش بۆ پێشمەرگە ڕەخسا، جەماوەرێکی زۆر رۆژانە پەیوەندیان بە هێزی پێشمەرگەوە دەکرد، خەڵك بێزاربوو، ناوچە ڕزگارکراوەکانی پێشمەرگە بەرە بەرە فراوان دەبوون، سەدان ڕاکردووی جەنگ لە ناوچە ڕزگارکراوەکان خەریکی کارو کاسبی خۆیان بوون. لەڕووی سیاسییەوە هەموو لایەنەکانی کوردستانی جەنگەکەیان سەر کۆنە کرد. حزبی شیوعی عێراقی دروشمی ڕاگرتنی دەست بەجێی جەنگەکەی هەڵگرتبوو و هاوکات داوای ڕووخاندنی دیکتاتۆریشی دەکرد. ئەو دروشمەی(ح.ش.ع) رەخنەی لەسەر بوو، رەخنە گرەکان پێیان وابوو جەنگ بوەستێ ڕژێم بە

هێزتر دەبێ، بە کردەوەش هەروا بوو، (حزب) لە رووی مرۆڤایەتییەوە ئەو جەنگەی سەرکۆنە دەکرد و، راگرتنی جەنگەکەی بە ئەرکێکی بە پەلەو هەنووکەیی دەزانی...

هاوڕێ بەهادین نوری ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی(حزب) کۆبوونەوەیەکی فراوانی بۆ هاوڕێیانی بارەگای (بێتووش) سازکرد. لەو کۆبوونەوەیەدا ئاماژەی بە لاوازی و شپرزەیی رژێم کرد، وتی پێویستە لایەنەکان هێزەکانیان کۆ بکەنەوە و لە دەوروبەری شارەکان مۆڵ بدرێن، بۆ هەر ئەگەرو پێشهاتێك ئامادەبن. وتی بڕیارمانداوە هێزێکی زۆر لە هاوڕێیان ڕەوانە بکەین بەرەو شارباژێڕ و ناوچەکانی تر. بۆ ئەمەش هێزێکی گەورە پێکهات. لە رێگای زێی بچووك پەڕینەوە لە بەرامبەر گوندی(هەرزنە) پردێکی هەڵواسراو بەسیم دروستکرابوو، دوو، دوو لە هاوڕێیان بەڕێدەکراین. من و هاوڕێ خدر ئیسماعیل بە یەکەوە پەڕینەوە، ناوبراو چاوی رەشکەو پێشکەی دەکرد و توند باوەشی بە مندا کردبوو.

لە ١٩٨٠/٩/٢٧ لە دۆڵێکی سەفرەو گەڵاڵەی شینکایەتی بووین، کاتی نیوەڕۆ دانیشتبووین لە دوورەوە ڕەشەوڵاخێك دیاربوو، من و هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ و بابەکر مەحمود بە دووربینی سەیرمان کرد. هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ وتی: بابچین بزانین ئەو رەشەوڵاخە چییە؟ خۆ ئەو ناوچەیە چۆڵە رەشەوڵاخێك بە تەنیا لەم دۆڵەدا چی دەکات. سێ قۆڵی چووین، کە سەیرمان کرد جوانەگاییێکی سێ ساڵە بوو، نەخۆشی تەبەکە لە هەر چوارپێییەکانی دابوو، لە جەڵەب دابڕابوو، وتم خۆ ئەمشەو گورگ لێرە دەیخوات بۆچی بۆ هاوڕێیانی سەر نەبڕین؟ هاوڕێ محەمەد وتی لێمان قەبووڵناکەن، لێمان دەکەن بە مەسەلەی جوانەگا رەشەکەی تر. گەڕاینەوە بۆ لای هاوڕێیان پێمان گوتن رێگا بدەن جوانەگایەکە سەربڕین. هاوڕێ (بەکر تەلانی) وتی پشدەرینە کەتنان مەکەن، هێشتا کێشەی جوانەگایەکەی ترتان لە کۆڵ نەبۆتەوە. چەند مانگێك پێشتر بە مەفرەزە لە چیای ئاسۆس دەگەڕاینەوە، ئەو کاتەی بارەگای لق لە زەڵێ بوو، لە رێگا هاورێیەك جوانەگایەکی لە جەڵەبێك دابڕی و سەربڕی، بەشێك لە هاوڕێیان گۆشتەکەیان نەخوارد، پێیان وابوو کارێکی نابەجێیە جوانەگایەك سەربڕین بێ ئەوەی پارە بدەینە خاوەنەکەی. ئەو هاوڕێیانە راستیان دەکرد، بەڵام ئێمە زۆر سوێ و تامەزرۆی گۆشت بووین، ماندوو هیلاك بووین، گوێمان بە توورەبوونی هاوڕێیان نەدەدا. سەری جوانەگایەکەمان بڕی، بەشێك لە هاوڕێیان بە نیگەرانی دانیشتبوون ئێمەش بەرامبەر ئەوان گۆشتی جوانەگا ڕەشمان دەبرژاند. کە گەڕاینەوە بارەگا بە سەرکردایەتیمان راگەیاند گۆلکێکمان سەربڕیوە،

(حزب) زۆر بە توندی سەرزنشتیان کردین... بە هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ و هاوڕێ بابەکرم وت پێتان چۆنە ئەو سەرپێچییەش بکەین! بۆچی گورگ بیخوات ئێمە نەیخۆین؟ هاوڕێ محەمەد وتی(حزب) سزامان دەدات. وتم هەر پێمان دەڵێن پشدەری گۆلك خۆر، با بیلێین!. هەرسێکمان چەقۆی باشمان پێ بوو، منیش لە پێشمەرگایەتیدا هەندێك قەسابی فێربووم. جوانەگا نەخۆشمان سەربڕی و بانگی هاوڕێیانمان کرد، کە بەشی خۆیان گۆشتی ببەن. هاوڕێیانی بەرپرس پێیان گوتین بۆچی سەرپێچیتان لە بڕیاری مەفرەزە کردووە؟ پێم وتن ئێوە جارێ لە گۆشت تێر بخۆن، دواتر سزای من بدەن، چونکە من سەرپێچی فەرمانی ئێوەم کردووە... جوانەگایەکە قەڵەو بوو پتر لە(٧٠) کیلۆ گۆشتی هەبوو هەریەکەی یەك کیلۆ گۆشتی وەبەرکەوت، ئەو دۆڵە پڕبوو لە بۆنی گۆشتی برژاو، ئەگەر گۆشتی گۆلکەڕەش نەبوایە یا دەبوو خورما یا نانی وشك بخۆین. یەك دوو هاوڕێ وەکو ئاربیجی لاقە گۆشتیان بە ئیسقانەوە بە شانیدا کردبوو، دڵیان نەدەهات لاقە گۆشتەکە فڕێ بدەن. هاوڕێیانی گەرمیان و بناری کۆسرەت و بیتوێن هاواریان دەکرد: بژی پشدەر، ئەگەر ئێوە نەبان کوا ئەو گۆشتە پەیدادەبوو. هاوڕێیانی بەرپرس ئەمجارەش چاوپۆشیان لێکردین، بەڵام وتیان پشدەرینە جارێکی تر کەتنان مەکەن، با(حزب) و ئێمەش بە ئاگری ئێوەوە نەسووتێین...

مەفرەزەکە لە گوندە رووخاوەکەی سەفرەو زەرونەوە بوو بە دوو بەش. ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە گوندی (گاپێڵۆن) ناو دەوەنەکان تاریکبوو، هاوڕێ خدر ئیسماعیل لە پێش هاوڕێ د. فارس دەڕۆیی، جارجارە شوڕکە دەوەنی دەگرت و دوایی بەریدەدا تا دوای خۆی ئازار بدات. شوڕکێك بەر لووتی هاوڕێ (د. فارس) دەکەوێ. د.فارس وتی هاوڕێ حەمە، پشدەر پیاوی وەك هاوڕێ خدری زۆر تێدایە؟! وتم بۆ؟ پرسیار دەکەی؟ وتی پیاو ناوی خدر بێت چاوەڕوانی چی لێ دەکرێت؟! هاوڕێ(د.فارس) لە گوندەکان قسەی دەکرد و لەسەر بارودۆخی سیاسی و جەنگی عێراق — ئێران، سیاسەتی حزبی ڕووندەکردەوە. هاوڕێ د. فارس زۆر جار بە زاراوەی سلێمانی لەدرێژەی قسەکانیدا زۆر دەستەواژەی (هینی) بەکاردەهێنا، هاوڕێ(خدر ئیسماعیل) هاوڕێیەکی تووڕەو لەسەر بوو، لەو کاتانەی ژەمی نیوەڕۆیان نزیك دەبۆوە هاوڕێ خدر زۆر بێزاردەبوو. جارێك لە گوندی (خەمزە) بووین، نیوەڕۆ بوو کاتی دابەشبوون بوو بەسەر ماڵاندا، (د.فارس) کۆتایی بە قسەکانی نەدەهێنا، هاوڕێ خدریش هەر دەهات و دەچوو بە هاوڕێ د.فارسی دەگوت ئەو هینە هینەت تەواونەبوو ئاخر لە هینت...! دکتۆر

فارسیش گویی لێ بوو، هاوڕێ خدر لە پشتەوە وەستا بوو، دکتۆر(فارس)، کە گوێی لە جوێنەکەی هاوڕێ خدر بوو کۆتایی بە قسەکانی هێناو ئاوڕێکی لە ئێمەو هاوڕێ خدر دایەوە، دواتر بانگی منی کردە لاوە، وتی: محەمەد ئەگەرچی تۆش پشدەری، بەڵام پێت ناخۆش نەبێ پشدەر خەڵکی وەکو هاوڕێ خدری زۆر تێدایە؟ وتم دکتۆر پشدەری جوێن دەدەن بە جوێنی پشدەریان تەنگاو مەبە لە جیاتی هاوڕێ خدر داوای لێبوردن دەکەم...

ئەو کاتە حزبی شیوعی چەکی زۆر کەم بوو هێشتا وەکو پێویست چەکی نەوعی نەبوو، بە هەموو هێزەکە یەك( R.B.G )یمان لابوو، ئەویش درا بە مەفرەزەی هاوڕێیانی سنووری شوان و کەرکووك، زۆربەمان کلاشینکۆفمان پێ بوو، بەڵام تەنیا بە دوو مەخزەن فیشەکەوە. مەخزەن زۆر گران بوو یەك مەخزەن بە ٢٠ تا ٣٠)دینار بوو. یارمەتی(٦) مانگی حزبیم کۆکردەوە، کە مانگی پێنج دینارمان وەردەگرت بە یەك مەخزەنی پلاستیکم دا. ئەوسا مەخزەنێك بۆ پێشمەرگە لە هەموو شتێك گرینگتر بوو. ئێستاش مەخزەنەکەم ماوە... مەخزەنێك یارمەتی(٦) مانگی پێدرابێت خۆشەویستە، هەر دەبێ بمێنێ. ڕۆژێك لە ناوچەی شارباژێڕ بووین، منداڵێك سەیری ناو کیفی مەخزەنەکانی منی کرد بانگی برادەرەکانی دەکرد دەیگوت ئای لەو پێشمەرگەیە خۆ مەخزەنەکانی هەموو بەتاڵن! کلاشینکۆفێکم پێ بوو کووبی قۆنداغدار تەنها دوو مەخزەنی لەگەڵ بوو، کیفە مەخزەنەکانی ترم پڕکردبوون لە فیشەك لەناو پاکەتی جگەرەدا پێچابوومنەوە، هەر لە مەخزەن دەچوون...

لە سنووری سلێمانی چالاکییەك لە لایەن هاوڕێیانی سلێمانییەوە ئەنجامدرا، کە مەفرەزەی (یاسین) بوو. ناوبراو هاوڕێیەکی چاونەترس بوو، کەمینێکی لە نێوان دوو ڕەبیەدا دانابوو بە پێی زانیاری خەڵکی ناوچەکە(٥) سەرباز لەو چالاکییەدا کوژرابوون...

مەفرەزەی سلێمانی دواتر بوو بە دوو بەش لە١٩٨٠/١٠/١٥ بەشێك بەرەو هاوڕێیانی بیتوێن و شوان ڕۆیشتن، هاوڕێیانی سلێمانی لە ناوچەکە مانەوە، هاوڕێیانی بەرپرسی سلێمانی لە مەفرەزەکە بریتی بوون لە هاوڕێیان: مەحمود دیکتاروف، حەمە کەریم قەرەچەتانی، بێکەس، دکتۆر فارس... ئێمەش لەگەڵ هاوڕێیانی شوان و (بیتوێن) گەڕاینەوە بناری کۆسرەت. لە ڕۆژی ١٩٨٠/١٠/٢٦ بەرەو ئەودیوی چیای کۆسرەت ڕۆیشتین لەوێشەوە چاوەدێری شەقامی گشتی (سلێمانی- رانیە)مان دەکرد، هاوڕێ مەحمود حاجی بەرپرسی مەفرەزەکە بوو، هاوڕێ مەحمود پێشنیاری کرد کە خاڵێکی پشکنین لەسەر شەقامی گشتی

سلێمانی- رانیە دابنێین. هەرچەند هەندێك لە هاوڕێیان پێیان وابوو(R.B.G)مان پێ نییە جەنگی دەبابەو هێلی کۆپتەری سەمتی پێ بکرێ، ڕەنگە سەرکەوتوونەبین، بەڵام هاوڕێیان حەزیان دەکرد چالاکییەکی عەسکەری ئەنجام بدەین... لە کاتژمێر سێ و نیوی دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە چووینە سەر شەقام لە تەنیشتی ڕۆژئاوای چێشتخانەی کانی وەتمان کەمینمان دانا، هاوڕێ مەحمود حاجی سەرپەرشتی مەفرەزەکەی دەکرد هەشت هاوڕێ لەسەر شەقامەکە بووین، هاوڕێیانی تر لە هێڵی پاشەکشێ و پشتگیری دامەزرابوون. بۆ ماوەی دەخولەك چوار پۆلیسی بێ چەك لە سەیارە دابەزێنرانە خوارەوە، لەو کاتەدا سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بووین لەگەڵ پۆلیسەکان، گەنجێك هات کە تەمەنی ٢٥ساڵ دەبوو پێی وتین قافڵەیەکی زۆر بەرێوەیە، هاوڕێیەکی (عەرەب) زللەیەکی سرەواندە گەنجەکە، بە کوردییەکی شەپرێو پێی گوت ئەوە دەمان تلسێنی، لە جیاتی دەمان ترسێنی دەمان تلسێنی بەکارهێنا، لەو کاتەدا ئەو برادەرە زللەکەی لە گەنجەکەدا کوڕەکە ئاوڕی دایەوە وتی: وەڵڵا قافڵەکە لە دوای منەوە بوو، هەر لەو قسانەدا بووین سەیرمان کرد قافڵەکە سەری لە لۆفەکە وەدەرنا بەرەو چێشتخانەی کانی وەتمان، کوڕە گەنجەکە وتی نەمگوت لەدوامەوەیە؟! داوای لێبوردنمان لە گەنجە کرد و کەوتینە خۆ هاوڕێ مەحمود فەرماندەیەکی هێمن و ئازا بوو، فەرمانیدا کە بە هێواشی لێواری شەقامەکەی نزیك چایخانەکە چۆڵ بکەین بۆ ئەوەی خەڵکی ناو چایخانەکە زەرەرمەند نەبن، کە دوورکەوتینەوە لە لێواری شەقامەکە قافڵەکە بەرەو ڕێڕەوی خۆی جوڵا، قافڵەکە زۆر بە ئەسپایی دەهاتەپێش، پانزە سەیارەی ئیفای عەسکەری و جێپ قیادەیەك بوو، مەدراعەیەك و دەبابەیەکیش یاوەریان دەکرد، قافڵەکە هاتەپێشەوە هەر(٣٠٠) مەتری هەوایی مابوو بگاتە ئێمە لە هێڵی پشتگیرییەوە دوو تەقە کرا وەکو ئاگادارکردنەوە پێیان وابوو ئاگاداری هاتنی ئەو قافڵە نین... کە تەقە کرا قافڵەکە لە جێگای خۆی ڕاوەستا، هاوڕێ مەحمود فەرمانی دا تەقە بکرێ، ماوەی دە چرکە تەقە لەسەر نشینەکانی قافڵەکە کرا، ڕەبییەکانی دەوروبەرو قافڵەکە تەقەیان لە ئێمە کردەوە، خۆمان لەناو دەوەن و خڕو چۆمەکانی باشووری چێشتخانەکە بزرکرد. لەناو لێوارەکەدا شوێنێکمان دەست نیشان کردبوو یەکترمان گرتەوە، لەو کاتەدا کە چەکەکانمان پاك دەکردەوە هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ فیشەکێکی لە دەست دەرچوو لە کڕکەی ئەژنۆی خۆیدا... بریندابوونی هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ زۆر دڵتەنگ و سەغلەتی کردم، هەر ئەو شەوە گەڕاینەوە بناری کۆسرەت. هاوڕێیان لە گوندی (باقلان)

کەرێکیان پەیداکرد. هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵمان سواری کەرەکە کرد و بەسەر شەقامی گشتیدا ڕەتبووین. لە نزیك ڕەبییەکانی چێشتخانەی کانی وەتمان قەپۆزی کەرەکەمان بە کندرێك پێچابوو بۆ ئەوەی نەزەڕێت، هاوڕێ محەمەد ئازاری زۆر بوو، بەڵام دەنگی نەدەکرد، هاوڕێیەکی عەرەب بەناوی: (سەباح) (معاون طبی) بوو، زۆر باش خزمەتی تەندروستی هاوڕێیانی دەکرد، جارێك لە گوندی (شوشکە) خێزانێکی بناری کۆسرەت لە مردن ڕزگارکرد، کە بەهۆی غازی(سۆپا) دووچاری تەنگەنەفەسی ببوون.

هەر ئەو رۆژە هەواڵی چالاکییەکەمان پێگەیشت هەر یەکە ژمارەیەکی دەگوت لە کوژراوو برینداری دوژمن، بەڵام لە ڕاستیدا کەس نەیدەزانی چەند سەرباز کوژراون، چونکە قافڵەکە تێپەڕی، تەنها ئەوەندە زانرابوو، کە خوێنێکی زۆر لەسەر شەقامەکە ڕژابوو...

دۆڵی (خەلەکان) یا بناری خەلەکان جێگاو پێگەی پێشمەرگە بوو. دوو زنجیرە چیای دوورو درێژ دەورەی داوە، چیای کۆسرەت لە گوندی (تۆربە)وە بۆ (هیزۆپ) لە باشوورەوە زنجیرە چیای بناری رۆژهەڵاتی کۆیە شوێنی سەیتەرەی پێشمەرگە بوو... لەسەر شەقامی گشتی نەزیلەیەك سازکرابوو، واتا(نوکتە). گوایە هاوڕێ حاجی ئامینە و حەمەئەمین عەبدوڵڵا مامەش بە یاوەری ژمارەیەك هاوڕێی تر سەیتەرەیەك لەسەر شەقامی گشتی رانیە- سلێمانی دادەنێن، هاوڕێ حاجی و هاوڕێ حەمەئەمین لێیان دەبێتە دەمەقاڵێ، حەمەئەمین دەڵێ من قسە دەکەم، هاوڕێ حاجی دەڵێ من، لە نێوان هەردووکیان هاوڕێ حاجی برای هاوڕێ حەمەی مام عەولا خەڵکی مێوژە گوایە دەچێتە پێشەوەو دەڵێ ئێوە عەیب ناکەن خەڵکتان ڕاگرتووە قسەیان بۆ ناکەن، پێیان دەڵێ رێگام بکەن هۆ هۆ خەڵکینە ئێمە حزبی خۆمان پێ راستە ئەوەی پێی راست نییە لە ...! حەمەئەمین رێگایان بکە... با برۆن... شایەنی باسە هاوڕێ حاجی مێوژەیی دەیان نوکتەی سەیرو جۆراوجۆری لەسەر بوو، هەر بۆ نموونە لەسەر ژنان شتی سەیری لێ دەگێڕنەوە، گوایە رۆژێك چووەتە بەرزاییەکی پشتی کانییە ژنان لە گوندی مێوژە تاوێرێکی بەرداوەتەوە خوارەوە هەر لەسەر چیاوە خۆی هاواردەکات ژنینە هەڵێن بەرد هاتە خواری، تومەس ویستوویەتی ئەگەر لە دوورەوەش بێت هەندێك لەشی رووتی ژنان ببینێ. حاجی دوکانێکی دانابوو هەموو کەلوپەلی دوکانەکەی بریتی بوو لە جلی ژێرەوەی ژنان یا دەرمانی حەمام، رۆژێك یەکێك لە ژنانی گوند دەرمانی حەمام لە حاجی دەکرێت، دواتر هەر کەسێك دەرمانی حەمامی لێ کڕی بێت پێی وتووە ئەو دەرمانە هیچ موویێك بە لەشی

مرۆڤەوە ناهێڵێ بۆ راستی قسەکەشم برۆن لە فلان ژن بپرسن، کە خۆی بەکاری هێناوە...
حاجی هەموو هیوایەتی ژن بوو، کەچی لەبەرئەوەی هەژاربوو پیر بوو بە داخەوە ئەو ئاواتەی بەدی نەهات...

هاورێ حەمەئەمین و هاورێ حاجی ئامینەش دوو هاورێی زۆر سەیر بوون، هەمیشە مشتومڕیان بوو، بەردەوام دژ بە یەك بوون. جارێکیان زستان بوو خۆم لەگەڵیاندا بووم، نێوان گوندی مالومە و گاپیلۆن تەم و مژ بوو، رێگامان هەتلە کردبوو. هاورێ حەمەئەمین و حاجی گرەویان کرد بوو، حاجی ئامینە دۆڕاندی هەردەیگوت قەرزدارین، هاورێ حاجی گوتی دە وەرە تا بتدەمێ، لە ناو مزگەوتی مالومەدا بوو بە قاقای پێکەنین، ئەو کاتە زانیمان هاورێ حاجی و هاورێ حەمەئەمین ئەو جۆرە گاڵتەدەکەن. من و هاورێ مەحمود حاجی و هاورێ سابیر دوکانی لەگەڵ هاورێ نەوزادی خزمێکی کاك مەحمود حاجی و هاورێ خدر ئیسماعیل، هاورێ محەمەد ڕەسوڵمان بەرەو بارەگای(بێتووش)هێنایەوە، لە بناری کۆسرەت شەومان بەسەرداهات، وڵاخە بەرزەیەکمان پەیداکرد و بەشەو لە رێگای گوندی **تۆرەبەوە** لە دەریاچەی دوکان پەڕینەوە، وڵاخەکەش وێڕای بەلەمەکە مەلەی دەکرد. کە گەیشتینە ئەوبەری دەریاچەکە، هاورێ محەمەدمان سوارکرد، لە رێگا ماینەکە ماندووبوو، بەڵام چارەمان نەبوو، قۆناغ بە قۆناغ هەورازی چیای کوریسمان بڕی و بۆ حەسانەوەی خۆمان و ماینەکە لاماندایە گوندی(کانی توو). لەوێ ئاورگەیەکی ڕاوچیان هەبوو تازە کەویان تێدا برژاندبوو و ئێسقانەکانیان فڕێدابوو. هاورێ مەحمود وتی ئەگەر گۆشت کەو نەبوو ئێسقانەکانیش دەخورێت، وتی ئێمە پیرۆتین توێکلیش بێت هەر دەیخۆین. کەوتینە سەر پاشماوەی ئەو ئێسقانە، تاکە ئێسقانێکی لێ نەما هەموویمان خوارد، ئای چەندە خۆش و بە لەزەت بوو...
ئەو رۆژە لە چیای کوریس سەرکەوتین، لە لوتکەی چیا جەڵەبێك حەیوانە کێوی ڕەوێنەوە، تەقەمان لێکردن، بەڵام هیچیان نەپێکان. ئەو شەوە لە کانییە خەندەکە لەسەر کوێرەکانییەك ماینەوە. بۆ بەیانی گەیشتینەوە(بێتووش)... دوای ماوەیەك پشوودان جارێکی تر ڕەوانەی رادیۆی حزب کراینەوە، کە لەسەر گردێکی بەرز دانرابوو، رادیۆیەکە لە هیچ کوێیەك، تەنانەت لەناو ئاوایی گوندی(بێتووش)یش نەدەبیسترا، بەڵام جێگاکەی بەرزو خۆش بوو، من لەوێ ئاسوودەتر بووم.

## جارێكی تر چیای كۆسرەت:

گەڕاینەوە بەرەو بناری كۆسرەت سەرەتای مانگی شوبات بوو، گەیشتینەوە بناری كۆسرەت، هاوڕێ عەلی حاجی فەرماندەیەكی سەربازی ئازاو بە هیمەت و لێوەشاوە بوو، هەركە ڕژێم هەواڵی كاك عەلی دەزانی ناوچەكە ئالۆزدەبوو، چونكە كاك عەلی فەرماندەیەكی دەستوەشێن بوو، لە شەوی ١٩٨١/٢/١٠/٩ بڕیاردرا كە چەند جاشێكی جەیشی شەعبی چەك بكرێن، كە لە شارۆچكەی چوارقوڕنە تازە چەكیان بەسەردا دابەشكرابوو. لەوانە دوو كەس دەست نیشان كران، زانیاریان لەسەر كۆكرابۆوە، كە چەكی جەیشی(شعب)یان لە ڕژێم وەرگرتووە. بە شەو ماڵی ئەو دوو كەسە لە لایەن هاوڕێیانەوە كونترۆڵ كرا. من و هاوڕێ مەحمود حاجی نادر كەوتبووینە دەرگای رۆژئاوای ماڵی كابرا، هاوڕێیان لە دەرگای رۆژهەڵاتی ماڵە جاشەكەیان دا لێی نەكردەوە، خۆیان فڕێدایە ناو حەوشەی ماڵەكە، كابرا تەقەقەیەكی كرد و چووە ژێرزەمینی خانووەكە، هاوڕێیانیش وەڵامیاندایەوە، هاوڕێ مەحمود لە تەنیشت من بوو بە گوللەی هاوڕێیان بریندارببوو، گوللەیەك بەلەكی پێكابوو، دوو كاتژمێر خەریكی ئەو پیاوە بووین نەدەهاتەدەرێ و نەشمان دەویست بیكوژین. ناچار بەجێمان هێشت و چووین بۆ گرتن و چەككردنی جاشێكی تر. ئەو جاشە ئاسان دەستگیركرا، هەندێك ئامۆژگاریمان كرد و بۆ خاتری ژن و منداڵەكانی هەر ئەو شەوە ئازادمان كرد... پێش ئەوەی بچینە سەر ماڵی جەیشی شەعبییەكان، لە كۆڵانان دابەشبووین، هاوڕێ سابیر وتی بگرە، وتم چییە؟ وتی دۆڵمەیە، پێم وت دۆڵمە چی دەكات لەم كۆڵانە و لەم ساتە وەختەدا؟ وتی ئەو تەنەكەی خۆڵە پڕە لە دۆڵمەی بەتام. پێم وت پیسە وتی لە سەرەوەی حاویەكە بوو خاوێنە، منیش لێم وەرگرت و خواردم زۆر خۆش بوو...تراكتۆرێكیان بۆ كاك مەحمود پەیداكرد، بە هێمنی گەڕاینەوە بناری كۆسرەت...

ڕۆژێك مام عەبدوڵڵا مامەش سەردانی كردین لە بناری كۆسرەت لە گوندی مێوژە، وتی بۆچی لە دوای ماڵەوەتان نانێریت، وتم زۆر حەزدەكەم. وتی جارێكی تر لەگەڵ خۆمدا دەیانهێنم، دوای دوو رۆژ هاوڕێ حاجی ئامینە وتی: وا دایكت و مامت لە ماڵی ئێمەن، چووم دایكم و مامم لەوێ بوون زۆر خۆشحاڵ بووم، شەوو رۆژێك لام مانەوە. زۆر جار لە ناوچە ڕزگاركراوەكان پێشمەرگە دەرفەتی بۆ ڕێك دەكەوت، كە خزم و كەسی خۆی ببینێ. لە ساڵی ١٩٨٢ خێزانم هێنایە شاخ بۆ لای خۆم. مامۆستا دڵزار زۆر پێی ناخۆش بوو، ناوی كچەكەم

ناوە(کۆسرەت)، وتی گەورە بێت ناوی خۆی دەگۆڕێت، چونکە ناوێکی کوڕانەیە، قسەی مامۆستا دڵزار راست دەرچوو، کە ئامادەیی تەواوکرد ناوی خۆی گۆڕی بۆ (هۆنیا). ئەو چەند مانگەی لە بناری کۆسرەت بووم لەگەڵ ژمارەیەك لەماڵی هاوڕێیان وەکو ئەندامی خێزانێکمان لێ هاتبوو. وەك کوڕی ماڵەوە دەچووین بۆ بارەدار، بەتایبەتی بۆ ماڵی مام حەمەدی کە پیاوێکی بە تەمەن بوو. ماڵی پوور ئایشی دایکی هاوڕێ برایم ناسراو بە (مام قادر) هێلکەیەکی بێ هاوڕێیان نەدەخوارد، زۆر جار هێلکە ڕاوکەکەی بۆ هاوڕێیان لە رۆنی دەکرد و پیازی لە جێگای دادەنا. ماڵی مام سمایلی و ماڵی هاوڕێ سەید سمایلەکەی ترو مام سمایلی باوکی کاك مەولود، مام سمایل و خەڵکی مێوژە زۆربەیان شیوعی بوون، کە دەگەیشتینەوە ناو ئەو گوندە وەکو بگەینەوە ماڵی خۆمان وابوو. ژنەکانیان وەکو خوشك و دایکی خۆمان جلەکانی ئێمەیان وەکو جلی کوڕەکانی خۆیان دەشووشت خواردن و خزمەتێکی زۆریان دەکردین... ئەو خۆشەویستییەی لە ناو خێزانی شیوعییەکان هەبوو لە هیچ کوێێك نەبوو، بە دەگمەن روویداوە هاوڕێیەك خیانەتی بە هاوڕێیەکی خۆی بکا... هاوڕێ مام جوامێرو هاوڕێ(سەرکەوت، کە ناوی خۆی محەمەد خدر) بوو، هاوڕێ ئەحمەد حەساری لە سنووری شوان و گۆپتەپە بوون، ئێمەش لە کۆسرەتەوە بەرەو سنووری رۆژهەڵاتی کۆیە چووین، لە گوندی(حاجی قەڵا) یەکترمان گرتەوە، ماوەی هەفتەیەك لە سنووری رۆژهەڵاتی کۆیە ماینەوەو دواتر چووین بۆ گوندی بۆڵقامیش، زۆربەی دانیشتوانی گوندەکە هاوڕێمان بوون، مام جوامێر بەڕاستی جوامێربوو. بە داخەوە هاوڕێ سەرکەوت هەر لە بۆڵقامیش لەگەڵ ژمارەیەك هاوڕێی تر شەهیدبوو. ناوبراو گەنجێکی هەڵکەوتوو و ئازاو روح سووك بوو. هاوڕێ ئەحمەد حەساریش هەر لەگەڵ هاوڕێ سەرکەوت شەهیدکرا، ئەحمەد هەتا دڵ بخوازێت مەرد بوو، زۆر رۆشنبیرو لەخۆ بوردوو بوو. یەکێك بوو لەو هاوڕێیانەی لەگەڵ هاوڕێیانی پشدەردا بەردی بناغەی بنکە سەرەتاییەکانی دانا بوو...

گوندی بۆڵقامیش لە گوندی مێوژە باشتر بوو. خێزانی هاوڕێ جوامێرو ماڵی سەرکەوت و هاوڕێیانی تر لە جل و بەرگمان ڕۆدەهاتن، کە بۆمان بشۆن، ئای چەند میهرەبان و دڵسۆز بوون بۆ هاوڕێکانیان، ئەو خەڵکە چ خەڵکێکی فیداکارو خۆشەویست و دڵسۆز بوو لەگەڵ یەکتر...

ئێمە وەکو هاوڕێیانی(بیتوێن) گەڕاینەوە بەرەو بناری کۆسرەت. ئێوارە لە پشت گوندی حاجی قەلا خۆم و جلەکانیشم شووشت، هەر بە تەڕی لەبەرم کردنەوە، شەویش کاتژمێر دووی شەو بۆ کەمین دەرچووم، بەیانی لە جێگای خۆم نەمتوانی هەستم، پشتم ڕەق ببوو. تایەك دایگرتم خۆم بە پێوە ڕانەدەگرت. دکتۆریشمان لەگەڵ نەبوو، هەر چۆنێك بوو تینم وەبەر خۆدا و لەگەڵ برادەران ڕۆیشتم، لە زۆر جێگادا بەهۆی منەوە دوادەکەوتن، کە گەیشتینە گوندی مێوژە هاوڕێیان منیان بەجێهێشت، ماوەی دە ڕۆژ لە جێگادا کەوتم، بە چەورکردن و هەنون چارەسەری نەخۆشییەکەم کرا...

## کەمینێکی دۆڵی خەلەکان:

ڕۆژی ١٩٨١/٣/٢ بە فەرماندەیی هاوڕێ عەلی حاجی نادر کەمینێکی مەحکمان لەسەر جادەی گشتی سلێمانی – ڕانیە لە نزیك چێشتخانەی کانی وەتمان دانا، کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆ بوو، ئەفسەرێکی پایەبەرز بە ناوی: (ئایاد تکریتی) کەوتە ناو بۆسەکەوە، ئەفسەرەکە لە تەنیشتی سەیارەکەی دەستێکی بەرزکردبۆوە، کە ئاماژە بوو بۆ خۆبەدەستەوەدان، بەڵام دەستەکەی تری لەسەر چەکەکەی بوو، ئێمە نەمانزانی بوو مەبەستی چییە؟ هاوڕێ (جەواد) گەنجێکی زۆر ئازاو لێوەشاوە بوو، ئەوەندە ئارامی نەگرت تاکو ئەفسەرەکە لە سەیارەکە دووردەخرێتەوە، یەکسەر بۆی چوو، کە لێی نزیك بوو ئایادی تاوانبار تەقەی لە هاوڕێ جەواد کرد و شەهیدی کرد. ڕەبیەکانی دەوروبەریش تەقەیان لە ئێمە دەکرد، هێزێکی یەدەکیش لە سوپا بەرەو مەیدانی جەنگەکە دەهات، جەنگێکی زۆر گەرم دروست بوو، هاوڕێ علی حاجی لە ناو ڕێژنەی گوللەبارانی خۆمان و دوژمندا بۆ ئەفسەرەکە چوو، گەیشتە سەر تەرمی شەهید جەواد. سەیرێکی کردو هەڵیکوتایە سەر سەیارەی(ئایاد تکریتی) کە ئایادی تاوانبار لە ژێر تایەی سەیارەکەیەوە شەڕی دەکرد ماوەی دە خولەك لەگەڵ ئایادی تاوانبار جەنگی ئەودیو بۆ ئەم دیوی سەیارەی دەکرد تاکو ئایاد تکریتی کوشت و کلاشینکۆفە مزەلییەکە و دەمانچەیەکی چواردە خۆری لە لاشەی تاوانباری کردەوە، چەك و ڕەزمی شەهید جەوادی هێنا، سێ جار باوەشی بە تەرمی شەهیداکرد بۆی هەڵنەگیرا، بە ناچاری بەجێیهێشت... هاوڕێ عەلی حاجی نموونەی فەرماندە قارەمانەکانی کوردستان بوو، چاوی لە گوللە نەدەترسا، بەڕاستی جوامێر و هەڵکەوتوو بوو...

له ٣/٧/ ١٩٨١ گەڕامەوە گوندی(بێتووش) ماوەی هەفتەیەك لە بارەگا بووین، وەکو پیاسە هاتوچۆی گوندی (بێتووش)مان دەکرد، هاورێ سابیر دوکانی کەسێکی تر بەناوی شێخ ناوێك تازە پەیوەندی کردبوو بە حزبەوە، دەیانگوت خەڵکی ناوچەی دەربەندیخانە، مرۆڤێکی سروشتی نەبوو، لە هەموو شتێك تووڕەدەبوو، لەگەڵ هاورێ(سابیر) بوو بە دەمەقاڵێیان، شێخ جوێنێکی بە سابیر دا، هاورێ سابیر مستێکی لە شێخ دا، ئێمەش چووینە نێوانیان، شەوێ شێخ خرابووە لیستی حەراسەتەوە نەیازانیبوو، کە شێخ لەگەڵ هاورێ سابیر شەڕی کردووە، سەعات دووی شەو لە بۆنی بارووت و دەستڕێژی گوللە وەخەبەرهاتین، سابیر لە تەنیشت من خەوتبوو لرخەی دەهات. چرا کوژابۆوە، پێلاوەکانی ئێمەی هەموو فڕێدابووە دەرەوە، ئەو بنکەیەش تەنها یەك دوو چەکی لێ بوو، ئەو چەکەی حراسەتی پێ دەگیرا چەکی من بوو، کە شێخ سابیری پێ کوشت و بردی... هەتاکو پێلاومان دۆزینەوەو چەکمان پەیداکرد پتر لە نیو کاتژمێری پێچوو، چووین بۆ سەر رووباری هەرزنە پردەکەمان گرت و سۆراغمان کرد... کەس نەیگوت بینیومانە... ئەو گەنجە جوانە خاوەنی ژنێك و دوو منداڵ بوو، لەسەر دەمەقاڵێیەکی هیچ بە دەستی کەسێکی شێت و کەم ئەقل کوژرا...

له ١٩٨١/٣/١٥ گەڕامەوە بۆ لقی(پشدەر). گەڕانەوەم بۆ(لق) لەسەر بڕیاری حزب بوو، کە ماوەی شەش مانگ لەگەڵ مەفرەزە گەڕۆکەکان بووم، لە سنووری بێتووش بۆ سنووری پارێزگای سلێمانی و رۆژهەڵاتی کۆیە و رۆژهەڵاتی کەرکووك. ئەو گەشتە زۆر شتی فێرکردین، تاڵی و برسێتی و جەنگ و میوانداری دۆست و خۆشەویستانی حزب، بەتایبەتی هاورێیانی گوندی مێوژەی بناری کۆسرەت و گوندی بۆڵقامیش لە رۆژهەڵاتی کۆیە...

یەکێکی تر لە یادەوەرییەکانم ئەو هاورێیە بوو کە لە کۆیەوە هاتبوو قۆناغی یەکەمی زانکۆی بەجێهێشتبوو، ببوو بە پێشمەرگە، ماوەی سێ مانگ لەگەڵ ئێمەدا بوو، لەو سێ مانگەدا ئەوەندە لاواز ببوو جێگای سەرسوڕمان بوو. رۆژێك بە ئاوێنە سەیری خۆی کرد، وتی هاورێیان دەزانن بۆچی وا لاواز بووم؟ ئێمەش پێمان وت بۆچی؟ مەگەر پێشمەرگە هەر لاواز نییە؟ وتی بەڵێ وایە، بەڵام گرفت و ناخۆشییەکانی ژیانی پێشمەرگایەتی لە لایەك، نیسك و کولەکەش لە لایەکی تر. هەموو کردمانە پێکەنین. ئەو برادەرە راستی دەکرد خەڵکی رۆژهەڵاتی کۆیە و بناری کۆسرەت و ئەو بنارانە زۆر هەژار و کەم دەرامەت بوون، سێ ژەمەش پێشمەرگەیان میوان بوو، لێفە شڕەکە لەبەر بێلایە دانرابوو، پڕ پڕ لە ئەسپێ بوو، ساوار،

داندۆك،کەشکی سوێرکراوە، کولەکەو نیسك... هتد، خواردنی سێ ژەمە بوو. زۆر جار پێشمەرگە لاساری دەکرد، کە شەوانە لەبەر ئەسپێ نەیاندەتوانی بخەون، لێفەکەیان دەسووتاند...

ڕۆژێك لە داوێنی چیای کۆسرەت لە پشتی گوندی چناران دانیشتبووین، ئەو هاوڕێیە بە شەرمەوە خواحافیزی لێکردین و وتی هیچی تر ناتوانم پێشمەرگایەتی بکەم، ئێستا دەزانم پێشمەرگە یەعنی چی، پێشمەرگایەتی تەنها دژایەتی ڕژێم و دەزگا سەرکوتکارەکانیان نییە، بەڵکو دوژمنەکانی تریش وەکو: نیسك و کولەکەو ئەسپێ هەر دوژمنی پێشمەرگەن... وتی بەڕاستی پێشمەرگە پیرۆزە... پێمان وت: هاوڕێ (شەماڵ) پێمان وتی خوێندن جێ مەهێڵەو بڕۆ بخوێنە بە قسەت نەکردین، هەر دەتگوت دەیان کتێبم خوێندۆتەوە، لەوانە جەنگی پارتیزانی گیڤارا، ئێستا دەزانی ڕۆشنبیری نەزەری زۆر جیاوازە لە کرداری ڕۆژانە... شەمال تەسلیم بە ڕژێم بۆوە...

## ئەرکی خەباتی شارو شاخ:

سێ ڕۆژ بوو گەڕابوومەوە بارەگای لقی پشدەر لە(مێرگی زەڵێ) لە ڕۆژی ١٩٨١/٣/١٨ هاوڕێ مەحمود حاجی فەقێ خدر کۆبوونەوەیەکی سازدا، ئەو هاوڕێیانە بەشداربوون: مستەفا غەفور، ئەحمەد ئەبوبەکر، محەمەد خدر. لە کۆبوونەوەکەدا بڕیاردرا ئەرکی ڕێکخستنەکانی ناو شار وەربگرین لە سنووری پشدەر، هاوڕێ مستەفا غەفور، هاوڕێ مەحمود و هاوڕێ سەلیم حەسەن سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی ناو قەڵادزێ بکەن، هاوڕێ(سوورە)، ئەحمەد ئەبوبەکر، محەمەد خدر سەرپەرشتی سنووری ناحیەی سەنگەسەرو ئۆردووگاکانی تووەسوران، بەستەستێن بکەن... لە ڕۆژی ١٩٨١/٣/١٨ بەرەو بناری ڕەزگە ڕۆیشتین، ئەو ڕۆژە لە داوێنی شاخی(بێدیۆ) ماینەوە... بۆ شەوی دواتر واتا شەوی ١٩٨١/٣ ٢٠/١٩ دابەزین بەرەو خوارەوە، شەوێ چووین بۆ ماڵی خۆمان لە گوندی بەستەستێنی سەرێ، پێش ئەوەی بگەینە ناو گوند بۆنی چرۆی درەخت و بۆنی گوڵەباخی گوند دەهات، شەماڵ بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندەکە بۆنەکەی دەگواستەوە. بەری بەیانی ئەو شەوە، من و هاوڕێ ئەحمەد بۆ ئۆردووگای بەستەستێن ڕۆیشتین، ئاگاداری هاوڕێ (سورە) مان کرد بۆ لامان هات... سێ قۆلی کۆبووینەوە ڕێکخستنەکان گەشەیان کردبوو، هاوڕێ(سورە) کادرێکی زۆر چالاك و چاونەترس

بوو رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە پێشکەوتن و گەشەپێدانی ڕێکخستنەکان... گەڕاینەوە بارەگا کۆمەڵێك پێشنیاری ڕێکخستنەکانمان بردەوە لای(حزب)...

### فراوانبوونی لقی پشدەر:

بەهۆی جەنگی عێراق – ئێران ڕاکردوانی جەنگەکە ڕۆژ بە ڕۆژ زیادیان دەکرد، وای لێ هاتبوو زۆربەی زۆری کاسبکارەکان لە فرۆشگاکانی ناوزەنگ و قاسمەڕەش لە فیرارەکان پێکدەهات، ئەو هاوڕێیانەی خۆیان تەسلیم بە ڕژێم کردبۆوە جارێکی تر گەڕانەوە بۆ ڕیزەکانی هاوڕێیانی پێشمەرگە. لقی پشدەر ڕۆژ بە ڕۆژ فراوانتردەبوو. نزیکەی(٣٠٠) هاوڕێ پتر پەیوەندییان بە لقەوە کردبوو، لە پشت ئاشانەوە تا خڕی ناوزەنگ بارەگامان تێدا دانابوو... لیژنەی سەرکردایەتی لقی پشدەر پێکهاتبوو لە هاوڕێیان: سەلیمە سوور بەرپرسی(لق)، ڕەسوڵ سوور جێگیری(لق)، مامۆستا گۆران بەرپرسی سیاسی(لق)، هاوڕێ (حەمید) عەرەب بەرپرسی دارایی...چەند بارەگایەکی تر لە(لق) جیابوونەوە(لق) سەرپەرشتی دەکردن...سەرەڕای ئەرکی ڕێکخستن بەرپرسی پەلێکی عەسکەری و بەرپرسیاری زیندانی حزب بووم لە توژەڵە، هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ جێگر و ماجید(عەرەب) بەرپرسی سیاسی، عەبدولڕەحمان سپێرویی بەرپرسی ئیداری بوون. هەر کەسێك لە پیاوانی ڕژێم بەدیل دەگیرا، لقەکانی حزب دەسەڵاتی ڕەمیکردنی ئەو کەسانەیان نەبوو. بڕیاردرا بوو دیلەکان بنێردرێن بۆ زیندانی ناوەندی(حزب)... سەرکردایەتی، حزب بەتایبەتی(م.س) دەسەڵاتی تەواوی هەبوو سزای تاوانباران بدات، ئەگەر کادرێك یا هەیئەتێکی حزبی سەرپێچی کردبا لە خۆیەوە دیلێك بکوژێت، حزب زۆر بە توندی سزای ئەو هاوڕێیەی دەدا...زیندانییەکانی(توژەڵە) (٢٥) زیندانی بوون لە کەسانی پلەداری ڕژێم. ئەوەی زۆر بەلامەوە سەیر بوو هاوڕێیەکی خۆمان زیندانی کرابوو بە ناوی: (سەلام) یەزیدی لەسەر ئەوەی خۆی غەیرە ئیسلام بوو دەیویست کچێك لە هاوڕێیانی عەرەب بخوازێت کە ئیسلام بوو، حزب ڕێگای پێ نەدەدا ئەو کچە بخوازێت، چونکە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام بوو، ئەوە لە کاتێکدا حزبی شیوعی حزبێکی(مارکسی - لینینی) یە، کەچی زۆر خۆی دەپاراست لە پێشلکردنی بنەماکانی ئیسلام. من کە ئەو ڕاستییە وەکو بیرەوەرییەك دەخەمەڕوو حەزدەکەم خوێنەری بەڕێز بزانێ حزبی شیوعی عێراقی زۆر خۆی دەپاراست لە پێشێلکردنی ئایین. چونکە ناکرێت چاوپۆشی لە

کۆمەڵێك هەڵوێست بکرێت، کە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە زۆر بایەخیان هەیە. بە داخەوە ناحەزانی حزب زۆر جار زوڵمیان لە حزبی شیوعی کردووە، کە پروپاگەندەی نابەجێیان بۆ هەڵدەبەست... بارەگای زەڵێ لە کاتێکدا ڕادەستی پەلەکەی ئێمە کرا، کە بەرەی(جود) خەریکبوو پێکدەهات لە نێوان حزبی شیوعی عێراقی و پارتی و حسك و پاسۆك. ڕۆژبەرۆژ نێوانی (ی.ن.ك) و حزبی شیوعی بەرەو ئاڵۆزی دەڕۆیشت، ڕۆژێك ئاگاداریان کردین، کە خواردن سازبکرێت مام جەلال میوانە بۆ کۆبوونەوە لە نێوان یەکێتی و حزبی شیوعی. خواردنمان سازکردبوو بۆ ژەمی نیوەڕۆ، بوو بە کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ مام جەلال و شاندی یاوەری هەر نەگەیشتن، ئێمەی پشدەریش بۆ ژەمی نیوەڕۆیان بە پەلەین بەتایبەتی کە گۆشت هەبێ، هاوڕێیەك هات وتی دەڵێن مام جەلال نایەت، کات بوو بە کاتژمێر یەك و نیو هاوڕێ (ڕەحیم عەزیز) قەڵادزەیی لەسەر بێتەل بوو هات و وتی هاوڕێیانی(م.س) بروسکەیان کردووەو دەڵێن کۆبوونەوەکە دواخراوە، منیش بڕوام کرد ئەو خواردنەی بۆ مام جەلال سازکرابوو خواردمان. ئێمە لە نان خواردن بووینەوەو مام جەلال گەیشت وتی هاوڕێیان نان دەخۆین ئینجا کۆدەبینەوە... لە ژیانمدا ئەوەندە تەنگەتاو نەبووم، هاوڕێ ئەبو فاروق وتی هاوڕێ کوا نان حازرە، وتم نانی چی؟ وەکو خۆی گێڕامەوە، هاوڕێ ئەبو فاروق وتی کەواتە کێشەی جوانەگاڕەشی درۆ نەبوو. وتی کەیفی خۆتە کێ دەتوانێ بە مام جەلال بڵێ نان نییە! من هەر دەتوانم یەك کاتژمێر بە قسەو دواندن مام جەلال بخافڵێنم ئەوەی تر لەسەر خۆتە... دەڵێن بەوری بەیانی زۆر گورج و گۆڵە، بەو شێوەیە چووین خێرا دوو گیسکمان لە حاجی ڕەسوڵی توژەڵە کڕی، ڕەحیم عەزیز کە قەساب بوو بە کەمتر لە چارەگە سەعاتێك سەری بڕین و کەوڵی کردن، دەستمان کرد بە گۆشت برژاندن، لە ماوەی سێ چارەگدا دوو جێی باشمان گۆشتی برژاو گەیاندە مام جەلال و هاوڕێیان، بە مام جەلال و هاوڕێیانم وت ژەمێك بخۆن وەکو بەرکوڵێك دواتر پەیتا پەیتا خواردنی تریشتان پێدەگات، مام جەلال وتی: بۆیە دەڵێن شیوعی(منظمن). هاوڕێ ئەبو فاروقیش چاوێکی لێکردم و وتی: (لیدری یدری)؟! مام جەلال وتی مەبەستت چییە؟ هاوڕێ ئەبو فاروق وتی من و هاوڕێ محەمەد دەزانین!! دواتر برنج و گۆشتی تریش سازکرا، هەتا کۆبوونەوەکە تەواوبوو گۆشت قەلیش پێگەیشت، چونکە مام جەلال زۆر حەزی لە گۆشتی(قەلە). کۆبوونەوەکە تەواوبوو، مام جەلال ڕووی لە هاوڕێ ئەبو فاروق کرد و وتی: بە حوکمی تەجروبەی خۆم هەر شتێك حزبی شیوعی وتی: (دراسەی دەکەین یەعنی نایکات)...

له دوای ئەو کۆبوونەوەیە پەیوەندی نێوان حزبی شیوعی و یەکێتی بەرەو ئالۆزی دەڕۆیشت. بارەگای زیندانی (زەڵێ) لە ناو جەرگەی بارەگا سەرەکییەکانی یەکێتی و بارەگای مام جەلال و رادیۆ و (م.ن) راگەیاندنی (ی.ن.ك) بوو. لە توژەڵە یەکێتی دەیەویست بارەگای زیندانی(حزب) دەربکەن، بۆ ئەو مەبەستەش شێوازێکی زۆر سەیریان گرتەبەر. رۆژێك دوو خێوەتیان لە پاڵ خێوەتی ئێمەدا هەڵدا، رۆژێکی تر(سالار عەزیز)، کە ئەندامی (م.س)ی (ی.ن.ك) و بەرپرسی (م.ن) راگەیاندن بوو، خۆی بە شەخسی رێگای لە کاروانی هەرەوەزی داربڕینی بارەگاکەمان گرت، کە زیندانییەکان بۆ داربڕین چووبوون، هاوڕێ رەحیم عەزیز، کە حیمایەی زیندانییەکانی دەکرد فیشەکی لە سالار عەزیز وەبەر تفەنگ دابوو، هاوڕێیەکی خانەقینی لە بارەگا بوو بە ناوی: (جەمشید) وتی: هاوڕێ بوو بە جەنگ، کە چووین وتم کاك سالار تۆ سەرکردەی یەکێتی و پیاوێکی رۆشنبیری، چۆن خۆت رێگا لە هاوڕێیان دەگریت؟ وتی ئەگەر هەموو شیوعییەکانی دنیا لەسەرتان وەدەنگ بێن هەر لەم ناوە دەرتان دەکەین... دواتر بارودۆخەکە بەرەو خراپتر ڕۆیشت، مام جەلالیش لە گوتارێکی رادیۆییدا بەرەی(جود)ی بە بۆمبایەك شوبهاند، بە زمانێکی زبر هەڵوێستی یەکێتی بەرامبەر بە حزبی شیوعی دووپات کردەوە... دوای ئەوەش کێشەی (عەبدوڵڵا ماویلی)ی دروست بوو. یەکێتی عەبدوڵڵا ماویلیان کوشت، هاوڕێ عەلی کلاشینکۆفیش سێ کادری لە بکوژانی عەبدوڵڵا ماویلییان کوشتەوە. عەبدوڵڵا ماویلی کە تازە پەیوەندیی بە حزبی شیوعییەوە کردبوو، لە ناو ڕژێمدا ئامر مەفرەزەی جاش بوو. مام جەلال دەیگوت کادرێکی یەکێتی کوشتووە نابێ حزبی شیوعی بیگرێتە خۆی، لە کاتێکدا مام جەلال خۆی نامەی بۆ عەبدوڵڵا ماویلی ناردبوو، ئەگەر پەیوەندیی بە(یەکێتی)یەوە بکات... پێشوازی لێ دەکەن... یەکێتی لە حزبی شیوعی بە بیانوو بوو. پێی وابوو حزبی شیوعی دەبێتە پرد بۆ پارتی لە سنووری دەڤەری(سۆران)، بەتایبەتی ئەو دەڤەرانەی کە یەکێتی تێیدا باڵادەستە، حزبی شیوعی عێراقیش پێیی وابوو کێشە و ناکۆکییەکان لە نێوان پارتی و یەکێتیدا کێشەی لاوەکین، نابێ لەسەر حسابی دۆستایەتی پارتی و یەکێتی، جەنگو ناکۆکی نێوانیان، بۆ کۆکردنەوەی لایەنە سیاسییەکان لە بەرەیەکی بەرهەڵستکاردا، ئەو ناکۆکیانە ببنە کۆسپ و لەمپەر. بەڵام ژیان سەلماندی کە حزبی شیوعی عێراقی نەك هەر نەیتوانی کێشەی نێوان پارتی و یەکێتی چارەسەر بکات، بەڵکو خۆیشی بوو بەشێك لە جەنگی ناوخۆ. بەداخەوە تا شەقی زەمانە ناچاری نەکردین

وازمان لەو جەنگە نەهێنا، بەدەیان و سەدان شۆڕشگێڕو فەرماندەی هەڵکەوتوو لەو جەنگە بێ مانایەدا بوونە قوربانی...

## دروستکردنی بارەگاکانی پشت ئاشان:

بە بڕیاری سەرکردایەتی(حزب) بەشێك لە لقی پشدەر بە فەرماندەیی هاوڕێ مام ڕەسوڵ سوور جێگری(لق) بەرەو پشت ئاشان ڕۆیشت، لقی ئێمەش ڕەوانەی پشت ئاشان کرا، زیندانییەکانی(توژەڵە) بۆ بارەگای نۆکان بۆلای سەرکردایەتی(حزب) گوازرانەوە. بەندەو هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ گوازراینەوە بۆ پشت ئاشان، بۆ بارەگایەکی هاوینە، کە لە ژێر سێبەری گوێزێ گوڵێ بوو. وەرزی پایز بوو مانگی گەڵاڕێزانی ١٩٨١، دار و درەخت و گەلای پایز دیمەنێکی زۆر جوانییان هەبوو. مرۆڤ لە خۆیەوە ئاوێتەی گۆرانی ڕەنگ (زردی خەزان)ی مامڵێ دەبوو، کە سەیری ئەمبەرو ئەوبەری دۆڵی(پشت ئاشان و قرناقاو) دەکرد، تارایەکی زەردی پۆشیبوو، بۆن و بەرامەی وەرزی پایز بەو ناوەدا بڵاوبۆوە. ناسکە هەرمێ، ترێ و گوێز ئەوەندە زۆر بوو، کەس هەستی بە بێزاری و ماندووبوون نەدەکرد. ئەوساڵە ئەوەندەمان میوە خوارد تۆڵەی ساڵانی رابردووشمان کردەوە...

ئەرك وکاری رۆژانە زۆر بوو، سەرەڕای چەندان مەفرەزە بۆ سوسەکردن و شوناسایی بە مەبەستی پارێزگاری ناوچەکە، هێزێکی هاوڕێیانی پشدەر بەرەو شەڕگەی وەرتێ چوو بوو، بۆ جەنگی نێوان لایەنەکانی بەرەی(جود) و یەکێتی، لەو جەنگەدا (ی.ن.ك) شکابوو، دوانزدە بارەگایان دەستیان بەسەرداگیرا بوو هەر لە دۆڵی(خانەقا) (٤٥) پێشمەرگەی یەکێتی لەجەنگێکدا دیلکران، لە ناوەڕاستی مانگی تشرینی دووەم(هدنە) ئاگربەست لە نێوان لایەنەکانی(جود) و یەکێتیدا ڕاگەیەنرا، بەڵام بۆسەدانانەوە و جەنگ لێرەو لەوێ، درێژەی هەبوو، رۆژانە مەفرەزەی (سوسە)کردن دەردەچوو. جارێك مەفرەزەیەکی هاوبەش بووین بۆ سوسەکردن دەرچووبووین، بەرپرسێکی پارتی لەو مەفرەزەیەدا کاك مستەفا بچکۆل یا مستەفا سوور بوو، لە نزیك (کانی ساوین) بەسەر مەفرەزەیەکی (ی.ن.ك)دا دەکەوێت، لە یەکتر دەخوڕن یەکێتییەکان بە کاك مستەفا دەڵێن ئێوە پێشمەرگەی چ لایەنێکن؟ (مستەفا) دەڵێ: پارتین بۆ سوسەکردن واتا(استطلاع) هاتووین یەکێتییەکان پێیان دەڵێن درۆدەکەیت، کە بڵێی شیوعین بڕوامان پێ دەکردی، پارتی و (استطلاع) کوجا مەرحەبا! چەند تەقەیەکیان

بەسەرداکردبوون و ئەوانیش وەڵامیان دابوونەوە، کە گەڕانەوە پێمان وتن بۆچی چوونە سەرکانییەکە؟ وتی ویستومە مەتارەکەم پڕ لە ئاو بکەم... کانییە ساوینی لە نێوان هەردوو لایەنی جەنگەکە بوو، تیشە شاخی مۆڵ و لێڕەواری رۆژهەڵاتی کانییە ساوین نێوانمان بوو. ئێمە لە داوێنی چیای مۆڵی بووین، یەکێتی بەسەر ئێمەدا زاڵبوو، بە چەکی دۆشکەو بیکەیسی و قەنناس بێزاریان کردبووین ئەگەرچی ئاگربەست بوو، بەڵام یەکێتی دووره تەقەیان دەکرد، رۆژێك هاوڕێیانی(عەرەب) بۆ مەفرەزەی(استطلاع) دەرچووبوون، مام خاڵندی خەڵکی گوندی(قادراوا)یان گرتبوو، هێنایان بۆ بارەگای(حزب) لە(پشت ئاشان)، مام خاڵند و هاوڕێ مام ڕەسوڵ یەکتریان دەناسی، مام خاڵند وتی رەسویٚ خۆم لۆ ئەمن و گرتووە؟ هاوڕێ ڕەسوڵ نەیدەزانی چی پێ بڵێ، چونکە خەڵکی ناوچەکە بوو، مام ڕەسوڵ پێکەنی بە مام خاڵندی گوت: چۆن لەبەرچی گرتوومانی لە تۆ قاچاختر هەیە؟ مام خالند گوتی چۆن؟! مام ڕەسوڵ پێی گوت چۆن ناوت خاڵندە؟! کەسێك ناوی خاڵند بێت دەبێ بگیرێت! بوو بە پێکەنین. مام خاڵند وتی وەباڵم بە ملێ هەقی خۆتانە بمگرن، منیش ناوی خۆم پێ سەیرە...

بەو پایزەو پایزە درەنگە سەری دوانزە کاولە خانووی ڕووخاوی (پشت ئاشان و قرناقاو) مان گرتەوە، دوانزە بارەگای پێشمەرگە جێگیرکران، پێشمەرگەکانی پارتی و سوشیالیست و پاسۆك کە لە دۆڵی خانەقا گەڕابوونەوە لەو خانوانەدا جێگیرکران. هێزەکانی پارتی زۆر بوون، ئەرزاق و خانوویان نەبوو بەفرێکی ئەستوور لە دۆڵی پشت ئاشان و قرناقاو باری، پێشمەرگەکانی پارتی بەشێکیان لە بۆڵێ جێگیرکران، کاك حاجی دێلویی بەرپرسیان بوو، ئەوان هەم بارەگای خۆیان دروستکرد هەم ئەرزاقی خۆیان دابینکردبوو، بەڵام ئەو پێشمەرگانەی لە ئێرانەوە هاتبوون رێگایان نەبوو بگەڕێنەوە، چونکە بەفر رێگای قەندیلی گرتبوو وەکو میوان میوانی حزبی شیوعی بوون. حزبی شیوعی خواردەمەنی و ئەرزاقی(٦) مانگی کۆکردبۆوە بۆ(١٠٠) هاوڕێ، بەڵام پتر لە(٢٠٠) پێشمەرگەی پارتی میوان بوو، ئەرزاقەکە لە کۆتایی مانگی کانوونی دووەم تەواودەبوو...

## دابینکردنی ئەرزاق:

رۆژێکی تەمومژاوی بوو بەفر کڕێوەی دەکرد، هاوڕێ ملازم خدر (ئەبو عاید) داوای هاوڕێ مام ڕەسوڵ و هاوڕێ حەسەن خدرو بەندەی کردبوو، کە چووین بۆ لای، هاوڕێ ملازم خدر وتی

هاوڕێیان گرفتی ئەرزاقمان بۆ پەیدابووە، خواردن شتێکە مرۆڤ هەر سێ سەعات ژەمێکی دەوێت، چی بکەین؟ ڕێگای قەندیل گیراوە، لە وەرتێوە یەکێتی ڕێگا نادات، ڕێگای تر بەرەو شار ڕۆژانە هەم کەمینی جاشەکانی لێیە هەم کەمینی یەکێتی... هاوڕێ ملازم خدر قسەکانی تەواوبوو، هاوڕێ مام ڕەسوڵ وتی ملازم خدر خەمت نەبێ ئێمە مەنگوڕین وابزانە ئەمساڵ میوانی ئێمەن...

هەر لەسەر نەبوونی ئەرزاق جارێکی تر(حزب) بەو هۆیەوە حاڵەتی(دەسپێوەگرتنی) ڕاگەیاند. هاوڕێ ڕەسوڵ وتی هاوڕێیان ئێمە ناتوانین لە خواردن بگرینەوە، خەڵکی(پشدەر) میوانداری و تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی زۆر فراوانە، چۆن دەکرێ ژەمی لەتکە نانێك و مانگی یەك کیلۆ ڕۆن بۆ کەسێك بکەینە بڕیار؟ کاك ڕەسوڵ بە پێکەنینەوە وتی ئێمە مەنگوڕین هەر پیاوێکمان مانگی کیلۆیەك ڕۆن لە کیری هەڵدەسوێ... قسەی هاوڕێ ڕەسوڵ بوو بە بڕیار هیچ بڕیارێکی(حزب)ەکە پەیوەست بوو بە گرتنەوەی خواردن لقی پشدەرو پشدەرییەکانی نەدەگرتەوە...

پتر لە بیست پێشمەرگەی بێ چەك دەست نیشان کران لەگەڵ مەفرەزەیەك بۆ پارێزگاریکردنیان تایبەت بۆ هەڵگرتنی کۆڵە ئاردو ئەرزاق، ئەو بیست پێشمەرگە لە هاوڕێیان و هەڤاڵانی پارتی پێکهاتبوون، مخابن ناوی ئەو قارەمانانەم لەبیر نییە، ئەو بیست کەسە لە لایەن هاوڕێ مام ڕەسوڵ و هاوڕێ حەسەن خدر و هاوڕێ حەمەئەمین عەبدوڵڵا یاوەری کران بە ڕێگای شاخی(تەورداسە)دا تێپەڕین تا گەیشتنە گوندی(زورکان) لە ماڵی هاوڕێیان و دۆستانی(حزب) پتر لە بیست کۆڵ ئەرزاق پەیداکرا هەر ئەو شەوە گەڕانەوە پشت ئاشان، جارێکی تر هاوڕێ مام ڕەسوڵ و هاوڕێ حەسەن خدر و بەندە دابەزین، هاوڕێ ڕەسوڵ و هاوڕێ حەسەن خدر بەرەو گوندی زورکان ڕۆیشتن، منیش بە تەنیا بەرەو ئۆردووگای بەستەستێن چووم، (٧) بار ئاردو خواردەمەنی و بارێك سووتەمەنی و پێداویستی تر لە ماڵی هاوڕێیان و لە ڕێکخستنەکان کۆکرایەوە، هاوڕێ خەلیفە پیرۆت و کاك ئەبوبەکر باداوەیی ڕۆڵێکی زۆر مەردانەیان گێڕا، کاك ئەبوبەکر ئەسپێکی تایبەتی هەبوو ڕادەستی منی کرد، هاوڕێیان(٨) هێستری زۆر باشیان بۆ پەیداکردم پتر لە(١٠) هاوڕێ کە شارەزا بوون لە کاری ولاخداری ڕەگەڵم کەوتن و گەڕاینەوە پشت ئاشان...هاوڕێ (مام ڕەسوڵ و هاوڕێ حەسەن) یش (٧) باریان ئەرزاق هێنا بوو...گرفتی ئەرزاق لە هەموو پشت ئاشان کۆتایی پێهات، بێ ئەوەی(حزب)

یەك فلس پارە خەرج بكات... هاوڕێ ئەبو عاید وتی هاوڕێیانی پشدەر بەڕاستی ئێوە جێگای شانازین دەبێ رۆژێك حزب بە مەدالیایی ئازایەتی پاداشتان بداتەوە؟...

### زستانی پشت ئاشان:

دۆڵی پشت ئاشان و قرناقاو وەکو بەهەشت وایە، هەموو وەرزەکانی هەر خۆش و دڵگیرە، لە وەرزی زستاناندا سروشتێکی زۆر جوانی هەیە. ئەو ساڵە پتر لە دوو مەتر بەفر باری بوو، شەوانی پشت ئاشان کت و ئارام بوو میوەیەکی زۆرمان لە هەرمێ و گوێز پاشەکەوت کردبوو. لە ١٩٨٢/١/١٣ هێشوە ترێی ئاودارمان لە ژێر تاتوێی بەفر دەردەهێنا، شەوانمان بەدەم گەڕەلاوژەی گۆرانییەوە بەسەردەبرد. هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ دەنگی زۆر خۆش بوو گۆرانی (خەجیجێ) ی دەگوت، وێنەی حوسێن شریفی دەنگی خۆش بوو، هاوڕێ عەبدوڵڵا مینە وەکو گوڵی مەقر وابوو، لە خۆیەوە چریکەیەکی دەکێشاو دەیگوت (گزگرنگ) پێمان دەگوت هاوڕێ(گزگرنگ) یەعنی چی؟ بە پێکەنینەوە دەیگوت لێگەڕێن هەرخۆم دەزانم؟! بە داخەوە ئەو گوڵەش هەڵوەری لە شارۆچکەی سەنگەسەر بە نامرادی کۆچی دوایی کرد...

### مەفرەزەیەکی ناوەخت:

لە رۆژێکی سامالٚ دا جگە لە بریسکانەوەی تیشکی خۆر بەسەر ئەو بەفرە زۆرەدا هیچ شتێکی تر نەدەبینرا، لە ١٩٨٢/١/١٣ مەفرەزەیەکی بیست و یەك کەسی بەرەو شاخی زێڕنە کێوی وەڕێکەوتین، لە بیست و یەك هاوڕێ، کە (١٦)یان عەرەب بوون، ئامانجی مەفرەزەکە چی بوو و بەرەو کوێ دەڕۆین هیچمان لێ نەدەزانی، ناشبێ بپرسین وەکو دەگوترێت ئەوەیان هەر(حزب) دەیزانێ؟! بەرپرسی مەفرەزەکە ملازمێکی عەرەب بوو، بەداخەوە ناوەکەیم لەیادنەماوە، بەرپرسی سیاسییەکەمان هاوڕێ (ئەبو شروق) و بەرپرسی ئیداریش هەر هاوڕێیەکی عەرەب بوو. ئەو کات سێ کەس دیاریدەکرا بۆ ئەو مەفرەزانەی بە(جەولە) دادەبەزین. لەو مەفرەزەیەدا پێنج هاوڕێ کورد بووین: محەمەد ڕەسوڵ، قادر موسا، شەیدا برادەرێکی خەڵکی هەولێر بوو، دەروێش ئەویش خەڵکی هەولێر بوو، بەندە. پێش ئەوەی لە شەقامە قیرەکە بپەڕینەوە، لە نزیك گوندی (بۆڵێ) هاوڕێ (ئەبو شروق) کۆی کردینەوە ، هەر

بە پێوە وتی هاوڕێیان ئامانجی مەفرەزەکەمان پڕوپاگەندەیە بۆ (حزب) هەروەها ڕاهێنانی هاوڕێیانە لەسەر ئەرکی (خەبات) بەتایبەتی لە وەرزی زستانانندا، ئەو ناوچەیەی بۆمان دیاریکراوە سنووری دێهاتەکانی بزنان و دەوروبەرێتی نەیدەزانی بلێ (ماخو بزنان) قسەکانی بەم رستەیە کۆتایی پێ هێنا، وتی: هەموو فەرمانێك جێبەجێدەکرێت، ئەگەر گەڕاینەوە هەرچی سەرنج و بۆچوونێکتان هەبوو بە حزبمانی رابگەیەنن... بێ ئەوەی وەلام بدەینەوە بەڕێکەوتین، لە رێگای هەورازی (کەندە بووکە) سەرکەوتین بەرەو زینوی (ئەستێروکان) بۆ ئێواریێ بەدرەنگەوە گەیشتینە ناو گوندی (ماخۆ بزنان) ئەو شەوە بەفر باری.. بەفری کەونیشی لێ بوو، بەفر هەموو پێدەشتەکانی سەنگەسەری گرتبۆوە، بۆ رۆژی دواتر ڕۆیشتین بۆ گوندی (مەمکان) جارێکی تر بەفر باری هەموو رێگاکان گیرابوون ، ئێوارەیەکی درەنگ لەسەر نان خواردن بووین، دۆستێکی خانەخوێ ئاگاداری کردم وتی هەر ئێستا خەبەرم وەرگرتووە، جاشەکانی ( برایم ئاغا) لە گوندی زەنگلانی خوارێن. نیازیان وایە بەرەو ئێرە بێن، هەرچی زووە هاوڕێیەکانتان ئاگاداربکەنەوە، منیش زۆر بە پەلە ئاگاداری هاوڕێیانی دەوروبەری خۆم کردەوە، ئەوانیش بە زنجیرە ئاگاداری برادەرانیان کردەوە... هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ، بەندەو قادر موسا بووین بە بەرپرسی مەفرەزەکە، ئەو لیژنەی بۆ سەرکردایەتی مەفرەزەکە دیاریکرابوون هیچیان لەدەست نەدەهات، چاویان لە دەمی ئێمە بوو ڕێنوێنی ئەوان بکەین، لەڕاستیدا هەڵبژاردنی ئەو سێ هاوڕێ عەرەبە زۆر هەڵە بوو. برادەرانی عەرەب لە ناوچەیەکی وەکو پیرانە ڕەشان و ماخۆ بزنان، کە ناوچەیەکی عەشائیری و دواکەوتووە، هیچیان لەدەست نەدەهات... لە ماوەیەکی زۆر کورتدا هەر بیست و یەك هاوڕێیەکە کۆبووینەوەو لە ناو گوندی مەمکان و بەرزاییەکانی دەوروبەری دابەشبووین. کاك ڕەسوڵ پیاوێکی بە هیمەت و جەسوور دیاربوو خۆی وەکو ریش سپی گوندی مەمکان و بەرەبابێکی ئەو گوندە ناساند، وتی: لە خۆتان ڕادەبینن شەڕبکەن؟ لە وەلامی کاك ڕەسوڵدا وتم هیچ دەرەتانێك نییە هەر دەبێ شەڕبکەین، رێگاکان هەمووی گیراون، ئەو رێگایەی بەفر نەیگرتبێ ئەوە جاشەکان گرتوویانە، کاك ڕەسوڵ وتی خەبەرم هەیە، (پیرۆت ماخۆ بزن) بەرزاییەکانی زیندووی ماخۆ بزنانی گرتووە، زەنگلانی خوارێ هەمووی کۆنترۆڵ کراوە، جاشەکانی برایم ئاغا زۆربەیان خەڵکی ئەو ناوچەیە بوون. برایم ئاغا خۆیشی هەر خەڵکی ناوچەکە بوو، زۆربەی زۆری خەڵکەکە لایەنگری عەباس بایز و برایم ئاغا بوون. لە ١٠٠٪ پیلانەکەیان بە

سەرکەوتوو دانا بوو، کاك ڕەسوڵ هاتە لای من و هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ و قادر موسا وتی هاوڕێیان زۆر وریا نەبن لەم پیلانە دەرناچن، پێم گوت تۆ پێشنیارت چییە؟ وتی هەتا لە ئێوە دڵنیانەبم هیچتان پێ ناڵێم، پێمان گوت تۆ دڵنیابە شەڕدەکەین بیست و یەك کەسین هەتا هەموومان دەکوژرێن شەڕدەکەین، کاك ڕەسوڵ وتی: کەواتە گوێم لێبگرن وتی هەر خزمی پشتێ لە بەرەبابی خۆم(١٧) کەسی چەکهەڵگرو شەڕکەر هەیە، هەتاکو(٤) ڕۆژان شەڕبکەن نان و فیشەکتان لەسەر من بێت، بە دەستێکی ئاماژەی دا و وتی: ئەو ماڵانە هەمووی خزمی خۆمن، ئەو شوانەی ئەوبەری لەکن مەڕییە ئامۆزامە هەر یەکەم فیشەك بتەقێت دووەم فیشەك ئێمە دەیتەقێنین،... کە ئەو قسانەم لە کاك ڕەسوڵ بیست لەگەڵ هاوڕێ محەمەد سەیری یەکترمان کرد، باس ناکرێت چەند بە قسەکانی کاك ڕەسوڵ دڵخۆشبووین. مرۆڤ کە دەگاتە هەڵوێستێکی مەترسیدار، بەتایبەتی کە مەرگ و بەرپرسیارییەتی پێوە بوو لە پڕ فریادرەسێك پەیدادەبێ و دەربازدەکرێی، هەڵوێستی کاك (ڕەسوڵ)م وا هاتە بەرچاو، چونکە هەرگیز بڕوامان نەدەکرد خەڵکانی وا هەبن لەم ناوچەیە، کە زۆربەیان خزمایەتی زۆر نزیکیان لەگەڵ عەباس بایزو برایم ئاغا هەیە... ماوەی چوار ڕۆژ و چوار شەو لەگەڵ جاشەکان بەرامبەری یەکتر بووین، ئەوان لە زەنگلانی خوارێ ئێمەش لە مەمکانێ سەرێ، هەردوو گوندەکە خانووەکانیان بەسەر یەکەوە بوو، واتا دوو سەد مەتر لە یەکتر دوور نەبووین، بەڵام خانووەکانیان جۆرێك دروستکرابوون زۆر لە ڕەبیەی سەربازی دەچوون، نەك لە خانووی ئاسایی، نە جاشەکان دەوێران بێنە پێشەوە نە ئێمەش لەوێ دەڕۆیشتین، ڕۆژێك هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ بە پێکەنینەوە وتی جاشەکان خەبەرێکی سەیریان بۆ ناردووین، وتم خەبەری چی؟ وتی(پیرۆت ماخۆ بزنان) بە ڕاسپاردەیەکدا وەڵامی بۆ ناردووین، کە دوو عەرەبی بدەینێ و ڕێگامان پێ دەدات لە کەمەندی گەمارۆی جاشەکان رزگار بین، هەر وەکو بڵێ لەو جەڵەبەی پێتانە دوو سەر حەیوانم بدەنێ، وەکو ئێمە جەڵب کڕ بین ئەوان گومرگ وەربگرن... وتم: بۆ ئێمە جەڵەبمان پێیە؟! هاوڕێ محەمەد زۆر پێکەنی. پێم وت: ڕاسپاردەکەی لە کوێیە؟ وتی: وەڵامم داوەتەوە. پێم وتووە: بابێت بەسەر لاشەی هەمووماندا بڕوات ئەوسا نەك ئەو دوو عەرەبە با تەرمی هەمووشمان بەرێتەوە بۆ ئاغاکانی...لە دوای هەفتەیەك سەنگەرگرتن بەرامبەر بە جاشەکان، ئێوارەیەك هاوڕێ محەمەد وتی هاوڕێیانی بەرپرس بڕیاریان داوە ئەم شەو بگەڕێنەوە، زۆر پێم سەیربوو، پێم گوت: بە کوێدا بڕۆین. وتی: بانگی منیان کردووە. منیش ڕێگاکانم بۆ باس

کردوون. ڕێگای کوێستانەکانی زێڕنە کێویان هەڵبژاردوە، پێم وت: کارێکی زۆر خراپت کردووە ئەو ڕێگایەت پێ وتون، هەمووومان لە ناو بەفردا بە هیلاك دەچین...

شەوێ کاتژمێر یەکی شەو بوو بەبێ ئەوەی بە کاك ڕەسوڵ بڵێین ڕۆیشتین. مەفرەزەکەمان وەکو مەڕ سەرمان بەیەکەوە نابوو، ماوەی سێ کاتژمێر ڕۆیشتین. هەنگاو بە هەنگاو لە مەترسی مەرگ و تێداچوون نزیك دەبووینەوە. ڕێگاکان بە باتیوەی بەفر باریك و لوس ببوون هاوڕێیان شەکەت و ماندووبوون، ڕووم لە هاوڕێ محەمەد کرد و پێم وت: دە هەڵیگرەوە ئەوە کار بوو کردت؟ پێکەنی و وتی: قسەیان لەگەڵ دەکەم، مەبەستی ئەبو شروق و ئەبو عامر بوو، لەوەڵامدا وتیان ئەوە بڕیاری حزبە پێویستە هاوڕێیان سەرپێچی نەکەن، پێم وتن: ئێوە شارەزای ئەو کوێستانەنین، هەمووومان دەمرین، وتیان: ئەگەر هەمووومان بمرین هەر ناگەڕێینەوە. ڕووم لە هاوڕێیان کرد و وتم: کامەتان دەگەڕێنەوە بە دوام بکەوێ. من بەرپرسیار دەبم لە بەرامبەر حزب... نیوەی هاوڕێیان بە دوای مندا گەڕانەوە. لە داوێنی کوێستانی زێڕنە کوی چوار هاوڕێمان پەکیان کەوت، ناچاربووین بەڕاکێشان ڕۆکشمان دەکردن هەتاکو گەیاندمانننە ناو لێڕەواری، لەوێ خێرا ئاگرمان کردەوە، لەگەڵ تینی ئاگریان بۆ هات هەموویان خەریکبوو خەویان لێ بکەوێت، ئینجا نەدەبوو بوار بدەین هاوڕێیان بخەون، خەوتن لەناو بەفرێدا بەتایبەتی لە ماندووبووندا مرۆڤ یا دەمرێت یا زۆر بە خراپی نەخۆش دەکەوێت...هەتاکو ئاگرمان کردەوەو هەندێك حەساینەوە هاوڕێیانی تریش گەڕانەوە، دوای پشوودانێکی کورت گەڕاینەوە بۆ ناو گوندی مەمکان، لە کاتژمێر یەکی شەو بۆ حەوتی بەیانی بە ڕێگاوە بووین، کە گەیشتینە ناو گوند حراسەتمان داناو خەوتین، من نەخۆش کەوتم، هەموو گیانم گرژ بوو لەرزو تایەك دایگرتم خەریکبوو جێگا بە خۆمەوە نەگرێت. جارێکی تر بەفر بارییەوە، کە ئەو شەوە نەگەڕابایینەوە لەبەر بەفرو کرێوە ڕێگای گەڕانەوەمان بزردەکرد و هەمووومان دەمردین...خزمەکانی هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ و هاوڕێ قادر موسا لەگەڵ عەباس بایز و برایم ئاغا جاش بوون، بابی هاوڕێ محەمەد چوو بوو بۆ لای خزمەکانی، پێی وتبوون: ئەگەر محەمەدی کوڕم بکوژرێت بیست کەسی لەسەر دەکوژم، گوشاری خزمەکانی هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ و هاوڕێ موسا باوکی قادرو خۆڕاگری هاوڕێیان و ئەو دۆستە بەڕێزە، واتا کاك ڕەسوڵ مەمکانی پیلانی برایم ئاغایان پوچەڵ کردەوە، جاشەکان پاشەکشەیان کرد... ئێمەش بە ڕێگای گوندی ماخۆبزناندا گەڕاینەوە بۆ پشت ئاشان، بە کوێدا هاتبووین هەر بەوێشدا

گەڕاینەوە...کە گەڕاینەوە لیژنەی سەرکردایەتی مەفرەزەکە راپۆرتێکی زۆر بێ ویژدانانەیان لەسەر من نووسیبوو لە جیاتی رێز لێ گرتن ڕەخنەیان لێ گرتین... نازانم کاك ڕەسوڵ مەمکان کێ بوو، چ کارەیە.. لە ژیاندا ماوە یا کۆچی دوایی کردووە. هیوادارم لە ژیاندا مابێت، بە راستی جوامێرێکی هەڵکەوت و چاونەترس بوو، لەو سەردەمەدا ئەو جۆرە جوامێرانە لە کوردستان نموونەیان زۆر بوو، بەڵام مخابن زۆربەی ئەو جوامێرانە بەبێ قەدری سەریان نایەوەو سەر دەنێنەوە، کە هیچ پێوەرێك نەماوە لە نێوان کەسانی جوامێرو بوودەڵەو ترسنوك، کە لە رۆژانی ڕەش و تەنگانەدا هەردوو کەسایەتییەکە نموونەیان زۆر بووە، واتا کەسانی ئازاو کەسانی ترسنوك...

## ئەرکی رێکخستن و بارەگای ڕەزگە:

هاوڕێ مەحمود حاجی فەقێ خدر داوای لێکردم لە (زەڵێ) سەردانی بارەگای (لق) بکەم، کە چووم جارێکی تر سەبارەت بە رەوشی رێکخستنەکان گفتوگۆمان کرد، هەر لەو سەفەرە بڕیارمان دا من و هاوڕێ ئەحمەد ئەبوبەکر سەردانێکی خوارەوە بکەین و رێکخستنەکان بەسەر بکەینەوە. لە(لق) هاوڕێ سەلیم پێی راگەیاندم، کە ئەرکی بەرپرسی سیاسی بارەگای(رەزگە) وەربگرم، هاوڕێ ئەحمەد ئەبوبەکریش بەرپرسی سیاسی بارەگایەکی (حزب) بوو لە ئاشقوڵگە... لەگەڵ هاوڕێ ئەحمەد دووقۆڵی لە (زەڵێ)وە گەڕاینەوە پشت ئاشان. بۆ رۆژی دواتر جەژنی نەورۆز بوو. لە بارەگای خۆمان لە پشت ئاشان ئاهەنگێکی خنجیلانەمان سازکرد، هاوڕێ محەمەد ڕەسوڵ سەرپەرشتی ئاهەنگەکەی دەکرد، لە ئاهەنگەکەدا کۆمەڵێك گۆرانی و سروود لەلایەن هاوڕێیانی عەرەب و کورد وتران، منیش بە گۆرانییەکی هونەرمەند ناسری رەزازی بەشداریم لە ئاهەنگەکەدا کرد...

## پیلانێکی سەرنەکەوتوو:

من و هاوڕێ ئەحمەد ئەبوبەکر بەرەو ناوەوە بەرێکەوتین، ئێوارەیەکی تاریك و لێڵ گەیشتینە گوندی (زورکان)، بۆ رۆژی دواتر پەیوەندیمان کرد بە هاوڕێ (سورە). شەوی ٢٢/٢٣ /١٩٨٢/٣ من و هاوڕێ سورەو هاوڕێ ئەحمەد ئەبوبەکر لە ماڵی هاوڕێ مەلای حاجی پیرۆت میوان بووین. باسی بارودۆخی سیاسی و رێکخستنەکانمان دەکرد، لەناکاو تەققەی سێ فیشەك

هات، له ژوورەوە دەرچووین دەنگێك دەهات چەكدارەكانی ئاراستەدەكرد، هاوڕێ سورە وتی ئەو دەنگە دەنگی (كانەبی)یە، كە ئامۆزای عەباس بایز بوو... جاشەكان تەقەیان لە ماڵێك دەكرد... ئەو رۆژە دوای ئێمە هاوڕێ حەسەن خدرو هاوڕێ موسا ڕەسوڵ هاتنەخوارەوە، لە رێگا خەڵكانێك چاویان پێ كەوتبوون كە یەكێك لەوانە سیخوڕێكی عەباس بایز دەبێ، عەباس بایزی ئاگاداردەكاتەوە. جاشەكان هاتبوون هاوڕێ موسا بەدیل بگرن یا بیانكوژن، عەباس بایز ڕقی لە هاوڕێ موسا دەبۆوە، چونكە حزبی شیوعی ژمارەیەك مەڕی عەباس و برایم ئاغای بردبوو، كە بە شوانكارەیان دابوو. برایم ئاغا پێی وابوو هاوڕێ موسا ڕەسوڵ دەستی هەبووە لە ئاشكراكردن و بردنی مەڕەكان... لە تۆڵەی ئەو مەڕانە عەباس بایز و برایم ئاغا تراكتوری ماڵی هاوڕێ مام ڕەسوڵ و هاوڕێ حەسەن خدریان برد، دواتر ڕقی ئەو مەڕانە هەر نەبڕایەوە، لە سنووری (بیتوێن) برایم ئاغا دوو كادری ئازاو تێكۆشەری حزبی شیوعی بە ناوەكانی سدیق عەبدوڵڵا و شۆڕش مەلا كەمال لە گوندی (بۆسكێن) گرت و رادەستی ڕژێمی كردنەوە، هەردووكیان لە بە ندیخانەی موسل لە سێدارە دران...

ئەو كاتە كە جاشەكان گەمارۆیی گوندی (زوركان)یان دابوو ئێمەو هاوڕێ حەسەن خدرو هاوڕێ حەمەئەمین عەبدوڵڵا هاوڕێ موسا هەریەكەمان لە ماڵێك بووین، كەسمان ئاگاداری جێگای ئەوی تر نەبووین، جاشەكان بە شێوەیەكی هەرەمەكی تەقەیان بەرەو ئەو ماڵە دەكرد، كە هاوڕێ موسا و هاوڕێ حەسەن خدری لێ بوو، پیلانەكە ئاشكرابوو، من و كاك ئەحمەد لە بن وشكە كەڵەكێك دانیشتبووین، چاوەدێری بارودۆخەكەمان دەكرد، ئاگاداربووین كە هاوڕێ حەسەن خدرو مام موسا و كادرێكی یەكێتی، ئەویش رێبوار بوو لە ماڵی باوكی هاوڕێ حەسەن خدر، هەر سێكیان لە گەمارۆی كەمینەكان دەربازبوون، چاومان لێ بوو چەند دەسترێژێكی گرداریان بەدوادا كرا، بەڵام كادرەكەی یەكێتی دەمانچەكەی لەبەر دەرگای ماڵی باوكی هاوڕێ حەسەن خدر لێ كەوتبوو، بەیانی زوو دەمانچەكەیان دۆزییەوە و ناردیانەوە بۆ شاخی و درایەوە كادرەكەی یەكێتی، هاوڕێ حەمەئەمین عەبدوڵڵاش بەسەر وشكە كەڵەكی ماڵی كاك بابەكرە گەورەدا خۆی فڕێداو ئەویش وەبەر دەسترێژی فیشەك درا، جێگای دڵخۆشی بوو هەموویان سەلامەت بوون، من و كاك ئەحمەد ماینەوە، دوای پاشەكشێی جاشەكان چووین بۆ سۆراغی هاوڕێ موسا و هاوڕێ حەمەئەمین، كە دڵنیابووین ئەوان دەرچوون، ئێمەش گەڕاینەوە. لەم پیلانەدا هاووڵاتییەك بریندابوو بە ناوی(حەمە جۆلا) و، دوو قۆرییە گیاش

سووتان. پێویستە بگوترێت یەکێك لە جاشەکان دۆست و لایەنگری خۆمان بوو، سێ فیشەکی ئەو دۆستە بوو کە پیلانەکەی ئاشکراکرد... ئەو ڕق و دوژمنایەتییەی جاشەکان هەموو سنوورێکیان بەزاند، تەنانەت ڕقیان لەو کەسایەتییە شۆڕشگێڕانەش دەبۆوە، کە خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتی بوون لە ناوچەکەدا، ئیتر دەکوژران یا شەوکوت دەکران...

## پێوی نییە شێتە:

ئێوارە بوو ڕۆژ خەریکبوو لە سوێی شاخی کێوەڕەش ئاوا بێ، ڕێکەوتی ١٩٨٢/٤/١ بوو، لە بەرزایی تیشە شاخی بن(تیشی)یەوە بە دووربین لە پێدەشتە جوان و خنجیلانەکەی دەوروبەری گردی قوببە و داوێن گوندی زورکان و سەر جۆگای سیفۆنم دەڕوانی، بۆ ئەوەی کەمینی جاشەکان دەست نیشان بکەم. مەگەر بە ڕێکەوت ئەگەرنا هەموو شەوێ کەمینی جاشەکانی برایم ئاغا و عەباس بایز و سەرۆك جاشەکانی تر، لە(ئۆردووگای بەستەستێن)ەوە بۆ دەروازەی دۆڵی ڕەسوڵ دەردەچوو، دەیان پێشمەرگەی تێکۆشەرو کاروانچی و ڕێبواری جۆراوجۆر لەو دەروازەیە شەهیدکراون. دەروازەی دۆڵی ڕەسوی گۆڕستانێکی لێیە بە ناوی **کێلی مەزنان،** ئەو گۆڕستانە ناوی خۆی بە خۆیەوە، چونکە کێلەکانی باڵای سێ مەتر بەرزن. وێدەچێ هەریەك لەو کێلە بەردانە لە تیشە شاخی دەوروبەر دروستکرابن، نازناوی مەزنیش نازناوی گەورە پیاوانە، کە دەشێ لەو جێگایە نێژرابن. دەگونجێ ڕۆژێك لە ڕۆژان پسپۆران لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو کێلانە بکەن...ئێوارە بوو نانی شێوانم لە گوندی زوورکان لەماڵی مام موسا خوارد. ناوبراو وتی شتێکت پێ بڵێم لێم تووڕەنابیت! وتم بۆچی تووڕەدەبم، وتی ڕاستییەکەی حەزناکەم بە ڕۆژ لێرە بمێنییەوە، چونکە خۆت دەزانی چەند ڕۆژێك لەمەوبەر کە ئێوە ئیخباری کرابوون، جاشەکانی برایم ئاغاو عەباس بایز چ کارێکیان بە گوندی زورکان کرد... وتم دڵنیابە نابمە گرانایی بۆ ئێوە...پێش کاتژمێر سێی شەو بەرەو گوندی زورکانی خوارەوە وەڕێکەوتم، گەیشتمە ناو گوندی زورکانی خوارێ، واتە ئەیوب ئاوا. ئەو ماڵانەی ئەوبەری وەرزە چۆمی زوورکان بە ناوی حاجی ئەیوبەوە کراوە، کە ریش سپی و پیاوماقووڵی گوندەکەیە... ماڵی مام خدری باوکی هاوڕێ (حەسەن خدر)یش لەو گوندە بوو. ویستم ئەو ڕۆژە لەوێ بمێنمەوە، حەمەدی کوڕی مام خدر و هاوسەرەکەی خوشکە (ئەستی) لەبەر بێلایە لەسەر کەپرۆکەیەك خەوتبوون. دەمویست بە ئەسپایی کاك حەمە لە خەو هەستێنم، کەچی

خوشکە (ئەستی) لە خەو هەستا، کە چاوی بە من کەوت چەکدارم و بەسەر سەرییەوە وەستاوم واقی وڕماو زریکاندی. دوای ئەوەی خۆم پێ ناساندن ئەوێم بەجێهێشت. لە گوندەکەی خۆمان واتە بەستەستێن، لەبەر ئاودێران نەمتوانی خۆم بگەیەنمە ماڵێ. لە گوندی (بەستەستێنی سەرێ)ش جووتیارەکان بەدرێژایی شەو خەریکی پاراوکردنی باخچەو پەڵە توتن و دیراوی تەماتە بوون، بۆ هەر جێگایەك دەڕۆیشتم تووشی ئاودێرێکی گوندی خۆمان دەبووم. ئەو شەوە نەمتوانی بگەمەوە ماڵی خۆمان. ناچاربووم ڕووم کردە خڕی کفری، خڕی کفری کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی گوندی (بەستەستێنی سەرێ)، لە کۆتایی جۆگای سیفۆن(خڕی کفری) تەواودەبێ، لەو شوێنە ژمارەیەك ئاوەڕۆی سندوقی دروستکراون، کە خەڵکی گوندی بەستەستێنی سەرێ بەو ئاوەڕۆیانە دەڵێن(کونە مەنفەس). چوومە ناو یەکێك لەو کونە(مەنفەس)ـانە، تاقم و چەکەکەم خستە ژێر سەرمەوە و خەوم لێکەوت، کاتێك لەخەوهەڵسام و سەیری کاتژمێرەکەی دەستم کرد کاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆ بوو، بە نانە وشکەی ناو کۆڵە پشتەکەم و مەتارە ئاوەکەی تەنیشتم ژەمی نیوەڕۆم خوارد، ئینجا جارێکی تر خەوتمەوە، بەهۆی فیکە فیکی شوانان و دەنگی خۆشی زەنگوڵی نێری پێش مێگەلە مەڕ وەخەبەر هاتم. بینیم شوانەکان لە دەوری کونە مەنفەسەکە کۆبوونەتەوە، سەگێك لە سەگی شوانەکان بۆنی بە کونەکەوە دەکاو دەوەڕی، یەکێك لەشوانەکان وتی ڕەنگە ڕێوی بێ، بوو بە هات و بگرەی شوانەکان دەی...دەی...دەی گۆڵە شین بە قوربانت بم دەری پەڕێنە، سەگەکانی تریش کۆبوونەوە. ئەوسەرو ئەوسەری کونەکەیان گرتبوو، شوانێکیش خۆی کرد بە کونەکەدا، هیچ چارەم نەما تاقم و چەکم بەست و بەرەو رووی دەرەوە ڕۆیشتم، لە دەرگای کونەکە نزیکبوومەوە، شوانەکە پاشەوپاش گەڕایەوە دەرەوەی کونەکە و هاواری کرد وتی ڕێوی نییە شێتە!! منیش چوومەدەرەوە و سەیری شوانەکانم کرد هەموویان مێردمنداڵ بوون، لێم پرسین بۆچی وتتان ئەوە ڕێوییە لە ناو کونەکەدا، وتیان چەندان جار ڕێوی لەم کونە(مەنفەسانە)دا بوون و سەگەکان دەریان پەڕاندوون. وتم ئێمەش جۆرێکین لەو ڕێویانە، شوانەکان پێکەنین... شوانەکان خەڵکی گوندی (قەڵاوێ) بوون، مێردمنداڵێکیان وتی: کوڕی کاك (موسا)م، باوکی کوڕەم دەناسی. دوا ئەوەی نانێکی شوانانەمان بە ماستی مەڕان خوارد، ئەوێم بەجێهێشت. چووم بۆ ناو پەڵە گەنمی ماڵی هاوڕێ حەسەن خدر، کە ڕەقمی مڵکایەتی باوکیان بوو لەسەر جۆگای کۆنکرێتی، واتە پرۆژەی ئاودێری جۆگای سیفون. شەو چوومە گوندی بەستەستێنی سەرێ بۆ ماڵی خۆمان. ڕۆژی دواتر

لە ڕێگای مام (برایم)ەوە هاوڕێ (سورە)م ئاگادارکردەوە، ئەویش هات بۆ لام، بارودۆخەکەمان شەنوکەوکرد. هاوڕێ (سورە) ڕای وابوو لە یادی کارەساتی ١٩٧٤/٤/٢٤ شاری قەڵادزێ ئەگەری (ڕاپەڕین) هەیە. پێم وت چۆن دەزانرێت خەڵك ڕادەپەڕێت. وتی ئەمنەکان لەو بۆنەیە دەترسێن، سوپا لە ئامادەباشی دایە...

## ڕاپەڕینی ٤/٢٤/ ١٩٨٢ لە قەڵادزێ :

لە ڕۆژی ١٩٧٤/٤/٢٤ شاری قەڵادزێ بە موشەك و ڕۆکێتی فرۆکە جەنگییەکانی ڕژێمی شۆڤینی(بەعس) بوردومانکرا، زیاتر لە(٣٠٠) هاووڵاتی لەو شارە شەهید و برینداربوون، خێزانی وا هەبوو بە تەواوی لەناوچووبوون، کارەساتی شاری قەڵادزێ لەو سەردەمەدا ڕووداوێکی خوێناوی کەم وێنە بوو، شۆڕشی ئەیلول بە ڕابەرایەتی بارزانی نەمر ئەو ڕووداوەی وەك ڕۆژی ماتەمی نەتەوەیی لە مێژوویی شۆڕشی ئەیلولدا تۆمارکرد... ڕژێم زۆر ڕقی لە شاری قەڵادزێ بوو، شاری قەڵادزێ و دەڤەری پشدەر بە گشتی، هەمیشە مەڵبەندی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی گەلی کوردستان بوون. لە سەرەتای هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی چەکداری و کۆتایی هاتنی گەمەی مفاوەزات لە سەرەتای ساڵی١٩٧٤ دەڤەری پشدەر و قەڵادزێ بوو بە مەکۆی داڵدەدانی فراوانترین جەماوەری شارەکانی تری کوردستان. گواستنەوەی بەشێك لە قوتابیانی زانکۆی سلێمانی بۆ قەڵادزێ ڕژێمی شێتگیرکردبوو. ڕژێم چاوی بە دەڤەری پشدەر هەڵنەدەهات، ئەو دەڤەرە لە شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێدا لە فیداکاری و قوربانیداندا لە دوای گەرمیان دێت. وەك نەریتێکی ساڵانە خەڵکی قەڵادزێ لە ڕۆژی ٤/٢٤/ یادی شەهیدەکانیان دەکەنەوە و سەردانی گۆڕستانی قەڵادزێ دەکەن. ئەو ڕۆژە خەڵکی شار خۆیان ئامادەکردبوو بۆ دیداری گڵکۆی ئازیزانیان بڕۆن بۆ گۆڕستانی شار، دامودەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات هێزێکی زۆر گەورەیان لە دەبابەو زرێپۆش و چەکی جۆراوجۆر مۆڵدابوو. ئەوانەی لە ناو گۆڕستان بوون لە دەیان کەسەوە بوون بە سەدان، لە کاتی گەڕانەوەیان بەرەو شار بوو بە ڕێپێوان و گوتنەوەی دروشمی شۆڕشگێڕی، وەکو: تۆپ و تانك و تەیارە، ناترسێنێ ئەم شارە، بژی هێزی پێشمەرگە دوژمن نزیکی مەرگە، بژی گەل، حوکمڕانی گەل بۆ گەل. وەکو پیشەی هەمیشەیی ڕژێم دەستڕێژی گوللەیان لە ڕێپێوانەکە کرد، ژمارەیەك لە خەڵکی چاونەترسی ئەم شارە شەهید و بریندارکران. دایکە ئامینە سوور و مامۆستا سنەوبەر شەهیدبوون چەند

هاووڵاتییەکی تریش بریندارکران، ژمارەیەکیش لە گەنجانی شار لەلایەن دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێمەوە زیندانی کران... جەماوەری لایەنە سیاسییەکانی کوردستان و دەزگای ڕاگەیاندنی شاخ، بەتایبەتی رادیۆکان ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبوو لە هاندان و ئاراستەکردنی جەماوەر لە شارەکە... هاوڕێ مستەفا غەفور و هاوڕێ ئازاد کوڕی هاوڕێ مەحمود حاجی فەقێ خدر شەوێك پێش ڕاپەڕین لە ناو شاری قەڵادزێ بوون، لە ناو شار پشتیوانی خۆیان بۆ لیژنەی سەرپەرشتی ڕاپەڕینەکە دەربڕی، کە کۆمەڵێك لاوی خوێن گەرمی ڕێکخستنەکانی یەکێتی و سۆسیالیست و شیوعی و پارتی بوون. ئەگەرچی ڕاپەڕینەکە خەڵتانی خوێن کرا، بەڵام بەستەڵەکی ترس و تۆقاندن شکا، ڕژێم لە بەرامبەر ئازایەتی و جوامێری خەڵکی شارەکە هەیبەتی نەما...ڕۆژی ١٩٨٢/٤/٢٥ من و هاوڕێ ئەحمەد ئەبوبەکر لە بارەگای ڕەزگەوە بەرەو خوارەوە چووین، لە ئۆردووگای بەستەستێن و دەوروبەری ڕێکخستنەکانمان بەسەرکردنەوە بۆ پشتگیری ڕاپەڕینەکەی شاری (قەڵادزێ) لەگەڵ هاوڕێ سوورە کۆبووینەوە، بڕیاردرا پەیوەندی بکرێ بە لایەنەکانی تر، بۆ ئەو مەبەستەش هاوڕێ (سورە) ئاڵقەی پەیوەندی بوو لەگەڵ لایەنەکان. ڕۆژی ١٩٨٢/٤/٢٧ جەماوەر لە ئۆردووگای بەستەستێن ڕژانە سەر شەقامی گشتی قەڵادزێ — ڕانیە شەقامەکەیان کۆنترۆڵ کرد، جەماوەرێکی زۆر کۆبوونەوە و دەستیان کرد بە دروشم گوتنەوە. هاوڕێیەکمان هەبوو بە ناوی (سەلام) کۆیی، وەپێش جەماورەکە کەوتبوو، پڕ بە گەروی هاواری دەکرد: **ئەم دینارە بە وردە سەدام قۆندەرەی کوردە**. من و هاوڕێ ئەحمەد لە ژوورەوە بووین لە ئۆردووگای بەستەستێن پەیوەندیمان بە هاوڕێیانی ناو خۆپێشاندەرانەوە دەکرد، هەوڵمان دا دروشم و هیتافی هاوڕێ سەلام بگۆڕین بە دروشمی شۆڕشگێڕانەی تر، بەڵام سوودی نەبوو، سەلام هەر لەسەر هیتافەکانی خۆی بەردەوام بوو و دەیگوت: خەڵك ئاوها باشتر گەرم دادێت...کوێخا خدری گوندی گردهێستر تاکە ئامر مەفرەزەی جاشی ناو ئۆردووگای بەستەستێن بوو، کە هیچ دەسەڵاتی نەبوو. ڕۆژی پێشتر واتا ١٩٨٤/٤/٢٦ جەماوەری شۆڕشگێڕو ڕێکخستنی لایەنە سیاسییەکان لە ناو شارۆچکەی سەنگەسەر بۆ پشتگیری ڕاپەڕینەکەی شاری (قەڵادزێ)خۆپێشاندانیان سازکردبوو، بەڵام جاشەکانی عەباس بایزو برایم ئاغا بە توندی ڕووبەڕووی جەماوەرەکە بوونەوە، ئازاری کەسایەتی کۆمەڵایەتی و ناسراوی شارەکە کاك (سەید حەسەن)یان دا. کە زانیمان لە کاك سەید حەسەن دراوە پەیوەندیمان بە

سەرکردایەتی(حزب)ەوە کرد، حزب بڕیاری دا پێشوازی لە کاك سەید بکات و ئامادەیە خاڵە سەید ڕەوانەی دەرەوەی کوردستان بکات، من و کاك ئەحمەد ئەبوبەکر بەتایبەتی چووین بۆ خزمەت کاك سەید و پێمان ڕاگەیاند لە خزمەتیدا دەبین تاکو دەگاتە لای سەرکردایەتی حزب... بەڵام خاڵە سەید ڕازی نەبوو، کە ڕازی نەبوو لەگەڵمان بێت، پێمان وت بە فەرمانی ڕژێم جاشەکان دەتکوژن... وتی دەزانم دەکوژرێم، بەڵام ئێرە جێ ناهێڵێم... بەداخەوە شەوی ٢٨/٢٧ - ١٩٨٢/٥ لەناو ماڵی خۆیدا شەهیدکرا، ژنێکی گەنج و چەند جگەرگۆشەی وردیلەی لە دوای خۆی بەجێهێشت... کە کاك سەید شەهیدبوو، هاوڕێ هیوا مەغدید لەڕەزگە بوو بە پێشمەرگە، لەو ڕۆژەوە من و هیوا پێشمەرگە و برا بووین، وەك ئەندامی خێزانێك وا بووین، هیوا کوڕێکی زۆر لەبەر دڵان بوو، گەنجێکی ڕوح سووك تاقانەی خێزانی خۆیان بوو، تازە لە پەیمانگای مامۆستایان خوێندنی تەواوکردبوو، دامەزرابوو بە مامۆستای سەرەتایی. من و کاك ئەحمەد خۆمان لەگەڵ ماندووکرد بگەڕێتەوە بۆ ناو شار خزمەتی پیرە دایك و باوکی بکات، کەچی بێ سوود بوو، چونکە شەهیدبوونی خاڵە سەید حەسەن زۆری کاریگەری لەسەر دەروونی هیوا دانابوو، ڕۆژانە دەیان پێشنیاری دەکرد بۆ ئەنجامدانی چالاکی خۆکوژی لە تۆڵەی خاڵە سەید حەسەن. ڕۆژانە بەیەکەوە بووین زۆر جار، کە سەفەرم دەکرد بۆ پشت ئاشان یا ناوزەنگ و نۆکان لەبەر خۆشەویستی من دەهات...

## ڕاپەڕینی شاری ڕانیە:

بۆ پشگیری خەڵکی ڕاپەڕیوی شاری قەڵادزێ لە ڕۆژی ١٩٨٢/٥/٢ شاری ڕانیە لە دامودەزگاکانی ڕژێم ڕاپەڕین، ڕاپەڕینی شاری ڕانیەش وەکو ڕاپەڕینەکانی تر لەلایەن ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناو شار سەرپەرشتی دەکرا، هەموو لایەنە سیاسییەکانی کوردستان بەشداربوون، هاوڕێیانی ئێمە بەتایبەتی هاوڕێ عەبدوڵڵا ڕەش ڕۆڵێکی کاریگەرو چالاکی تێدا گێڕا، هەر لەو ڕاپەڕینەش بە دەستی ئەمنەکان بریندارکرا. هاوڕێ عەبدوڵڵا پەیوەندی کرد بە هاوڕێیانی شاخەوە لەوێ تیمارکرا... دروشمی ڕاپەڕینەکە بریتی بوو لە: "الجنود اخواننا الفاشیست اعدائنا، بژی گەل حوکمڕانی گەل بۆ گەل...هتد".

لە ڕاپەڕینەکەی شاری ڕانیە ئەو تێکۆشەرانەی ڕێکخستنەکانی ناوشار شەهیدبوون: ١- عەبدوڵڵا پیرۆت، ئەندامی حزبی شیوعی عێراقی ٢- ئەبوبەکر محەمەد حەسەن، ئەندامی

حزبی شیوعی عێراقی ٣- ئیسماعیل مام کاك، ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان (٩) کەسیش بریندابوون لەوانە: ١- سابیر مەحمود ٢- قادر حەمە سدیق ٣- دەرسیم عەبدوڵڵا ٤- سەیران کاکەمین ٥- هاوڕێ عەبدوڵلا رەش...

لە دوای راپەڕینی قەڵادزێ و رانیە و ئۆردووگاکانی... دەزگاکانی ڕژێم وەکو ئاگریان لێهاتبوو، هەر کەسێك سەربەخۆیان نەبا بە دوژمنیان دەزانی، رۆژانە بە دەیان تێکۆشەریان دەگرت و راوەدوودەنا...دەیان کادری رێکخستنە نهێنییەکان پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە کرد. هاوڕێ (سوورە) کادرێکی دیارو ناسراو بوو لە سەردەمی راپەڕینەکان ئاشکرابوو، ژیانی ئاسایی تێکچوو وەکو پێشمەرگە قاچاخ بوو، دەزگاکانی ڕژێم سۆراغی هاوڕێ (سورە)یان دەکرد، هاوڕێ ناچاربوو خۆی و خێزان و منداڵەکانی بە نیمچە قاچاخی لە گوندو ئۆردووگاکانی دەڤەری پشدەر بە نهێنی جێگۆڕکی بە شوێنی مانەوەی بکات ...

## شەنەی سەر کایە:

لە دوای راپەڕینەکانی دەڤەری پشدەر دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات زۆر توندوتیژ بوون، چاودێری کادرەکانی شاخ و جموجۆڵی هێزی پێشمەرگەیان دەکرد، ناچاربووین خۆمان لەو ماڵانەی ناسراو بوون و نزیکبوون بپارێزین. حەزم دەکرد لە شوێنی وا خۆم پەنابدەم کەس هەستی پێ نەکات. ماڵی کاك خدر سەعید و برایم سەعید دوو برای دراوسێمان بوون، دراوسێیەکی زۆر باش و ئەمین و دڵسۆز بوون، (٤٠) ساڵە دراوسێین ساڵ بۆ ساڵ دراوسێتیمان خۆشتر دەبوو. ساڵانی پەنجاکان لە گوندی (خڕە جوە)ی نزیك (دەربەند) هەر دراوسێ بووین، زۆر جار رێگای هاتوچۆیی ماڵی خۆمان نەدەڕەخسا، میوانی ماڵی کاك خدر دەبووم، کاك خدرو خوشکە (گوڵێ)ی خێزانی وەکو مام و ئامۆژنم وابوون، هەندێك لە منداڵەکانیان من ناوم لێ ناون...کاك خدر خۆیشی لە شۆڕشی ئەیلولدا کادرێکی پارتی و موختاری گوندی بەستەستێن بوو، ئاوارەی ئێران بوو، دواتر لە رێگای خوارووی عێراقەوە گەڕایەوە، لە بەستەستێن جێگیربوو. ئیستاش هەر لە گوندە خنجیلانەکەی بەستەستێن نیشتەجێیە...

لە شەوی ١٩٨٢/٨/٣١ لای بەیانی بوو ویستم بچمەوە ماڵی خۆمان، زۆر فکری خۆم هێناو برد ئەقلم نەیبڕی لە دەرگای خۆمان بدەم و لەوێ بمێنمەوە، بە دەوری کادێنی خۆمان و ماڵی کاك برایمی دراوسێماندا سوڕامەوە، بینیم کادێنی ماڵی کاك برایم باندڕکراوە بۆ

تێکردنی(کا). جاران (کا) بە کاکێش دەکێشرا، کاکێش یا ڕەشکە وەکو تۆڕی شەداو وابوو لە شێوەی هێلکە یا شەڵتەی تەلیس دەچوو لە مووی بزن دروستدەکرا... لەسەر جۆخینەوە (کا)یەکە بە گوێدرێژو وڵاخی تر دەگوازرایەوە بۆ ناو(کادێن)... ئەو رۆژە لەسەر قەبارەی لۆدەکای ناو کادێن خەوتم. نووستن لەسەر لۆدەکا ئەگەر بۆنی مشکی تۆپیو لێگەڕێت خەوی ناخۆش نییە. (کا) وەکو ئەسفنج وایە، نەرم و خۆشە... خەوم لێ کەوتبوو، لەپڕ ئازارێکم لە پەنجەکانی پێم پێگەیشت، بەخەبەر هاتم، کە گوێم هەڵخست (پوور ئامین)ی مام سەعیدی هەر دەیگوت بە بابی خۆمت دەگێم، جوجکە مریشکت پێ نەهێشتین! لەسەر کایەش دەخەوی؟ وەڵلاّ لێم وەردەگری!، شەنە دارێکی لەبن پێم کوتا، بەوەشەوە نەوەستا تەڕکە دارێکی هێنا تا دارکاریم بکات. ناچاربووم خۆم ئاشکراکرد و وتم پوور ئامین، پوور ئامین ئەوە منم محەمەد...پوور ئامین حەپەسا و وتی ئەیرۆ محەمەدۆکە ئەوە لێرەچی دەکەیت؟ وەرە بابچینە ژووری... ئایش دەزانیٚ تۆ لێرەیت؟ گوتم پوور ئامین دایکم نازانیٚ، حەزناکەم بە هیچ جۆرێك قسەی لەلا بکەیت، پێم وت ناتوانم بێمە ژوورەوە، بەڵام ئەگەر هەندێك ئاوی ساردو خواردنێکم بۆ بێنی سوپاست دەکەم، پوور ئامین وتی وەی بەسەر هەردوو چاوان. ژەمی نیوەڕۆم بە دەستی پوور ئامین خوارد. هەزار ڕەحەمەت لە گۆڕی بێت هەتاکو لە ژیاندا بوو نەم بیستەوە قسەی بۆ کەس کردبیٚ...

لە سەفەرێکی تریشدا من و هاوڕیٚ ئەحمەد ئەبوبەکر چووین بۆ ئۆردووگای بەستەستێن میوانی مام حەسەن حەمەدی بوزوان بووین، کە خەڵکی گوندی ڕەزگەیە لە ئۆردووگای بەستەستێن دراوسێمان بوو، بنەماڵەیەکی زۆر رێکوپێك بوون، دواتر بووین بە خزم و ژن و ژنخوازی لە نێوانماندا دروستبوو، خوشکێکم بە کاك ڕەسوڵی کوڕی مام حەسەن برا... مام حەسەن وتی یەك ژوورمان هەیە ئەگەر بتوانن تێیدا بژین زۆرمان پێ خۆش دەبیٚ لێرە بن. وتم بۆچی ناتوانین تێیدا بژین؟ وتی: پار (کا)ی تێکرابوو ڕەنگە مشکی زۆری تێدا تۆپی بێت. پێیم گوت: مام حەسەن ئێمە لەگەڵ کادێن و مشکی تۆپیودا ڕاهاتوین و بە لامانەوە ئاساییە. ئەو رۆژە(١٤) مشکی تۆپیومان لە ژوورەکەدا فڕیٚ دا...

راپەڕینەکەی ١٩٨٢/٤/٢٤ زۆر ئۆردووگا و شار و شارۆچکەی تری گرتەوە. لە دەڤەری(پشدەر، بیتوێن) دەزگاکانی ڕژێم متمانەیان بە کرێگرتەکانی ناوچەکە بە جاش و مەفرەزە تایبەتەکانیشەوە، نەمابوو. ئیستخبارات لە دەڤەرەکەدا حوکمڕانی دەکرد،

چواردەوری ئۆردووگای بەستەستێن بە چاڵێکی قووڵی (٣-٤)م هەڵکەندرابوو. لە گۆشەکانی ئەو چاڵەشدا ڕەبیەی سەربازی دانرابوون، سەرەڕای چەپەری شەوانەی کەمینی جاشەکان و ترس و تۆقاندنی ڕۆژانەی دەزگاکانی ڕژێم، بەڵام هەر نەیانتوانی تایبەتمەندی دەڤەرەکە بگۆڕن، ئەو ئۆردووگایە وەك ناوچەیەکی یاخی بوو لە ڕژێم، مایەوە.

## خەباتی نهێنی و قۆناغێکی نوێ:

لە دوای راپەڕینەکانی ساڵی ١٩٨٢ی دەڤەری پشدەر، زۆربەی ئەو کادرانەی سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانیان دەکرد، لە لایەن ئەمن و ئیستخبارات دەست نیشان کرابوون، دەیان سیخوڕو خۆفرۆشیان تەرخانکردبوو چاودێری تێکۆشەرانی ڕێکخستنەکان بکەن. هاوڕێ (سوورە) یەکێك بوو لەو کادرانەی، کە سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی سنووری شارۆچکەی سەنگەسەرو بەستەستێن، تووەسووران و دێهاتەکانی دەوروبەری دەکرد. ناوبراو خۆی و خێزانەکەی وەکو پێشمەرگەی شاخ قاچاخ بوون، بەڵام بەهۆی تایبەتمەندیی دەڤەرەکەو دیاردەی چەکداری دەکرا لە دەڤەری پشدەردا بمێنێتەوە... لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکی ڕێکخستن، من و هاوڕێ سوورە بەردەوام بەیەکەوە بووین، زۆرجار بە ڕۆژ دەچووین بۆ دیداری هاوڕێیان. دەچووین بۆ هەرەوەزی تووتن چەقاندن، بەتایبەتیش لەو جێگایانەی کە منیان نەدەناسی. چەندان جار بۆ ئەوەی لە جێگایەکەوە بڕۆین بۆ جێگایەکی تر خۆمان شەل کردووە، یا بە بەرگی تووتنەوانی و بێڵێکی ئاودێرییەوە ڕۆیشتوین. جارێك بەندەو هاوڕێ سوورە لەسەر جۆگای کۆنکرێتی تووشی ئەمنەکان بووین، هاوڕێ (سوورە) وتی ئەوانە ئەمنی مونەزەمەی سەنگەسەرن چی بکەین؟ پێم وت هیچ خۆت تێکمەدە هەردووکمان دەمانچەمان پێیە، ئەوانیش هەر دەمانچەیان پێیە، هەر لێمان بپرسن وەبەر فیشەکی دەمانچەیان دەدەین، بە لایاندا تێکشاین هیچیان نەگوت، ئێمەش هیچمان نەکرد ئەگەرچی کوشتنیان ئاسان بوو، بەڵام خۆمان بۆ ئەرکێکی تر ئامادەکردبوو... من و هاوڕێ سوورە وەکو دوو برای خێزانێك وابووین، خۆشەویستی نێوان من و هاوڕێ سوورەو هاوڕێیانی تر لە ناو ڕێکخستنەکاندا لە ئەندامانی یەك خێزان دەچوو، یەکترمان خۆشدەویست، هەر ئەو دڵسۆزی و خۆشەویستییەش بوو متماناو ورەو ئیرادەی بە هەمووومان دەبەخشی. لە ڕووخانی (ڕژێم) بە هەزاران مەلەفی هەمەجۆر ئاشکرابوو، دەرکەوت بە سەدان کەس لە ناو ریزەکانی ڕێکخستنەکان و سەرکردەی ناوداری لایەنەکانی تر لە ژێرەوە

پەیوەندییان بە دەزگاکانی ئەمن و ئیستخباراتەوە کردووە، بەڵام لە ناو ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی لە سنووری پشدەردا، کەسێکی ئەوتۆمان بەدینەکرد کە ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبێ و لە ژێرەوە کاری کردبێ بۆ دەزگاکانی(ڕژێم). ئەگەر بە ویژدانەوە مێژوو بنووسرێتەوە، ئەگەر بایەخی ئەو ڕۆژگارانە کاڵ نەبێتەوە و هەڵوێستەیەك لەسەر خەباتی ڕۆژانی ڕەش بکرێت، دەبێ پەیکەری قارەمانەتی بۆ ئەو تێکۆشەرانە دروست بکرێت، کە لە ڕۆژانی ڕەشدا فیداکاریان کردووە بۆ گەلەکەیان. بەڵام مخابن لە دوای ڕاپەڕینەوە ساڵ بە ساڵ ئەو ڕۆژگارانە بەرەو کاڵبوونەوە دەڕۆن، تەنانەت جیاوازیش ناکرێت لە نێوان خۆفرۆش و خەباتکارەکانی ئەو ڕۆژگارانەی بنیاتنەری ئەزموونی کوردستان بوون...

## خێزان و پێشمەرگایەتی:

یەکێك لە گرفتە دەروونییەکانی من لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا خێزان بووە. بەدەیان شەو کاتژمێرەکانی شەوانی حەراسەت و تەنانەت کاتی بە ڕێگادا ڕۆیشتن و کەمین و ئەنجامدانی چالاکی عەسکەریش هەر بیرم لە لای دایکم و خێزانم بووە، دایکم زۆر خەمی منی بووەو هەیە، خێزانم کە هەر چاوەڕوان بوو ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە خاوەنی ماڵی خۆی و وەچە بنێتەوە وەکو خێزانێکی ئاسایی ژیانێکی ئاسوودە بەسەربەرین. هەر چەند بیرم دەکردەوە، پێشمەرگایەتی و خێزان دروستکردن یەکیان نەدەگرتەوە. پێشمەرگە مانای پێش مەرگ کەوتن و مردن، واتا مەرگی پێشوەختە. خێزان لە بارودۆخێکی ئاساییدا پێکدەهێنرێت، هەر لە خۆمەوە دەمگوت ئەدی ئەوە نییە فلان هاوڕێیە خێزانی لەگەڵدا دەژی، خۆ ئێمە هیچمان لە ئەوان کەمتر نییە، هەروا بوو لە بارەگای ڕەزگە هاوڕێ حوسێن و مام پیرۆت و خاڵ هۆمەرو هاوڕێ بابەکرو عەلی گۆران ماڵیان پێکهێنا بوو و خێزانیان لەگەڵ دەژیا،... دواتر بڕیارم دا کە خێزانم بهێنم. خێوەتێکی بچکۆلەم کڕی، دایکم یەتاخێکی پێشمەرگایەتی و بارێك پێداویستی تری لەگەڵ خێزانمدا بۆ ناردبووین، ماڵێکی پێشمەرگانەمان پێکەوەنا...

**ڕەزگە:**

خێوەتمان لەسەر لێواری چۆمەکە هەڵدا. وەرزێکی خۆش و بەهارێکی سەوزو جوان و باراناوی بوو، دیمەنی زنجیرە شاخی **پیری** و بەرزایی چیای **پانەسەر** لە کیژێکی بەژن و باڵا جوان دەچوو. ئەو شەوە نم نم باران دەباری. خەوی ژێرچادر و ڕەشماڵ زۆر خۆشە بەتایبەتی کە باران ببارێت. من و دایکی هۆنیا لە خەو دابووین هۆنیای کچمان تازە خەریکبوو گاگۆڵکەی دەکرد. لە نێوان من و دایکیدا خەوتبوو. نەمانزانی لە نێوانمان هاتۆتەدەرێ بە جۆگەلەیەکدا پەڕیوەتەوە و لە ژێر لێزمەی باران ڕۆیشتووە بۆ ماڵی هاوڕێ عەبدولڕەحمان خدر، کە ماڵیان لە خوار ماڵی ئێمە بوو. بەری بەیانی ئایشە خانی خێزانی عەبدولڕەحمان کە لە ماڵ دێتە دەری (هۆنیا) دەبینێ. لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە، کە سەیری خێوەتەکەمان کرد بینیمان داخراوە و هیچ کەلێنێکی تێدانییە، بەڵام هۆنیا لە ژێر داوێنی خێوەتەکەوە دەرچوو بوو، لەو شەوە بەولاوە نەماندەوێرا (هۆنیا) لە لانکە دەربهێنین... منداڵێکی وریابوو، ئاقلی لە پێش جەستەیدا گەشەی کردبوو... ئەگەرچی ژیانی پێشمەرگایەتی ژیانێکی سەخت و دژواربوو، بەڵام بۆ پێشمەرگایەتی و خەباتی چەکداری زۆر پێویست بوو ژن و منداڵەکانیش وەکو ئێمە پێشمەرگە بن، پێمان وابوو ژیان هەتا سادەتر بێت خۆشترە. هەفتانە مامم دەهات بۆ لامان کە دەهات بارێکی ئەرزاق لە کەرە بۆز باردەکردو دەیهێنا بۆمان. دایکم لێمان خافل نەبوو. ڕۆژێك من و هاوڕێ هیوا مەغدید بە یەکەوە چووین بۆ سەر گۆڕستانی ڕەزگە، کە لە باکووری بارەگای حزب بوو، کاردووییێکی سەوز و جوان لەسەر گۆڕستانەکە هەبوو، ئارەزووم لێ بوو بیهێنینەوە لێی بنێین، بەڵام دەمزانی خیاڵی خێزانم رازی نابێت، چونکە خیاڵ پێی وابوو (کاردووی سەر گۆڕستان حەرامە)، بە هیوام گوت کاردووەکە دەبەینەوە بەڵام تۆ ڕاستییەکە بە خیاڵێ مەڵێ! وتی باشە، کە کاردووەکەمان بردەوە، خیاڵ وتی ئەو کاردووە جوانە هی کوێیە؟ وتم لە شاخی کردوومانە. هیوا پێکەنی کە هیوا پێکەنی خیاڵ تێگەیشت... هەرچەند هەوڵمان دا کاردووەکەی لێ نەنا...

زستانی ساڵی ١٩٨٢-١٩٨٣ زستانێکی زۆر خۆش و بەفراوی بوو، سۆبەیەکی بچکۆلەم هەبوو لە ژوورە بچکۆلەکەم هەموو ئێوارەیەك بیورم هەڵدەگرت و دەڕۆیشتم بەرەو دارستانی سەرووی(بارەگا) لە پیرەدار بەڕوویێك بەسەردەکەوتم سەرو گوێلاکیم دادەپاچی و بەشی شەوو ڕۆژێك دارم دەهێنایەوە. لەگەڵ دراوسێکان بەو جۆرە زستانەکەمان بەڕێکرد. هاوڕێ (خدر

عەزیز)کە بە نازناوی (شۆڕش) ناوی دەهێنرا، کوڕێکی نەرم و هێمن بوو، منداڵێکیان هەبوو بە ناوی هێرش، خێزانەکەی ناوی خوشکە ئەستی بوو، دراوسێیەکی ترمان هەبوو ماڵی کاك(حەمەدەمین تورکە) بوو، کە پێشمەرگەیەکی پارتییە وەکو ماڵی هاوڕێیان هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرا، بە هاوڕێیەکی خۆمان دەزانی و لە دەستدرێژی یەکێتی دەمانپاراست. ماڵی مام ڕەسوڵ کاك ئەحمەدی (بەستیٚ)یش لە ڕەزگە بوون، زۆر ڕێزمان دەگرت، مام ڕەسوڵ کەسایەتی ناوچەکە و لایەنگری(پارتی) بوو. یەکێتی چارەیان نەدەویست، بەڵام بەهۆی حزبی شیوعییەوە هیچیان پیٚ نەدەگوت.

## ڕێکەوتننامەی شوبات:

یەکێتی نیشتمانی کوردستان و حزبی شیوعی عێراقی پەیوەندییان زۆر ساردو سڕ بوو، یەکێتی دەیزانی حزبی شیوعی بۆ یەکێتی دەستەمۆ نابێت، پێی وابوو حزبی شیوعی لاقی لە بەرەکە بردۆتەدەرەوە، هەر بۆیە بیریان لە داڕشتنی پیلانێکی نویٚ دەکردەوە تا (ح.ش.ع) لە مەیدانەکەدا سڕبکەن. بۆ ئەو مەبەستەش مام جەلال بە ڕۆژێکی زۆر ساردو باراناوی سەردانی بارەگای (م.س)ی حزبی شیوعی کرد، کە بەشێکی هێشتا لە(نۆکان) مابوو. مام جەلال بەسەر کاریتە دارێکی درێژدا پەڕییەوە، کە لە جیاتی پردی (نۆکان) لەسەر رووبارەکە کرا بوو بەپرد. لە ١٩٨٢/٢/٦ ڕێکەوتننامەیەکی دووقۆڵی لە نێوان یەکێتی و حزبی شیوعی واژووکرا بە ئیمزای هاوڕیٚ عەزیز محەمەد و مام جەلال. لە ڕێکەوتننامەکەدا هاتبوو، کە یەکێتی لە سنووری ژێر دەسەڵاتی ناوچە ئازادکراوەکاندا، حزبی شیوعی بەشداردەکات لە داهاتی گومرگ. دەستەواژەی قووڵ و بنچینەیی بۆ باشترکردنی پەیوەندیی نێوانیان بەکارهاتبوو. بەڵام لەڕاستیدا بەیاننامەکە بۆ فریودان بوو، ئەگەرنا هەموو لایەك دەیانزانی یەکێتی پابەندنابێت بە ناوەرۆکی بەیاننامەکە. ئەو بەیاننامەیە تاڕادەیەك ئامانجی خۆی پێکا، چونکە سەرکردایەتی حزبی شیوعی لە بەرامبەر کارەساتی پشت ئاشان و قرناقاودا خافڵگیرکرد. بەڵام یەکێتی لەو کاتەدا کە ڕێکەوتننامەکەی ئیمزادەکرد هێزەکانی کۆدەکردەوە تا پەلاماری سەرکردایەتی(ح.ش.ع) بدات. لەو نامەیەدا کە (نەوشیروان مستەفا) کە بۆ (سەید کەریم)ی بەرپرسی مەڵبەندی(٣) یەکێتی ناردبوو، بە ئاشکرا ئامانجی پیلانەکەیان دەردەخات، نامەی(نەوشیروان) کە بۆ سەید کەریمی ناردبوو لە کاتی هێرشی (جود) بۆ مەڵبەندی سیٚ لە

ناو جانتای سەید کەریمدا گیرابوو، فۆتۆکۆپی نامەکە بڵاوکرایەوە... لە کۆتایی مانگی ئازاری ١٩٨٣ دا کێشەی نێوان لایەنەکانی(جود) و یەکێتی بەرەو ئاڵۆزی دەڕۆیشت. بەیاننامەی ٦ شوبات هەر مەرەکەبی سەر کاغەز بوو بڕگەیەکی لیّ جێبەجێنەکرا... لایەنەکانی (جود) لە سنووری مەڵبەندی(٣)ی یەکێتی بەرەو قووڵایی سنووری دەشتی هەولێر دەچوون بۆ ئەوەی جموجۆڵ و چالاکی بەرەیی ئەنجام بدەن، ئامانج ئەوە بوو وجودی بەرەی (جود) لەسەر گۆڕەپانەکە بسەپێنن، بەڵام یەکێتی هەرگیز قبوڵی نەبوو لایەنەکانی(جود) لە سنووری هەولێر بوونیان هەبێت، بەتایبەتی پارتی دیموکراتی کوردستان، لەبەر ئەو هۆکارانە لە مانگی نیسانی ١٩٨٣ جەنگێکی خوێناوی لە نێوان لایەنەکانی(جود) و مەڵبەندی سێی یەکێتی بەرپابوو، مەڵبەندی(٣)ی یەکێتی لە لایەن لایەنەکانی (جود) دەستی بەسەرداگیرا... لە دوای جەنگی لایەنەکانی (جود) لە مەڵبەندی(٣) سەرکردایەتی یەکێتی نەخشەی پەلاماردانی پشت ئاشان و قرناقاوی کردە ئەرکی هەنووکەیی خۆی...

## شەڕی پشت ئاشان و قرناقاو:

سەرکردایەتی یەکێتی لە سێ قۆڵەوە هێزەکانی خۆی کۆکردەوە قۆڵی یەکەم خڕی ناوزەنگ، کە (نەوشیروان مستەفا) خۆی وەکو سەرکردەی پەلامارەکە لەگەڵ هێزەکەدا بوو بەرەو ڕەزگە بەڕێکەوتن، قۆڵی دووەم لە چیای ئاسۆسەوە بەرەو (قەڵاتوکان) لەگەڵ هێزی دووەم یەکیان گرتەوە، قۆڵی سێیەم هێزەکانی باڵەکایەتی بەرەو رۆژئاوایی پشت ئاشان و بۆڵێ نزیکبوونەوە لە زەنگەڵێن و دەوروبەری جێگیربوون... هێرشی راگەیاندنی یەکێتی بۆسەر لایەنەکانی (جود) بە گەرمی دەستی پێکرد. دامودەزگاکانی (ڕژێم) لە سنووری پشدەر ئاسانکاریان بۆ هێزەکانی (ی.ن.ك) دەکرد. لەو کاتەدا کە ی.ن.ك نەخشەی پشت ئاشانی دادەڕشت لە هەمان کاتدا بە ناوبژیوانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران سەرقاڵی گفتوگۆ بوون، بە واتایەکی تر نەخشەی پەلاماردانی پشت ئاشان بەدەر نەبوو لە کاریگەری ڕژێم، یەکێتی پشت ئاشان و قرناقاوی کردە نێچیرێك بۆ مفاوەزاتی نێوان یەکێتی و ڕژێمی دیکتاتۆری...

لەو کاتەدا یەکێتی هێزەکانی لە دەوری پشت ئاشان و قرناقاو مۆڵدابوو، سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراقی بەنجی ڕێکەوتننامەکەی ٦ی شوبات بەری نەدابوو، پێیان وابوو یەکێتی

نیشتمانی کوردستان هێرش ناکاته سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی(حزب) لە(پشت ئاشان و قرناقاو)، تەنانەت لە ڕۆژی پەلامارەکەشدا هیچ ئامادەکاری نەکرا بوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پیلانەکەی یەکێتی...

## شەڕی ڕەزگە:

ماوەی پانزە رۆژ بوو ڕەبیەکمان لەسەر بەرزاییەکی بەرامبەر بارەگای رەزگە لە (بەرد بیرۆ) جێگیرکردبوو. ئەو ئێوارەی قۆڵی یەکەمی هێزەکانی یەکێتی گەیشتە لێرەواری گردی رەمکان و دەوروبەری ڕەزگە، هاوڕێیانی لقی پشدەر منیان راسپارد، کە بچم بۆ ڕەبیەکە واجب وەربگرم، هاوڕێ مستەفا غەفوریش هەر ئەو ئێوارەیە هاتە سەر گردەکە، ئەو هاوڕێیانە لە ڕەبیەکە بووین حەوت هاوڕێ بووین، ئەو رۆژە: ١٩٨٣/٤/٣٠ بوو، ئەو ئێوارەیە کاروانی نەپساوەی پێشمەرگەکانی یەکێتی درێژەی هەبوو بەرەو بناری ڕەزگە. دوای نیوەڕۆ ڕەتلێك تۆپی ڕەبیەی بەرد قەڵشیو ژمارەیەك پێشمەرگەی گەرمیانی یەکێتی کردە ئامانج، کە بۆ جەنگی پشت ئاشان و قرناقاو هاتبوون، ژەمارەیەکیان لێ کوژران و بریندارکران. وەك ئەرکێکی مرۆڤانە بریندارەکانمان تیماردەکرد و خواردنمان دەدانێ، کەچی هەر ئەو هێزە بوو شەو هێرشیان کردە سەر ڕەبیەکەمان، ئەوەیە کە دەڵێن: نانی دەخواو ناندێنێ دەدڕێ. ئەو هێزە لە چوار دەوری باسکی (بەرد بیرۆ) دابەشبوون، گومانم لەو جۆرە دابەشبوونە بوو، رۆژ بەرەو ئێوارە شۆڕدەبۆوە، هاوڕێ مستەفا غەفور چوو بۆ ناو پێشمەرگەکانی یەکێتی، کە لە دەوروبەری رەبیەکە دابەشبووبوون، بە جۆرێك دەورەی هاوڕێ مستەفا غەفوریان دابوو پێم وابوو، کە خەریکن پەلاماری بدەن، دەنگی هاوڕێ مستەفا غەفورم دا، کە لە ناویان بێتەدەرێ. تا خۆرئاوابوو زیاتر گومانم پەیدادەکرد، کە شەو پەلامارمان دەدەن... تەلەفۆنێکی مەیدانیان راکێشابوو لە بارەگای ڕەزگە بۆ ناو رەبیەی گردی (بەرد بیرۆ)، لە رێگای ئەو تەلەفۆنەوە قسەم لەگەڵ هاوڕێ (هێمن) کرد، کە ڕابەر سیاسی لقی پشدەر بوو، پێم گوت کە یەکێتی نیازی وایە ئەمشەو هێرش بکاتە سەر رەبیەکەمان، کە رەبیەکەیان گرت ئەوسا پەلاماری بارەگای لقیش دەدەن، لە وەڵامدا هاوڕێ هێمن وتی نابێ ئێوە دەستپێشخەری جەنگەکە بکەن، کە هێرشیان کردە سەرتان بەرگری لە خۆتان بکەن. وەڵامی هاوڕێ هێمن وەڵامێکی نابەجێ بوو، بەڵام لەبەرئەوەی هیچ تەوجیهاتێك نەبوو جەنگی یەکێتی بکرێت هەر

ئەو وەڵامە دەدرایەوە، گوایە ڕێکەوتننامەی ٦ی شوبات لە ئارادایە، هەر بۆیە هاوڕێ (هێمن) ناهەقی نەبوو، نە من داوای هێزی زیاترم کرد نە هاوڕێ (هێمن)یش پرسیاری کرد، کە هێزی دیکەتان پێویستە یان نا. لە کاتێکدا ژمارەی ئەو هێزەی یەکێتی پتر لە(١٠٠) پێشمەرگە دەبوو لە دەوروبەری ڕەبیەکە مۆڵدرابوون، کات دیاریکراو بوو، سەت پێشمەرگە بەرامبەر بە حەوت پێشمەرگە دانرابوو، ناهاوسەنگییەکی زەق بوو. چارە هەر ئەوەبوو پشت بە خۆمان ببەستین. لەگەڵ هاوڕێ مستەفا غەفور راوێژم کرد، وتم: (مچە) گیان زۆر وریا نەبین چەکمان دەکەن یا دەمانکوژن، چەککردن شەرمەزاری و کەرامەت شکاندنە، کە لە فەرهەنگی ئێمەدا نییە، کەواتە دەبێ شەڕبکەین، مستەفا وتی: تۆ بڵێی هێرشمان بۆ بکەن؟! وتم: بەڵێ بێگومان... ڕۆژئاوا بوو دەنگی ئەو کۆمەڵە پێشمەرگانەی (یەکێتی)م دا، کە لە دەوروبەری ڕەبیەکەمان خۆیان مەلاس دابوو، پێم وتن لە ڕەبیەکەمان دووربکەونەوە لەبەر(حراسەت)ی شەوانە. وتیان: باشە دووردەکەوینەوە... بەڵام کە سەیرم کرد دە مەتر دوورکەوتبوونەوە. بە هاوڕێیانم وت سەنگەر لێدەن... بە زۆری زۆرداری(٤) سەنگەرم پێ هەڵکەندن. هیچیان بڕوایان نەدەکرد یەکێتی پەلامارمان بدات... هاوڕێ هیوا مەغدید لە ناو بارەگا بوو نەماندەویست بێتە ڕەبیەکە، چونکە تازە پێشمەرگە بوو جەنگی نەدیبوو، هاوڕێ هیوا زۆر نیگەران دەبوو ئەگەر پێمان دەگوت نابێ بچێتە مەفرەزەی سەربازی. مامۆستا هیوا وەکو کادرێکی ڕێکخستن لەگەڵ مندا ئەرکی ڕێکخستنی وەرگرتبوو، ڕۆژئاوا بوو دنیا تاریك داهات، بە ئەستەم مرۆڤ و داربەڕووەکانی لاپاڵی گردە باسکی ڕێگای بارەگاو ڕەبیەی سەر گردەکە لێك جیادەکرایەوە، یەکێك بە مشەمش بەرەو ڕەبیەکە هات، هێشتا چەند مەترێکی مابوو بگاتە ناو ڕەبیەکە، وتی: ئەوا هاتم ئینجا مەیەڵە بێم تۆ پێت وایە مامۆستام نەستەلە خۆری شاریم، دەبێ بیسەلمێنم کامەمان ئازاترین!! زۆر لەگەڵ هاوڕێ (هیوا) خەریکبووم بگەڕێتەوە بارەگا، کەچی سوودی نەبوو. بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ بارەگا کرد، هاوڕێ هێمن وتی ئاگادارنەبووین، کە هیوا هاتووە بۆ ڕەبیەکە... کە زانیمان ناچێتەوە خوارەوە لە لیستی حراسەتدا واجبی بۆ دانەنرا، گوتمان کە هیچ نەبوو واتا هێرش نەکرایە سەر ڕەبیەکە پێش کاتژمێر یانزەی شەو دەینێرینەوە بارەگا، پێم وابوو ئەگەر هێرشمان بۆ بکرێت، بەرە بەیان دەکرێ یا کاتژمێر یەکی شەو بەولاوە پەلاماردەدرێین... لە شێوەی بازنە دوو کەس و سێ کەس بە پێی سروشتی سەر گردەکە دابەشبووین، من لەگەڵ هاوڕێیەك بووم بە ناوی (حاجی)

هیوا هیچ کوێیەکی بۆ دیاری نەکرابوو، هەر دە چرکە جارێك دەهاتە سەرم پێی دەگوتم کێ لەگەڵ من دەبێ کام جێگایەتان بۆ من دیاریکردووە، منیش هەر حەزم دەکرد بیخافڵێنم تا چەند کاتێکی تر دواتر بە بیانووی نەبوونی یاتاخ بینێرمەوە خوارێ. کاتژمێر(١٠) ی شەو بەرەو سەر بوو یەکێك بانگی کرد وتی هیواتان لەگەڵە، هیوا خۆی وەڵامی دایەوەو ڕۆیشت، دوای ڕۆیشتنی هیوا بە چارەگێك زۆر نیگەران بووم، کە هیوا نەگەڕایەوە بە هاوڕێ (حاجی)م گوت تۆ وریابە بزانم هیوا بۆ نەگەڕایەوە... لە سەنگەری خۆم دەرچووم ژمارەیەك چەکدار لە هەڵدێری بەرزایی رەبیەکە پەلاماریان داین داوایان لێکردین چەکەکانمان دابنێین. لەگەڵ یەکەم وتەی چەك بن، بەرەو سەنگەری خۆم گەڕامەوە، پێش ئەوەی لاقم بگاتە ناو سەنگەرەکە دەنگێکی (غەریب) تێی خوڕیم وتی کوڕە کێی؟ وتم: (وریا)م ئەوسا نازناوم (وریا) بوو، کابراش پێی وابوو منیش هەر لە خۆیانم تەقەی لێ نەکردم، ئەگەرنا هیچ گومانی تێدا نەبوو دەیکوشتم و تەرمەکەشم بەسەر خۆیدا بەردەبۆوە، لەم دیوەی سەنگەرەکەی خۆمەوە داربەڕوویێك هەبوو، شانم وەدار بەڕووەکە دا زۆر بە گەرمی تەقەم لە کابرا کرد هەرچی کەڵەکە بەردی سەنگەرەکە بوو بەسەر کابرام دا وەرگێڕا، ئەویش وەدەست هات بەڵام ئەو نەیدەتوانی سەرهەڵبڕێت لە ترسی من ئەو فیشەکانەی دەیتەقاندن بە قەدی داربەڕووەکە دەکەوتن، کە من شانم وێدا بوو. مەخزەنێکی ترم لە کابرا بەتاڵکرد، کەچی نەکوژرا خۆی تەخت کردبوو فیشەکی من نەیدەگرتەوە. منیش نەمدەوێرا سەر بەسەر سەنگەرەکەیدا شۆڕبکەمەوە، ئەگەرنا تفم هاویشتبا وەکابرا دەکەوت. مەخزەنم ئاڵگۆڕ دەکرد لەسەر کلاشینکۆفەکەم هەستم کرد کابرا لە سەنگەرەکە دەرپەڕی، ریزە فیشەکێکم پێوەنا، کەچی وەبەرنەهات لەو کاتەدا لە پشتەوە تەقەیان لێکردم، بۆن کرۆزێکم لێ هات وام زانی هەموو فیشەکەکان لە پشتم دەرچوون، لەسەر خۆ بەناوی(حزبی)یەوە بانگی هاوڕێ مستەفام کرد وتم ئاگاداربن، هاوڕێ مستەفا دەنگی هاوڕێ جەباری دا وتی ئەوە(محەمەد) بوو تەقەت لێکرد، جەبار هەقی هەبوو، چونکە من تەقەم لە سەنگەرەکەی خۆم دەکرد کە ئێوارێ بۆ من و هاوڕێ حاجی دیاریکراو بوو، هاوڕێ حاجی منداڵکار بوو شەڕی دەستەویەخەی نەدیبوو، کە من لە جێگای خۆم هەڵسا بووم یەکسەر چاوی بە پێشمەرگەکانی ی.ن.ك کەوتبوو کە گەیشتبوونە ناو رەبیەکە پێی وابوو هەمووومان یا کوژراوین یا چەککراوین، گەڕابۆوە بۆ بارەگای(لق) لە رەزگە، گوتبووی هەموویان کوژراون... کابرا لە بن داربەڕووەکە دەرچوو بەرەو(بەرد بیرۆ) کە

لە ناوەڕاستی گردەکە لە کێلێکی گەورە دەچێ، منیش بە دوای کەوتم کابرا تەققەی لێکردم نەپێکرام، لەمدیو بۆ ئەودیوی بەردە بیرۆ لێمان بوو بە شەڕی دووبەدوو هەموو برادەرەکانی ڕایان کردبوو ئەو مابوو ڕابکات، نە ئەو دەیتوانی ڕا بکات نە منیش ڕێگام پێ دەدا بڕوات. من ئەودیوەم گرتبوو کە دەیتوانی پێیدا ڕابکات، ئەویش ئەم دیوی ڕەبیەکەی لە من گرتبوو، دەنگی هاوڕێ جەبارم دا تەقە لەو بن بەردە بکات کە دەنگی منی لێ دەبیستێ هاوڕێ جەبار تەقەی لێکرد کەچی کابرا نەپێکرا، چەند فیشەکێکی ڕووەو من تەقاندو ڕایکرد... کە کابرا ڕایکرد، هێرشی پێشمەرگەکانی یەکێتی فەشەلی هێنا. ئەو شەوە جگە لە چەکی خۆم کە کلاشینکۆف بوو تفەنگێکی برنەوم لا بوو لەگەڵ دووربینێکی عەسکەری، بەڵام لەسەر یاتاخی نووستن بە جێم هێشتبوو لە بن(بەرد بیرۆ). ئەو کەسەی لەگەڵ من دەرگیربوو، دواتر ناسیم کە ئامر کەرتێك بوو لەگەڵ غەریب عەسکەری بوو، غەریب عەسکەریش لەو شەڕەدا بە نارنجۆکی دەستی بە خەستی برینداربوو. مرۆڤ کە ئازا بوو ناحەزیش بێت هەقە باسی بکرێت. ئەو پێشمەرگەیە پیاوێکی زۆر ئازاو لە جەنگ شارەزا بوو. بە داخەوە لە جەنگێکی تری ناوخۆدا کوژرا. نموونەی ئەو پێشمەرگە ئازایانە لە ناو هەموو لایەنەکاندا زۆر بوون، بەڵام لە جەنگی براکوژیدا بوونە قوربانی... جەماعەتی یەکێتی شکان نەیانتوانی رەبیەکەمان بگرن، هاوڕێیانمان سەرژمێر کرد لەو(٨) هاوڕێیە جگە لە هاوڕێ حاجی هاوڕێیەکی تریش ڕایکرد بوو، هاوڕێ هیوا دیار نەبوو، تەلەفۆنم دەکرد بە تەلەفۆنە مەیدانییەکە هەڵتوتەکابووم لە نزیك دەوەنێك ریزە فیشەکێك لە ناو هەردوو قاچمی دا بەرەو پشتەوە سوڕاندمی، منیش خێرا تەقەم لە شوێنی بلێسەی ئەو چەکە کردەوە، هەندێك دەستم لە خۆم کوتا بریندار نەبووم ئەو تەقەیە لە لایەن یەکێك لە پێشمەرگەکانی یەکیتییەوە کرا، کە خۆی شاردبۆوە و نەیوێرا بوو لە ناو شەڕەکە تەقە بکات... بەیانی کە چووین لە ناو دەوەنێکی خوارەوەی رەبیە کە (٦) قەوانە فیشەکی کلاشینکۆفی لێ کەوتبوو کە کابرا خۆی تێدا شاردبۆوە... بە تەلەفۆن هاوڕێیانم لە جەنگەکە ئاگادارکردەوە. لە سۆراغی هاوڕێ هیواو هاوڕێیانی ترم پرسی وتیان جگە لە هاوڕێ هیوا ئەو دوو هاوڕێیانەی تر گەڕاونەتەوە، داوام لە هاوڕێیان کرد فیشەکمان بۆ بنێرن، چونکە(١٥) فیشەك دەبوو پێم مابوون، (٦) مەخزەن و نیو فیشەکم تەقاندبوو، هاوڕێ محەمەد دەلگەیی خۆی هات لەگەڵ هاوڕێ عەلی گۆران فیشەکیان بۆ هێناین... شەو خەریکبوو کۆتایی دەهات هیچ کەسمان نەخەوتین. ئەوشەوە وردە تەقە لە نێوان ئێمەو

جەماعەتی یەکێتی درێژەی هەبوو. من زۆر خەمی هاوڕێ هیوام بوو نەمدەزانی چارەنووسی بە چی گەیشتووە. کە دنیا رووناك بوو هاوڕێ عەلی سەیدە و هاوڕێیانی تر هاتن بۆ لامان. هاوڕێ عەلی سەیدە بە دووربین دووربەدوور تارماییی دوو لاشەی بینی، یەکەم کەس بوو چوو بۆ سەر تەرمی هاوڕێ هیواو وریای مام قادر، بانگی کردین وتی وەرن وا هیوا لێرە شەهیدبووە، کە ئەو قسەیەم لە هاوڕێ عەلی سەیدە بیست لە جێگای خۆم سست بووم، ماوەیەك لە جێگای خۆم بێدەنگ دانیشتم، دواتر لەگەڵ هاوڕێیانی تر شۆڕبووینەوە خوارێ، کە چووین هەردووکیان چەکەکانیان رووەو سینگی یەکتر کردبوو فیشەکیش لەبەر چەکەکانیان بوو... تەرمی هەردووکیانمان پشکنی بەڕای هەموو هاوڕێیان هەردووکیان یەکتریان کوشتبوو، چونکە گوللەکان وا دیار بوون لە نزیکەوە لە یەکتریان دابوو...

پێم وابوو ئەگەری هێرشێکی تر هەیە، بەڵام دیاربوو ئامانجی سەرەکی هێرشەکەی یەکێتی پشت ئاشان و قرناقاو بوو، نەیان دەویست لەوە زیاتر هێزەکانیان هیلاك بکەن. بە پێی زانیاری ئەو کاتە(نەوشیروان) خۆی لە پێشمەرگەکانی تووڕەکردبوو، وتبووی لێرە لەگرتنی رەبیەك سەرکەوتوو نەبن، چۆن ئەوێمان پێ دەگیرێت، مەبەست لە ئەوێ پشت ئاشان و قرناقاو بوو. لە دوای پشوودان پاڵتویەکەم لەبەر خۆم دادەنا، هاوڕێ جەبار، کە ئێستا لە دەڤەری پشدەر بە مام جەبار ناسراوە، وتی کوا فیشەك بەر کوێت کەوتووە، وتم سەگە کوێر زۆری نەمابوو بمکوژێت. چەند فیشەکێك لە ژێر جلەکانم دەرچوو بوو سەر پێست داخی کردبوو، جەبار وتی: قسەی قۆڕ ئەگەر کابرام لە کۆڵ نەکردبایەوە ئێستا مردبووی... هاوڕێ جەبار هاوڕێیەکی ئازاو روح سووك و قسە نەستەقە، مخابن ئەو کەڵە پیاوە لە دوای راپەڕین بۆ بژێوی خێزانەکەی لە کۆنە رەبیەکانی سوپای عێراق بە دوای فافۆندا دەگەڕێت، ساروخێك پێیدا دەتەقێتەوە، برادەرێکی دەکوژرێ و خۆیشی دەبێتە پەککەوتە هەردوو قاچی دەپەڕێت... پێش نیوەڕۆی ١٩٨٣/٥/١ نامەیەکی هاوڕێ(ڕەسوڵ سوور)م پێگەیشت، لە نامەکەدا نووسیبووی کە شەڕەکەی لای خۆمانی بە نامە بۆ بنووسینەوە، لە نامەکەدا ئاماژەی دابوو بە ئەگەری هێرشی یەکێتی بۆ سەر بارەگاکانی ئەوان لە کانی ساوێن و کورکی کاوی، نووسیبووی هێزێکی زۆر لە قەڵاتوکان و ئەبوبەکرە مۆڵدراون، خەریکە لێمان نزیك دەبنەوە... هاوڕێ ڕەسوڵ خۆی و ژمارەیەك لە هاوڕێیانی پشت ئاشان لە کانی ساوێن جێگیرکرابوون. هێزێکی گەورەی یەکێتی بە(٥٠٠) چەکدار مەزندە دەکرا لە کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ پەلاماری ئەو

قۆڵەی(ساوێن) دەدەن هەر ئەو ڕۆژە هاوڕێ ڕەسوڵ و جوتەبرا هاوڕێ عەبدوڵڵا و قادر دەڵگەیی بە یەکەوە شەهیددەکرێن ژمارەیەکیش لە هاوڕێیانی عەرەب شەهیددەبن...

لە ڕۆژی ١٩٨٣/٥/٢ لە سێ قۆڵەوە پەلاماری (پشت ئاشان و قرناقاو)یان دا، قۆڵی یەکەم لە سەری مۆلی، ساوێن، بێپالان، قۆڵی دووەم لە سڵەو بۆلێوە، قۆڵی سێیەم لە بەرزاییەکانی گۆمی کرمە سووران و دەوروبەری، لە ماوەی دوو ڕۆژدا یەکێتی لە هەر سێ قۆڵەکەوە سەرکەوتوو بوو. سەرکردایەتی حزبی سوشیالیستی کوردستان و پاسۆك، لە گوندی ئاشقوڵکە بوون. هێزەکانی یەکێتی یەکەمجار دەستیان بە سەر بارەگاکانی ئەوان داگرت. دواتر پشت ئاشان و قرناقاویش داگیرکران، کە حزبی شیوعی عێراقی دەیان بارەگای هەمەجۆری لە پشت ئاشان هەبوو. رادیۆی دەنگی گەلی عێراق بارەگاکەی لە بەرزاییەکی سەرووی گوندی(بۆلێ) بوو، دەستی بەسەردا گیرا...(٦٥) هاوڕێ لە کادری پێشکەوتووی حزبی شیوعی شەهیدکران، کە زۆربەیان بە دیلی کوژرابوون، تەنانەت هاوڕێی واهەبوو لە دوای هێرشەکە خۆی ڕادەستی یەکێتی کردبوو بە دیلی کوشتبوویان. نەوشیروان مستەفا لە وتەیەکدا بۆ رادیۆکەیان دەڵێ: (**سەری لایەنەکانی(جود) مان خواردووە پەڕو باڵەکانیشیان دەکێشین**). لە کاتی پەلاماری پشت ئاشان و قرناقاو نەوشیروان پێشمەرگەکانی یەکێتی راسپارد بوو، کە (پەریزیان پاك بێت) واتا دیلەکان بکوژن!!... دیل کوشتن لە دوای جەنگی پشت ئاشان و قرناقاو بوو بە مودیلێك لە جەنگی براکوژی شاخدا... بە دەیان تەرمی هاوڕێیانی حزبی شیوعی، کە بە دیلی کوژرا بوون لە لاپاڵ و لێڕەوارەکانی دەوروبەری بۆلێ و پشت ئاشان و قرناقاو کەوتبوون... هاوڕێ کەریم ئەحمەد و مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی و ژمارەیەك لە هاوڕێیانی تر، کە لەگەڵیان دابوون لە گوندی زەنگەڵێنی بەدیل گیران. گوندی زەنگەڵێن کەوتۆتە باکووری ڕۆژئاوای پشت ئاشان، هاوڕێیانی تریش بە سەرکردایەتی و کادرو پێشمەرگەوە (بە قەندیل)دا ئاودیوی ئێران بوون، لە گوندی کۆنە لاجان و دەوروبەری پەرتەوازەبوون، ئێمەش لە ڕەزگە چاوەڕوان بووین، نەماندەزانی پشت ئاشان و قرناقاو وا بە ئاسانی کۆتایی دێت... ڕۆژی ١٩٨٣/٥/٤ ڕۆژێك لە دوای چۆڵکردنی پشت ئاشان بڕیارمان دا ڕەزگە بەجێ بهێڵین... ئەو ئێوارەیە دایکی هۆنیا و هۆنیای تەمەن یەك ساڵە لەگەڵ خێزانی هاوڕێیان چووبوون بۆ ئەشکەوتەکانی پشت ماڵان لە ڕەزگە، چونکە مەترسیمان هەبوو یەکێتی هێرش بکاتەوە سەر بارەگای ڕەزگە، پێمان باش بوو خێزانەکانمان لە بارەگای ڕەزگە دووربخەینەوە...ئەو ڕۆژە دیمەنێکی خەمناك بوو، هەمووومان

بێ تاقەت و کەمدوێ بووین، دۆشدامابووین، خەمی هەموو شتێکمان دەخوارد. خەمی شەهیدبوونی هاوڕێیان، خەمی لەدەستدانی پشت ئاشان و قرناقاو، خەمی لەدەستدانی بارەگای ڕەزگە و سەرگەردانبوونی خۆمان و منداڵ و خێزانمان... لە ناو ئەو هەموو خەم و پەژارانەدا، هۆنیا هاتە لام سەیری دەکردم وەکو بزانێ ئێمە زۆر خەمبارین، وادیار بوو برسی بوو ئاماژەی دەدا شتێك بخوات، هەندێك برنجی ساردی نیوەڕۆمان لابوو لە مەنجەلێکدا لەوێ دانرابوو، لەو کاتەدا کاك(عەزیزی خاڵ حاجی ئەزدین)ی لە گوندی بەلکی پەیدابوو، وڵاخێکی باشی پێ بوو وتی چی دەڵێی ئامادەم، وتم: ئەگەر دەتوانی دایکی هۆنیاو هۆنیا ببەوە بەرەو ماڵی مامم لە بەستەستێن... وتی بەسەرچاو. کاك عەزیز لێمان بوو بە خدری زیندە... کاك عەزیز بارێکی بارکرد لە بەتانی باش، دایکی هۆنیاو هۆنیاشی لەسەر بارەکە سوارکرد و ڕۆیشتن... کاك عەزیز خزمێکی زۆر بە کەڵك بوو، لە تەنگاناندا فریامان دەکەوت، ناوبراو زۆر جاری تریش ئیشی بۆ ڕاپەراندووین... هاوڕێیانی تریش وەکو من خێزانەکانیان ناردەوە، تەنها باجی شەمسەی خێزانی مەحمودی حاجی فەقێ خدر لەگەڵ هاوڕێ مەحموددا مایەوە، وتی هاوڕێ مەحمود بەجێ ناهێڵم...

ئەو ئێوارەیەی کە بڕیارمان دا رەزگە بەجێ بهێڵین، ئێوارەیەکی زۆر شووم بوو. بارەگای حزب لەگەڵ ماڵی هاوڕێیان لە گوندێکی خنجیلانە دەچوو، کە لەسەر شوێنەواری گوندە ڕوخێنراوەکەی رەزگە دامەزرابوو. هەتا ئەو ئێوارەیە جمەی دەهات لە هاوڕێیان، کەچی لە ناکاو بۆنی خوێن دایگرت. لەگەڵ مچە گیان لەسەر کێلەکانی گۆڕستانی نزیك بارەگای رەزگە دانیشتبووین، هاوڕێ مەنگوڕ بە ڕاکردن بە لاماندا تێپەڕی، هاوڕێ مستەفا وتی بۆ کوێ دەچی؟ وتی هاوڕێ سەلیم گوتویەتی بڕۆ بارەگای رەزگە بسووتێنە... ویستمان قسە لەگەڵ هاوڕێ مەنگوڕ بکەین، بەڵام ئەوەندە بە خێرایی و بە پەلە ڕایکرد گوێبیستی بانگە بانگی مچە گیانیش نەبوو...هەر ئەوەندەمان زانی بڵێسەی ئاگر لە بارەگا هەڵسا، دووکەڵ و تەقینەوەی تەقەمەنی ناو بارەگا بەیەکەوە دەبینران و دەبیسران... گوندە خنجیلانەکەی رەزگە لەسەر دەستی ڕژێمی دیکتاتۆری ڕاگوێزراو سووتێنرابوو، بارەگاو گوندە خنجیلانەکەی حزبی شیوعی لە رەزگە بە هۆی شەڕفرۆشی یەکێتی بە ناچاری بە دەستی خۆمان ئاگری تێبەردرا...

هێشتا کیلۆ مەترێك لە بارەگای رەزگەو خانووەکانی خۆمان دوورنەکەوتبووینەوە، هەندێك خەڵکی شڕە خۆرو پاتاڵ خۆر دەستیان کرد بە تاڵانکردنی ماڵەکانمان، تەنانەت جلوجۆڕی خۆمان و خێزانەکانیشمان دزراو بە تاڵان بردیان. ئەو کەسانەی ماڵەکانیان تاڵانکردین چەند ساڵێك بوو نەخۆشەکانیان لە نەخۆشخانەی (حزب) چارەسەرو تیماردەکران. بچووکترین خراپەمان بەرامبەریان نەبوو... کەچی لە جیاتی ئەوەی کەل و پەلەکانمان بپارێزن تاڵانیان کردین... ئێستاش بەلامەوە سەیرە، چۆن مرۆڤ چاو دەبڕێتە ناو ماڵی ناسیاوی خۆی، لەکاتێکدا دەزانی کە مرۆڤ چاوی بە چاوی یەکتر دەکەوێتەوە... ئەو ئێوارەیە بە درەنگەوە بە رێگای (گامۆڵی)دا سەرکەوتین. شەوێ لە بن دەروە شاخی (گامۆڵێ)ماینەوە. دارمان کۆکردەوەو ئاگرمان تێبەردا، وەکو لەشکرێکی لە جەنگ شکاو وابووین، بەڵام زۆربەمان بە بیروباوەڕێکی بەهێز لە ئایندەمان دەڕوانی و، پێمان وابوو دەبێ دەرەقەتی ئەو قەیرانەش بێین. بەڵام هەبوو بە زۆر لاشەی خۆی بە دوای خۆیدا کێشدەکرد و هەر بە تەواوی رووخابوو، لە بیانوویێك دەگەڕا، بۆئەوەی هەر لەو سەفەرە بگەڕێتەوە خۆی ڕادەستی ڕژێم بکاتەوە... ئەو شەوە هەر بە دوودڵی و نیگەرانییەوە سەرم نایەوە، بڕواناکەم هاوڕێیان زۆربەیان خەوتبن، بەیانییەکەی لە خەو هەڵسایین تاوێك بەرەو بناری رەزگە بە دووربین ڕوانیم، لەو کاتانەدا هەستی تۆڵە و جەنگی براکوژی وەکو خوێن.. وەکو تارمایی بە دوامانەوە بوو. نرکەو نەڕە نەڕی فەرهاد سەنگاویش هێندەی تر دەروونی ئازاردەداین، کە لەسەر رادیۆی یەکێتی بە ئێمەی شیوعییەکانی دەگوت مارکس گۆڕ هەڵتەکێنە وا تەحریفییەکان، واتا شیوعییەکان رێبازەکەت دەشێوێنن، کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان خۆیان بە(مارکس — لینین)ی راستەقینە دەزانی و شیوعییەکانیشیان بە دیلی دەکوشت...! هێشتا کەس دەرکی بە هۆکاری راستەقینەی جەنگی ناوخۆ یا براکوژی یا وەکو یەکێتییەکان دەیانگوت جەنگی خوشککوژی نەکردبوو. جەنگ لەبەرچی بەرپابوو لە ناو بزووتنەوەی چەکداری شۆڕشگێڕدا؟ ئاخۆ جەنگەکە لەسەر بەرژەوەندی ئابووری بوو، لەسەر دەسەڵاتی سیاسی یا...؟ بڕواناکەم هیچیان بووبێت، چونکە بن دەوەنەکانی(قەندیل) بەرژەوەندی چی تێدا بوو بۆ دەسەڵات، کەس دەسەڵاتی نەبوو، هەموومان هەر پێشمەرگە بووین، هەموومان جەنگی پارتیزانیمان بەرامبەر بە ڕژێم دەکرد... ئەی کەواتە چی هاندەری یەکێتی بوو جەنگی شیوعی و پارتی و پاسۆك و سۆسیالیست و لەشکری قورئان...هتد بکات؟. کە مفاوەزاتی ١٩٨٣ لە نێوان یەکێتی و ڕژێم دەستی پێکرد وەڵامی ئەو پرسیارەم وەرگرتەوە لەبەر ئەو هۆکارانەی خوارەوە بووە:

١- یەکێتی خۆی بە بەدیلی پارتی دەزانی لە مەیدانەکەدا وەکو دوژمنی سەرەکی سەیری پارتی دەکرد، رێگای نەدەدا بە شیوعی و حزبی سۆسیالیست و پاسوك لە یەك کاتدا(بەرە) لەگەڵ پارتی و یەکێتیدا پێك بهێنن... لایەنەکان سەر پشك کران یا یەکێتی یا پارتی هەڵبژێرن، پارتی پێی وابوو کوردستان بۆ هەموو لایەك ئازاد بێت... یەکێتی دڵنیابوو کە پارتی پاشخانێکی جەماوەری شۆڕشی ئەیلولی هەیە کە رێگای بدرێت بە شێوەیەکی سروشتی بنەماڵەی بارزانی رێبەرایەتی شۆڕش دەکاتەوە...

٢- دیموکراتییەت لای یەکێتی باڵا بە قەت کاڵا بوو، حەزی نەدەکرد لایەنەکانی تر بەهێزتر بن، بە واتایەکی تر زۆر نارەحەت دەبوو کە حزبی شیوعی ژمارەی پێشمەرگەکانی رۆژبە رۆژ لە سەرانسەری ناوچە رزگارکراوەکان زیادیان دەکرد، لە گەرمیانەوە بۆ بادینان بارەگای پێشمەرگەیان هەبوو...

٣- یەکێتی پێش ئەوەی پەلاماری پشت ئاشان و قرناقاو بدات لە رێگای د.قاسملو سکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران خەریکی گفتوگۆ بوو لەگەڵ رژێم، زۆر هەوڵی دەدا لایەنەکانی تریش راکێشێت بۆ مەیدانی ئەو گفتوگۆیە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، هەر بۆیە لێدانی شیوعییەکان و لایەنەکانی تری(جود) لە پشت ئاشان و قرناقاو بوو بە ئیمتیازێك بۆ گفتوگۆی نێوان یەکێتی و رژێم، لە جەوهەردا رژێمش ناڕاستەوخۆ دەستی هەبوو لە جەنگی پشت ئاشان و قرناقاو... لە کاتی گفتوگۆی نێوان یەکێتی و رژێم دا ئەو راستییە باشتر بۆ هەموو لایەك روونبۆوە...

## بەرەو ئاوارەیی:

لە بەرزایی رێگای (گامۆڵێ) بەرەو کوێستانەکانی (قەندیل) بەڕێکەوتین بە دیوی ئەودیوی رێگای گامۆڵێ هەڵدێرێکی زۆر سەخت بوو، بەرەو حەساری مامەڕەشی شۆڕدەبۆوە. ڕەنوێکی بەفری لێ بوو هەموو شەختە بوو واتا بەستبووی، بە لولەی تفەنگ شەختەی سەر ڕەنوە بەفرەکەمان دەشکاند ئینجا پێیدا ڕەتدەبووین، هاوڕێیان یەك بەدوای ئەوی دیکەدا دەڕۆیشتین، سرنجم دا باجی شەمسەی خێزانی هاوڕێ مەحمود خەریکە سەرێکی گۆپاڵەکەی کاك مەحمود دەگرێت، بە ئەسپایی لە پێشەوەی کاك مەحمود دەڕواو رێنوێنی کاك مەحمود دەکات، کە قاچی لە جێگا شکاوەکەدا بنێ، واتا لەسەر ئەو جێگایە کە بە زەبری لولەی

تفەنگ و نووکە نێزە سەهۆڵەکەیمان شکاندبوو، هەر کەسێك لاقی ترازابا سێ هەزار مەتر هەر بە ئاسماندا دەفڕی ئینجا دەکەوتە ناو ماهیەکانی حەساری مامەڕەش. باجی شەمسە ئەوەندە خەمی هاوڕێ مەحمودی بوو، هەموو جارێك ئەوەندە کوڕ دەبۆوە پێم وابوو خەریکە لەپە دەستەکانی خۆی بۆ کاك مەحمود ڕادەخات... باجی شەمسە تاکە ئافرەت بوو لەگەڵ هێزەکەماندا بوو، لەم ئاوارەییەشدا زۆر فریای هاوڕێ مەحمود کەوت لە گوندی سێڵوێ و مەشکان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. هەمیشە ژەمی بە لەزەت و بەتام و بۆی بۆ سازدەکردو جلەکانی بۆ دەشووشت و خزمەتی دەکرد. بەڕاستی ژنێکی زۆر دڵسۆزە بۆ هاوڕێ مەحمود و منداڵەکانی، دەکرێ پێی بیڵێین هاوسەرێك و دایکێکی نموونەییە...

کە لە ڕەنوە بەفرەکە دەربازبووین بە کوێستانەکانی (مەزرێڵێ)دا ڕۆیشتین، پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٨٣/٥/٥ گەیشتینە گوندی (کونە مشکە)ی دەشتی بەهەشت دەشتی وەزنێ. ئەو گوندەی سێساڵ پێشتر بە میوانی پێیدا تێپەڕیبووم، (کونە مشکە) بە غەدر ئەو ناوەی لێ نراوە وا دیارە جرجە مشکی لێ هەن، ئەگەرنا کونە مشکەو دەشتی بەهەشت لە کوێ یەکتردەگرنەوە. کە گەیشتینە کونە مشکە لە لایەن کاك حەسۆ میرخانەوە پێشوازیمان لێکرا. ناوبراو لە شۆڕشی ئەیلولدا فەرماندەی هێزی(کاوە) بوو، پیاوێکی زۆر ناسراو و وریا بوو، زاوای شێخەکانی بنەماڵەی(سیکەنەو سەرخان) بوو. مام ڕەسوڵ کاکە ئەحمەدی (بەستێ)شمان لەگەڵ بوو. مام ڕەسوڵ کاکە ئەحمەد کەسایەتییەکی نیشتمانپەروەرو بنەماڵەو شێخێکی وەجاخزادەن، هەتا ئێستاش لێرەو لەوێ خەڵکێك هەیە وەکو دەروێش یا مریدی ئەو بنەماڵەیە ماونەتەوە. بنەماڵەی بارزانی بە گشتی و کاك ئیدریسی ڕەحمەتی بەتایبەتی زۆر ڕێزی دەگرتن، ماوەی هەفتەیەك لە بارەگاکانی پارتی لە گوندی کونە مشکەماینەوە. گوندی کونە مشکەو دەشتی وەزنێ تازە پەڵەی ڕەشی تێکەتبوو، واتا بەفر خەریکی توانەوە و ماڵئاوایی بوو. ئەگەرچی گوندی کونە مشکە گوندەکەی جاران نەبوو، نە ماڵی کاك حەمەدی لەوێ مابوو نە خەڵکی ئاوایی، بەڵکو تەواوی گوندەکە بارەگای پارتی بوون، ساڵێك دەبوو خەڵکی گوندەکە، بەهۆی جەنگی حزبی دیموکراتی ئێران و کۆماری ئیسلامی ئێران ئاوارەببوون، بەرەو عێراق و دێهاتەکانی دەوروبەر کۆچیان کردبوو، بەڵام دەشتە ڕەنگینەکەی وەزنێ وەکو بووکی یەك شەو، کە چاوەڕوانی زاوا دەکات، ئەوها چاوەڕوانی حیلەی ئەسپی خێڵانی مەڕدارەکانی دەکرد، کەچی بە داخەوە ئەو ساڵە دەشتی وەزنێ بەبێ مێگەل و لەنجەولاری شەنگەبێریان بوو

وەك رۆژی سەر بستوی شاخی جاسووسان بەهارەکەی ئاوا ببوو، چەندان کراسی سپی رەنگی بەفری پۆشییەوە چەندان زستانی بەسەردا تێپەڕی، کەچی مەڕدارەکان هەر نەهاتنەوە... لە کونە مشکەوە بەڕێکراین بەرەو گوندی سێڵۆی لە مزگەوتی گوندی سێڵۆیٚ جێگیربووین. گوندی سێڵۆیٚ گوندێکی زۆر خۆش بوو، بەڵام سەیر بوو.. ئەو گوندە دەتگوت کونە ئەسپێیە، هەر فریادەکەوتین جلەکانی ژێرەوە فڕیٚ بدەین، ئەوەندە ئەسپێیان دەگرت کەڵکی ئەوەیان نەبوو بشۆرێن. رۆژانە هاوڕێیان لە قەراخ چۆمی سێڵۆیٚ خەریکی کۆڵکردن بوون. هەر هاوڕێیە و تەنەکەیەکی ئاو گەرم دەکرد و جلەکانی تێدا دەکولاندن تا ئەسپێیەکان قەلاچۆبکات... رۆژێك لە ژێر بێلایەکەی مزگەوتی سێڵۆیٚ بووین قرچە قرچێکم گویٚ لیٚ بوو، وتم دەڵێی دەڕووخیٚ؟! لە قسەکەم نەبوومەوە لایەکی بێلایەکە ڕووخا، هاوڕێیەك وتی خەڵك ناڵێت مزگەوتەکە شڕو پەرپوتە بۆیە ڕووخاوە، دەڵێن خوا غەزەبی لە کۆمۆنیستەکان گرتووە... هەر لە گوندی سێڵۆیٚ بووین کە هاوڕیٚ کەریم ئەحمەدو هاوڕیٚ ئەحمەدی بانیخێلانی لە لای یەکێتی گەڕانەوە، هاوڕیٚ ئەبو شوان قاتێکی بوزو دەمانچەیەکی چواردەخۆری لە خودی مام جەلال وەرگرتبوو، جێگای لۆمەو سەرزنشتی هاوڕێیان بوو...هاوڕیٚ کەریم ئەحمەد ئەو کاتەی کە دیلکرابوو لەلای یەکێتی لە گەرمەی جەنگی پشت ئاشاندا ڕێکەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ یەکێتی مۆرکرد. راگەیاندنی ئەو ڕێکەوتننامەیە جێگای سەرزەنشت و گلەیی هاوڕێیان بوو. هاوڕیٚ کەریم دیلکرابوو مافی راگەیاندنی ئەو ڕێکەوتننامەی نەبوو...ئەو ڕێکەوتننامەیە لە لایەن مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی عێراقییەوە ڕەتکرایەوە... هاوڕیٚ کەریم سەردانی هاوڕێیانی دەکرد و کۆڕو کۆبوونەوەی سازدەکرد، کە جۆرێك بوو لە داوای لێبوردن لە هاوڕێیان لەمەڕ ئەو بەیاننامەیەی لەگەڵ ی.ن.ك واژۆی کردبوو... هاوڕیٚ مستەفا غەفور زۆر بە توندی رەخنەی لە هاوڕیٚ کەریم ئەحمەد و سەرکردایەتی حزب گرت، کە نەیانتوانی لەم جەنگەدا سەرکردایەتی پشت ئاشان و قرناقاو بکەن... هاوڕیٚ مستەفا غەفور لە دوای جەنگی پشت ئاشان و قرناقاو هیچ بڕوایەکی بە سەرکردایەتی حزبی شیوعی نەما، هاوڕیٚ (مستەفا غەفور) یەکێك بوو لە هاوڕیٚ خۆشەویستەکانم لە ناو لقی پشدەردا، تاکە رۆشنبیر بوو کە هەم کادرێکی مەیدانی بوو، هەم رۆشنبیرێکی ئاست بەرز بوو، زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و فارسی و کوردی بە نووسین و قسەکردن دەزانی، لە کۆتایی قۆناغی چوارەمی زانکۆ بوو لە بەشی(فیزیا)، لەژێر گوشاری دەزگا سەرکوتکەرەکانی بەعس زانکۆی بەجێهێشت و بوو بە پێشمەرگە. لە جەنگی(بەرد بیرۆ) لە رەزگە بە دوو چەك شەڕی دەکرد، بە کلاشینکۆف و ڕەشاش عفاروف، زۆر ئازاو چاونەترس بوو، لەو ساوە

من و هاوڕێ مستەفا وەکو دوو برای جمك واین، تاکو ئێستاش هەروەکو خۆمان واین، برایانە سەیری یەکتر دەکەین. لە گوندی سێلۆێوە چووین بۆ گوندی (مەشکان)، گوندی مەشکان کەوتۆتە داوێن کوێستانەکانی کێلەشین، بە دیوی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا، لاپاڵ و پێدەشتی گوندی مەشکان زۆر جوان و سەوز بوو، بەڵام خەڵکی گوندەکە زۆر هەژارو ڕەشوڕووت و هەروەها زۆربەیان نەخوێندەوار بوون، پیاوێکی شێتی لێ بوو بە ناوی مام (حەسەن)، کە سەرسام بوو بە باڵای هاوڕێ خدری مرادی. هاوڕێ خدر قەدو باڵا بەرز و هەیکەلێکی گەورەی هەبوو، خەڵکی گوندەکە پێیان وابوو هاوڕێ خدر مراد بەرپرسی هەموومانە، لەبەرئەوە هەر ڕۆژە لە ماڵێك دەعوەت دەکرا. خەڵکەکە پێیان وابوو پێوەر بۆ بەرپرسایەتی هەیکەلی گەورەیە...حەسەنە شێت لە سەربانی بانگی ژنەکانی ئاوایی دەکرد و دەیگوت وەرن خۆتان لەو پیاوە چاك بکەن تا وەچەی لەبەربگرنەوە، دەیگوت تەلاقم کەوێ هەتا ئێستا لەناو پیرانان، مەبەستی پیرانانی مامەشان بوو، پیاوی وا بە هەیکەلی بەخۆوە نەدیوە... لە گوندی مەشکان بەزمی زۆر سەیر رووی دەدا لەناو هاوڕێیان بوو بە گاڵتەی ڕۆژانە هەرچی شەوانە پێلاوەکانی ریخی ولاخانی پێوە با پێیان وابوو شەوێ چووە بۆ(ماکەر)گانێ، شەوێك یەکێك لەو هاوڕێیانە بە هەڵە پێلاوی هاوڕێ خاڵ هۆمەری لەپێکرد بوون، بەیانی کە خاڵە هۆمەر سەیردەکات پێلاوەکانی ریخاوی بوون، تووڕەدەبێ و دەڵێ ئەوە چ حەرامزادەیەك ئەو شەو ماکەری گاوە بەسەر منی داهێناوە...

سەرەتای مانگی تەمووز، لە گوندی مەشکانەوە گەڕاینەوە گوندی **ئاڵوەتان** نزیك **میراوێ**. ئەو گوندە گوندێکی خۆش بوو بەڵام خەڵکی گوندەکە زۆربەیان لەوێ نەمابوون، ژمارەیەك (پایەگا)ی سوپای پاسدارانی ئێرانی و بارەگای پێشمەرگەکانی پارتی لێ بوو. پایەگای پاسداران خواردەمەنی دابەشدەکرد بەسەر بارەگاکانی پێشمەرگەدا. لەو خواردنانەی زۆر باو بوو گۆشتی (کەنغەر) بوو. لەسەرەتادا باش شارەزا نەبووین چۆن دەخورێت، چەورییەکەیمان وەکو گۆشتی حەیوانی خۆماڵی بە شیشەوە دەکرد، کە دەمانخوارد پێی سکمان دەچوو، بەڵام دواتر شارەزا بووین بۆ شفتەو کەبابیش کەڵکمان لە گۆشتی کەنغەر وەردەگرت. ئێوارانی ئاڵوەتان زۆر خۆش بوو دووکەڵ و بۆنی گۆشتی برژاو ئەو دۆڵەی پڕکردبوو، لەهەر بەر دەرگایەك گۆشت بە شیشەوەکردن بوو، کە پێمان دەگوت شیشی سەدامی... سەدام حوسێن، کە دەچوو بۆ هەندێك جێگا بە تەلەفزیۆن نیشانی دەدا، کە سەلاجەی دەکردەوەو گۆشتی لە شیش دەداو دەیبرژاند...

## پشت ئاشانی دووەم:

کۆتایی مانگی تەمووز بوو لایەنەکانی(جود) لە پارتی و شیوعی و سۆسیالیست و پاسۆك، بڕیاریاندا بەرەو بناری(قەندیل) بگەڕێنەوە، هەم تۆڵەی جەنگی پشت ئاشان و قرناقاو لە یەکێتی بکەنەوە هەم ئەگەر بکرێ لەو دەڤەرە واتا لە بناری (قەندیل) بارەگاکانیان جێگیربکەنەوە. بۆ ئەو ئامانجەش لە دوو قۆڵەوە هێزەکانی(جود) بەرێکەوتین، قۆڵی یەکەم لە ئالْواتان بەرەو قەلاّتوکان و ئەبوبەکرە، قۆڵی دووەم لە کۆنە لاجانی قەندیلەوە بەرەو پشت ئاشان و گۆمی کرمە سووران و شێخ شەرۆ، هەتاکو گەیشتینە بناری قەندیل ناوچەکە چۆڵ بوو، هێزێکی ئەوتۆی یەکێتی لێ نەمابوو، لە بێدەلانەوە تا پشت ئاشان و قرناقاو لە ژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی(جود)دا بوو، یەکێتی هێزەکانی خۆی کۆکردەوە لە کوێستانەکانی کونەکۆتر لە بەرزایی کوێستانەکانی کونەکۆترو دۆڵی خانەقا هێزەکانیان مۆڵدا... هاوکات لەگەڵ پەلاماری لایەنەکانی(جود) بۆ بناری قەندیل کۆماری ئیسلامی ئێران هێرشی کردە سەر حاجی هۆمەران و زنجیرە چیاکانی دەوروبەری حاجی هۆمەرانی داگیرکرد، کە سوپای عێراق زۆر بە مەحکەمی لەو ناوچەیە جێگیرکرابوو، بەبێ ئەوەی بە خۆمان بزانین وەکو لایەنەکانی(جود) کەوتینە بەرەی کۆماری ئیسلامی، (یەکێتی)ش کەوتە بەرەی ڕژێمی عێراق، چونکە هێرشەکە هاوکات بوو. ژمارەیەك دیدەبان (رەسەد)ی سوپای پاسداران هاتبوون بۆ ناو هێزەکانی (جود) لە سنووری گۆمی(کرمە سووران). هاوڕێ ملازم خدر، ئەبو عاید کە زانی رەسەدی کۆماری ئیسلامی ئێران تێکەڵی هێزەکانی (جود) بوون بە بروسکە ئاگاداری سەرکردایەتی بەرەی (جود)ی کردەوە و پێی راگەیاندن ئەگەر دیدەبانەکانی پاسداران نەگەڕێنەوە سنووری بەرەکانی جەنگ لە حاجی هۆمەران، ئەوا حزبی شیوعی عێراقی هێزەکانی خۆمان لە بەرەی شەڕەکە پاشەکشێ پێ دەکەین. لە دوای بروسکەی، ملازم خدر دیدەبانەکان پاشەکشێیان پێکرا. لە سنووری یەکێتی کە هێزەکانی سوپای عێراقی تێدا جێگیرکرابوو، رۆژانە لە لایەن هێلی کۆپتەرەکانی عێراقەوە بوردومانی پێگەی لایەنەکانی(جود) دەکرا، بەتایبەتی لە سنووری کونە کۆتر... خالّی لاوازی لایەنەکانی جود بریتی بوون لە:

- تیۆەگلان لە جەنگی سوپای دەوڵەتێك بەرامبەر بە سوپای دەوڵەتێکی تر، کە لە سنووری زنجیرە چیای (قەندیل) دابەشکرابوو، هەر وەکو بەرەی جەنگی عێراق- ئێران، لە کاتێکدا پێویست بوو وەك هێزێکی پارتیزانی هەر لە هێڵەکانی پێشەوە کۆ بکرێتەوە...

- ماوەی(٤٠) رۆژ بوو هێزەکانی (جود) چاوەڕوانی رۆژی پەلاماردان بوون بۆ سەر هێزەکانی یەکێتی، کەچی ئەو ڕۆژە هەر نەهات، ئەو چاوەڕوانییە پێشمەرگەکانی تووشی بێ ئومێدی و خەمساردی کردبوو پەیتا پەیتا پێشمەرگە بە مۆڵەت دەگەڕانەوە بەرەو ئێران...

- لە بواری سەربازیدا بەتایبەتی لە بەرەی جەنگدا پیویستە یەك سەرکردە هەبێ، بەڵام لە ناو بەرەی (جود) هەر لایەنە سەرکردەی خۆی هەبوو، ئەو سەرکردانە کەس کاغەزی کەسی نەدەخوێندەوە، بە هیچ جۆرێك ئەم سەرکردایەتی ئەوی دیکەی قبوڵ نەبوو... لەڕووی زانیارییەوە هیچ زانیارییەکی دروستی ئەوتۆ نەبوو لەسەر جموجۆڵ و ژمارەی پێشمەرگەکانی یەکێتی...

یەکێتی هێزەکانی خۆی کۆکردەوە و، لە دوو قۆڵەوە هێرشی کردە سەر لایەنەکانی(جود) قۆڵی کونەکۆتری بەهۆی جامەدانی(سوور) کە یەکیتییەکان بە تاکتیك و بۆ هەڵخەڵەتاندن بەستبوویان خۆیان گەیاندبۆ ناو پێشمەرگەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و پیلانەکەیان سەریگرت و بە دەیان پێشمەرگەی پ.د.ك لەو قۆڵەوە شەهیدو بریندواربوون، شەڕەکە پارسەنگی گۆڕا، چونکە بەرزاییەکان کەوتنە دەست یەکێتی... لە قۆڵی (لێوژەو سلێ)ش سەرکەوتوو بوون... هێزی حزبی شیوعی عێراقی بە فەرماندەیی هاوڕێ مام کانەبی لە لایەن پێشمەرگەکانی یەکێتییەوە گەمارۆدرا، هاوڕێیان دووچاری جەنگێکی دەستەو یەخە دەبن ( ملازم ئیحسان، ئەبو لەیلا، د. عادل شەهیددەکرێن، کە سێ کادری سەرکردایەتی شەڕەکە بوون، پلەی حزبی ئەو سێ کادرە لە ئاستی ئەندامی (ئیقلیم)دا بوون و هەرسێکیان ئامادەییان هەبوو ببن بە ئەندامی سەرکردایەتی (حزب)، ئاستی خوێندنیان باڵا بوو، وەکو رۆشنبیرێکی پێگەیشتوو، دەیان دەورەی رۆشنبیریان بۆ هاوڕێیان کردبۆوە...حزبی شیوعی عێراق بە قەدەر نیمچە دەوڵەتێك کادری خاوەن بڕوانامەی باڵای هەبوو، زۆر بێ باکانە لە ئەرکی عەسکەریدا، کە هی ئەو رۆشنبیرانە نەبوو تێدا دەچوون کە بە ئاسانی جێگایان پڕنەدەبۆوە...

## جارێکی تر ئاوارەیی و بێ ئومێدی:

یەکێتی لە پەلامارەکەیان بەسەر لایەنەکانی(جود)دا سەرکەوتووبوون، هاوکات شاڵاوێکی ڕاگەیاندنیان ئاڕاستەی لایەنەکانی(جود) کرد، کە لە هێرشەکەیان کاریگەرتر بوو لەسەر ورەی پێشمەرگەکانی(جود). وتارە ئاگرینەکانیان (یەکێتی)یان بە هێزێکی لەشکان نەهاتوو دەست نیشان دەکرد، لایەنەکانی جودیشیان بە کلکی کۆماری ئیسلامی ئێران دەشوبهاند، پێیان وابوو نابێ لە پشتەوە خەنجەری ژەهراوی لە سوپای عێراق بوەشێنرێت... ئەوسا هێزێکی (جود) لە قۆڵی ئەبوبەکرەو قەلاتوکان و گردی رەمکان بوو لە بناری(قەندیل)، منیش لەسەر گردی رەمکان بووم وەکو بەرپرسێکی عەسکەری، هاوڕێ ئەحمەد ئەبوبەکر وەکو رابەر سیاسی بوو، لەگەڵ هێزێکی حزبی سۆسیالیستی کوردستان، لەسەر گردی رەمکان ئەرکمان وەرگرتبوو تەنها شەوێك جاشەکان هێرشیان کردە سەر هاوڕێیانی لقی(بیتوێن) لە گوندی ئەبوبەکرە، بەڵام هەر زوو جاشەکان ڕایانکرد، ئێمەش لەسەر گردی رەمکانەوە بە ڕەشاشی عەفاروف تەقەمان لە جاشەکان دەکرد...

کە لایەنەکانی جود لە شەڕەکە شکان بەرەو چیای قەندیل و شێخ شەرۆ ڕۆیشتبوون، بەهۆی جهازی (هۆکی تۆکی) پەیوندیمان لەگەڵ هاوڕێیانی پشت ئاشان هەبوو، پێیان راگەیاندین، کە ژمارە(٥٧) جێبەجێبکەین، جێبەجێکردنی ژمارە(٥٧) پاشەکشێ بوو، بە گەیشتنی ئەو بروسکەیە، زۆر لە هاوڕێیان نیگەران بوون، یەکێك لەو هاوڕێیانە وتی خۆم ڕادەستی ڕژێم دەکەمەوە و ناگەڕێمەوە ئێران، منیش پێم گوت لێرەوە خۆت تەسلیم مەکەوە، تۆ کادرێکی دیاری، هاوڕێیانی تر ورەبەردەدەن، پێم وت چەند ساڵێکە لەبەر(حزب) و میللەتەکەت پێشمەرگایەتی دەکەیت، ئەو چەند مانگەش لەبەر من بمێنەوە...ئەو ئێوارەیە کە هێزەکانی جود پاشەکشێیان پێکرا لە لایەن یەکێتییەوە خەسارەتی لایەنەکانی جود بە(٤٦) شەهیدو برینداربوونی دەیان پێشمەرگە راگەیاند... هەر ئەو ئێوارەیە دەنگێکی نوساو بە کزی لە رێگای جیهازی هۆکی تۆکییەوە پەیوەندی دەکات بە هاوڕێ (ملازم خدر)ەوە و دەڵێ من کانەبی گەورەم و برینداربووم، لە تیشە شاخێك دام لە لاپاڵێکی رۆژئاوای(لێوژە) هێزەکانی یەکێتی گەمارۆیانداوم و تا دوا تنۆکی خوێنم بەرگری دەکەم... هاوڕێ ملازم خدر دەستبەجێ هاوڕێیان دەگەڕێنێتەوە بەرەو هێڵەکانی پێشەوە، هاوڕێیان دەبن بە دوو بەش بەشێك بە فەرماندەیی هاوڕێ عەلی حاجی، کەڵەپیاوی رۆژانی تەنگانە، قۆڵەکەی تر بە فەرماندەیی

هاوڕێ مام جوامێر، کە بە هەقیقەت جوامێری مەیدانی جەنگەکان بووە. لە کاتژمێر(٧)ی ئێوارە بۆ یانزەی شەو جەنگی دەستەویەخە لە نێوان هاوڕێیان و یەکێتی بەردەوام بوو، ئەم جەنگەیان جەنگێکی جیاواز بوو، جەنگی دەربازکردنی فەرماندەیەکی نموونەیی بوو، جەنگی تێکۆشەرانی شیوعی بوو بۆ دەربازکردنی هاوڕێیەکەیان. لە کاتژمێری(١١) شەو دەگەنە سەر ئەو تیشە شاخە، کە مام کانەبی لێ بوو، (یەکێتی)یش کە لە ڕێگای فڕوفێڵەوە بەسەر لایەنەکانی (جود)دا سەرکەوتووبوون لە بەردەم هێرشی هاوڕێیاندا ڕایان کرد... مام جوامێر و هاوڕێ عەلی وەکو لە شەوارە بن وابوو، بن دەوەن بۆ بن دەوەن.. تیشە شاخ بۆ تیشە شاخ سۆراغی هاوڕێیەکەیان دەکەن... مام جوامێر لەسەر خەت بوو، هاوڕێ ملازم خدر سەرکردایەتی جەنگەکەی دەکرد، لە ڕێگای جیهازەوە بە مام جوامێرو هاوڕێ عەلی حاجی دەڵێ هاوڕێ کانەبی دەنگی بڕا، ڕەنگە بەهۆی برینەکەیەوە مردبێ، یا ئێوەش دەمرن یا کانەبیم دەوێتەوە، ئینجا مردو بێت یا زیندوو...مام جوامێرو هاوڕێیان هەر بە فیتو لێدان و ئاماژەی دەنگی ئاژەڵی کێوی شوێن و ئاراستەی یەکتر دەست نیشان دەکەن... لەسەر ڕۆشنایی یەکەم ناونیشان، کە هاوڕێ کانەبی گەورە بە هاوڕێیانی دابوو، مام جوامێر تیشە شاخەکەی دەست نیشان دەکات و دەچێتە سەر مام کانەبی، کە دەگاتە سەر مام کانەبی دەبینێ بە عاستەم نوزەیەکی تێدا ماوە. کاتژمێرێکی تر فریای نەکەوتبان گیانی دەردەچوو، چونکە بە(٧) گوللە زامدارکرابوو و لەشی لە خوێندا شەڵاڵ بوو... مام جوامێر بانگی هاوڕێیان دەکات، وردە وردە بە دەستە بەرە دەیگوازنەوە بەرەو هێڵی دواوە، لەوێشەوە هاوڕێیان و لایەنەکانی جود یەك دەگرنەوە. مام کانەبی بەرەو ئێران بەڕێدەکەن و لەوێ تیماردەکرێت، برینەکانی سارێژدەبن، بەڵام قاچێکی سەقەت بوو... تاکو دوا ساتەکانی ژیانی، کەس ئەو کەڵەپیاوەی وەکو خۆی نەناسی، خەباتی ئەویش بوو بە( سووتەڕۆ)، پتر لە(٤٠) ساڵ خەباتی چەکداری و چوار ساڵ زیندانی خێزان و منداڵەکانی، هەزاران کێشەو گرفتی ژیان، مێژوویی پڕ لە کوێرەوەری مام کانەبی پێکدەهێنا... مام کانەبی هەر ئەو کانەبییە بوو، کە لە شاخ دەماننناسی لەسەر پاکی و ڕاستگۆیی خۆی تووشی سەدان کێشە دەبوو... ئەو جوامێرە لە ٢٠١١/٥/٤ لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد و خێزانە خێرلەخۆنەدیوەکەیشی لە خانوویێکی(١٠٠) مەتریدا بەجێهێشت...

هاوڕێیانی بیتوێن وپشدەر، کە هاوڕێ ملازم ئەحمەد سەرکردایەتی ئەو میحوەرەی دەرکرد گەڕاینەوە بەرەو سنووری ئالّوەتان...(١٧/٠٠٠) فیشەکی یەدەکمان پاشەکەوت کردبوو، خزمێکی من ئاگاداربوو لە جێگایەك بۆمانی حەشاردابوو، خوالێخۆشبوو کاك ئەبوبەکر باداوەیی بە پارەی خۆی بە بڕی (١٧٠٠) هەزارو حەوت سەد دینار ئەو فیشەکانەی بۆ کڕیبووین، خۆم چووم لە ئۆردووگای بەستەستێن هێنام بۆ قەلاّتوکان... دوای یەك سالّ بە هەولّێکی زۆر هاوڕێ ملازم ئەحمەد پارەکەمان لە سەرکردایەتی حزب وەرگرتەوە بۆ کاك (ئەبوبەکر باداوەیی)یان ناردەوە، کە لەسەر راسپاردەی من فیشەکەکانی کڕیبوون... ئەو کاتە(حزب) بە پارە لە ڕێگای هاوکاری دۆستەکانییەوە تەقەمەنی پەیدادەکرد... هاوڕێ ملازم ئەحمەد منی راسپارد ئەو فیشەکانە بکڕم... سالّێك بوو ئێمە لەو سنوورانە نەمابووین ئەو فیشەکانە هەر پارێزرا بوون لە لایەن ئەو خزمەی ئێمە دواتر بۆ حزبمان گەڕاندنەوە.

هیچ سەرکەوتنێك لە سەرکەوتنی جەنگ خۆشتر نییە، سەرکەوتن لە جەنگ مرۆڤ بە ئیرادەو بەهێز دەکات، بەتایبەتی لەڕووی سیاسییەوە، بەلاّم پێچەوانەکەی زۆر(تالّە) هەموو کەسێك خۆی بۆ تێکشکانی سەربازی ناگرێت، کە گەڕاینەوە ئالّوەتان وردە وردە لەگەلّ بارودۆخەکە ڕاهاتین، رۆژانە خەریکی برژاندنی گۆشتی کەنغەر بووین، هەموومان خەریکبوو قەلّەو دەبووین و نیمچە مەدەنیانە دەژیاین...

## گفتوگۆی نێوان ی.ن.ك و ڕژێم:

لە کۆتایی سالّی ١٩٨٣ یەکێتی بە فەرمی دانی نا بە مفاوەزاتەکەیان لەگەلّ ڕژێم، کە پتر لە سالّێك بوو ژێر بە ژێر لە ڕێگای د. قاسملو سکرتێری گشتی(حزبی دیموکراتی کوردستان)ەوە بەردەوام بوو. یەکێتی لە ڕێگای رادیۆکەیانەوە شالاّوێکی راگەیاندنی دەست پێکرد کە زنجیرە گوتارێك بوو لەسەر گفتوگۆی نێوان یەکێتی و ڕژێمی دیکتاتۆری سەدام... ناوەڕۆکی گوتارەکان بریتی بوو لە پاساوهێنانەوە بۆ گفتوگۆکە، پێیان وابوو یەکێتی عێراق مەترسی لەسەرە بەهۆی جەنگی عێراق – ئێران، ناکرێت خەنجەری ژەهراوی لە پشتەوە لە سوپای عێراق بدرێت... کۆماری ئیسلامی ئێرانیان بە ڕژێمێکی کۆنەپەرست و مەترسیدار دەشوبهاند... پارتی و لایەنەکانی (جود)یان بە پاسدار موەقەتە ناودەبرد... لایەنەکانی جودیش بەیاننامەیەکی هاوبەشیان لە دژی گفتوگۆی نێوان یەکێتی و ڕژێم بلاّوکردەوە، بە

گفتوگۆیەکی فاشیل و سەرشۆڕانەیان وەسفکرد... ڕۆژ بە ڕۆژ دەنگۆی بڵاوبوونەوەی بەیاننامەی نێوان یەکێتی و ڕژێم لە شارەکانی کوردستان بڵاودەکرایەوە، ڕێکخستنەکانی یەکێتی زیاد لە پێویست بەشان و باڵی مفاوەزاتەکەیان هەڵدەگوت، ڕۆژانە خەڵکی کوردستان چاوەڕوان بوون ها ئەمڕۆ ها بەیانی ڕێکەوتننامەکە رادەگەیەنرێت، کەچی ڕژێم هەر ئاماژەشی بە ڕێکەوتننامەکە نەدەدا، بەڵکو لە ڕێگای دەزگاکانی ئەمن و ئیستخباراتەوە بڵاوی دەکردەوە، کە یەکێتی گەڕاوەتەوە ریزی نیشتمانی. دەزگاکانی ڕژێم وایان نیشان دەدا کە جاشەکان لە یەکێتی بە سوودو قازانجترن و لە پلەی پێشەوە دێن، نەك یەکێتی نیشتمانی کوردستان. لایەنەکانی جود بە هاوبەشی یەك بەیەك بەیاننامەیان بڵاوکردەوە، مفاوەزاتەکەیان شەرمەزارکرد، حزبی شیوعی عێراقی لە ڕێگای رادیۆی (دەنگی گەلی عێراق)ەوە زنجیرەیەك وتاری لەسەر مفاوەزاتەکە بڵاوکردەوە و کاریگەری زۆر بوو، یەکێتی زۆر بە شاڵاوی راگەیاندن سەغلەت بوو. (نەوشیروان مستەفا) لە کتێبەکەیدا بە ناوی (پەنجەکان یەکتر دەشکێنن) باسی لە کاریگەریی راگەیاندنی حزبی شیوعی دەکات...

## زوڵم و غەدەر لەبیرناچی؟[٢]!:

حزبی شیوعی عێراق و هاوڕێیان ئێستاشی لەگەڵ دابێ ڕووداوی پشت ئاشان و ئاسەواری براکوژی سەردەمی شاخیان لەبیرناچێتەوە، چونکە شیوعییەکان پێیان وایە یەکێتی لە کاتێکدا ڕێککەوتننامەی لەگەڵ واژوو کردوون هەر لەو کاتەشدا نەخشەی لێدان و پەلاماری پشت ئاشانی دادەڕشت، زۆر بێ بەزەیی بوون بەرامبەر بە شیوعییەکان، دەیان کادریان بە دیل و دەست بەستراوی قەتل و عام کرد. لەکاتێکدا ژمارەیەك لە هاوڕێیان هێشتا دیل بوون لای یەکێتی کاریگەریی پاشەکشێی پشت ئاشان بەرەو دێهاتەکانی سەر سنوور لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان... دووری لە کەسوکار ڕقێکی زۆریان کەڵەکە کردبوو بەرامبەر بە یەکێتی، پێمان وابوو غەدرمان لێکراوە، بە واتایەکی تر هەستمان بە کەمی و زوڵم و ستەم دەکرد، کە یەکێتی بە ناڕەوا بەرامبەر بە شیوعییەکانی پشت ئاشان و قرناقاو کردبووی... بۆ ئەوەی نیشانی بدەین، کە دوورکەوتنەوەی بارەگاکانی حزب کاریگەریان نابێ لەسەر چالاکییەکانمان، بڕیاردرا بە شێوەی پارتیزانی چالاکییەکان پەرەپێ بدەین... لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەم ساڵی ١٩٨٣ بە فەرماندەیی هاوڕێ مەحمود حاجی نادر لقی بیتوێن مەفرەزەیەکی هاوبەشی

له نێوان لقی پشدەرو بیتوێن ئامادەکرا. هاوڕێیانی لقی پشدەر پێکهاتبوون لە هاوڕێیان عەلی سەیدە، محەمەد ڕەسوڵ، هاوڕێ هێمن و هاوڕێ عەلی سەیدە و محەمەد ڕەسوڵ وەکو بەرپرسی عەسکەری هاوڕێ هێمن وەکو بەرپرسی سیاسی سەرپەرشتی مەفرەزەکەیان دەکرد لقی بیتوێن بە فەرماندەیی هاوڕێ مەحمود حاجی نادر، دەپەڕێتەوە بەرەو چیای ئاسۆس، لەوێشەوە دەچێتە بناری کۆسرەت، لە بناری کۆسرەت جەولەدەکەن چەند بارەگایەکی یەکێتی کە چۆڵکرابوون دەسووتێنن، چەند ڕۆژێك دەمێنێتەوە و سەرقاڵی جێبەجێکردنی کاروباری ڕێکخستن و ئەرکی تری مەفرەزەکە دەبن...لقی پشدەریش بەرەو سنووری گوندی بێدەلان و زێوکە دەگەڕێتەوە، لە گوندی(سونێ و شێنێ) هەواڵیان پێدەگات، کە یەکێك لە بەرپرسەکانی یەکێتی لە ناوچەکە لە ماڵی کەسێکە لە گوندی(بەرد قسڵ)، هاوڕێیانی بەرپرسی مەفرەزەکە بڕیاردەدەن ئەو بەرپرسەی یەکێتی بە دیلی بگرن بە ناوی(هەمزە سوور)، کە شێنێی بوو، ئامانجی هاوڕێیان تەنها دیلکردنی هەمزە سوور بوو نەك کوشتنی، بۆ ئەوەی حزب ئاڵوگۆڕی پێ بکات لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەی هێشتا بە دیلی لە لای یەکێتی مابوونەوە، بۆ ئەو مەبەستەش لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٩٨٣/١١/٤ ئەو ماڵە گەمارۆدەدەن، کە هەمزە سوور لەوێ میوانە داوا لە ناوبراو دەکەن خۆی رادەستی هاوڕێیان بکات، بەڵام ژن و خێزانی ئەو ماڵەی هەمزەی لێیە دەیکەنە گریان و هات و هاوارو خۆیان دەکەن بە چەپەری ناوبراو... هاوڕێیان زۆر هەوڵدەدەن، کە ناوبراو لە ناو ژن و منداڵەکان دەرچێ، بەڵام بێ سوود دەبێ، لەو بێنەو بگرەدا کات بە فیڕۆدەدەن، ویژدانیان قبوڵ ناکات بۆ ئەوەی نابراو لە ناو خێزانەکە دەربهێنن تەقە لە ناو ژن و منداڵی ئەو ماڵە بکەن یا ئاگر لە ماڵەکە بەربدەن. کە ئەوە ناکەن یەکێك لە ژنەکانی دراوسێی ئەو ماڵە هاوار دەباتە بەر پێشمەرگەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، کە هەمزە سووری شێنێیی لە گەمارۆی هاوڕێیان دەربازبکەن... لەو کاتەشدا سێ هێزی شەڕکەر لە پیشمەرگەکانی دیموکرات لە سنووری بارەگاکانی دیموکرات دەبن لە سونێ و(گەلوەرەز)، ئەو هێزانە، کە پتر لە(٢٠٠) پێشمەرگە دەبوون گەمارۆی هاوڕێیان دەدەن پێش ئەوەی تەقە لەو هاوڕێیانە بکەن، کە گەمارۆی ئەو ماڵەیان دابوو، کە هەمزە سووری شێنێی تێدا بوو... مەفرەزەی پشتگیری هاوڕێیان بە چەکی قەنناس و بیکەیسی لەمبەر بۆ ئەوبەری رووباری گوندی بەردقسڵ و بیدەڵان شەهیددەکەن رووبەڕوو ی ئەو هاوڕێیانە دەبنەوە، کە دەورەی ئەو ماڵەیان داوە... ئەگەرچی هاوڕێیان بە فەرمی بە

حزبی دیموکراتیان ڕاگەیاندبوو، کە مەفرەزەکەیان بە ئەرکێکی سەربازی لە ناوچەکەیە، کەچی سەرەڕای ئەوەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران پەیوەندی زۆر باش بوو لەگەڵ حزبی شیوعیدا قبوڵی نەدەکرد لە بنەو پاڵی بارەگاکانی ئەوان بەرپرسێکی یەکێتی بکوژێت یا بەدیلی بگرێت، بۆیە بیانوویێکی زۆر نابەجێیان بۆ ئەو شەڕە هێنایەوە بۆ حزبی شیوعی و وتیان پێمان وابوو(پارتین)، بۆیە شەڕمان کردووە لەگەڵ مەفرەزەکەتان... پەیوەندی نێوان حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پارتی دیموکراتی کوردستان چەندان ساڵ بوو تێکچوو بوو، کە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران گەلاڵەنامەی(٨) خاڵی دابوو بە کۆماری ئیسلامی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ یەکێك لەو هەشت خاڵانە دەرکردنی ئاوارەکانی کوردستانی باشوور بوو، کە زۆربەیان ئاوارەی پارتی بوون لە شۆڕی ئەیلولدا ئاوارەی ئێران ببوون...لەو جەنگە جەرگبڕەدا(٥) هاوڕێی دڵسۆزو تێکۆشەر شەهیدکران، کە نموونەی فیداکاری بوون، هاوڕێیان محەمەد ڕەسوڵ، هێمن، سەرکەوت، ئالان، عامر، هاوڕێیەکی تریشمان بریندابوو بە ناوی(کۆسرەت)، شەهیدبوونی ئەو پۆلە شەهیدە بە قەدەر رووداوی پشت ئاشان کاریگەری لەسەر لقی پشدەر هەبوو. ساڵی ١٩٨٣ ساڵێکی شوم بوو، هەم وەکو حزب بە گشتی هەم وەکو لقی پشدەر، کە باشترین هاوڕێمان لە جەنگی براکوژیدا شەهیدکران، کە خواست و ویستی هاوڕێیان نەبوو... ئەو رۆژەی کە مەفرەزەی هاوڕێیان بەرێدەکەوت بەرەو خوارەوە، منیش هەر ئەو رۆژە لە خوارەوە دەگەڕامەوە، ئەو سەردانەم تەنها بۆ فرۆشتنی سێ پارچە چەك بوو بۆ خەرجی هەردوو لقی پشدەر و بیتوێن، کە ماوەی چەند مانگێك بوو یارمەتی هاوڕێیان نەدرا بوو، بەتایبەتی ئەو خێزانانەی کەم دەرامەت بوون، بڕە پارەیەکیش لەو پارەیە تەرخانکرابوو بۆ کڕینی خواردەمەنی و پێداویستی بارەگا بۆ وەرزی زستان... پارەکە هەمووی لای هاوڕێ هێمن بوو لە قەفی پشتێنی بەستبوو کە شەهیدکرابوو پارەکە بە خوێنی هاوڕێ هێمن سوور بوو، کە هەواڵمان زانی هاوڕێیان شەهیدکراون لە داخان خەریکبوو دڵم راوەستێ، بڕواناکەم رۆژێك لە رۆژان بۆ هیچ شەهیدێك گریانم هاتبێ، چونکە هەموومان دەمانزانی شەهیدبوون شتێکی ئاساییە، بەڵام بە بیستنی شەهیدکرانی ئەو پۆلە هاوڕێیە داهێزرام، بەتایبەتی بۆ شەهید(محەمەد ڕەسوڵ). من و محەمەد وەکو برا وابووین لە شاربازێڕو بناری کۆسرەت و بێتووش رۆژگارێکی دوورو درێژمان بە یەکەوە گوزەراندبوو... هاوڕێ محەمەد گەنجێکی جوان و باڵا بەرز بوو، لە حوجرە خوێندبووی، زۆر نەرم و هێدی و ئاقل و چاپووك

بوو، لەدەستدانی(محەمەد و هیوا) یەك بەدوای یەكدا، دوو برادەری زۆر نزیكی شەخسیم بوون، كە كاریگەرییەكی زۆریان لەسەر دەروونم دانا... لەدەستدانی مشورخۆرێكی وەكو شەهید هاورێ (ڕەسوڵ سوور) وەكو لەدەستدانی باوكێك وابوو لە ناو خێزانێكی گەورەدا. هەردوو برای لاوی جوانە مەرگ و جوامێر، عەبدوڵڵا دەڵگەیی و قادر دەڵگەیی كەلەبەرێكی گەورەیان لە ریزبەندی كوڕە قۆزەكانی قەڵادزێ كردبوو. (مستەفا)گیانیش هیچ بڕوای بە سەركردایەتی حزبی شیوعی نەمابوو، بەرەو قووڵایی ئێران سەری خۆی هەڵگرت و حزبی بەجێهێشت. هاوڕێ سەلیم حەسەن و محەمەد دەڵگەیی بۆ چارەسەركردنی نەخۆشی ڕەوانەی هەندەران كرابوون... ساڵی ١٩٨٣ ساڵێكی زۆر شووم بوو بۆ لقی پشدەر، هەستم بە جۆرێك لە غەدرو ستەم دەكرد، كە نەیارانی حزبی شیوعی بەرامبەر بەو حزبە ئەنجامیان دابوو، هەر بۆیە وەكو تەڵقیندان خۆم تەڵقین دابوو هەموو توانایەك بەكاربهێنم بۆ ئەوەی(حزب) لەم قەیرانە دەربازبێت...

## ژیانی ژێرزەمینی:

ئەگەرچی بارودۆخەكە زۆر مەترسیدار بوو هەم ڕژێم لەوپەڕی لە خۆبایی بوون بوو، هەم یەكێتی لە خۆی بایی بوو، كە لایەنەكانی (جود)ی لە سنووری ژێر دەسەڵاتی خۆی وەدەرنابوو، لەڕووی سیاسیش خۆی ساغكردبۆوە، كە بەردەوام دەبێت لە گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێم، ئومێدێكی زۆریشی لەسەر گفتوگۆ هەڵچنیبوو، لەم رۆژگارەدا كەوتبووینە سەر دووڕیانێكی یەكلاكەرەوە یا دەبوو رێكخستنەكان پشتگوێ بخەین و لە ئالۆەتان دانیشین، كە دابڕانێكی راستەقینەبوو، ئەو دابڕانە كەلەبەرێكی تری دەخستە سەر كارەساتی پشت ئاشان یا دەبوو قوربانی بە خۆم بدەم و بیر لە مانەوەیەكی درێژخایەن بكەمەوە لە ناوەوە. ئەو بڕیارە لە ١٠٠٪ مەترسی لەسەر ژیانی خۆم و خێزانەكەمان هەبوو، بەڵام كەی ئێمە بیرمان لە ژیانی خۆمان و خێزانەكەمان دەكردەوە...دوای ئەوەی لەگەڵ هاورێ مەحمود حاجی فەقێ خدردا ڕاوێژم كرد و فەرمانی ئەوم وەرگرت بۆ مانەوەیەكی درێژخایەن لە ناوەوە بمێنمەوە. لە رۆژی ١٩٨٣/١١/٢٤ من و هاورێ هەمزە سوور بەرەو سنووری كوێستانەكانی گوێزێ وەرێكەوتین. پێویست بوو رێگای ئالۆەتان بەرەو قەڵادزێ و سەنگەسەر بە سێ قۆناغ ببڕین. **قۆناغی یەكەم** كوێستانەكانی قەندیل، **قۆناغی دووەم** بناری قەندیل بەتایبەتی لێڕەواری گردی رەمكان و گوندی رەزگە، **قۆناغی سێیەم** پێدەشتی بەستەستێن و بناری بیرێ، كە تەپۆلكەكانی باكووری

گوندەکانی زوودان و شەروێت و سیدەلان و قەلاوە، ئینجا دەگەیشتینە گوندە خنجیلانەکەی بەستەستێنی سەرێ، کە تەمەنی منداڵیم لەو گوندە بەسەربردوە و تێیدا گەورە بووم... قۆناغ بە قۆناغ وەکو دوو براو دوو هاورێ بە کوێستانی **گوێزیلیدا** شۆڕبووینەوە بەرەو کانی **دڕولەی** لە رۆژهەڵاتی **حەساری مامەڕەش**. من و هاورێ هەمزە وەکو ئەندامی یەك خێزان وا بووین، خێزانی هەردوو لامان لەمێژ ساڵە تێکەڵاون، وەکو دوو بنەماڵەی هاوبیروباوەڕ و ناسیاو لە گوندی شەروێت و بەستەستێن بووین. لە سەردەمی پێشمەرگایەتی و رۆژگارە سەختەکان بە هانای یەکترەوە هاتووین. هاورێ هەمزە سوور پێشمەرگەیەکی زۆر دڵسۆزو ڕەوشت بەرز و لە هاورێیەتیدا نموونە بوو. زۆر شارەزای رێگاو بانەکان بوو، بەتایبەتی لە تەپۆلکەکانی رۆژهەلاتی گوندەکەی خۆی شەروێت و زودان، هەموو جارێ بۆ پێکەنین دەیگوت بە مێردمنداڵی سەت جار ژوانم تێداکردووە! بە واتایەکی تر دەیگوت بن بەرد بە بن بەردی ناوچەکە شارەزام، بەڕاستیش وابوو. من کە ئێستا لە ژیاندا ماوم قەرزداری هاورێ هەمزە سوورم، چونکە هەمزە بۆڕی ڕێوی دابوو لە فڕوفێڵی کەمین و خۆلادان لە پیلانی سوپاو جاشەکان لە کاتژمێر دووی شەو بوو، هاورێ هەمزە نیشانەی خۆی بەکارهێنا بۆ ئەوەی دایکم ئاگاداربکاتەوە. وەکو لە جێگایەکی تر ئاماژەم پێداوە لە دەرگادانی من و هاورێ هەمزە لەگەڵ خەڵکانی تر جیابوو، دایکم دەرگای کردەوە توند باوەشی بە مندا کرد ئینجا هاورێ هەمزەشی وەکو من ماچ کرد، خولق و بەخێرهاتنی دایکم لەگەڵ هەموو ژنی دنیا جیاوازە، هەر پێنج دەقیقە جارێك دەڵێ یاخوا بەخێر بێن سەر گلێنەی چاوانم، رۆڵە بە کوێدا هاتن، خۆ تووشی هیچ نەبوون، بە خوای کراسێکی هەتیوانم بۆ کردوون بەخێر. هەر ئێستا بەخەو لەگەڵتان بووم. ئەو رستەو وشانەی دایکم وەکو ریزبەندی تەسبیح بە دوای یەکتردا ریزدەکران بێ ئەوەی فریای وەڵامدانەوە بکەوین. ئینجا وەکو میلی کاتژمێر وابوو راوەستانی نەبوو لێکدا لێکدا پێی دەگوتین: هانێ فلان خواردنە بخۆن... برایم بەیانی برۆ بۆ سەنگەسەر و فلان شتە بکڕە... کە ئێمە لە ناوچەکە دەبووین مام برایم و کەرە بۆز بەردەوام لە رێگادا بوون، هەم بۆ کاری حزبی هەم بۆ ئەرکی دایکم... کە مام برایم چوو بۆ سەنگەسەر ڕامسپارد هاورێ(سورە) ئاگاداربکات... ئێوارێ بە درەنگەوە هاورێ(سورە) گەیشت، ناوبراو چونکە لە ناوچەکە ناسراو بوو و بە کادرێکی حزبیان دەزانی، وەك ئێمە بە قاچاخی دەهاتە ماڵی مام برایم. هەربۆیە لەبەرئەوە لە جموجۆڵی رۆژانەدا بە وریایی هەڵسوکەوتی دەکرد، تا کەس

هەست نەکات ئێمە لەوێین، لەکاتی نان خواردنی ئێوارەدا خۆی بە ژووری ماڵی مام برایمدا کرد... ئەو شەوە هەتا سەعات سێی شەو هەر دانیشتین، پلان و بەرنامەی کارو چالاکییەکانمان دانا. بڕیارماندا هەر پانزە ڕۆژ جارێك سەردانی ڕێکخستنەکان بکەین، هەر مانگی چەند جارێك هەڵمەتی بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەکانی حزب ئەنجام بدرێت وەکو پۆستەری شەهیدان و ڕۆژنامەکانی(حزب)... لەگەڵ هاوڕێ(سورە)دا زۆر ئاسوودە بووم، متمانەیەکی زۆرم پێی بوو، لە هەڵسەنگاندن و جموجۆڵی دەزگاکانی ڕژێمدا، زۆر وردو ژیرانە بیری دەکردەوەو هاوڕێکانی دەپاراست... لە سێیەم شەودا چووم بۆ ئۆردووگای بەستەستێن نامەیەکی هاوڕێ (مەحمود حاجی فەقێ)م پێ بوو بۆ کاك مەحمودی محەمەدی مەلا شەریف، نەمدەزانی ناوەرۆکی نامەکە چییە، بەڵام دەمزانی کە چەند جارێك کاك مەحمود بە تەقەمەنی هاوکاری لقی پشدەری کردووە... لە ڕێگای کاك ئەبوبەکری باداوەییەوە نامەی هاوڕێ مەحمودم بە کاك مەحمود گەیاند، کە نامەکەی وەرگرتبوو بە کاك ئەبوبەکری وتبوو حەزدەکەم هاوڕێ محەمەد ببینم...کاك ئەبوبەکر پێی ڕاگەیاندم، کە حەزدەکات بمانبینێ. منیش پێشنیارەکەیم قبوڵ کرد، لە ماڵی کاك محەمەدی کوڕی کاك ئەبوبەکر باداوەیی چاوم بە کاك مەحمود کەوت، وتی هاوڕێ مەحمود لە نامەکەیدا نووسیویەتی کە هاوکاری تۆ بکەم، بەڵام خۆتان دەزانن (ڕژێم) زۆر دڕندانە ڕووبەڕووی پێشمەرگە دەبێتەوە، بەتایبەتی ئێوەی شیوعی وەکو تریاك وان، هەر بۆیە پیویستە تۆ نامەیەك بنووسی کە خۆت تەسلیم بە ڕژێم دەکەیتەوە، کە لە جێگایەك دەستگیرکرایت ئەوسا دەڵێم ئەوەتا نامەی نووسیوە، کە خۆی رادەستی ڕژێم دەکاتەوە... کە ئەو قسانەم لە کاك مەحمود بیست خۆم لەبەر چاو کەوت، بە نیگەرانییەوە وەڵامم دایەوە و وتم کاك مەحمود تۆ پێت وایە کاك مەحمود داوای لێکردوویت من داڵدەبدەیت؟ وتی دەڵێ هاوکاری هاوڕێ محەمەد بکە، وتم مەبەستی ئەو جۆرە هاوکارییە نییە، چونکە من ئەو هاوکارییەم ناوێت، هاوڕێکانم من دەپارێزن، ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان بە زیندوویی دەستگیرکرام دیفاعی کەسم ناوێت، ئێمە وا پەروەردەکراوین دەکوژرێن ناگیرێن، کۆبوونەوەکەم بە رستەیەك کۆتایی پێ هێنا و پێم وت: کاك مەحمود دنیا سەری بە پووش نەگیراوە؟!...

## هەڵکەندنی ژێرزەمین:

گەڕامەوە ماڵی دایکم. چەند جێگایەکمان دەست نیشان کرد بۆ ئەوەی ژێرزەمینی تێدا هەڵکەنین. پێش ئەوەی ژێرزەمینەکە هەڵکەنرێت، لەگەڵ دایکمدا بە شێوەیەك دەدوام کە حەزم دەکرد دایکم تێ بگەیەنم مانەوەم لەوێ مەترسی لەسەر تەواوی خێزانەکەمان دروستدەکات. مەبەستم بوو وتەی ناخی دایکم بزانم، کەچی دایکم وەڵامێکی زۆر لەسەرخۆو دڵنیاکەرەوەی دامەوە، وتی رۆڵە کە تۆ لێمان نزیك بیت ئەو شەوانە بە ئاسوودەیی دەخەوم، بە پێچەوانەوە لێمان دووربیت هەرگیز ئۆقرەناگرین. مرۆڤ لە رۆژانی تەنگانەدا دڵسۆزی و خۆشەویستی خزم و کەسە نزیکەکانی بۆ دەردەکەوێت بەتایبەتی دایك. دڵسۆزی دایك بۆ منداڵەکانی وەك هیچ کەس نییە، دایکم بۆ من دڵسۆزترین کەسە... هەر ئەو رۆژە مام برایم بە سواری کەرەبۆز چوو بۆ سەنگەسەر، پاچێك و نوێڵێکی تایبەتی کڕی و هێنایەوە، بە ماوەی سێ شەو کونێکمان لێدا لە ناو چێشتخانەیەکی بچووکەوە بۆ دیواری ئەودیو، کە تێکەڵدەبۆوە لەگەڵ حەمامێکی کۆن کە بۆ خۆ شووشتن بەکار نەدەهات. لە ژێر بناغەی ئەو حەمامەدا کونێکی(١×١م)مان تەواوکرد. دایکم و خەیاڵی خێزانم و بەندە بووین. من هەڵمدەکەند، ئەوانیش خۆڵەکەیان فڕێ دەدا، کونەکە شێوەی لە کونە ریوی دەچوو بە مارپێچی هەڵکەنرابوو، تا دوای کاتژمێر یەکی شەو لەو کونە دەرنەدەچووم. رۆژانە هەردوو قاچەکانم بە لادیواری کونەکە هەڵدەپەسارد. لە رێگای رادیۆییێکی بچووکەوە ئاگاداری دنیای دەرەوە بووم. سەرووی کونەکە کونێکی کەوانەیی بۆ هەوا تێدا بوو، هەر بە قەدەر گۆلمەی دەست بەرین بوو، بۆ هەناسە وەرگرتن گۆڕێکی تەواوبوو...

## رۆڵی کەرە بۆز:

کەر و هێستر باشترین هۆکاری گواستنەوەی کەلوپەلی بارەگاو تەقەمەنی و تەرمی شەهیدان و برینداران بوو، لە هەندێك جێگادا کە چالاکی سەربازی ئەنجام دەدراو شەهیدو بریندار لێ دەکەوتەوە، (کەر) یا گوێدرێژ کەڵکی لێ وەردەگیرا. زۆر جار کە مەفرەزەی پێشمەرگە بە ناو زنجیرە ڕەبیەکانی سوپاو جاشەکاندا ڕەتدەبوو، لبادیان لە سمی کەرەکە دەئاڵاند، لمبۆزیان بە جەمەدانە یا گوریس دەبەست تا نەزەرێت. کەر لە مەفرەزە پارتیزانەکانی دوای ئەنفال رۆڵێکی گرینگی هەبوو، خواردەمەنی و پێداویستی رۆژانەی پێشمەرگە لە پشتی گوێدرێژ دەبەسترا...

ئەو نموونانەی سەرەوە کە لەسەر گوێدرێژ هێنامەوە بۆ ئەوەی سەرنجی خوێنەری خۆشەویست رابکێشم بۆ سەر رۆڵی گوێدرێژ لە خەباتی پێشمەرگایەتی شاخدا... کەرەبۆزی مام برایم یەکێك بوو لەو کەرانەی رۆڵێکی زۆر گرینگی گێڕا لە ئەنجامدانی ئەرکی رێکخستنەکان. کورتانی کەرەبۆز بۆ بردنی بەریدی حزبی لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر، بە چەند جێگا جێسازی تێدا کرابوو، تەنانەت زۆرجار چەکی کلاشینکۆف و دەمانچەی عەقرەبیشمان هەر لە کورتانی کەرەبۆزدا دەشاردەوەو بۆ هاوڕێیانی رێکخستنەکانمان دەنارد...

لە ماوەی ئەو شەش مانگەدا، کە لە ناوەوە بووم مامم خۆی و کەرەبۆزەکەی هاوکارێکی سەرەکی و کاریگەر بوون بۆ سەرکەوتنی ئەرك و کارەکانمان ... هەروەکو لە سەرەتادا باسم کردووە، مامم دڵسۆزترین کەس بووە لە رۆژگارە سەختەکاندا، رۆژێك لە رۆژان هەستم پێنەکردووە ترسا بێت یا بیانوویێکی هێنابێتەوە و خۆی لە ئەرکێك دزیبێتەوە، یا لە ئەرك و فەرمانی حزب سڵی کردبێتەوە... ئێمەی شیوعی ئەوسا وا گۆشکرابووین، کە کاری رێکخستن لە خۆمان و کەسە نزیکەکانمانەوە دەست پێ بکەین. هەر لەسەر ئەو پرەنسیپەش بوو هەموو خێزانەکەمان لە کارو چالاکی حزبەوە گلاندبوو، مامم، دایکم، براکانم، خێزانم، بە سەدان جار لەسەر بردن و هێنانی بەریدی (حزب) کەوتوونەتە بەر گەورەترین مەترسی. لە١٠٠٪ لە مەرگ و تێداچوون نزیکبوونەتەوە و هەر بە رێکەوت رزگاریان بووە. بڕواناکەم مێژوو جارێکی تر ئەو رۆژگارانە بەخۆیەوە ببینێتەوە و ئەو مرۆڤانە دروست بکاتەوە...

بەسەرهاتێکی سەیر هەبوو لەسەر کورتانی کەرەبۆز. جارێك دۆستێکی مام برایم کەرەبۆز لەگەڵ خۆی دەبات. ئەوسا بۆ بردن و هێنانی باراشی خێزان لە دێهاتەکان گوێدرێژ بەکاردەهات. کاتێك ئەو دۆستە کەرەکە کورتان دەکات، لەگەڵ تەنگەدانی کورتانەکە، رۆژنامەی(حزب) بەردەبنەوە. ئەو برادەرەش دەڵێ، وەڵڵا ئەو شیوعیانە کەرەکانیشیان حزبایەتی دەکات. لەوێ بە پەلەپەل رۆژنامەکان دەشارێتەوەو کەرەکە دەهێنێتەوە بۆ مام برایم و پێی دەڵێ: کوڕە خەریکبوو تووش بم، هەتا تەنگەم دەدا رۆژنامە لە کورتانەکەی هەڵدەوەری. خەڵکەکە پێی گوتم کاکە تۆ باراشت هێناوە یا بەریدی حزبی شیوعی؟ کاك برایم توخوا ئەوە چاکە نەبوو لەگەڵتدا کردم...

هاوڕێ هەمزە سوور لە ژاراوە لە ماڵی باوکی بوو، بەهۆی مەترسی و جموجۆڵی جاشەکان، بۆ ئەوەی مەترسی لەسەر هاوڕێیان دروست نەبێ، زۆر جار جێگای خۆی دەگۆڕی. سەرەتای

مانگی نیسانی ساڵی ١٩٨٤ بەرەو ئاڵوەتان گەڕاینەوە کە بارەگای لقی پشدەری لێ بوو، زۆر ماندووبووین، ڕێگای یەك سەعاتمان بە دوو سەعات دەبڕی، هەردووکمان ڕەنگمان سپی هەڵگەڕابوو، ئەو شەش مانگە گۆڕانکاری بەسەر بەدەنماندا هاتبوو، جەستەمان سست ببوو، لە پێشمەرگەی جاران نەدەچووین. لەگەڵ هاوڕێ هەمزە سەیری یەکترمان دەکردو پێدەکەنین، جاران لە ئاسکەکێوی دەچووین، ڕێگا خۆی لەبەرنەدەگرتین، کەچی وا شەپرزەبووین وەکو قاچەکانمان سندم کرابن وابوو، ماوەی سێ ڕۆژمان پێچوو تا گەیشتینەوە بارەگای(لق)، ناو هاوڕێیان. لەو شەش مانگەدا دەیان چالاکی هەمەجۆرمان ئەنجامدا، هەموو هەفتەیەك چالاکییەکمان ئەنجام دەدا وەکو نووسینی دروشم، بڵاوکردنەوەی ئەدەبیاتی حزب، وردە چالاکی سەربازیش ئەنجام دەدرا لە بەرامبەر سوپاو نۆکەرەکانی ڕژێم، لەو شەش مانگە هیچ بۆشاییەك بۆ ڕێکخستنەکان دروست نەبوو، بە پێچەوانەوە لە ساڵانی پێشتر چالاکتر بوون و گەشەیان ساند...

## جارێکی تر پێکهێنانەوەی ماڵ:

دوا ئەوەی بەهۆی ڕووداوی پشت ئاشان ماڵەکەمان تاڵانکراو خانووەکانمان لە ڕەزگە سووتان. ئەستەم بوو جارێکی تر ماڵ پێکەوە بنێینەوە بەتایبەتی لە ژیانی ئاوارەییدا. بەڵام بیرم لە ئایندەی دایکی هۆنیا دەکردەوە، کە خۆی و منداڵێك هەتاکەی لەمن دوور بێ؟ شۆڕشی چەکداری هیچ ئاسۆیەکی دیارنەبوو. کەس نەیدەزانی چارەنوسمان بە کوێ دەگات، هەر بۆیە بڕیارم دا مردن و ژیانمان بە یەکەوە بێت، ئەوە بوو لە ڕێگای کاروانچییەکانی ئاڵوەتانەوە، کاك محەمەدی سۆفی قادری و حەمەدی مام حوسێن کالانی، دایکی هۆنیاو خوشکە زێنەبی خێزانی هاوڕێ عەلی گۆران و، خوشکە حەلیمەی خێزانی کاك(کەریم والی) یان بە یەکەوە هێنا بۆ ئاڵوەتان... کە دایکی هۆنیا گەیشتە ئاڵوەتان مانگی ئایار بوو هەمووی هەفتەیەك بوو بارەگای(لق) بەرەو خوارکوڕك چوو بوو، من و هاوڕێ عەلی گۆران و هاوڕێ هەمزە سوور لە ئاڵوەتانماینەوە... پێشتریش کاك مەحمود حاجی فەقێ خدر ماڵی لە ئاڵوەتان دانابوو، لەگەڵ ماڵی هاوڕێ حەسەن خدرو هاوڕێ مەلا خدر... ئەو خانووەی ماڵەوەم تێدا دانابوو ڕەشە خانوویێکی زۆر کۆن بوو، هی مام(ڕەسوڵ) ناوێك بوو، کە بەهۆی جەنگی چەکداری حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆماری ئیسلامییەوە ئاوارەی عێراق ببوو...

هەر لەو خانووەدا هاوێری کچم لە ١٩٨٤/١١/١٦ لەدایکبوو. پێکهێنانەوەی ماڵ، هەروەها خێزانداری لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا، بە تایبەتیش لە ژیانی ئاوارەییدا، زۆر سەخت و دژوار بوو، بەڵام سەرەڕای ئەو سەختیانەش هەمووی زۆر خۆش بوو، چونکە هیچ خۆشییەك ئەوەندەی خۆشی ناو خێزانی خۆت بەختەوەرت ناکات، ئەگەر ژیانێکی پڕ لە کوێرەوەریش بێت، چونکە لە نزیکەوە چاودێری خێزانەکەت دەکەیت لە خۆشی و ناخۆشیدا بەشداری یەکتری دەکەیت...

## بەفرو کرێوەی دەشتی وەزنێ[٧]:

هێشتا تەمەنی هاوێری کچم تەنیا هەشت رۆژ بوو، کە هاوڕێیان فەرمانیان دا هاوڕێیەتی هاوڕێ عارف رانیەی و هاوڕێ حەسەن کاکە بکەین، کە دەیانەویست بەرەو ناوەوە بگەڕێنەوە. بەندە و هاوڕێ حەسەن خدر و هاوڕێ نەوزاد سابیر علوەی کۆیی، یاوەری هاوڕێ عارف و حەسەن کاکەمان کرد. لە رۆژی ١٩٨٤/١١/٢٤ بەرێکەوتین ئەو رۆژە کە لە ئالۆەتانەوە هاتین پتر لە دوو مەتر بەفر باری بوو. بە دوانزە پلیکانی بەفردا لە سەربانەوە دەچووینە ناو ژووری ماڵەکەمان. ئەگەرچی زۆر نیگەران بووم بۆ دایکی هۆنیا، کە تازە هاوێرمان ببوو و زۆر پیویستی بەمن بوو هاوکاری بکەم، بەڵام فەرمان و بڕیاری حزبمان پێ نەشکا هاوڕێیانی بەرپرسیش یا ئەو گرفتەیان لە بیر نەبوو یا بە لایەنەوە گرینگ نەبوو گرفتی من چییە لە ماڵەوە... ئەو رۆژە رێکەوتێکی زۆر سەیر بوو، ساڵی ١٩٨٣ لە هەمان رۆژدا لە ١٩٨٣/١١/٢٤ بە کوێستانەکاندا تێپەڕین، ئەم جارەش لە هەمان ڕێکەوت بە هەمان جێگادا هاتینەوە. ئەگەرچی کوێستانەکان زۆر سەخت و پڕ بەفر بوون، بەڵام ئەو رۆژە رۆژێکی خۆش و کەش و هەوا ساماڵ بوو، بۆ ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە خڕێ زاخێ، لە قونەبانی کێلێ لە باشوری گوندی رەزگە پشووماندا. تا شەو درەنگتر دەبوو، هەورەکان چڕتر دەبوون. ئێوارە بولێڵ بوو، سەگ و گورگ لە یەکتر جیادەکرایەوە، شۆڕبووینەوە بەرەو خڕو شیو و گردو لاپاڵەکانی گوندی(زوودان). لەو سەرەو لێژە سەختانەی کەوتۆتە سەر تەپۆلکەکانی کانییە زودان رێگامان هەڵەکرد، بە رێگای رەبیەکەدا دەڕۆیشتین بە دەنگی فیشەکی حەرەسی رەبیەکە بەئاگاهاتینەوە و زانیمان رێگاکەمان هەڵەکردووە. هەر بەرەو رۆژئاوای تەپۆلکەکە رێگامان گرتەبەر بە سەرەوژێرێکی زۆر ڕکدا شۆڕبووینەوە، لەو سەروژێرەدا هاوڕێیان زۆر ئەزیەتیان بینی، هەموو هاوڕێیان بە هێمنی رەفتاریان دەکرد تەنها هاوڕێ حەسەن

کاکە زۆر تووڕەبوو، بەڵام هەمیشە لەو کاتانەدا کە مرۆڤ هەڵە دەکات، بەتایبەتی لە هەتەڵەکردنی ڕێگادا دەبێ لە سەرخۆ بێت بەرامبەر بە ئەوانەی بەهۆی هەڵەی ئەو هیلاك و ماندوودەبن... لە دوای کاتژمێر یەکی شەو گەیشتینە ماڵی مامم، ئەو شەوە لەوێ بووین، بەیانی زوو دەرچووین بەرەو ئۆردووگای بەستەستێن، ئەو ڕۆژە لە ماڵی(حەسەن)ی ئامۆزامماینەوە. ئەو ڕۆژە لە دوای هاوڕێ سوورەم نارد بۆ ئەوەی ئاسانکاری بۆ بەڕێکردنی هاوڕێ حەسەن کاکە و هاوڕێ عارف بکات بەرەو(رانیە). هاوڕێ(سوورە) وەکو هەموو جارێك مشورخۆری هاوڕێیانی رانیە بوو، ئەمجارەش ئێوارەیەکی درەنگ لەگەڵیان ڕۆیشت بە ناو سەنگەسەردا بەرەو شاخی کێوەڕەش. کە هاوڕێ عارف و هاوڕێ حەسەن کاکە بەڕێکران دواتر سەردانی هێڵەکانی(ڕێکخستن)مان کرد. هێڵەکانی ڕێکخستن گەشەیان کردبوو، جەماوەر زۆر هاوسۆز بوو لەگەڵ لایەنە کوردستانییەکانی شاخ و بەردەوام پەیوەندییان بە ڕێکخستنەکانەوە دەکرد و دەبوون بە پێشمەرگە... لە ڕۆژی ١٩٨٤/١٢/١٧ گەڕاینەوە، بەفرێکی ئەستوور باری بوو. لە دەشتێ و بنارەکانی قەندیل تەنها یەك ڕێگا هەبوو پێیدا بگەڕێینەوە، ئەویش ڕێگای چەکوچ و سادر بوو، ئەو ڕێگایەو کوێستانەکان بەفرێکی زۆریان لێ باری بوو، نەماندەتوانی بەو ڕێگایەدا بگەڕێینەوە. پێش ئەوەی بگەینە گوندی ئالیەڕەش رووم لە هاوڕێ حەسەن خدرو هاوڕێ نەوزاد کرد، پێم گوتن کە هیچ چارەمان نییە دەبێ بە چۆمی سوێسنێدا بە ناو بارەگاکانی یەکێتیدا بڕۆین. ئەوسا یەکێتی و لایەنەکانی جود پەیوەندییان زۆر خراپ بوو، دوژمنایەتی یەکتریان دەکرد، چەند مانگێك لەمەوبەر مەفرەزەیەکی هاوبەشی سۆسیالیست و (حزب) لە قەڵادزێ دەگەڕێنەوە، لەو بارەگایەی سوێسنێ یەکێتی ڕێگایان لێدەگرێ و جەنگ لە نێوانیاندا دروستدەبێت، لە ئەنجامدا فەرماندەیەکی یەکێتی دەکوژرێ، کە بە داخەوە برایەکی کاك حاجی دێلوییی بوو بە ناوی حەسەن... لەبەر ئەوە حەزمان نەدەکرد جارێکی تر رووبەڕووی یەکێتی بینەوە، بەڵام چارەمان نەبوو هەر دەبوو بە ناو بارەگای سوێسنێی یەکێتیدا بڕۆین... بە وریایی بە بەر دەرگای بارەگاکەیاندا ڕەتبووین، هەر سەیریان دەکردین و چاوەڕوان بوون سڵاویان لێ بکەین، بەڵام بێ سڵاوکردن تێپەڕین. کات بەرەو ئێوارەیەکی درەنگ شۆڕدەبۆوە بەفر بڕین و هەوراز بڕین مرۆڤ شەکەت و ماندوودەکات، ئەو هەورازەی کە جاران بە سەعاتێك دەمانبڕی بەهۆی ماندووبوون و بەفرێکی زۆرەوە بە دوو سەعات بڕیمان. گەیشتینە(کانی وەتمان)، کانییەکە کەوتۆتە نێوان گوندی(زێوکەو بێدەلان) لە بن چیای جاسووسان. لە ناو کاولە خانووە

رووخاوەکەدا گەڕام هەتا تەنەکەیەکی ژەنگاویم دۆزییەوە، لەگەڵ هاوڕێ (نەوزاد) هەندێك بەفرمان تێوەر کردو پڕمان کرد لە بەفرو وەبەر ئاگرمان نا، چاییشمان لە کۆڵەپشتەکاندا بوو، هەرچەندە هاوڕێ حەسەن خدر زۆر ناڕازی بوو پشوو بدەین و چا لێ بنێین، بەڵام بە قسەمان نەکرد. چایەکەمان لێنا، چایەکە پێگەیشت و کەمێك حەساینەوە. کاتژمێر یەکی شەو گەیشتینە گوندی(دۆڵەتوو)، گوندی دۆڵەتوو لە نێوان دەسەڵاتی سوپای پاسداران و پێشمەرگەکانی حزبی دیموکراتی کوردستاندا بوو، لە دەرگای ماڵی کاك حەمەدی پوور بێرییەمان دا. ناوبراو خەڵکی کونە مشکەی دەشتی وەزنێ بوو...زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردین، ئەوەندە ماندوو هیلاك بووین لە قسەکردندا خەومان دەهات ئەو شەوە خەوتین، بەیانی نانمان خواردو وەڕێکەوتین. بەفرەکە ئەوەندە زۆر بوو هەنگاومان بۆ هەڵنەدەهات. پتر لە دوو مەتر بەفر باری بوو. هاوڕێ حەسەن و نەوزاد لاقیان درێژ و لاقەکانی من کورت بوون. بە پێکەنینەوە پێم دەگوتن هیچ مەمنون نیم وەپێش کەوتوون، چونکە لەبەر هەنگاو درێژیتان جێ پێی ئێوە بە دەردی هەنگاوەکانی من ناخوا، ئێوە قوچ و درێژن و منیش کورتە باڵا!! هەتا لە دەشتی وەزنێ نزیکتر دەبووینەوە تەم و مژ چڕتر دەبۆوە. کاتێك گەیشتینە ناو دەشتی وەزنێ ڕێگامان بزرکرد، بەفرو کڕێوە بوو نەماندەزانی بەرەو کوێ دەڕۆین. بە هەر چواردەوری خۆماندا دەسوڕاینەوە. سەرمان دەرنەدەکرد کام ئاراستە بگرین. بە هاوڕێ حەسەن و نەوزادم وت پێویستە ئاوەڕۆیی دەشتی وەزنێ بدۆزینەوەو پێیدا بڕۆین. هەرواشمان کرد ڕاڕەوی چۆمی وەزنێمان دۆزییەوە، بەو ئاراستەیە توانیمان بارەگاکانی پارتی لە کونەمشکە بدۆزینەوە. گەیشتینە ناو بارەگاکان یەکەم بارەگا، کە تووشی بووین بارەگای کاك ڕەسوی مەنزەمە بوو. وەکو تابلۆیەکی سەهۆڵ وا بووین، شیخەسۆڵ بە سمێل و جل و بەرگ و هەموو لەشمان دا شۆڕببووە. بە ئاوی شیلەتێن سەهۆڵی قاچوقولمان تواندەوە. چایەکی گەرممان خواردەوە، کاك ڕەسولڵ زۆر حورمەتی گرتین، پشدەری لە هەر کوێیەك بن خانەدانی خۆیان نیشانی میوانەکانیان دەدەن ...

دوای پشوودانێکی باش بەرەو ئاڵوەتان گەڕاینەوە... کە چوومەوە دایکی هاوێر پێی سەیر بوو بەو کەش و هەواو بەفرە گەڕاوینەتەوە، هەر ئەو ساڵە لە دەشتی وەزنێ یەك فەوجی سوپای پاسداران لە ناو ڕەبیەکانی خۆیان لە بەفردا ڕەقبوونەوە. لەم سەفەرەدا گرینگی (خورما)م بۆ دەرکەوت، خورما وزەبەخشێکی زۆر باشە، بەتایبەتی لەکاتی سەرماوسۆڵە و ڕۆیشتنی ناو بەفر..

## به بنبەست گەیشتنی گفتوگۆی نێوان (ی.ن.ك) و ڕژێم:

گفتوگۆی نێوان یەکێتی و ڕژێم وەکو مەتەڵی لێ هاتبوو، سەدان نوکتەی میللی لەسەر دروستکرابوو، هەر بۆ نموونە دەگوترا ڕۆژی (٣٢)ی مانگ بەیاننامەکە رادەگەیەنرێت، ماوەی ساڵێك بوو (ی.ن.ك) ڕۆژانە پروپاگەندەیان دەکرد، کە ئەمڕۆ نا سبەی بەیاننامەکە رادەگەیەنرێت. بەڵام نەك هەر هیچ بەیاننامەیەك رانەگەیەنرا، بە پێچەوانەوە دەزگاکانی ڕژێم سەدان فەوجی خەفیفەیان لە جاشەکان دروستکرد. تەنانەت لە کەناڵەکانی راگەیاندەوە بە هەواڵێکی کورتیش باسی گفتوگۆکەیان نەکرد. دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات مستەشارەکانیان دڵنیاکردەوە، کە جاشەکان وەکو خۆیان دەمێننەوە، چونکە خزمەتی ڕژێمیان کردووە... ساڵی ١٩٨٤ لە زۆربەی زانکۆکانی سلێمانی و موسل و جێگاکانی تر، خۆپیێشاندان سەری هەڵدا، کەچی یەکێتی ئەو خۆپیێشاندانانەی بە گێرەشێوێن ناودەبرد. پێیان وابوو راپەڕین و خۆپیێشاندان لایەنەکانی (جود)ی لە پشتییەوەیە، بە کردەوە (ی.ن.ك) کەوتبووە ژێر گوشارێکی زۆرەوە هەم لە لایەن جەماوەری کوردستان، کە مژدەی ئەمڕۆ یا سبەی بە خەڵك دەدا، هەم هاوسەنگی سیاسی لە بەرژەوەندی گفتوگۆکە نەبوو، چونکە زۆربەی لایەنە کاریگەرەکان وەکو پارتی و شیوعی و سۆسیالیست و پاسۆك لە دژی ئەو جۆرە گفتوگۆیە بوون. لەوەش زیاتر ڕژێم لەوپەڕی لەخۆبایی بوون دابوو، هیچ سازشێکی لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانی کوردستان قبوڵ نەدەکرد. ڕژێم پێی وابوو زۆرینەی خەڵکی کوردستان پشتگیری دەکەن، تەنیا لە کوردستاندا پتر لە سێ سەت فەوج و مەفرەزەی تایبەتی جاشیان هەبوو، کە بە مەزەندەی ڕژێم پتر لە(٣٠٠/٠٠٠) چەکداری بوون. لە بەرامبەردا هەموو هێزی پێشمەرگە بە لایەنەکانی (جود) و یەکێتییەوە لە(١٠/٠٠٠) پێشمەرگە تێنەدەپەڕی، بەڵام کاتی کە راپەڕین بەرپابوو زۆربەی مستەشارەکان و مەفرەزە تایبەتییەکانی جاش، پەیوەندییان بە شۆڕش و هێزی پیشمەرگەوە کرد، ڕژێم لەوەشیاندا هەڵە بوو... لە ١٩٨٤/١/١٥ یەکێتی بەیاننامەیەکی راگەیاند و بە فەرمی کۆتایی هێنا بە گەمەی گفتوگۆ. لە بەیاننامەکەدا هاتبوو ڕژێم بە هیچ کلۆجێك مافەکانی گەلی کوردستان ناسەلمێنێ، لە تەوەرێکی تری بەیانەکەدا هاتبوو، کە بەهۆی ناهاوسەنگی سیاسییەوە گفتوگۆ هیچ ئەنجامێکی نەبوو. لە دوای هەڵوەشانەوەی گفتوگۆ یەکێتی زنجیرەیەك چالاکی سەربازی ئەنجامدا، کە بە داستانی گەورە مەزندە دەکران. لەو سەردەمەدا یەکێتی هێزێکی کاریگەر بوو لە مەیدانی هێزە

بەرهەڵستکارەکاندا. ئەو گفتوگۆیەی یەکێتی گۆڕی، لە دوای ئەو گفتوگۆیە یەکێتی بەکردەوە دروشمی ئاشتبوونەوەی گشتی هەڵگرت و گڕوتینێکی تریان دا بە رەوشی شۆڕشی چەکداری... پارتی دیموکراتی کوردستان بە نوێنەرایەتی کاك ئیدریس بارزانی زۆر بە نەرمی و گەرمییەوە پێشوازیان لە هەڵوێستەکانی یەکێتی کرد، حزبی سۆسیالیست و پاسۆك یەك بە دوای یەکتردا پەیوەندییان لەگەڵ یەکێتیدا ئاسایی کردەوە. دواتر بۆ ئەوەی کۆتایی بەهەموو ناکۆکییەکانی نێوان یەکێتی و پارتی بێت، کە بە مێژوویێکی خوێناویدا تێپەڕی بوو، کاك ئیدریس لە ڕێگای کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە دەستپێشخەری کرد و، پەیوەندی بە یەکێتییەوە کرا. کاتێك کە پارتی و یەکێتی ئاشتبوونەوە کۆتایی بە جەنگی ناوخۆ و براکوژی شۆڕشی چەکداری هات، بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردستان وەرچەرخانێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی. دوا لایەن کە لەگەڵ یەکێتیدا ئاشتبۆوە حزبی شیوعی عێراقی بوو. لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٥ بەیاننامەی ئاشتەوایی لەگەڵ یەکێتیدا راگەیاند. نێوان (١٩٨٥ — ١٩٨٧) ساڵانی زێڕین و مێژوویی بوون لە شۆڕشی چەکداریدا، بە دەیان داستانی نەوعی و گرینگ لە لایەن هێزی پێشمەرگەوە ئەنجامدرا، بە هاوبەشی و یەك بەیەك دەیان شارۆچکە ئازادکران. لە ناوچەکانی گەرمیان و بەڕانەتی هەولێرو دەڤەری بادینان، پێشبڕکێ بوو لە نێوان لایەنەکان، کە کام لایەنە داستانی سەربازی زیاتر و گەورەتر ئەنجام دەدات. بە سەدان چەکی قورس و سووك کەوتە دەستی هێزی پێشمەرگە، سوپای ڕژێم هیچ هەیبەتی لای هێزی پێشمەرگە نەمابوو... جارێکی تر ژیان ئەو راستیانەی سەلماندەوە، کە هەر کاتێ تەبایی و ئاشتی ناوخۆ هەبوبێت دەستکەوتی سیاسی و سەربازی زۆر گرینگ بۆ گەلەکەمان مسۆگەرکراوەو وەدی هاتوون...

## هەڵدێران لە ڕەنوو:

لە رۆژی ١٩٨٥/٣/١٧ بەندەو کاك برایم زرار و عەزیز مراد ئاغا و کاروانە سوور، کە هەر سێکیان کادری حزبی سۆسیالیستی کوردستان بوون، لە رێگای دەشتی(وەزنێ)وە بەرەو کوێستانەکانی گوێزێ چووین. دەشتی وەزنێی رەنگین بەفر داپۆشی بوو. چۆمی وەزنێ تا بەفری گەورەی لەگەڵ خۆی دەهێنا، کە بە هۆی توانەوەی شەڵاڵەی بەفرەوە ڕەسەر ئاو کەوتبوون...

ژەمی نیوەڕۆیەمان هێنایە هەوارگەی گوێزێ سەرێ، لەو هەوارگە دڵگیرەدا ژەمی نیوەڕۆیەمان بە گۆشتی قوتو و پنگ و کوزەڵەی ژێر شەتە ئاوی گوێزێوە خوارد. سەرچاوەی ئاوی گوێزێ ئەوەندە بە خوڕ لە ژێر تاتەبەردو ڕازە شاخەکە دەهاتە دەرێ کە لە فوارەی تاڤگەیەکی هەڵدێر دەچوو. سەرچاوەی گوێزی هەوارگەیەکی دڵگیروو سازگارە. وەکو هەموو هەوارگەکانی (قەندیل) ساڵانە لە وەرزی هاوین، مەڕدارەکانی عەشیرەتی مەنگوڕایەتی و مامەش ڕووی تێدەکەن. ئەو هەوارگەیە دەکەوێتە سنووری لەوڕگای ئەو عەشیرەتانە... دوای خواردنی ژەمی نیوەڕۆ بە هەورازە ڕکەکەی چیای ئەوبەری ڕۆژئاوای گوێزیدا هەڵگەڕاین. یەك پارچە بەفر ئەو زنجیرە چیایەی داپۆشی بوو. بەفری زستانان کە دەمێنێتەوە لە وەرزی بەهاردا لە ژێرەوە دەبێتەوە شەختەو بەند بەسەر توێسکێکی نەرم و شڵتوشۆ دادەپۆشرێت، کاتێ کە مرۆڤ بەسەریدا دەڕوات دەبێ زۆر وریابێت بۆ ئەوەی لاقی نەخلیسکێ و نەکەوێت. کاك برایم زرار هەر زوو هاواری کرد و وتی: ناتوانم بەسەر ئەو لاپێیانەدا بڕۆم، لا پێ واتا هەڵدێری ڕەنوە بەفر، ڕەنوی بەفر دەکەوێتە لاپاڵ و هەورازو نشێوەکان بەهۆی پێتەلۆکەی بەفرو باتیوەو تەبارەی بەفرەکە دەکاتە تارمێکی کووڕ هەر کەسێك زۆر شارەزا نەبێ ناتوانێ خۆی پێوە بگرێ... گوایا من لەوان شارەزاتر بووم پێشکەوتم سێ تا چوار ڕەنوم بڕین، ئەو جێگایەی زۆر خلیسك و لووس دیار بوو بە سەری نێزەی تفەنگ دەمشکاند. ئاخیر ڕەنوو مابوو، کە زۆر بەرین و فراوان و ڕك بوو، تا ناوەڕاستی ڕەنوەکەم شکاند بوو و جێگای پێی پیادەڕۆم کردبۆوە، ئاوڕم دەدایەوە بۆ لای کاك برایم و برادەرانی تر بۆ ئەوەی پێیان بڵێم بە ئەسپایی وەرن وا تەواودەبین، لە ناکاو هەردوو لاقم ترازاو کەوتمە سەر پشت، هەر ئەوەندم پێکرا تفەنگەکەم بکەمە داردەست بۆ ئەوەی خۆم لە تاشە بەردو هەڵدێری شاخ بپارێزم، وەکو شارەزایەکی سەر بەفر بە خێراییەکی وا شۆڕدەبوومەوە لە قەنگلاشێك دەچووم، کە دەکەوێتە بەردەم گەردەلوولی گێژەلووکە، لە هەر کوێیەك هەستم دەکرد رووم لە تاشە بەردە یا هەڵدێرە بە تفەنگەکە خۆم لا دەدا پێش ئەوەی شۆڕببمەوە بەرەو لێژایی دۆڵەکۆگە کەوییەکی مەند هەبوو وەکو تۆپە لاستیك لە ناو مەنجەڵێکدا خول بخوا وابووم، بە خێرایی ئەوبەرو ئەمبەرم دەکرد، ئاگام لە خۆم بڕا، کاتێك چاوم کردەوە بینیم لە ناو پانتایی کەوییەکەدا کەوتووم، سەرم لە خوارەوەیەو لاقەکانیشم رووەو هەورازەکەیە. لە د. نەبەزم بیستبوو هەمیشە دەیگوت قورسایی مرۆڤ (١/٣)ی لە کەللەی سەری دا، هەر بۆیە مرۆڤ لە کاتی هەڵدێران و پێکادانی

سەیارەدا سەری زامداردەبێت... کە دەستم بە خۆم داهێنا ئەندامەکانی لەشم هەمووی ساخ بوون، کۆڵەپشتەکەشم یارمەتیدەرم بوو بۆ پاراستنی لەشم، تفەنگ و تاقمەکەشم هیچ زەبرێکیان بەرنەکەوتبوو... سەیرم کرد کاك برایم و برادەرانی تر لەسەر بەرزاییەکە لە پرێسکەیەك دەچوون، لە دوورەوە سەیریان دەکردم نەیاندەوێرا دوام بکەون، کە هەڵسامەوە سەر پێ، ئەوسا ئەوانیش دەستیان کردەوە بە ڕۆیشتن... پتر لە دوو کاتژمێرم پێچوو تاکو گەیشتمەوە لای کاك برایم و برادەرانی تر. کاك برایم وتی هەر ئێمە دەزانین چۆن هەڵدێرایت، لەو رووداوە بەدواوە ئەوەندەی دیکە لە ڕەنو بەفر دەترسام. کە گەیشتمەوە لای برادەران ئێوارەیەکی درەنگ بوو، چونکە لە ژەمی نیوەڕۆوە تا ئێوارەیەکی درەنگ لە گێژاوی هەڵدێرانی ڕەنوی بەفرەکە دەرباز نەبووین، ئەو ئازارو زەحمەتە لە پێناو دیدارێکی رێکخستنەکان بوو، لە ١٠٠٪ لە مەرگ نزیکبووینەوە، مەرگ بە گولله نا بەڵکو بەهۆی ڕەنوی بەفرەوە. سەرەڕای هەموو ئەو ئازارانەشم، کەچی ئەوساو ئێستاش ڕەنوی بەفرو کڕێوەی بەفرم هەر خۆشویستووە و خۆشم دەوێت...

ئەو شەوە لە کاولە خانووەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانداماینەوە. لە گوندە راگوازراوەکەی(مارەدوێ) حەراسەتی شەوانەمان دانا، ئەوەی جێگای سەرنجی هەموومان بوو هەڵوێستی ئەو کاروانچییە نەبوو، کە لە ناو کاولە خانووەکاندا ئاگریان کردبۆوەو لە دەورەی ئاگرەکە سەرگوزەشتەی کاروان و سەختی رێگایان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، کە چاویان بە ئێمە کەوت زۆر ترسان وایان دەزانی پارەیان لێ دەستێنین!...

بەیانی زۆر زوو بوو خۆمان پێچایەوە بەرەو کێوی بێدێو ڕۆیشتین، بۆ سەرچاوەی گوێزلی، گوێزلی کەوتۆتە باکووری رۆژئاوای شاخی بێدێو، دروست لە ناو دڵی شاخەکەدا بنەگوێزێکی لێیە کانیاوێکی تێدا ئاوەکەی خۆش نییە، ئەگەر ناچاری نەبێ بۆ خواردنەوە نابێ، بۆ کولاندنیش چایەکە تامی زۆر خۆش نییە، لە خواروی گوێزلی گوندە ڕاگوێزراوەوکەی(توتمێ) بوو لە باشووری گوێزلی ئەشکەوتی(گوجاوێ) یە ئەو ئەشکەوتە لە ناوەوە زۆر گەورەیە. لە سەرەتای دروستبوونی ژیان لەم ناوچەیەدا، وێدەچێ لە جیاتی خانوو مرۆڤەکان تێیدا ژیابن، ئەشکەوتی گوجاوێ بە سەدان شەمشەمە کوێرەی تێدا بوو، ئەوەندە گەورەو فراوانە جێگای(٢٠٠) سەر مەڕ دەبێتەوە. پڕ بوو لە کەمرەی پاشماوەی حەیوان، ئەو ئەشکەوتە زۆر

بە سوود بوو بە دەیان شەو لەگەڵ هاوڕێ هەمزە سوور لەو ئەشکەوتەدا ماوینەوە، هەر هاوڕێ هەمزەش ئەو ئەشکەوتەی بە من نیشان دا، ئەگەر مرۆڤ شارەزا نەبێ ناتوانێ بیدۆزێتەوە...

ژەمی ئێوارەمان لە داوێنی چیای بێدێودا خوارد، هێشتا ئێوارەیەکی ڕووناك بوو بە ناو دەوەن و لاپاڵەکانی گردو تەپۆلکەکانی بەرامبەر ڕەبیەکانی(پیسوار)دا شۆڕبووینەوە. (پیسوار) دەستەواژەیەکی سەیرە وێدەچێ پێ سوار بێت، بەڵام بە مەودای مێژوویی بووە بە(پیسوار)، پیسوار گردە بەرزاییەکی شێوە گومبەتییە هەر لە کەللەی قەندی ئەبو کلاوی جاران دەچێ. کەژو دامێنی هەموو خیزەڵانە. ڕژێم لەم گردەدا رەبییەکی دانا بوو ئەو رەبیە ئەوەندە سوارو باڵا دەست بوو مرۆڤ خۆی پێ نەدەشاردرایەوە. هەر لەو رەبیەوە بوو کادرێکی یەکێتی بە ناوی خلیل رانییەی لەگەڵ کاروانچییەك بە هاوانی شەست ملیم شەهیدکرا. گوللەیەکی هاوەن راست کەوتبۆ ناو ئاگردانی بەردەمیان. خوێنی ئەوان و رەنگی چای سەر ئاگرەکە تێکەڵ بە یەك بوون. بەهۆی خوێنی ئەو دوو شەهیدەو چای کترییە ڕەش ئاگرەکە کوژابۆوە، تەمەنی ئەو دوو کەسەش کۆتایی هات، هێسترکەشیان زامدار ببوو... بۆ ئەوەی خۆمان لە مەترسی ئەو هاوانە بپارێزین ئاگرمان نەکردەوە، بۆ ئەوەی دووکەڵ بەرز نەبێتەوە زۆربەی جار کلۆی ئیسپرتۆمان لە ناو ئەشکەوتەکەدا بەکاردەهێنا. سوپای ئێران لە جەنگی عێراق — ئێران کلۆی ئیسپرتۆی دابەش دەکرد، ئێمەش لە ئاڵوەتان لە رێگای برادەرانی پارتییەوە وەرمان گرتبوو...

وەکو هەموو جارێ بە لاپاڵ و رێچکەکانی گردو تەپۆلکەکانی زوودانداا چووینە خوارەوە. حەزم دەکرد کاك برایم و برادەرانی تری سۆشیالیست کە زۆر جێگای بڕوا بوون، بە تایبەتیش کاك برایم زرار کە ئامۆزای شەهید(هیوا) بوو، بەرێگایەکی ئەمیندا بیانبەم، بەڵام بەباشم نەزانی بەو رێگایەدا بیانبەم کە خۆمان پێدا دەڕۆیشتین، لەبەرئەوە بە لاپالێکی تردا بردمن کە هەرگیز نەیان دەزانی کوێیەو کەوتۆتە کوێ؟! رێگای هات و چۆن زۆر گرینگ بوو لەو سەردەمەدا، نەدەکرا هەموو کەس ئەو رێگایانە پێبزانن کە خۆمانپێیدا دەڕۆیشتین...

کە لە بەستەستێنی سەرێ نزیکبووینەوە لەگەڵ کاك برایم و برادەرەکانی لە یەکتر دابڕاین، وتیان بۆ کوێ دەچی وتم ئەوەیان حزب دەزانی؟! بوو بە پێکەنین و خواحافیزیمان لە یەکتر کرد پێم وتن بۆ گەڕانەوە ئاگاداری یەکتر دەبین...

ئەو شەوە سەردانی پیرە دایکم کردو بە دیداری مامم و براکانم شاد بوومەوە. بەری بەیانی زوو ڕۆیشتم بۆ ئۆردووگای بەستەستێن، لە دوای هاوڕێ(سورە)م نارد بە یەکەوە گەشتێکمان بە ناو ڕێکخستنەکاندا کرد، هەر لە ئۆردووگای بەستەستێن هاوڕێ شێخە هاتە لام کە لە قەلادزێ بە شێخە کەولە ناسرابوو، هاوڕێ شێخە زۆر ئازا و چاونەترس بوو، چایخانەیەکی هەبوو لە ناو بازاری قەلادزێ، بە ئاشکرا سروودەکانی رادیۆی دەنگی گەلی عێراقی پەخش دەکرد. لە ڕێگای چەند هاوڕێیەکەوە ڕۆژانە چالاکی سەربازی ئەنجام دەدا، هەر لەو دیدارەدا داوای لێکردم کە هاوڕێ حەمەدەمین ناسراو بە(مینە سوور) لەگەڵ خۆم دا ببەم بۆ پێشمەرگایەتی، وتی هاوڕێ(مینە) ئاشکرابووە مەترسی لەسەرە ئەمنەکان بیگرن، لەو دیدارە گلەیم لێکرد لەسەر شێوازی کارکردنیان، هاوڕێ شێخە بە پێکەنینەوە وتی هاوڕێ بارودۆخەکە ئەوەی دەوێت کە ئێمە دەیکەین، کەچی ژیان دەری خست ڕای ئێمە راستتر بوو، چونکە جەللادەکانی ڕژێم زۆر هەستیار بوون بەرامبەر بە ڕێکخراوەکانی حزبی شیوعی، بەتایبەتی لە قەلادزێ. ئەو شەوە گەڕاینەوە ئاگاداری کاك برایم و برادەرەکانیم کرد هەر ئەو شەوە هاوڕێ مینە سووریشم، لەگەڵ خۆماندا برد. مینە سوور مێرمنداڵێکی وریا بوو. لە کاتی گەڕانەوە وتی هاوڕێ چەکیشم بۆ پەیدابکە، وتم هەر چەکی خۆم پێیە وتی باشە نارنجۆکەکەتم بدەرێ بۆ ئەوەی بێ چەك نەبم. بۆ ڕۆژی دووەم ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە کاولە خانووەکانی گوندە راگوازراوەکەی(مارەدوێ) کۆمەڵێك کاروانچی بەلاماندا تێپەڕین تێمان خوڕین، هاوڕێ (مینە سوور) وتی هاوڕێ نارنجۆکەکەیان پێدا بدەم! وتم شتی وانەکەیت! ئەوانە کاروانچین دواتر پێمان دەڵێن بۆڕاو ڕووت هاتوونە سەر ڕێی قاچاخچی. ئەو ڕۆژە چووینەوە ئالۆوەتان... بەداخەوە دوای چەند مانگێك دائیرەی ئەمنی قەلادزێ، ڕێکخراوی شەهید عەبدوڵڵا کە هاوڕێ شێخە سەرپەرشتی دەکرد، لە ڕێگای خۆفرۆشێکەوە ئاشکرادەکەن و دەست بەسەر کۆمەڵێك بەڵگەنامەو دەمانچەیەکی(عەقرەب)دا دەگرن. هاوڕێ شێخەو(٥) لە هاوڕێکانی لە لایەن دائیرەی ئەمن لە قەلادزێ گیران، هاوڕێ شێخە فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو و لە سێدارەدرا، پێنج هاوڕێیەکەی تریش بە زیندانی هەتا هەتایی سزادران...بەشێك لەو هاوڕێیانە سزادرابوون بە لێبوردنی گشتی ئازادکران دواتر ڕایان کرد و لە بارەگاکانی لقی پشدەر بوون بە پێشمەرگە...

## دۆڵە کۆگە:

ماوەی ساڵێك بوو لقی پشدەر چوو بوو بۆ خوارکورك. بە بڕیاری سەرکردایەتی حزب لقی پشدەر گەرایەوە سنووری چالاکی خۆی کە دەڤەری پشدەر بوو، لەو هەلومەرجەش دا تەنها دۆڵە کۆگە هەبوو وەکو خاکی سنووری عێراق تەنها دۆڵەکۆگە گونجاو بوو بارەگای تێدا دابنرێت، چونکە هێشتا حزبی شیوعی و یەکێتی ئاشت نەببوینەوە، نەدەکرا بارەگای(لق) لە بناری(رەزگە و مارەدوە)دا بنرێت... دۆڵەکۆگە(٣٠٠م) لەسەر ئاستی دەریا بەرزە ناوچەیەکی شاخاوی و سەختە بەتایبەتی لە وەرزی زستان دا، هەر کەسێك لە دۆڵەکۆگە بژیت پێویستە ئەرزاق و پێداویستی ژیان بۆ شەش مانگ مسۆگەر بکات، بە پێی ژمارەی کەسەکان خۆراك پاشەکەوت بکات. دۆڵەکۆگە لە وەرزی زستاناندا هەموو رێگاکانی بە بەفر دادەپۆشرێت کەسانی زۆر شارەزا لە وەرزی زستان بەو ناوچەیەدا گوزەر دەکەن... لقی پشدەر زۆربەیان هاورێی قارەمان بوون، سەختی دۆڵەکۆگەیان هەڵبژارد نەك منەتباری کۆماری ئیسلامی ئێران. حزبی شیوعی عێراقی ئەگەرچی جۆرە پەیوەندییەکی ناڕاستەوخۆی بەهۆی پارتییەوە لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا هەبوو، کەچی هەمیشە وەکو حزبێکی قاچاخ هەڵسوکەوتی لەگەڵ دا دەکرا. بەرگەو هەویەی پەناهەندەیی لە رێگای پەیوەندییەکانی پارتییەوە بۆ هاورێیان دابیندەکرا. زۆر جار کە(گروهی زەربەت)ی سوپای پاسداران سۆراغی دەکردین، ئەدەبیات و کەلوپەل و کتێبی قاچاخمان دەشاردەوە... لەبەر ئەو هۆکارانە، دۆڵەکۆگە بەسەر بەرزی و بێ منەتی، بۆ لقی پشدەر لە هەموو شوێنێکی ئێران خۆشتر بوو. مرۆڤ هەتا دەردی ئاوارەیی و دەربەدەری نەچێژێت نرخی خاك و ئازادی و زێدی خۆی نازانێ...

جەنگی عێراق — ئێران بەردەوام بوو. ئێران دەترسا لەم سنوورەدا حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بۆ لێدانی بارەگاکانی سوپای پاسداران سوود لە بارەگای حزبی شیوعی وەربگرێت. لەبەر ئەوە زۆرجار بەهاوان و تۆپی قورس دەوروبەری دۆڵەکۆگەیان تۆپ باران دەکرد. بۆ نموونە لە مانگی تەموزی ساڵی١٩٨٦ لە هەوارگەی (کاڵەکین) ی رۆژئاوای دۆڵەکۆگە(٥٩) گوللە تۆپیان لە ناو بارەگای لقی پشدەر دا...یەکیتیش بە بوونی حزبی شیوعی لە دۆڵەکۆگە نیگەران بوو. دوای دوو مانگ هێزێکیان لە مەنگوڕەکان کۆکردەوە و لە رێگای هەوارگەی مەزرێڵی و بەرزاییەکانی دەوروبەری، دۆڵەکۆگەیان گەمارۆ دا. دەیانویست حزبی شیوعی ناچاربکەن دۆڵەکۆگە جێ بهێڵێ. بەڵام لقی پشدەر بە هاوکاری پارتی دیموکراتی

کوردستان هێزەکەیان ناچار کرد پاشەکشێ بکا، لقی پشدەر خاڵێکی گومرگی لەسەر بەرزایەکانی وشکەگۆمێ دانابوو، ئەو خاڵە گومرگیە وەکو سەرچاوەیەکی دارایی بوو لە لقی پشدەر، دواتریش بۆ مەڵبەندی سلێمانی، کە بارەگایان هێنایە ئەوێ بووبە سەرچاوەی دارایی... رێگای دۆڵەکۆگە لە وەرزی زستان دا گرفتی زۆر بوو، رێگای(سوێسنێ) رێچکەیەکی بزنە رێگا بوو، ئەو رێگایە دەکەوێتە باشووری دۆڵەکۆگە، (توولە) رێگایەکە تا ناو بارەگای دۆڵەکۆگە، یەك کاتژمێر پیادەڕۆ دەبێ. لە وەرزی زستان دا سێ ڕەنو بەفر رێگاکەیان دەگرت. جارێك لەگەڵ هاوڕێیەکی عەرەب بووین دوو ڕەنومان بە زەبری سەرە نێزە بۆ پەڕینەوە بڕی بوو، کەچی لە ڕەنوە بەفری سێیەم نەیوێرا پێیدا بڕوات، ناهەقی نەبوو چونکە هەر کەسێك لەو رەنوانە هەڵدێرێ پتر لە سێ کیلومەتر هەر بە ئاسماندا دەفڕێ، ئینجا دەکەوێتە سەر زەوی، خوارەوەش هەڵدێرێکی زۆر سەخت بوو... کادرێکی یەکێتی لەو رێگایە هەڵدێراو شەهیدبوو. دۆڵەکۆگە لە گوندێکی خنجیلانە دەچوو. هاوڕێ سەلیم و هاوڕێ حەمەدەمین عەبدوڵڵا زوورکەیی، لە تەنیشت بارەگای(حزب) خانوویان دروستکردبوو و ماڵیان لەوێ بوو. ساڵی ١٩٨٦ بارەگای مەڵبەندی سلێمانی(حزب) هاتە دۆڵەکۆگە، دەزگای راگەیاندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش هاتە دۆڵەکۆگە. یەکێتی دوو رادیۆی هەبوو یەکێك لە سەرگەلو بوو ئەوەکەی تریان لە دۆڵەکۆگە بوو، کە یەکێتی بنکەو بارەگای لە دۆڵەکۆگە دانا رێگای هاتۆچۆ بەسەردۆڵکۆگەدا قەرەباڵغ تر بوو. لەسەر خەرجی یەکێتی توولە رێگای سوێسنێ چاك کرا... دواتر دۆڵەکۆگە و هەوارگەی گوێزێ خوارێ و گوێزێ سەرێ بوو بە مەڵبەندی کۆڕو کۆبوونەوەی لایەنە سیاسییەکانی بەرەی کوردستانی و، دوا نەبەردی شۆڕشی چەکداری ساڵانی پێش راپەڕین لە دۆڵەکۆگە کرا...

## ئاڵوەتان :

ئاڵوەتان گوندێکی رۆژهەڵاتی کوردستانە کەوتۆتە سەر سنوورە دەستکردەکەی عێراق — ئێران. کەش و هەوای ئاڵوەتان وەکو کەش و هەوای دەشتی وەزنییە، رەنگە پانزە کیلومەتر دوور بێ لە سنوور. ئەو کاتەی کە ئێمە لە ئاڵوەتان بووین نزیکەی دووسەت خێزانی لێ دەژیا کە (١٠٠) خێزانیان هی پێشمەرگە بوو. لەو گوندە هیچ خۆم بە نامۆ نەدەزانی، خەڵکی ئاڵوەتان بۆ ئێمەی خەڵکی(پشدەر) وەکو خزم و عەشیرەتی خۆمان وابوون. زۆربەیان لە

عەشیرەتی وەجاخی کاخدری و سوێسنیێ و مامەش بوون، لەگەڵ هەندێکیان خزمی عەشیرەتی بووین. سەرەڕای گرفت و سەختی ژیان رۆژێك لە رۆژان لەو گوندە خنجیلانە بێزار نەبووم. ئاڵوەتان بەو پێیەی ناوچەیەکی کوێستانییە، هەر لە مانگی حوزەیرانەوە بەهارێکی راستەقینەیە. لە وەرزی زستان دەبوو مشوری بەفر ماشتن بخورێت، بێڵ چەور بکرێت، بەفر ماڵی باش، شەخرە داری زۆر گەرم کردنی سۆپا رەش، ئەرکی رۆژانەی هەموو خەڵکی ئاوایی بوو. زۆرجار وا رێدەکەوت جلی وشکمان لە ماڵەوە نەدەما لەبەری بکەین، چونکە بەشەو و رۆژ لە نێوان هەر کاتژمێرێکدا دەبوو جارێك سەربان بماڵدرێت. ساڵی ١٩٨٥ دوو مەتر بەفر باری، بەفرەکە شێوەی گۆڕابوو هەندێکی خۆڵەمێشی بوو بۆ ماشتن زۆر قورس بوو. نێوانی خانووی ئێمەو مام (حوسێن کالانی) دراوسێمان بنەبانمان لە یەکتر دەگەڕایەوە، کە بەفرمان دەماشت لەبەر بەرزی تارمی بەفرەکە مام حوسێن تەنیا کڵاوی سەری دیار بوو... ئاڵوەتان وەکو گوندێکی رۆژهەڵاتی کوردستان لەسەر نەریت و سروشتی دێهاتیانەی خۆی مابۆوە. لە رووی دەروونییەوە هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد(٧) ساڵی تەواو لەو گوندە ماینەوە. سێ منداڵی چاو گەشمان لەو گوندەدا لە دایك بوو. هاوێر لە کۆتایی مانگی یانزە واتا لە ١٩٨٤/١١/١٦، رەوند لە ١٩٨٦/٦/٣، رێبوار لە ١٩٨٩/٣/٧، لەدایکبوون. لە ماوەی ئەو(٧) ساڵەدا (٦) جار ماڵمان گواستۆتەوە لەم خانووە بۆ خانوویێکی تر، ئەو خانوانەی کە دەچووینە ناویان هەموویان بە قوڕ و بەرد دروستکرابوون، لەبەر ئەوەی توانای دارایی ئێمە کەم بوو چاومان لە جێگای خۆش نەبوو. جگە لە دیوەخانێ ئاغا کە هەندێك خۆشتر بوو لە خانووی جووتیارەکان خانووەکانی ئاڵوەتان هەموویان وەك یەك وابوون. ئێمەمانان ناچاربووین بە جێگای زۆر ناخۆش و شەپڕێو رازی بین، بۆ نموونە هاوڕێ حەسەن خدر ماڵی لە ژووری غەڵێك دابوو، غەڵەکە گەورە بوو ژوورێکی لیدابڕیبوو بە نایلۆن و مقەبا، کوڕێك هەبوو بە ناوی(ناسر) ڕەبەن بوو لە بارەگاکانی یەکێتی دەژیاو کاروانچییەتی دەکرد، خەڵکی سلێمانی بوو، پیاوێکی باریکەڵەو لاواز بوو. ئەسپێکی هەبوو ویستبووی بیباتە ناو غەڵەکە بێ ئەوەی مۆڵەت لە ماڵی هاوڕێ حەسەن وەربگرێت، خۆی و ئەسپەکەی، خۆیان بە ژووری غەڵەکەدا دەکەن. رێڕەوی غەڵەکەش لەگەڵ ماڵی هاوڕێ حەسەن خدردا یەك رێڕەو بوو. هاوڕێ حەسەن لە کابرا دێتەدەرێ یەخەی دەگرێت، دەڵێ شەرم ناکەیت بەبێ پرسی و ئاگادارکردنەوە بە ولاخەوە خۆت بە ژووریدا کردووە، کابرای باڵا کورت و لاواز لە هاوڕێ حەسەن خدر

دەپارێتەوە، دەڵێ خاڵو ببورە وەڵڵا وامزنیوە غەڵی حەیوانە نەك جێگای خێزان! حەسەن پێی دەڵێ لەمەودوا بزانە ئێرە ماڵی منی تێدایە... کابرا هەقی بوو چونکە کوڕەکانی مام ڕەسوڵی کاکە ئەحمەدی(بەستێ) هێسترو رەشەوڵاخیان لەو غەڵە دادەکرد و، بە رێڕەوی ماڵێ هاوڕێ حەسەن دا دەهاتن و دەچوون... کابرا لای خەڵکی ئالۆەتان و پێشمەرگەکانی پارتی وتبووی ئەو کابرا زەحمە خەریکبوو وەکو چۆلەکە لە شیشەم بدات... لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بکەم بە پشوو درێژی و هێمنی ئامانی خۆشکم، کە خێزانی هاوڕێ(حەسەن خدر)ە. ئامان دەریایەکە لە هێمنی و لە سەرخۆیی، کەسایەتییەکی زۆر گەورەیە...لە خراپترین بارودۆخی ژیاندا هەرگیز نەمبیستووە رۆژێك لە رۆژان گلەیی لە بەختی خۆی کردبێ. من تاکە برای ئەوم نەمزانیوە گلەیی لە بەختی خۆی کردبێ و بارگرانی لەسەر(حەسەن)ی هاوسەری دروستکردبێ... (حەسەن)یش زۆر رێزی لێ دەگرێ و خۆشی دەوێ لە خۆشەویستی ئەو هەمیشە بە ناوی ئامانە خان یا(کاڵێلێ) ناوی دەهێنێ...

لە کۆتایی هەشتاکان، ئالۆەتان بوو بە پێگەی زۆربەی لایەنە سیاسییەکانی کوردستان و، ئاوارەکانی پرۆسەی ئەنفال و کیمیابارانی ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان، لە جەژنی قوربان دا کە بەشە خێری گۆشت دەبەشرایەوە بەسەر ماڵاندا، ماڵە ئاوارەکان پتر لە خەڵکی گوندی ئالۆەتان بووین . ماڵی هاوڕێیان بریتی بووین لە: ماڵی هاوڕێ مەحمود حاجی فەقێ خدر، ماڵی هاوڕێ سەلیمە سوور، ماڵی هاوڕێ عەلی گۆران، ماڵی هاوڕێ حەسەن خدر، ماڵی هاوڕێ حەمەدامین عەبدوڵڵا، ماڵی هاوڕێ ئەحمەد باوکی تارا، ماڵی بەندە... مرۆڤ تا خێزان دروست نەکات و نەبێتە خاوەنی منداڵ، بە مانای مرۆییەکەی نابێتە مرۆڤێکی کامڵ، هەتا خێزانت نەبێ نازانی بەرپرسیاری خێزانداریێك، لە رووی دەروونی و دارایی و روحی و مەعنەوییەوە چۆنە. تا منداڵت نەبێ نازانیت بەزەیی و هەست و سۆزی باوك چۆنە بەرامبەر بە منداڵەکانی...هیچ گرفتێك مرۆڤ بێ ئومێد ناکات، بەڵام نەبوونی و گرفتی خێزان پروکێنەرە، ئینجا ئەو گرفتە گرفتی ژیان بێت لە ئاوارەییدا. لە ئالۆەتان گرفتی زۆربەی ئاوارەکان ژیان و باری تەندروستی خێزان بوو، بەتایبەتی منداڵەکان ئێمەی هاوڕێ لە زۆر کەس باشتر بووین مووچەیەکی مانگانەمان هەبوو ئەوانەی خێزانیان هەبوو خۆی (١٠) دینارو خێزان(١٥) دینار، (٢٥) دینارمان وەردەگرت. راستە ئەوسا پارەی عێراقی دینارێك بەرامبەر بە سێ دۆلاری ئەمریکی بوو. بەڵام ئەگەر ڕۆیشتباین بۆ شاری **نەغەدە و پیرانشار** پارەکە

بەشی هیچی نەدەکرد، پێشمان شەرم بوو پارە قەرز بکەین. زۆرجار منداڵەکانمان نەخۆش دەکەوتن ناچار بە پێیان دەمان بردن بۆ(میراوێ) کە ماوەکەی لە(٤٥) دەقیقە پترە. ئەو کاتەی بە مەفرەزە دەردەچووین هاورێ(گۆران) واتا هاورێ(عەلی گۆران) منداڵەکانی ئێمەی بۆ لای دکتۆر دەبرد، بەفر ماشتن، دار شکاندن، پێداویستی تری رۆژانەی شار ... چەندان ئەرك و راسپاردەی تر، هەر هاورێ(عەلی گۆران) وەئەستۆی خۆی دەگرت و خزمەتی ماڵ و منداڵی هاورێیانی دەکرد... بڕواناکەم هەرگیز ئەوجۆرە مرۆڤە لەخۆبردووانە پەیداببنەوە، هەمووومان وەکو خێزانێك وابووین. خۆشەویستی و گیانی هاوکاری لە نێوان هاورێیان دا بەهێز بوو، زۆربەمان وەکو خێزانێك خواردنمان یەك بوو، خیانەت و چاوبڕینە ناموسی یەکتر لە فەرهەنگی ئێمەدا بە رادەی کوفر بوو، راستگۆ و فیداکار بۆ یەکتری وەکو پرەنسیپکی نەگۆڕ بوو...

ماڵی هەمووومان بە ڕواڵەت ماڵ بوو، دەنا لەڕاستیدا وەکو بارەگای(حزب) وا بوون، کە هاورێیەك نەخۆش دەکەوت، یا بریندار دەبوو لە ماڵەکانی ئێمەدا خزمەت دەکرا. بۆ نموونە هاورێیەکی بە تەمەنمان هەبوو بە ناوی خاڵە(سەید عەلی) لە سنووری ئەحمەدئاوای(هەڵەبجە) ئەشکەوتێك بەسەریدا رووخابوو و بریندارببوو، ماوەی(٤) مانگ لە ماڵی هاورێ عەلی گۆران خزمەت کرا...

سەبارەت بە ئەرکی ژیان و سەختی بارودۆخەکە، ساڵ بە ساڵ ئەرکی سەرشانمان گرانتر دەبوو. جگەلەوەی وەك هەر ماڵێکی ئاسایی میوانداریمان هەبوو، نەخۆشی و گرفتەکانی تریش سەربار بوون. من و هاوڕی حەسەن خدر و حەمەدئەمین عەبدوڵڵا و عەلی گۆران، نامەیەکی چوارقۆلیمان بۆ هاورێیانی سەرکردایەتی لە قاتعی(سلێمانی و کەرکووك) نووسی، ئەوسا هاورێ(مام بارام و هاورێ ئەبو لینا) بەرپرسی قاتع بوون... مام بارام واتە وەستا محەمەدی نانەوا، خەڵکی سلێمانی بوو، هاورێ(ئەبو لینا) هاورێیەکی عەرەب بوو. لە نامەکەدا راپۆرتێکی مەزندەیی ئابووری و نرخی کەل و پەلی رۆژانە و لانی کەمی ژیان و گوزەرانی خێزانێك چەندو چۆن بوو، خاڵبەندمان کردو ناردمان... وەڵامی قاتعی سلێمانی و کەرکووك زۆر سەیرو جێگای سەرسوڕمان بوو، وەڵامەکەیان بریتی بوو لە: ١- ئەو نامەیەی ئێوە جۆرێکە لە دەستەبەندی و تەکەتول ٢- لەوە زیاتر ناتوانین هاوکاریتان بکەین...

بۆ ئەوەی لە نزیکەوە لە ناوەرۆکی وەڵامی نامەکە بگەم، چووم بۆ(دۆڵەکۆگە) و رووبەڕوو قسەم کرد لەگەڵ مام بارام و هاوڕێ(ئەبو لینا). قسەکانیان زۆر رەق بوو پێیان وابوو بیانوو دەگرین و دەمانەوێ واز لە(حزب) بهێنین. زۆر بە هێمنی و لە سەرخۆیی ویستم تێیان بگەیەنم کە هیچ مەبەستێکمان نییە، تەنیا کێشەمان کێشەی ژیان و سەرپەرشتی خێزانە... مام بارام وتی بۆچی هێسترێك ناکرِن و کاروانچییەتی ناکەن؟ پێم وت هاوڕێ بۆ کورتانی هێسترێکمان پێ دەکرِدرێت تا هێستر بکرِین؟ ئەو کات نرخی هێسترێك کە قاچاخچی پێ کرابا(١٥٠٠٠٠)تومان بوو. تووشی شۆك بووم گەڕامەوە، ئەوسا بۆم دەرکەوت هیچ کەس گرفتی خێزانی ئێمە چارەسەر ناکات. پەندێکی کوردی هەیە، دەڵێ: **تێگوشین بە تەمای جیرانی وشکە...**

هەڵوێستی مەردانەی هاوڕێ عەلی سەیدە هەرگیز لە بیر ناکەم، ئەوکاتە ماڵەکەی لە گوێزێ سەرێ بوو جار جارە سەردانی خوارەوەی دەکرد، دوکانێکی دانابوو پێداویستی رۆژانەی تێدا دەفرۆشت، هاتە لامان داوای لێکردین لەسەر دوکانەکەی ئەو کاربکەین. چەند رۆژێك لەسەر دوکانی هاوڕێ عەلی سەیدە خۆمان سەرقاڵ دەکرد. بەڵام فرۆشی دوکانەکە ئەوەندە نەبوو ژیانی ئێمەو خێزانی کاك عەلی مسۆگەر بکات. وازمان لە دوکانەکەش هێنا بیرمان لە هەموو ئیشێك دەکردەوە، خەریکبوو بەرەو ناوەوە برِۆم بۆ ئەوەی هێسترێك یا ئەسپێك پەیدابکەم بە نیوەیی کاری پێ بکەم، تا دەست مایەیەکم دەست بکەوێت هێسترێك بکرِین... رۆژێك هاوڕێ مەحمود حاجی فەقێ بە دوایدا ناردم وتی نامەیەکم بۆ (م.س) ی (حزب) نووسیوە لەسەر ژیان و گوزەرانی ئێوە، وەڵامی گەڕاوەتەوە دەڵێن کرێ خەرج دەکەین... کرێی خانوی من مانگانە (١٥٠٠) تومان بوو ئەگەرچی ئەو(١٥٠٠) تومانە گرفتەکانی ئێمەی چارەسەر نەدەکرد، بەڵام کە سەرکردایەتی وەڵامی داینەوە هیچ کێشەیەکمان نەما... ماوەی مانگێك بوو لە ئەرکی رۆژانەی حزب دابرِابووین جارێکی تر بە گورِو تینی جاران گەڕاینەوە سەر کاری حزب.

## رووداوی سەیارە:

تازە لە خوارەوە گەڕابوومەوە، ماوەی هەفتەیەك بوو لە دۆڵەکۆگە بووم، هاوڕێ (عەلی گۆران) کە ئەرزاق و پێداویستی کرِی بو و گەڕابۆوە (دۆڵەکۆگە) پێی وتم: هاوێری کچت

نەخۆشە ئەگەر دەکرێت سەرێکی ماڵەوە بدەوە...منیش مۆڵەتم وەرگرت و گەڕامەوە ئالوەتان. لە ڕۆژی ١٩٨٥/١١/٥ لەگەڵ خێزانم و منداڵەکان بە چوارقۆڵی خۆمان ئامادەکرد، بە سەیارەی(مام ئالڵا) کە خەڵکی گوندی ئالوەتان بوو، بەرەو شاری خانێ ڕۆیشتین تا هاوێری کچم ببەینە لای دکتۆر. لە نێوان گوندەکانی(ترکەش و کەوپەر) سەرەو ژێرێك هەیە، تانکەرێکی سەربازی زۆر بە خێرایی بە شەقامەکەدا دەهات، تانکەرەکە ئەمبەرو ئەوبەری جادەکەی دەکرد، خەریکبوو وەردەگەرا من لەگەڵ خێزانم لە پێشەوە سوار بووین منداڵەکانیشمان لە باوەش دابوو. مام وسوە شەلی هەڵشۆیی لە پشتەوە سوار بوو، چاومان بڕیبوو ئەو تانکەرە سەربازییە ئاخۆ کەی وەردەگەڕێت. یەکێك دەیگوت شۆفێرەکە سەرخۆشە یەکێك دەیگوت کۆنترۆڵی لەدەست داوە. مام ئالڵای شۆفێر هێواش هێواش سەیارەکەی لێ دەخوری و سەیری دیمەنی تانکەرەکەشی دەکرد...تانکەرەکە زۆر لێمان نزیکبوو فریای قسەیەکی تر نەکەوتین هەر ئەوەندەمان زانی تانکەرەکە وەکو گردێك خۆی کێشا بە سەیارەکەماندا. کاتێك وەهۆش خۆم هاتمەوە لە ژێر سەیارەکەدا بووم، هەستم کرد خۆم پێ ناجولێت، گوێبیستی غەلبەغەلبی خەڵك بووم. یەکێك دەیگوت مردووە، ئەوی دیکە دەیگوت سەری دەجولێ، یەکێك خەریکبوو جەگ لە سەیارەکە بدات. بە نوزەیەکەوە پێم گوت: کاکە جەگ لێ مەدە سەیارەکە پتر بەسەرم دادێت...تانکەرەکە کەوتبۆ سەرسەیارەکەی ئێمە کە پیکابێکی دەبل کابینەی گێرلەسوکان بوو، واتە من لە ژێر قورسایی سەیارەی خۆمان و تانکەرەکەدا بووم. هەر (١٠) چرکە جارێك بێ هۆش دەبووم و وەهۆش خۆم دەهاتمەوە... سەیارەیەکی زۆر لە دەوروبەرمان کۆببوونەوە، بریندارەکان بەرەو نەخۆشخانەی(خانێ) بەڕێکرابوون، تەنیا خێزانم بەدەم گریانەوە چاودێری بارودۆخی من بوو. هانای بۆ ئەم و ئەو دەبرد لە ژێر سەیارەکان دەربهێنرێم... لەژێرەوە جارجارە گوێبیستی راوێژو تەکبیری خەڵکەکە دەبووم، یەکێك دەیگوت با بەهەموومان تانکەرەکە پاڵ بدەین دواتر پیکابەکەش لا دەبەین، لە ناو ئەو هات و هاوار و قەرەباڵغییەدا، گوێم لە دەنگی کاك قادری خاڵە حەمەی ئالوەتان بوو، کە پێمان دەگوت قادری(سایەق). کاك قادر سەیارەیەکی تویوتا هەبوو، ژیان و گوزەرانی باش بوو، وتی من دەچم بۆ ئەو پایەگایەی بەرامبەرمان و داوایان لێ دەکەم بەڵکو جەریسەقیلمان بدەنێ واتە سلینگ، تا تانکەرەکە بەرز بکەینەوە ئینجا تیۆتایەکە لەسەر محەمەد لابدەین. پێشنیاری کاك قادر بە جێ بوو، لا بردنی تانکەرێکی واگەورەی سەربازی

هەر بە سڵینگ دەکرا. کاك قادر چوو جەریسەقیل بێنێ تا هاتنەوەی پتر لە کاتژمێرێکی پێچوو. لە ژێر هەردوو سەیارەکە چاوەڕوانی مەرگ بووم، دوا چرکەکانی ژیانی خۆم دەژمارد. ژیان شیرینە، لە هیچ بارودۆخێك دا مرۆڤ حەزناکات بمرێت، بەلام ئێمەی پێشمەرگە هەمیشە ناوی خۆمان بە خۆمانەوە بوو هەرگیز لە مەرگ نەدەترساین، بەڵام حەزم نەکرد ئەو کاتانە بەرووداوی سەیارە بمرم، بەڵکو ئارەزووم دەکرد لە شەرێك دا شەهیدبم. لە لایەکی تر خەمی خێزانم و هەردوو منداڵە وردیلەکانم هۆنیا و هاوێرم بوو کە سەرگەردان دەبوون. خەمی دایکم بوو کە مشور خۆری هەمیشەیی من بوو. لەو بیر کردنەوانەدا بووم گوێم لە کاك حەمەی میرزا خدری ئالۆەتان بوو، وتی وا جەرەسەقیلەکە گەیشت، بەگەیشتنی سڵینگەکە دەستبەجێ تانکەرەکەیان لەسەر لابردم، کە تانکەرەکە لاچوو بە ئاسانی پشووم هەڵدەکێشا، دواتر سەیارەی مام ئاڵلا لەسەر پشتم لابرا، بە هیمەتی خەڵکەکە لە ژێر سەیارەکە دەریانهێنام، هەموو لەشم سڕ ببوو لاقەکانم عەردیان نەدەگرت، میزڵدانم ئەستوور ببوو، دەم و ددانم هەمووی خوێن بوو، سواری سەیارەیەکی پشت بەتاڵیان کردم پێم وایە ئەویش هەر تویوتا بوو. دایکی هۆنیا و هەردوو کچە بریندارەکەشمیان خستە پشت تویوتایەکە. کە گەیشتینە خەستەخانەی(خانێ) خەریکبوو ڕەق دەبوومەوە سەرمام بوو چەقە چەقی ددانم دەهات، لە خەستەخانەی (پیرانشهر) تیمارێکی سەرەتایمان بۆکرا و، لە وێوە بەرێکراین بۆ نەخۆشخانەی(نەغەدە)، لە سالۆنی نەخۆشخانەکە فرێیان داین و کەس بە لاماندا نەهات. گوێم لە دەنگێکی میهرەبان بوو لە دەنگی خوشکێکی دڵسۆز دەچوو، هەردوو دەسکی نەقالەکەی لای سەرمی گرتبو و، قسەی لەگەڵ کەسەکەی تر دەکرد، دەگوت: پەلە بکەن تەندروستی زۆر خراپە دەبێ دکتۆر فریایی بکەوێت، ئەو دەنگە، دەنگی خوشکە حەلیمەی خێزانی کاك کەریم والی بوو ماڵیان لە نەغەدە بوو، خوشکە حەلیمە لەو سەفەرەدا بوو بە ئاشنامان لەگەڵ دایکی هۆنیا لە ناوەوە گەڕابۆوە... خوشکە حەلیمە و کاك کەریمی هاوسەری لەو ڕووداوەدا لەو ئاوارەییەدا بوون بە فریادڕەسی گیانی ئێمە. ئێستاش وەکو خوشکێکی گەورەو برایەکی ئازیز وان بۆ من. خوشکە حەلیمە ژنێکی دڵ گەورەو مشورخۆر بوو بۆ زۆربەی هاوڕێیان، تەنانەت بۆ کاری زۆر نهێنی و تایبەتی حزبی شیوعی، کاك کەریم والی خۆی و سەیارەکەی هەمیشە لە خزمەتی حزبی شیوعی و هاوڕێیاندا بوو... هەفتەیەك بوو لە خەستەخانەی نەغەدە بووم ئێسقانی حەوزم شکابوو، جگەرو گورچیلەکانم زۆر ئەزیەتیان

پێگەیشتبوو، دەم ولوت و ددانەکانم بریندرابوون، دکتۆر پێی گوتم لێرە چارەسەرت ناکرێ، ناشتوانم زەمانەتت بکەم دەگەیە (تاران) یان نا... حزبی شیوعی عێراقی بۆ چارەسەرکردن و فریاکەوتنی هاوڕێیانی خۆی زۆر باش بوو، بە هەزاران دۆلاری لە گیانی هاوڕێیەك خەرج کردبا بە لایەوە گرینگ نەبوو... ئەو کاتە(حزب) سەرقاڵی بەستنی کۆنگرەی چوارەم بوو، دەست بەجێ بڕیاردرا بمگەیەننە(تاران) بۆ ئەوەی چارەسەر بکرێم. لەگەڵ هاوڕێ حەسەن خدر هەمیشە وەکو برایەك وابووین. لەو رووداوە لام بوو لە نەخۆشخانەی(نەغەدە) وتی ڕات چییە دکتۆر دەڵێ ناگاتە(تاران)؟ وتم برۆ فایلی خەستەخانەم بۆ بێنە، هاوڕێ حەسەن خدر چوو فایلەکەی هێنا، لەسەر فایلەکەم نووسی: ئەگەر مردم خۆم بەرپرسیارم، رێگام بدەن لە خەستەخانە دەربچم... کە ئەوەم لە سەر فایلەکەم نووسی، دکتۆر ڕەزامەندی دەربڕی. سەیارەیەکی تایبەتیان بۆ گرتم من لە پشتەوەی سەیارەکە درێژ کرابووم هاوڕێ حەسەن خدریش لە پێشەوە دانیشتبوو. لە رێگایە هاوڕێ حەسەن زوو زوو ئاوڕی دەدایەوە و دەیگوت چۆنی! پێم گوت لەگەڵ ئیزرائیل رێککەوتووین ئەم جارەش بمبەخشێ، دڵنیابە نامرم.

ئەو جارەش لە مەرگ دەربازبووم. ماوەی دوو مانگ لە نەخۆشخانەیەکی تایبەتی(تاران) لەژێر چاوەدێری دکتۆرێکی پسپۆردا بووم. وردە وردە بە شەقەی دەست هاتوچۆم دەکرد. هاوڕێیانی بەشی سەرپەرشتی نەخۆش و کاروباری هەندەران لە تاران زۆر پێمەوە ماندووبوون، بەتایبەتی هاوڕێ ئەبو شیرین و ئەبو فاتمە دوو کوردی فەیلی بوون کە لە هەشتاکانەوە وەبەر شاڵاوی ترحیلی کوردە فەیلەکانی بەغدا کەوتبوون، لە تاران دەژیان...ئەو رووداوە ماوەی(٩) مانگی ڕەبەق دار شەقەی پێ هەڵگرتم و نەخۆش کەوتم. ئەوەی زۆر جێگای ناڕەحەتی بوو ئازاری هەناوم بوو بەتایبەتی جگەرم، ئازارێکی زۆری پێگەیشتبوو، هەرچی دەمخوارد دەسبەجێ دەمهێنایەوە. لە(ورمێ) سەردانی دکتۆرێکی هەناوم کرد وتی تووشی زەردوویی بووی چارەسەری بۆ نووسیم لە ئازاری جگەریش رزگارم بوو. لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٨٦ بەرەو باشی دەڕۆیشتم دارشەقەکانم فڕێدابوو خەریکبوو لە خۆم رابیینم بیر لە مەفرەزە بکەمەوە...

## کانی زوودان:

لە ١٩٨٦/٦/٣ ڕەوەندی کوڕم لەدایکبوو، بە لەدایکبوونی ڕەوەند چەپکە گوڵی خێزانم هەمەڕەنگ تر بوو، هیچ کاتێك فەرق و جیاوازیم بە کچ و کوڕەکانم نەکردووە و ناکەم، بەڵام

خێزان بە هەردوو ڕەگەزەکەیەوە جوانترە... لە ١٩٨٦/٦/١٦ بڕیارمدا سەردانی ڕێکخستنەکانی ناوەوە بکەم، هاوڕێی هەمیشەیم هەمزە سوور ئامادەبوو. لە ١٩٨٦/٦/١٧ بەرێ کەوتین لە(گوێزیلێ) ژەمی نیوەڕۆمان خوارد. هێشتا زەردە بە سەرانەوە مابوو بەرەو دۆڵێ زوودان شۆڕبووینەوە، کە گەیشتینە سەرکانییە زوودان دنیا ڕووناك بوو جاسووس هەڵنەگیرابوو. کانییە زوودان هەر(٥٠) مەتر لەو ڕەبیەی جاشەکان دوور بوو. کانییەکە هەندێك نەدیو بوو، هەم لە گەڕانەوە هەم لە هاتنەوە خوارەوەدا ئەو کانییە دەهاتە سەر ڕێگامان. ئەو کانییە بۆ ئێمە ببوو بە سنووری نێوان شاخ و پێدەشت، لە هەردوو سەری چوون وهاتنەوەدا لەو کانییە پشوومان دەدا، هەم مەتارەکانمان پڕ لە ئاو دەکرد، لەسەر کانییەکە وێنەیەکمان لەگەڵ هاوڕێ هەمزە گرت. دەمێکە گوتراوە کانییەك ئاوت لێ خواردەوە بەردی تێ فڕێ مەدە. کانی زوودانیش ئەگەرچی بێ ناز بوو وەکو جاران کیژۆڵە و شۆڕە ژنە ئازاو بوێرەکانی زوودان نەدەهاتنە سەری، گۆزەو کوندەی لێ پڕ نەدەکران، کوڵ و کانی لە لێواریدا بوونیان نەبوو، خورییە جندە و قەوزە وەك تەون ڕووی کانییەکەیان تەنی بوو. بەڵام سەرەڕای ئەو بێ نازییەش هێشتا بۆقە دەنگ خۆشەکان لە قیڕو قاڕی خۆیان نەکەوتبوون، وەك ئەوەی پێمان بڵێن هۆ کاکی پێشمەرگە ورەتان بەرز بێت، ڕۆژێك دێت کانییە زوودان و دەستە خوشکەکانی تری کوردستان ئاوەدان دەبنەوە... بە لەپی دەستی ڕاستم قەوزە شینەکەی سەر ئاوی کانی یەکەم لادا، وەکو زولف و پرچی ئاڵۆزی گەورە کچێك لادەم لە شیرین خەودا، زنجێکی مرواری لەژێر قەوزەکە چاو شارکێنەی لەگەڵ دەکردین، هەروەکو ئەویندار لێوی تەڕی بۆ ڕاگرتین تا لێوە وشك و تینوەکانمان پاراو بکات...

لە دوای ڕووداوی سەیارە یەکەم جار بوو سەردانی خوارەوە بکەم، دیداری دایك و مامم و براکانم خۆشحاڵی کردم. بە دیداری هاوڕێ سورەو هاوڕێکانی ترم ئاسوودە بووم، بەڵام مخابن هاوڕێ شێخە کەوڵەو ژمارەیەك لە هاوڕێیانی ڕێکخراوی شەهید عەبدوڵڵا دەڵگەییم نە بینییەوە، چونکە لە لایەن خۆفرۆشێکەوە خیانەتیان پێ کرابوو. دائیرەی ئەمن لە قەڵادزێ ماڵی هاوڕێ شێخەیان پشکنی بوو کۆمەڵێك بەڵگەنامەی(حزب) و دەمانچەو دەست نووسی هاوڕێیان لە ماڵەکەیدا دەستیان بەسەرداگیرابوو. هاوڕێ(شەهید) هاوڕێ جەمال بەرپرسی ڕێکخستنەکانی قەڵادزێ بوو، لە ئۆردووگای بەستەستێن چاومان بە یەکتر کەوت. بەداخەوە ئەویش چالاکییەکانی خۆی هەڵپەسارد و وتی هیچی تر بە دوام دا مەنێرە، ئەوە دوا دیداری

هاوڕێ جمال بوو. دیار بوو ئەو زەبرەی وەبەر ڕێکخراوی شەهید عەبدوڵڵا کەوتبوو کاریگەری بۆسەر ئەویش هەبوو... هاوڕێ شێخە کەوڵە لە لایەن جەللادەکانەوە لە سێدارەدرا، هاوڕێکانی تر حوکم دران دواتر لە ڕێگای لێبوردنی گشتییەوە ئازادکران... بەدەنەی ڕێکخستنەکانی(حزب) لە قەڵادزێ شیرازەی لە بەرێك ترازابوو، بەڵام بە هیمەتی دڵسۆزانی(حزب) بەتایبەتی تێکۆشەرە دێرینەکان لە دوای هەوڵێکی زۆر، ڕێکخستنەکان توکمەو پتەو کرانەوە، ماوەیەك ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی قەڵادزێ و دەوروبەریشم دەکرد، دواتر لەگەڵ هاوڕێ کاکەڕەش دا چەند جارێك سەردانی ناو قەڵادزێ مان دەکرد و، هاوڕێیانی ئەوێمان بەسەر دەکردەوە... هاوڕێ سەلیم و هاوڕێ محەمەد دەڵگەیی و هاوڕێیانی لقی پشدەریش ڕۆڵێکی چالاك و کاریگەریان هەبوو لە پڕکردنەوەی ئەو کەلەبەرەی کەوتبۆ ناو ڕێکخراوەکانی حزب لەناو شار...

## سێبەری خەیالۆکێ[٧]:

لە ناو مەنگوڕان نسێ بە سێبەر دەگوترێ. سێبەری خەیالۆکێ ئەو شوێنەیە دەکەوێتە باکووری گوندی(کوزینێ)، لە باکووری ڕۆژهەڵاتی پردی شەهید(حەسۆ میرخان). سێبەری خیالۆکێ لە چییەوە هاتووە نازانم وێدەچێ خیال ئەو کچە بووبێ لەو سێبەرەدا جێ ژووانی لەگەڵ لاوەکەیدا کردبێ، یا خود بە پێچەوانەوە ڕەنگە پەندێکی تر بێت بەسەر خەیالۆکیدا هاتووەو، نەوە بۆ نەوە ناونیشانەکەی گواستراوەتەوە و بەسەرهاتەکەی بزربووە، ئەوەیان ڕوون نییە هەر چۆنێك بێت هیچ دووکەڵێك بێ ئاگر نابێ... سێبەر یا نسێی خەیالۆکێ، لاپالێکی لێرەوارِ بوو ماڵی خوالێخۆشبوو مام حەسەن گۆرانی لی بوو. مام حەسەن گۆران خەڵکی توتمێ بوو مەڕداری دەکرد مێگەلێکی تێکەڵ لە بزن و مەڕی هەبوو، ژیانی خۆی و خێزانەکەی پێ دابین دەکرد. زۆرجار من و هاوڕێ هەمزە سوور لەو لاپالۆکەی سێبەری خەیالۆکێ میوانی پوورە زێنێ خێزانی مام حەسەن گۆران دەبووین. ناوبراو وەك دایکی خۆمان وابوو هەر کە دەنگی دەبیستین بەتایبەتی دەنگی هاوڕێ هەمزە، دەیناسی و دەیگوت هەمزیلە ئەوە تۆی، دەبڕۆن دانیشن منیش ئێستا دێمەوە. ئێستاش دیمەنی کۆتانی کاریلەکانی پوورە زێنێ و ڕەشماڵە سێ چەڵەگەکەیانم هەر لەبەر چاوە، شوێنی تاوڵەکە لە بارەگایەکی نەهێنی پێشمەرگە دەچوو، ئەگەر پاداشتی مادی بە پێی خزمەت و تێکۆشان بێت پێویست بوو مام حەسەن و

پووره زێنیٚ وەکو پێشمەرگەی دێرین خانەنشین بکرێن... هێشتا زەردەخەنەی پووره زێنیٚ بە سیمای گەڵای داربەڕووە بەساڵاچووەکانی سێبەری خیالۆکیٚ وە دیارە، پووره زێنەکان زۆر خۆشەویستن پووره زێنیٚ حەسەن گۆرانی پووره زێنیٚ عەلی گۆرانەکەی تری هاوڕیٚ...

بەندە پاڵم وە کۆڵەپشتی خۆم دابوو هەمزەش ببوو بە وەرگێرکەی پووره زێنیٚ پتر لە گەورە کچێکی پووره زێنیٚ دەچوو تا پێشمەرگە. ئەویٚ ڕۆژیٚ کۆتایی مانگی حوزەیرانی ساڵی١٩٨٦ بوو ماڵی مام حەسەن خەریکی گواستنەوەی هەوارگەکەیان بوون بەرەو گردی ڕەمکان، کە قۆناغێکی تر وەسەردەکەوتن بەرەو کوێستان...

## کۆڵە پشتی مام قادر:

مام قادر نازناوی هاوڕیٚ برایم ئەبوبەکر بوو. هاوڕیٚ برایم کوڕە تاقانەی پووره ئایشیٚ بوو، ماڵیان لە گوندی(مێوژە)ی بناری کۆسرەت بوو، هەروەك لە جێگایەکی تریش باسم کردووە بە هەق ژنێکی خۆنەویست و دڵسۆز بوو بۆ هاوڕێیان... مام قادر کادری سنووری بیتوێن بوو، وەکو هاوڕێیانی تری بیتوێن و کۆیە هاوڕیٚ عارف و هاوڕیٚ حەسەن کاکەش هەر بەهۆی هاوکاری هاوڕێیان و کادرەکانی سنووری پشدەر دەربازدەکران و بەرەو چیای کێوەڕەش، لەوێشەوە بەرەو ڕانیە و دەشتی بیتوێن دەچوون... باوکی سەرباز واتا هاوڕیٚ مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی ڕای سپاردین کە هاوڕیٚ مام قادریش لەگەڵ خۆماندا ببەین. کە وتم هاوڕیٚ مام قادر لەگەڵ خۆمان دەبەین، هاوڕیٚ هەمزە چەندە سوور بوو ئەوەندەی تر سوور هەڵگەڕا و، وتی کاکە جارەکەی تریش پێوەی مردم، ڕۆژمان بەسەرداهات کەچی لاقی بە روخی رووباری بەستەستێن دا ڕاهێشتبوو دوو هەنگاو مابوو، نەیدەتوانی بگاتە ماڵی(مام حوسێن)... هەر چۆنیٚ بوو هاوڕیٚ هەمزەم ڕازی کرد...

لە کۆتایی مانگی تشرینی دووەم بوو بە هەورازە ڕك و درێژو کوڕەکەی دۆڵەکۆگە هەڵگەڕاین بەرەو ڕەبیەی لوتکەی سەری سادر و چەکوچ کە پێی دەگوتریٚ گۆمە(وشکە)، لە ناوەڕاستی هەورازەکە هاوڕیٚ هەمزە ئاوڕێکی دایەوە وتی هاوڕیٚ برایم ئەم جارە لە ڕێگایە نەوەستیٚ، بوەستیٚ جێت دەهێڵم، کوا با بزانم کۆڵەپشتەکەت گرانە؟ کە هەڵی سەنگاند چەپەلۆکێکی بە سەری خۆی دادا، وتی ئەوە چییە پێتە؟ هاوڕیٚ مام قادر کۆڵە پشتەکەی ڕەکێش کردە لای خۆی و زەردەخەنەیەکی هاتیٚ، هەمزە وتی خۆ دەزانم چی تێدایە! هەمووی

دیارییە بۆ پرو پیرەژنان. هاوڕێ هەمزە راستی دەکرد، هاوڕێ برایم زۆر تێکەڵاو بوو، زۆر جار دیاری لە شارەکانی ئێران دەکڕی و دەیبردەوە، هەمزەش ترسی ئەوەی هەبوو کە هاوڕێ برایم پەکی بکەوێت سەرەڕای ماندووبوونی خۆی ئەو کۆڵەپشتەکەی ئەویش هەڵبگرێت... قۆناغ بە قۆناغ بناری(قەندیل) مان بڕی. ئەو شەوە گەیشتینە تەپۆڵکەکانی زوودان و شەروێت، ئەو جارەیان هەمزە رێگاکەی گۆڕی، ئێمەی بردەوە باکووری سەرچاوەی گوندی راگوێزراوەکەی شەروێت، شەروێت پایەگایەکی گەورەی سەربازی و تۆپخانەی لێ بوو کە سنووری بناری قەندیلی بوردومان دەکرد... ئەو جێگایەی پێیدا ڕۆیشتین پەنجا مەترێك لە پایەگایەکە دوور بوو، بلاجکتۆری تانکەکانی پایەگا بەهەر چوار دەوری خۆیاندا دەسوڕان، کە بلاجکتۆرکان روویان تێدەکردین دەبوو خۆمان نەوی بکەین. شێبای شەوانی قۆپی و، پنگ و شیوەڵی چۆمی شەروێت تەزوی رۆژگارەکانی سەرەتای لاوی بە گیانمدا رەت دەکرد. کە لە پردی دارینی شەروێت دەپەڕیمەوە سیلەی چاوم دەدایە شەپۆلەکانی رووبارەکە، ماسییەکان خۆیان دەهاویشتە ناو ڕێژەوی شەپۆلەکان و لە هاڵاوی ئاوەکەدا تەراتێنیان دەکرد. چۆمی شەروێت خوڕە رووبارێکە لە سەرچاوەی گوندی شەروێت هەڵدەقوڵێ. ئەو شوێنە پێی دەگوترێ(سەرچاوە)، بە زستانان گەرم و بە هاوینان ساردە، ئەوسا تەنانەت لە ناو ماڵانیش کانی و سەرچاوەی ئاو هەڵدەقولا. ماڵی وا هەبوو کانی لە ناو ماڵەکەیدا هەڵدەقولا، ناچار راڕەویان بۆ دروستدەکرد تا ئاوەکە بە ناو داڵانێدا بڕوا. هەموو ئەو بیرەوەریانە لە باوەشی خۆیاندا بزریان کردبووم، هەمزە بە سرتە قسەی دەکردو منیش هەر دەمگوت(ئم)!! هاوڕێ هەمزە وتی ئەرێ(ئم) یەعنی چی؟ وتم یەعنی(ئم)؟!... هێشتا مام قادر پەکی نەکەوتبوو، بەڵام ماندوو دیار بوو. بەرەو پێدەشتی چۆمی مەلا ئالێ رویشتین و لە بانوەکانی باکووری ژاراوە نزیکبووینەوە. ناقیلەکانی رەبیەی رێگا خاکییەکەی باکووری بەستەتێنی سەرێ، چیخ ماڵ بە دۆشکە دەیڕشاند. گولله بەرەو لای ئێمە گیزەگیزیان بوو. لەبەر مەترسی جاشەکان لە دەورەی بەستەستێن ئاراستەی خۆمان گۆڕی بەرەو گوندی(سوڵتانە دێ). باران و قوڕی بانوەکانی پشتی ژاراوە هاوڕێ مام قادری شپرزە کردبوو، بەڵام ورەی بەرز بوو. کۆڵەپشتەکەی زۆر گران بوو، لە ترسی زمانی هەمزەش دوا نەدەکەوت... کاتژمێر سێی شەوبوو هاوڕێ هەمزە لە دەرگای ماڵی کاك مستەفای برای هاوڕێ(سەلیم)ی دا، کاك مستەفا دەرگای کردەوە و بە گەرمی بەخێرهاتنی کردین، ئەو شەوە خەوتین چ خەوێك هەڵدەگرێت پێی بگوترێ **خەوی**

**مێژوویی**. هیچ خەوێك ئەوەندەی خەوی سەفەرێکی دوورو درێژی پێشمەرگایەتی خۆش نییە، ئەو سەردان و شەو ڕۆیشتنانەی ئێمە ڕۆیشتنی ئاسایی نەبوون، لە ڕێگادا بە پارێزو بێ هەست دەڕۆیشتین بۆ ئەوەی نەکەوینە ناو بۆسەی جاشەکان...

بەیانی لەخەو هەڵساین دیمەنێکی سەیرم دیت لە ماڵی کاك مستەفا سەیرم کرد منداڵێکی خرپنی قەڵەو بە پشتێنێك بەستراوەتەوە. خێزانی کاك مستەفا ناوی خوشکە گوڵێیە، خوشکی هاوڕێ سورەیە، رووی سپی بێت، یەکێك بوو لەو گوڵانەی باغی تێکۆشان، هەرگیز رووی گرژو ناخۆشمان لەو ژنە نەدیت، دەیان جار میوانی کاك مستەفا بووین کەچی جار لە جار رووی خۆشتر بوو. گوتم خوشکە گەڵێ بۆچی ئەو کوڕە جوانەت بەستۆتەوە وتی کاکە ئەوە جاری یەکەمی نییە هەموو منداڵەکانم فێرکردون دەیان بەستمەوە، ئەگەر نەبەسترێنەوە خۆیان دەسووتێنن، چونکە من لەگەڵ مستەفا دا دەچم بۆ ڕنینی توتن و کاری رۆژانە ناچارم منداڵەکان ببەستمەوە... ئەو کوڕەی دەبەسترایەوە ناوی ئەحمەد بوو. ئەو ئەحمەدە ئێستا گەنجێکی رێك وپێکە، خوێندنی تەواوکردووە، بووە بە مامۆستای ناوەندی، تەمەنی درێژ بێت... لەو سەردەمانەدا ئێمەی هاوڕێیان براو خزمەکانیشمان وەك باسم کردووە بەشێك بوون لە هاوڕێیانی حزبی، وەك تێکۆشەر بە کارمان دەهێنان و سوودمان لێ وەردەگرتن. براکانی هاوڕێ سەلیمەسووریش وەکو کاك مستەفا، کاك حەمەڕەش، کاك ڕەسوڵ کوڕانی رۆژی تەنگانە بوون، بە هەق چاونەترس بوون هەمیشە لە خزمەتی حزبی شیوعیدا بوون...هەر ئەو رۆژە کاك مستەفا چوو بۆ لای هاوڕێ(سورە) و پێی ڕاگەیاند کە ئێمە لەوێن... بولێڵی ئێوارە بوو، هاوڕێ سورە و بەندەو هاوڕێ هەمزەو مام قادر بە ناو بانووەکانی ئەوبەری گوندی سوڵتانەدێدا وەڕێکەوتین،، لەبەر قورو لێزمەی باران ناچاربووین پێڵاوەکانمان دابکەنین. دنیا تاریك بوو هەر بە ئاراستەی رووناکی گلۆپەکانی ئۆردووگای بەستەستێن دەڕۆیشتین، بەڵام لەبەرئەوەی شارەزا بووین چووینەوە سەر چۆمی بەستەستێن، ئینجا گەڕاینەوە ناو ئۆردووگای بەستەستێن. ماڵی پوور ئامانێ لاپەڕ بوو. چووینە ماڵی حەمەی پوور ئامانێ. ناوبراو خوارزای هاوڕێ خەلیفە پیرۆت بوو. پوور ئامان خوشکە گەورەی مام پیرۆت بوو، ژنێکی زۆر هێمن و لەسەرخۆ بوو، ئەویش هەر بە گەنجی هاوسەرەکەی کۆچی دوایی کردبوو، خۆی منداڵەکانی سەرپەرشتی دەکرد، هەتا دڵ بخوازێت ژنێکی دڵ گەورەو خۆش خولق بوو. لەوێشەوە چووین بۆ ماڵی مام پیرۆت (خەلیفە)، کە وەژوور کەوتین وتی ئەوە هاتی(حەمە

کۆیی)، به منی دەگوت حەمە کۆیی. حەمە کۆیی کادرێکی حزبی شیوعی بوو سەرپەرشتی رێکخستنەکانی سنووری عەشیرەتی مامەشایەتی دەکرد. خەلیفە بە هاوڕێ(سورە)ی وت ها(رەسو) بە خێر بێن(رەسو) هێمایەکی نهێنی نێوان خۆمان بوو...(رەسو) ناوی وەستا ڕەسوڵ بوو کە کادرێکی تێکۆشەری(حزب) بوو بەڵام زۆر مێ بازو دڵ تەڕ بوو، هەر بەهۆی ئەو دڵتەرییەوە، تەماحی لە خێزانی برادەرێکی خۆی کرد و بە تەڵاقدانی دا، دواتر خواستی و مارەی کرد، حزبیش لەسەر ئەم کارە دەری کرد... هاوڕێ ڕەسوڵ بە ناچاری خۆی تەسلیم کردەوە و چوو بۆ بەغدا، دواتر گەڕایەوە و خەریکبوو بگەڕێتەوە ناو حزب، بەڵام فریا نەکەوت لە ساڵی ١٩٨٥ لە ماڵی هاوڕێ حەمە کۆیی لە قەڵادزێ لەگەڵ خێزانی هاوڕێ حەمە کۆیی شەهیدکران. لەسەربانی ماڵی هاوڕێ حەمە کۆییەوە بە نارنجۆك و دەمانچە تەقەیان لێکردوون، لە لایەن ناحەزانی حزبی شیوعییەوە شەهیدکران. خێزانی هاوڕێ حەمە کۆیی و هاوڕێ ڕەسوڵ لەسەر حزب کوژران نەك لەسەر کێشەی شەخسی خۆیان. بەهۆی ڕووداوەکانی رابردوو بکوژەکان تۆڵەیان لە حزبی شیوعی کردەوە...

دەگوترێت قسە قسە رادەکێشێ با بچینە لای هاوڕێ خەلیفە، لەوێوە هاوڕێ سورەو هاوڕێ مام قادر بەرەو سەنگەسەر ڕۆیشتن. هاوڕێ سورە مام قادری بەرەو رانیە بەڕێکرد، بەرێ کردنی مام قادر چیرۆکێکی ترە. بۆشەوی دواتر هاوڕێ (سورە) وەپێش(مام قادر) دەکەوێت لە پردەدارینی گوندی(چۆمە سووتاو) لە رووباری(گاڕفێن)، دەیەوێت مام قادر بپەڕێنێتەوە بەرەو چیای کێوەڕەش بڕوات، لەوێشەوە بەرەو(رانیە)، ئینجا رادەستی چاوساغی رێکخستنەکانی رانیەی بکات. بەڵام مام قادر لە زەوییەکانی خدری کاکە شینی لە هاوڕێ سورە دادەبڕێت ناچار بە فیتو لێدان یەکتر دەدۆزنەوە. جارێکی تریش لەگەڵ هاوڕێ عارف دا بە هەمان شێوە لە ناو زەوییەکانی خدری کاکەشیندا مام قادر بزر دەبێ. زەوییەکانی خدری کاکەشین کەوتوونەتە رۆژهەڵاتی شارۆچکەی سەنگەسەر، سروشتی زەوییەکانی ئاماڵ کەوییە واتا نەوی و نشێوە. مام قادر چاوێکی تەواو نەبوو رەنگە شەرمی کردبێ بڵێ شەوانە باش نابینم، زۆرجار رێکەوتووە پێشمەرگە نەخۆش دەکەوت یا کەم وکورتییەکی بەدەنی دەبوو قسەی نەدەکرد، نەکا هاوڕێکانی پێی بڵێن ترسنۆکە و لە ترسان نەچووە بۆ مەفرەزە...

من و هاوڕێ هەمزە پێکەوە لە ماڵی هاوڕێ خەلیفە پیرۆت بووین، ئەو رۆژە(خەلیفە) ژمارەیەك گەنجی یەك بە دوای یەکدا دەنارده ژوورەوە بۆ ئەوەی قسەیان بۆ بکەم و ئاڕاستەیان

بکەین بۆ ناو ریزەکانی ڕێکخستن، لە هەر کاتژمێرێکدا خەلیفە سەرە تاتکێی دەکردو گەنجێکی وەژوور دەنا، جگەرەکەی بە لا لێویەوە دەناو پێدەکەنی و دەیگوت ئەوەشم مارە کرد! واتا بە قەولی(خەلیفە) هاتە ناو ڕێکخستن. بە گەنجەکانیشی گوتبوو بڕۆنە ژوورەوە(حەمە کۆیی) لەوێیە، ئەوانیش پرسیبوویان حەمە کۆیی کێیە؟ وتبووی حەمە کۆیی(حزبە). گەنجێك لەو گەنجانە پەلکێشی دەکات ئەویش نایەوێ بێت بۆ لام تا نەزانێ دەچێتە لای کێ؟ خەلیفەش دەڵێ: دەبڕۆ هەموتان بە(حەمە کۆییشەوە) ژنی دەمنن!! بە داخەوە گەنجەکە کە ناوەکەیم لەبیر نەماوە پێدەکەنێ و دەڵێ: باشە منیش بە ژنی خۆت حساب بکە...زۆرجار شەوانە دەردەچووین لە گەرەکەکانی ئۆردووگای بەستەستێن سەردانی هاوڕێیانی ترمان دەکرد. شەوێك زۆر بە درەنگەوە گەڕاینەوە کاتژمێر دوویی شەو بوو لە دەرگامان نەدا. لەگەڵ(خەلیفە) وا ڕێکەوتبووین بۆ ئەوەی دراوسێکانیان ئاگادار نەبن، لە دەرگا نەدەین. بە ئەسپایی چووینە ژوورەوە کە وەژوور کەوتین خەلیفەو خەلیفە ژن بە یەکەوە دانیشتبوون، لێمان کردنە هەرا گوتمان خەلیفە ئەوە خەریکی چی بەم شەوە درەنگە؟ خەلیفە پێکەنی و وتی: خەریکبووین... خەلیفە ژنیش چاپۆکێکی پێداداو وتی: ڕاست ناکات چاوەڕوانی ئێوەمان دەکرد. ڕاستە دەڵێن: هەموو پیاوێکی مەزن ژنێکی مەزنی لە پشتەوەیە، خەلیفەژن واتا پوورە فات لەو ژنە مەزنانەیە کە مێژووی خەباتی گەلەکەمان دەبێ شانازی پێوە بکات، ناوبراو وەك هاوڕێ خەلیفە پیرۆت ئازاو بە جەرگ بوو، یا ڕاستییەکەی ئەوەیە بڵێم خەلیفە پیرۆت وەك خەلیفە ژن بەجەرگ و ئازا بوو. هەمیشە ژن دەتوانێ هاوکاری پیاو بێت لە هەر کارێکدا کە پیاو ئارەزوو بکات ئەنجامی بدات، کە هاوسەرەکەی هاوکاری نەکات سەرکەوتوو نابێ و کێشەی بۆ دروستدەبێ. لە ساڵانی پێشمەرگایەتیدا دەیان تێکۆشەر، شێرانە لە بەرامبەر دوژمنان و ڕۆژگارە سەختەکان دەوەستان، بەڵام کە هاوسەرەکەیان هاوکاریان نەدەبوون، ناچار دەبوون سەر شۆڕبکەن و خۆی رادەستی دوژمن بکاتەوە... ژن هەمیشە ئارەزوو دەکات هاوسەرەکەی لەسەر پێ خەفی شەوانەی بێ و بەجێی نەهێڵێ... زۆر کەمن ئەوانەی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیان نەبێ. پیاویش ئارەزوو دەکات کە شەوانە لە باوەشی گەرمی هاوسەر یا ڕاستتر بڵێن ئافرەت دا بخەوێت، بەڵام هەلومەرجە سیاسییەکە ڕێگە نەدات ئەو جۆرە خەون و ئارەزووانە درێژەیان هەبێت. ڕەسوڵ هەمزە تۆف دەڵێ: **کە ئاگر لەسەر چیا کرایەوە پیاو دەبێ لە ماڵ وەدەرکەوێ**. گەلی کوردیش گەلێکی بێ دەوڵەتە، نیشتمانەکەی

بەسەر چوار دەوڵەتدا دابەشکراوە، هەتا نەبێتە خاوەنی قەوارەی نەتەوەیی خۆی ناچارە نەوە دوای نەوە پەرە بە خەباتی خۆی بدات، ئینجا هەلومەرجەکە دەیسەپێنیٚ چ شێوازێکی خەبات بگرێتە بەر. سەردەمی تەمەنی لاوییەتی ئێمە سەردەمی خەباتی شاخ بوو، هەر بۆیە ئەگەر ژنەکە وەك پیاوەکەی شۆڕشگێڕ نەبووبێت کێشەی بۆ دروست بووە و لە نیوەی ڕێگا مەیدانی خەباتی شۆڕشگێڕانەی پیٚ بەجێهێشتووە، لەبەرئەوە دڵنیام هەرپێشمەرگەیەك ژنەکەشی هەر پێشمەرگە بووە ئەگەر چەکیشی هەڵنەگرتبێت یا لە شاخیش نەبووبێت.

ئەو شەوە ماڵی هاوڕیٚ خەلیفەمان بەجێهێشت و، چووین بۆ ماڵی هاوڕیٚ(قادرە سوور) هاوڕیٚ قادر گەنجێکی جوان و ئازاو لەخۆ بوردو بوو، تازە ژیانی هاوسەری پێکهێنابوو، زۆر مەردانە لە سەختترین هەلومەرج دا ئێمەی لە ماڵەکەی خۆیدا دەشاردەوەو جێگای دەکردینەوە. پێشمەرگە ڕاگرتن لەو سەردەمەدا، لە رووی مەترسی یەوە هیچی لە ڕەبیە گرتن کەمتر نەبوو. ڕۆژگارێك بوو دەیان سیخوڕو خۆفرۆش بە ناوی جۆراوجۆر لە ماڵ و گەرەکەکان دەگەڕان بۆ ئەوەی پێشمەرگە بدۆزنەوەو، دەزگاکانی ڕژێم ئاگاداربکەنەوە و نانێکی پێوە بخۆن. لەو سەردەمانەدا هاوڕیٚ قادر هەم خۆی وەکو کادرێکی چالاك لە دەیان چالاکی هەمەجۆردا بەشداری دەکرد، هەم ماڵەکەیشی تەرخانکردبوو بۆ ئێمە هەر کاتیٚ وەژوور کەوتباین وەکو ماڵی خۆمان وابوو. هاوڕیٚ قادر دەیان جار وەکو پێشمەرگە چەکی دەبەست لەگەڵمان دەهات بۆ هەڵواسینی بڵاوکراوەکانی(حزب) لە ناو بازار. ژمارەیەك هاوڕێی تریش لەگەڵ هاوڕیٚ قادردا لە ڕێکخستن کاریان دەکرد ئەوانیش وەکو هاوڕیٚ قادر وابوون، شەوانە وەکو پێشمەرگە لەگەڵمان دەهاتن بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکانی ڕێکخستن، لەوانە: هاوڕیٚ خدری خاڵە مینە، هاوڕیٚ بەکر ئالآیی، هاوڕیٚ بەکر ئالآیی هاوڕێیەکی زۆر چالاك و گەنجێکی ڕۆشنبیرو دەم ڕاست بوو، زۆر بوێرو چاونەترس بوو، ئەوسا حەللاقی دەکرد دوکانەکەی وەکو بارەگای(حزب) وابوو، دەیان گەنجی هاوتەمەنی خۆی بۆ ناو (حزب) ڕادەکێشا، وەك هاوڕیٚ مەلای حەللاق، خالیدی فاتحی و کاسترو...هتد. هەمیشە ترسی تیرۆر یا زیندانی کردنی هاوڕیٚ بەکرو ئەو گەنجانەمان لە دڵدابوو، بەڵام ئۆردووگای بەستەستێن بە ڕژێم کۆنترۆڵ نەدەکرا، تەنانەت کەسانی سەر بە ڕژێمیش لەو ئۆردووگایە بۆ بەرژەوەندی خۆیان و باڵادەستی هاوکاری ڕژێمیان دەکرد، کەس بە بیروباوەڕ لەگەڵ ڕژێم نەبوو. ئەو کۆمەڵە گەنجە دەیان گەنجی تریان بۆ حزب دەستەبەر کرد، تەنانەت لە کاتی ڕاپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ هاوڕیٚ بەکرو قادرە سوور...هتد، وێڕای

هاوڕێ عەلی سەیدەو هاوڕێکانی تر کە لە شاخ دابەزیبوون بەشداریان کرد لە گرتن و دیلکردنی دائیرەی (ئەمن)ی ئۆردووگای(حاجیاوا). کاتێك ئێمە گەڕاینەوە، هاوڕێیان دەیان مەفرەزەیان پێکهێنابوو کە هێزێکی چەکداری گەورە بوون، لە سنوورەکەدا وێڕای پێشمەرگە بەشداریان دەکرد لە ڕزگارکردنی تەپۆڵکەو بەرزاییەکانی ناوچەکە. بۆ نموونە هاوڕێ (عەباس زرار) ناسراو بە هاوڕێ (کرێکار) وێڕای هاوڕێیانی (کۆیە) لەگەڵ هاوڕێ ملازم شیرزادی کۆیە، بەشداری کرد لە ڕزگارکردنی بەرزاییەکانی چیای هەیبەت سوڵتان، هەر ئەو ڕۆژەش لەگەڵ سێ هاوڕێ تر شەهیدبوو...هاوڕێیانی ڕێکخستن لە دەڤەری (پشدەر) نموونەی ئازایەتی و دڵسۆزی و فیداکاری بوون، سەختترین قۆناغی سیاسی، سەردەمی هەشتاکان بوو کە سیاسەتی کورد قڕان لەوپەڕی دابوو، ڕژێمی فاشستی بەغدا هەموو سنوورێکی بەزاند بوو، لەو هەلومەرجە سەختانەدا هاوڕێیانی پشدەر لەسەر خەبات و تێکۆشان سوورتر دەبوون و، ئازایەتی و فیداکاریان دەنواند. بە درێژایی ئەو ساڵانە نەك ئەندامان بەڵکو لایەنگرەکانی حزبیش خیانەتیان بە هاوڕێیانی خۆیان و ئەمانەتی (حزب) نەکرد، تەنانەت لە ساڵانی دوای ئەنفالەکانیش بەتایبەتی ساڵانی ١٩٨٨،١٩٨٩،١٩٩٠ لە هەموو کاتێك چالاك تر بوون. لە بیرمە لە ساڵانی (١٩٨٩، ١٩٩٠) جێگامان نەبوو تێیدا کۆببینەوە، ئەمنەکانی(حاجیاوا) شەوانەش لە گەڕەکەکان دەگەڕان، سۆراغی پێشمەرگەو جموجۆڵی ڕێکخستنەکانیان دەکرد. بە ناچاری لە دەرەوەی حاجیاوا لە ناو خەندەك و چۆڵەوانیدا کۆدەبووینەوە. لە کۆبوونەوەیەکدا لە تەموزی ساڵی ١٩٨٩، کە هاوڕێ بەکر ئاڵەیی، هاوڕێ قادرە سوور، هاوڕێ خدر مینە بەشداربوون، پلانمان دادەڕشت بۆ ئەوەی گەشە بە ڕێکخستنەکان بدەین و ڕووبەڕووی دەزگاکانی ڕژێم ببینەوە، لەو کاتە سەختەو دژوارەدا بینیم هاوڕێیان ورەیان لە لوتکەی چیا بەرزترە، زۆر دڵخۆش بووم پێم وابوو تا (حزب) خاوەنی ئیرادەی ئەو هاوڕێیانە بێت بەسەر دوژمنەکانیدا زاڵ دەبێت...

## گۆشتی سیخوڕ:

شەوی ٩-١٩٨٦/١١/١٠ بوو بەسەر ڕێگای کانییە بێنازەکەی گوندی(زوودان)دا شۆڕبووینەوە، لە کانییەکە هەندێك سەرەوژوورتر بووینەوە تووشی پوش و قانگەلاش بووین، کاولە وێران کراوەکانی گوندی(زوودان) بە قەدەر باڵای من پوش و قانگەلاش داپۆشی بوو،

لەو کاتەدا بیرم لە ژنە ئازاکانی زوودان دەکردەوە، دەمگوت ئەو شۆڕە ژنانە لە کوێن گوریسەکانیان ڕاخەن و شەخرە پوشی گەورە گەورە هەڵچنن بۆ ناو قۆرییەکانیان و لە وەرزی زستان ڕانە مەڕەکانیان پێ تێرو قەڵەو بکەن. ئاخر ناهەقم نەبوو لەو کاتەدا بە ناخی بیرەوەرییەکانمدا ڕۆچم، ئەوەی رۆژێك لە رۆژان پەنیری مەڕدارەکانی زوودیانی خواردبێ هەرگیز لە بیری ناکات، پەنیری مەیرەی زوودیان نموونەی نییە، هەمیشە نرخی پەنیری زودیان لە نرخی هەموو پەنیرەکانی تر زیاتر بووە، ئێستاشی لەگەڵ بێت هیچ مەڕدارێك ڕکەبەری پەنیری زودیانی پێ ناکرێت...دیسان چووبوومە ناو دنیای خۆم، ئاوەدانی دۆڵی زوودان و پەنیرەکەیم وەك شریتێکی ڤیدیویی دەهاتە بەرچاو، وردە وردەش بە دوای هەستی پێی هاوڕێ هەمزەدا دەڕۆیشتم، لە ناکاو دیسان هەمزە نەقۆرچێکی لێدام بەبێ ئەوەی بپرسم چییە؟ خێرا زامنی کلاشینکۆفەکەم لادا کە هەمیشە فیشەکی لەبەر بوو، دیسان هەمزە نەقۆرچێکی تری بە توندی تێکوتام وتی: نایبینی؟ وتم هەر خشەیە، چییە؟ پێم وابوو کاروانچی و ڕێبوارە، چونکە زۆر جاری تریش لەگەڵ کاروانچی و ڕێبوارانی تردا تووشی لێك ڕاسان و تێخوڕینی یەکتربووین. هاوڕێ هەمزە وتی(سیخوڕە) وتم قیروسیا با تەققەمان لێ بکەن لایتەکەت هەڵکە، هەمزە لایتی لێدا سەیرم کرد دوو سیخوڕ بوون نێرەو مێیە لەو کاتانەدا ژوانی دوو عاشقم هاتەوە یاد لە دوای نیوە شەو ژووان دەگرن... هەمزە دیسان نەقۆرچی لێدامەوە وتی بۆچی نایان کوژیت؟! وەکو هەمزە فەرماندەبێت منیش سەرباز یەکسەر رووی چەکەکەم کردە سیخوڕە نێرەکەو پەنجەم پێدا هێنا سێ فیشەك دەرچوون لاشەی نێرەکە لەوێ کەوتو مێیەکەش بۆی دەرچوو... هەمزە هەمیشە چەقۆی هەڵدەگرت کەچی ئەو جارە چەقوی پێ نەبوو. ناچاربووین موسێکمان لە کۆڵەپشتی هەمزە دەرهێناو سیخوڕەکەمان سەر بڕی. ئەوسا موسی(تیمساح) هەبوو چوار پێنج جار ریشمان پێ دەتراشی کول نەدەبوو. کە سیخوڕەکەمان هەڵگرت زۆر گران بوو، هەرگیز نەمدەزانی سیخوڕی ئەوەندە قەڵەو هەیە، لانی کەم(١٥) کیلو دەبوو. هاوڕێ هەمزە وتی چی لێ بکەین؟ گوتم هەڵی دەگرین و دەڕۆین بەرەو شاخی(بێدو). هاوڕێ هەمزە وتی زۆر گرانە هەڵناگیرێت، گوتم ئەوەی ناوێ ئەگەر ئەمرۆ لەبەر ئەو سیخوڕە بمێنینەوە بەجێی ناهێڵم. ناتۆیەکەم لە شانی هاوڕێ داگرت و بۆ سیخوڕەکەمان کردە دەستە بەرە، هەر چوار لاقمان بەستبو و ناتۆیەکەمان تێهەڵکێشابوو. پێش ئەوەی هەڵی بگرین هەمزە وتی دەزانی پەنجەکانی لە پەنجەی هاوێری کچت دەچێ. زۆر نیگەران بووم! هەمزە

راستی دەکرد، ئەوسا هاوێری کچم تەمەنی دوو ساڵ بوو، پەنجەی سیخوڕیش وەك پەنجەی منداڵ خڕین و نەرمونۆڵە. هەرچۆنێك بوو سیخوڕەکەمان هەڵگرت. زۆر گران بوو دیسان هەمزە وتی با بە جێی بێڵین هەڵناگیرێت. گوتم لە سەرخۆ دەرۆین هەر لە رەبیەکان دوور بکەوینەوە وەکو گورگ دەمی تێدەنێن، رێگای کاتژمێرێکمان بە دووکاتژمێر بڕی. زۆر ماندووبووین پشومان دابوو هەمزە وتی گوێت لی بوو! وتم چییە؟ وتی دەنگی سەگ دێت، ئەوە مێگەلە لەو دۆڵەدا مۆڵیان داوە با بڕۆین، هەتا پتر هەڵدەکشاین دەنگی سەگوەڕ پتر دەبوو. بە رۆژی رووناك ماوەیەك ڕۆیشتین، سەگەکان بۆمان هاتن بەڵام شوانەکان سەگەکانیان لە کۆڵ کردینەوە و سیخوڕەکەیان بۆ هەڵگرتین. من و هەمزە خەوتین. شوانەکان خەڵکی توتمێ و بناری رەزگە بوون، لە ناو کەپەنکی شوانان خەومان لێ کەوتبوو، کە هەڵیان ساندین گۆشت برژا بوو. ئەوان حەوت شوان بوون ئێمەش دوو کەس. ژەمی بەیانی و نیوەڕۆمان بە گۆشتی سیخوڕ خوارد، هەندێك ئێسقانیش مابۆوە شوانەکان خستیانە ناو مەنجەڵ بۆ ژەمی ئێوارە هەڵیان گرت، پێشمەرگە کە ژەمی بەلەزەت بێ زەوق و خولقێکی دیکەی دەبێ. رێگا بەرگەی نەدەگرت... هەر ئەو رۆژە گەڕاینەوە بارەگا...

## خڕێ گۆدەرێ:

لە رۆژی ١٩٨٧/٢/٥ بەندەو هاوڕێ کاکەڕەش و هاوڕێ حەمە بچکول رانیەیی لە ئالوەتانەوە بەرەو رەزگە وەڕێکەوتین. هەر ئەو رۆژە گەیشتینە بارەگای(حزب) لە رەزگە هەر ئەو ئیوارەیە ئەگەرچی ماندووبووین بەڵام حەزم نەدەکرد بمێنینەوە بڕیارم دا بەرێ بکەوین، ئەمجارەیان هاوڕێ هەمزە لەگەڵمان نەهات، هاوڕێ هەمزە سەفەرەکەی بەدڵ نەبوو. هەموو جاری بەیەکەوە بووین بۆ سەردانەکان بەڵام ئەوجارە ئەقلی نەیبڕی، منیش هەمزەم زۆر خۆش دەویست شارەزای تەبیعەتی بووم شتێکی بەدڵی نەبا نەدەکرا زۆری لێبکەی.

سێ قۆڵی بەڕێکەوتین رێگاکە باش شارەزا بووم، بەڵام کە لە زوودان شۆڕدەبووینەوە بەرەو شەروێت هەر جارێك لەگەڵ هاوڕێ هەمزە پێیدا ڕۆیشتبووم، هەمزە زۆر شارەزا بوو لەو گردو تەپۆلکانە لەهەر کوێیەك پرسیارت لە هەمزە کردبا دەیگوت ئێرە فلان جێگایە بۆ نموونە لێمان پرسی ئەو خڕە کوێیە وتی(خڕێ گۆدەرێ) هەزار جار بە مێردمنداڵی لێ(...). خڕێ گۆدەرێ دەکەوێتە رۆژهەڵاتی گوندی شەروێت ئانیشکە دۆڵێکی مارپێچییە دێتەوە ناو چۆمی

شەروێتیێ... لەگەڵ کاکەڕەش و هاوڕێ حەمەبچکۆل لەو خڕە دانیشتین ناقیلەکانی پایەگای شەروێتیش بلاجکتۆرەکانیان بە دەورەی خۆیاندا دەگێڕا زۆر جار تیشکی بلاجکتۆرەکە لە ئێمەشی دەدا، بەڵام ئێمە لە خڕێ دابووین، هاوڕێ کاکەڕەش وتی هاوڕێ محەمەد ئێرە کوێیە؟ گوتم خڕێ گۆدەرێیە ئەو خڕەیە کە هەمزە دەڵێ هەزار جار ژووانم تێدا کردووە.

ئەو سەردان و مەفرەزانەی لەگەڵ هاوڕێ هەمزە سوور بووین سەرم دادەخست و بە دوای هەستی پێیەکانی ئەو دەکەوتم، چونکە لە شارەزایی و وریایی بەتایبەتی بۆ ڕێگاکان، نموونەی هاوڕێ هەمزە زۆر کەم بوون. لە بۆن کردن دا هەمزە گورگیشی بۆڕ دابوو. جاریکی لە مەفرەزە دەگەڕاینەوە لە سوێسنێ بووین هەمزە وتی لاق هەڵێنە وا هاوڕێیان لە دۆڵەکۆگە گۆشتی دەبرژێنن. وتم چوزانی؟ وتی بۆنی گۆشتی برژاو دەکەم؟ بەڕاستی وابوو لە ڕێگا پەلەمان کرد گەیشتینە جێ خەریکبوو هاوڕێیان گۆشتیان دەبرژاند لە نان خواردن نەببوونەوە، ئێمەش هەر یەکەمان دوو شیشە گۆشتی(سەدام)یمان بەرکەوت... ئەو شەوەی کاکەڕەش لە ئێمە جیا بۆوە بەرەو قەڵادزێ ڕۆیشت، ئێمەش لەگەڵ هاوڕێ حەمەبچکۆل دا بەرەو گوندی بەستەستێنی سەرێ ڕۆیشتین. ئەو شەوە لە ماڵی مامم بووین، دایکم بە خولق و خوی تایبەتی خۆی، میهرەبانی دایکایەتی لێ دەباری. هەموو جارێ لەگەڵ هاتوچۆی دەرێ و ژوورێدا، جارێك دەیگوت یاخوا بەخێر بێن رۆڵە. کە ئەو هەموو میهرەبانییەم لە دایکم دەبیست لە رووی روحی و سۆزەوە هەستم بە ئارامی دەکرد، لە لایەکی ترەوە پێم وابوو ئەو هەڵپەو کەف و کوڵی دایکایەتی، لە دەروونی هەزاران دایکی کوردستاندا هەیە، کە پێی وایە هەر ئەم جارە جەرگ سۆزەکەی خۆی دەبینێتەوە، دوور نییە لە سەردانێکی تردا بەسەر کەمینێك دا بکەوێ یا لە جەنگێك شەهیدبێ و نەیدۆزێتەوە.

لەگەڵ هاوڕێ(سورە) یەکترمان گرتەوە. پلانمان دانا بۆ سەردان و کربوونەوەکانی رێکخستن، هاوڕێ سورە هاوڕێ حەمەبچکۆلی لە سنووری چیای کیوەڕەش ئاودیو کرد رادەستی هاوڕێیان لە رێکخستنەکانی سەنگەسەر و تووە سووران کرا، پێویستە بگوترێت بەڕێکردن و ناردنەوەی هاوڕێیانی(بیتوێن) بۆ سنوورەکانی کێوەڕەش لەوێشەوە بەرەو رانیەو بیتوێن کارێکی زۆر زەحەمەت بوو هەموو جارێ(سورە) خۆی یا بە هاوڕێیەکی زۆر ئەمین و دڵسۆزی دەسپاردن بۆ ئەوەی نەزانرێ کەی و بە کوێدا دەگەڕێنەوە(بیتوێن)...

ساڵی ١٩٨٧ ساڵی سەرکەوتنی هێزی پێشمەرگە بوو، لە دەیان داستانی نەوعی و گرینگ دا پێشمەرگە سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتنی تۆماردەکرد، بە دەیان شارۆچکەی سنووری گەرمیان و ناوچەکانی تری کوردستان دەستیان بە سەردا گیرا سەدان پایەگای گەورە کەوتنە ژێردەستی پێشمەرگە، کۆنترۆڵ کردنی شارۆچکەکانی کوردستان بوو بە شتێکی ئاسایی سوپاو دەزگاکانی تری ڕژێم لە کوردستان وەکو جاران خەڵك لێیان نەدەترسا، جاش و مستەشارەکان هەر یەکە پەیوەندی دەکرد بە لایەنێکی ناو شۆڕشەوە، ڕێگاکانی رانیە- سلێمانی و کۆیە- هەولێر رۆژانە لەژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگە دابوون، لە کاتژمێر دووی نیوەڕۆ بەم لاوە هیچ کەس لە سەرباز و پیاوەکانی ڕژێم نەیاندەتوانی بەم ڕێگایانەدا هاتوچۆ بکات...

لە ناو سەنگەسەر لە ماڵی هاوڕێ برایمی برای هاوڕێ (سورە) بووین، دوای نیوەڕۆ بوو هاوڕێ(سورە) وتی ڕات چییە بە ڕۆژ سەردانی هاوڕێیانی تووەسووران بکەین؟ منیش یەکسەر ڕایەکەم پەسند کرد، لە ڕێگای زەویەکانی خدری کاکە شینی چووینەوە گوندی چوومە سووتاو، بە ناو گوندەکەدا ڕۆیشتین هاوڕێ(سورە) بە دەست ئاماژەی بۆ ماڵێ کاك سێوەدین کرد و وتی: ئەگەرچی چەکداری ڕژێمە بەڵام پیاوێکی زۆر باشە. دواتر ناوبراو لەسەر ڕێگای کانی وەتمانێ لەگەڵ کۆمەڵێك لە جاشەکانی عەباس بایز بالوڵئاغا بەسەر کەمینێکی هاوڕێیانی خۆماندا دەکەون، شەڕ لە نێوانیان دروستدەبێ، هاوڕێیان ژمارەیان لە جاشەکان کەمتر دەبێ و، دەیانەوێت لە ماوەیەکی کورتیشدا زەبرێك لە جاشەکان بوەشێنن و شەقامی گشتی جێ بهێڵن، بەڵام ئەو دەرفەتەیان بۆ نارەخسێ، بەداخەوە لەو کەمینەدا هاوڕێیەکی(عەرەب) شەهیددەبێ و مام سیوەدینی دۆستی هاوڕێ (سورە)ش بریندار دەبێ دواتر ئەویش بەهۆی برینەکەیەوە دەمرێ. بەدەم گێڕانەوەی قسە خۆشەکانی مام سێوەدین لە رووباری گاڕفێن وەسەرکەوتین بۆ ناو(تووەسووران). لە ناو تووەسووران چووین بۆ ماڵی هاوڕێ(مستەفا) کە خەڵکی پشدەر بوو. هاوڕێ مستەفا گەنجێکی باڵا بەرزی هێمن بوو. هاوڕێ سورە بە یەکتری ناساندین، ئینجا ئەویش چوو ژمارەیەکی گەنجی تری هاوتەمەنی خۆی کۆکردەوە لە ماڵەکەی ئەودا کۆبووینەوە، هەستم کرد زۆر خۆشحال بوون کە ئێمە وەکو پێشمەرگە گیانی خۆمان دەخەینە مەترسییەوە بۆ ئەوەی هاوڕێیان ببینین و بەسەر بکەوینەوە...

کاکەڕەش وەڵامی ناردبوو بەرەو شاخ بگەڕێنەوە لە ١٩٨٧/٢/١٥. من و کاکەڕەش دوو قۆڵی گەڕاینەوە، لە ڕێگا پێش ئەوەی بگەینە شاخی(بێدێو) واتا کانییە گوێزلێ، هاوڕێ کاکەڕەش ئاوڕێکی دایەوە وتی نان نەخۆین؟ وتم بۆ ناخۆین! وتی: چ خواردنێك لە کۆڵە پشتەکەتدایە؟، وتم دوو قوتی گۆشت(گا)، کاکەڕەش وتی: گۆشت گای چی؟ گۆشت گا لێرەش لە یەخەمان نابێتەوە. وتی وەرە لەسەر ئەو تاشە بەردە دانیشە، دانیشتم، کۆڵەپشتەکەی خۆی کردەوە و یەك مریشکی سورکراوەی تەواوی دەرهێنا، شیرینی و خواردنی تریشی پێ بوو. کاکەڕەش  وتی بۆچی خواردن هەڵناگریت؟ گوتم هاوڕێ نامەوێت هیچ کەس ماندووبکەم. ئەگەرنا ئەوسا خەڵك بەگشتی باری ئابووریان باش بوو. مەفرەزەو سەردان لەگەڵ هاوڕێ کاکەڕەش وەك سەیران وایە!. جارێکی تریش بەیەکەوە چووینە قەڵادزێ کەباب عەلی مان بۆ هات. دوای(٩) ساڵ جارێکی تر کەبابی وەستا عەلیم خواردەوە. وەستا وشیاری کوڕی وەستا عەلی زاوای هاوڕێ (کاکەڕەش)ە، پێیان گوتبوو کاکەڕەش دابەزیوە ئەویش گورج کەبابی گەرم و گوڕی بۆ ناردین...

## کامەتان هێن کەم؟ :

لە سنووری پشدەر هەوڵێك لە ئارادابوو، کە پێشمەرگە پەلاماری قەڵادزێ و ئۆردووگاو شارۆچکەکانی پشدەر بدات. بۆ ئەو مەبەستەش بەرپرسی یەکەمی لایەنە سیاسییەکان وەکو پارتی و یەکێتی و حزبی شیوعی و سۆسیالیست کۆبوونەوە. لە کۆبوونەوەکە بڕیاردرا پەیوەندی بکرێت بە مستەشارەکان و ئامر مەفرەزە تایبەتییەکانی جاش، بۆ ئەوەی لە کاتی هێرش کردندا هاوکاری پێشمەرگە بکەن... ڕۆژێك لەگەڵ هاوڕێ ئەحمەد بانیخیلانی کۆبوومەوە، وتی بڕیارە پەلاماری پشدەر بدەین، ڕات چییە؟ وتم سەرکەتوو نابین، دوور نییە ڕژێم بە چەکی کیمیایی پشدەر بۆردومان بکات، جگە لەوە دڵنیام ئێستا ئەو هەواڵە بە ڕژێم گەیشتووە. هاوڕێ مەلا ئەحمەد وتی پێم باشە بچیتە خوارەوە، سەردانی ئەو بەرپرسە جاشانە بکەیت، کە دۆستی حزبن، ڕایان وەربگرە و، بزانە ئەگەر کارێکی ئاوا ئەنجام بدرێ دەتوانن پەیوەندی بە حزبەوە بکەن؟ منیش داوام لێکرد کە چەك بەسەر هاوڕێیانی ناوەوەدا دابەشبکرێت. هاوڕێ ئەبو سەرباز پێشنیارەکەمی قبوڵ کرد، بەڵام وتی جارێ سەردانێك بکە دواتر ڕای هاوڕێیانی ترو برادەرانی لقی پشدەریش وەردەگرین. لە ڕۆژی ١٩٨٧/٤/١٢ من و

هاوڕێ هەمزە سوور چووین بۆ ئۆردووگای بەستەستێن، لەگەڵ هاوڕێ سورە سەردانی ژمارەیەك سەرۆك جاش و ئامر مەفرەزەمان کرد کە دۆستی حزب بوون، تێکڕا هەڵوێستێکی زۆر باشیان هەبوو، لەوانە: کاك(فەقێ حەسەن)ی زودی کاك حوسێنی مامی کاك شریفی زوودی و چەندان چەکداری دیکە، هەموویان ئامادەیی خۆیان دەربڕی وێڕای پێشمەرگە پەلاماری دەزگاکانی ڕژێم بدەن... من و هاوڕێ هەمزە بە ڕۆژ لە ماڵی هاوڕێ خەلیفە پیرۆتماینەوە، من و هەمزە، (خەلیفە) مان راسپارد برادەرێك ئاگاداربکاتەوە تا بیبینین، پوورە فاتێی خێزانی خەلیفەش، خەلیفەی راسپاردبوو بچێتە بازار پێداویستی ماڵەوە بکرێت. هەر ئەوەندەمان بینی دوو چەکدار خۆیان بە حەوشەی ماڵی خەلیفە داکرد، خەلیفەش گورج دەستی کرد بە هەڵپەڕین و بە دەنگێکی بەرز هاورای کرد نازانم کامتان هێن کەم، ئێوە یا ئەوانەی ژووریێ؟! دیار بوو چەکدارەکان خزمی خەلیفە بوون و ئێشیان پێی بوو. هاوڕێ هەمزە سووریش لەسەرخۆ بە هێمنی وەڵامی دایەوە و وتی پێشدا ئەوانی دەرێ هینکە. جوێنەکانی خەلیفە بۆ ئێمە وەك خەلاتکردن وابوو، چونکە خەلیفە ئەوەی خۆشی نەویستبا جوێنی پێ نەدەدا، ئینجا خەلیفە زۆر لەوەگەورەتر بوو بە جوێندان بەسەرمان بکاتەوە، ژیان و مردنی ئێمە لە دەستی ئەمینی ئەودا بوو.

ئەو شەوەی دەگەڕاینەوە بە هاوکاری هاوڕێیانی ڕێکخستن بەتایبەتی ڕێکخراوی شەهید(هیوا) بڵاوکراوەی حزبمان بڵاوکردەوە. ئەو هاوڕێیانە بە چەکەوە لەگەڵمان هاتن: هاوڕێ بەکر ئالایی، هاوڕێ قادرە سوور، هاوڕێ خدر مینە، هاوڕێ هەمزەو هاوڕێ سورەو بەندە. بەشێکمان ئەو سەری دوکانەکانمان گرتبوو بۆ ئەوەی پارێزگاری لە هاوڕێیان بکەین، من لە بەردوکانێکدا راوەستابووم، سەیرم کرد یەکێك هەڵتوتەکاوە، پێم وابوو هاوڕێ قادرە سوور سیکۆتین لە بەیانەکان دەدات تا بەدەرگای دوکانەکانییەوە بچەسپێنێت. لێی نزیکبوومەوە و پێم وت: ئەوە چی بوو هاوڕێ سیکۆتینەکە نایگرێت؟ کابرا کە گوێی لە دەنگی من بوو بێ ئەوەی وەڵامم بداتەوە ڕایکرد، منیش بەدوایدا، وامزانی هاوڕێ قادر پێی وایە من کەسێکی ترم بە دوایدا ڕادەکەم، پێم گوت هاوڕێ خۆمانەین، کەچی کابرا هەر پتر ڕای دەکرد. دوایی دەرکەوت کابرا دز بووە خەریکی بڕینی دوکانەکە بووە. باش بوو، بوونی ئێمە خێری تێدا بوو بۆ خاوەن دوکانەکە. ئەگەر ئەو شەوە، ئێمە نەچووباین بۆ هەڵواسینی بڵاوکراوەکانی(حزب)، دوکانی کابراش دەشکێنراو دزی لێدەکرا...

## هێستره بۆز:

هاوڕێ مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی وتی: حەزدەکەم برێك پارەو سێ پارچە چەك ببەیت بۆ هێڵی چیا لە سلێمانی. لە رۆژی ١٩٨٧/٦/١٦ بە تەنها بەرێکەوتم هێسترێکم لە هاوڕێیانی لقی پشدەر وەرگرت. وەرگرتنی هێستر لە لقی پشدەر سەردانێکی وەبیر هێنامەوە، لە ساڵی ١٩٨٢ من و دایکی هۆنیا و هاوڕێ ئەحمەدی کاکی بەکر، لە بارەگای رەزگە بەرەو پشت ئاشان دەڕۆیشتین. ئەوسا هۆنیا تەمەنی حەوت مانگ بوو دەبوایە لە رێگایە من و دایکی بە کۆڵ هەڵیبگرین. هاوڕێ  ئەحمەد وتی بۆچی داوا لە هاوڕێیانی(لق) ناکەیت هێسترێکمان بدەنێ بۆ ئەوەی دایکی هۆنیاو هۆنیا سوار بکەین. وتم رەنگە هێسترمان نەدەنێ! هاوڕێ ئەحمەد وتی چۆن ناماندەنێ؟! چووم بە هاوڕێ(هێمن)م گوت ئەویش وتی با پرسێك بە هاوڕێیان بکەم تاوێك رۆیشت و گەڕایەوە وتی هاوڕێ دەڵێن هێستر بۆ کاری شەخسی نابێ بەکاربێت. هەر لە جێگای خۆم سڕ بووم، پێم گوت مەگەر من و خێزانم هاوڕێی(حزب) نین؟ پێم گوت نایبەم بۆ قاچاخچییەتی! ئەمە لە کاتێکدایە کە بارەگای(لق) (٩) هێستر لێبوو. ئەو کاتە لقی پشدەر ژمارەیەك هێستری باشی لە رەبیەکانی دەوروبەری لە سوپای عێراقی گرتبوو. دزینی هێستر هەروا شتێکی ئاسان نەبوو دەبوایە نەخشەی بۆ دابنرێت، وەکو گرتنی رەبیە وابوو. یەکێك لەو هێسترانە هێستره بۆز بوو هێسترێکی زۆر کارامە بوو....

ئەو سەردانەی پشت ئاشان وەکو گرێیەك لە ناو دڵم دا مایەوە، هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە ئاخر خۆم و خێزانم پێشمەرگە بووین، هەر وەك دراوسێیەك داوام لە خەڵکانی تر بکردایە هێستریان پێ دەدام. کەچی ئێستاش نەمزانی بۆچی تەنیا بۆمن وەکو ئەرکێکی شەخسی حساب کرا نەك بۆ هاوڕێیانی تر.

بۆ سەردانی خوارەوە ئەو هێسترەیان وێدام، لە دۆڵی(سێوەیسی) لەگەڵ ئاپۆرای قاچاخچییەکانی ئێرانی تێکەڵبووین، هەتا لە دۆڵەکە بەرەو خوارتر دەڕۆیشتین، قاچاخچییەکان پتر خۆیان وەدواوە دەخست، من ئاخیر کەس بووم، کەچی بینیم بووم بە یەکەم کەس لە پێشەوە. دەرکەوت لە ترسی(کەمین)ی سەر رێگا و ڕاوڕووتی جاشەکان قاچاخچییەکان خۆیان وەدوادەخەن. بە تاریکی گەیشتینە دەرووەکانی کونی پیرێژنێ، کونی پیرێ ژنێش چیرۆکێکی ترە کە لێرە جێگای باس کردنی نییە...

کاتێك قاچاخچییەکان زانیان مەترسی نەماوە بەتایبەتی لە دەرووەکانی تەنگە دۆڵی کونی پیرەژنیێ، ڕاکەڕاك دەستی پێکرد کەس نەدەگەیشتە کەس. ئەو شەوە چووم بۆ ناو پەڵە توتنی رەقەمی ماڵی مامم. ئەو رۆژە لەویێ مامەوە، وەڵامم بۆ هاوڕیێ(سورە) نارد ئاگاداری هاوڕێیانی محەلی سلێمانی بکات، بێن بەریدەکەیان ببەن کە بریتی بوو لە بڕێك پارەو سێ پارچە چەك...شەوی دواتر چووم بۆ ماڵی(مام حوسێن)ی برای شەهید ڕەسولێ، لەویێ (دایکی شەهید عەبدولڕەحمان حەمە لۆز) بەریدی سلێمانی وەرگرت، ئەو شێرەژنەش کە خەڵکی پشدەر بوو، ژنی رۆژانی تەنگانە بوو لە سەختترین هەلومەرجی سیاسیدا ئامادەبوو بەریدی حزب وەربگرێت، خێزانەکەیان خێزانێکی تێکۆشەری شیوعی بوون، کوڕێکیان هاوڕیێ عەبدولڕەحمان لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکێکی حزبی لە ناو شاری قەڵادزیێ لە ساڵی ١٩٨٢ شەهیدبوو، کوڕەکانی تریشی کادری حزب بوون بەتایبەتی مامۆستا محەمەد... لە گوندی(زوورکان) دوای کۆبوونەوەو دیداری رێکخستنەکان، ویستم بگەڕێمەوە بەرەو شاخ کەچی فریا نەکەوتم، فاتەخان خێزانی مام حوسێن وتی چۆن دەکریێ بڕۆی، سوێندی خوارد کە هەر لەویێ بم... ماڵی مام حوسێن ژوورێکیان هەبوو هەندێك کەل وپەلی تێدا بوو چیخێکیش لەویێ بوو لە پاڵ قەفی چیخەکە جێگام بۆ ڕایەخرابوو. توتنەوانێکیان هەبوو خێزانەکەی ناوی خوشکە خاتون بوو، هاتە ئەو ژوورە کە منی تێدا بووم، سەرێکی بە دیوی چیخەکەدا کرد و وتی(هۆپ) و، یەکسەر گەڕایەوە. پێم سەیر بوو ئێستاش بۆم ڕوون نەبۆوە منی دیوە یا هەر لە خۆیەوە وتی(هۆپ)... خاتون خوشکی هاوڕیێ ئەحمەد مەحمودی حەمبال بوو، کە ماڵیان لە گوندی شەروێت بوو، لەگەڵ ماڵی خەزورم، بەیەکەوە لە پەنجاکان لە لایەن ئاغا میراودەلیەکانەوە لە پشدەر دەرکرا بوون بۆ ناو مەنگوڕان...

## سەگ و خەندەق:

لە دوای ڕاپەڕینەکانی ١٩٨٢/٤/٢٤ و ١٩٨٧... ڕژێم شێوازی جۆراوجۆری بەکارهێنا بۆ ئەوەی هەم کۆنترۆڵی ئۆردووگاکان بکات هەم ترسێك نیشانی جەماوەری ئۆردووگاکان بدات. لە سنووری پشدەردا تەنیا ئۆردووگای بەستەستێن دەست نیشان کرابوو، بۆ ئەوەی خەندەقێکی (٣م قووڵX٤م پان) بەهەر چواردەورەدا لیێ بدریێ و، بە زنجیرەیەك رەبیەی سوپا و جاشی ناوچەکەش گەمارۆ بدریێ. ئۆردووگای بەستەستێن لە ئۆردووگایەکی سەربازی دەچوو نەك

کۆمەڵگایەکی مەدەنی، بەڵام سەرەڕای ئەو گەمارۆیەش خەڵکی ئۆردووگای بەستەستێن نەك هەر دەستەمۆ نەکران، بەڵکو لە جاران باشترو ئازایانەتر رووبەڕووی خەندەق و گەلەکۆمەگی سەربازی ڕژێم بوونەوە، هێشتا خەندەقەکە تەواو نەببوو، بە دروستکردنی دەستەبەرەو داڕووخاندن خەندەقەکەیان پڕکردەوە. خەندەقەکە لەرووی سەربازییەوە هیچ دادێکی ڕژێمی نەدا، بەڵام ئەو خەندەقە مەترسییەکی هەبوو ئەویش کەمین بوو. چەندان جار لەناو خەندەقەکەوە جاشەکان بە تایبەتیش باندی ڕاو ڕووت، تەقەیان لە پێشمەرگەو کاروانچییەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان دەکرد... تەنیا چوار رۆژ بوو لە خوارەوە گەڕابوومەوە، هێشتا نەحەسابوومەوە، کە هاوڕێ ئەبو سەرباز بە دوایدا ناردم. کە چووم بۆ دۆڵەکۆگە، هاوڕێ ئەبو سەرباز داوای لێکردم بۆ ئەنجامدانی دوو ئەرك سەردانێکی خوارەوە بکەم، یەکەمیان بەریدێکی هاوڕێیانی بەغدا بوو، دەبوو لە ڕێگای هاوڕێیانی ناوەوە بگاتە سلێمانی، دووەمیان هێنانی هاوڕێیەك بوو، کە بڕیار بوو لە بەغداوە بگەیەنرێتە ئۆردووگای بەستەستێن. لە ساڵانی رابردوودا ناونیشانی وێستگەکانی حزب لای هاوڕێیانی بەغداو خواروی عێراق هەبوو، ئەو جارەش بە تەنیا ڕۆیشتم. وەکوجاری رابردوو هێسترێکی باشمان هەبوو لە دۆڵەکۆگە لەگەڵ خۆمدا بردم، ئەوە دووەم جار بوو بە سواری هێستر سەردانی ناوەوە بکەم. ئەو دوو جارە بۆم دەرکەوت هێستر کەلێنێکی زۆر دەگرێت بۆ پێشمەرگە، هەم مرۆڤ لە ڕێگا سواری دەبێ و ئەوەندە ماندوو نابێ، هەم خواردن و پێداویستی سەفەری پێ هەڵدەگرێت. بە درێژایی ساڵانی رابردوو ئەوەندەی کۆڵەپشت هەڵبگرین، پشتمان وەکو هی وڵاخ جدەو ببوو، واتا(گورا)بوو، قورسایی هیچ کۆڵەپشتێك لە(١٥) کیلو کەمتر نەبوو. خواردن و پێداویستی مەفرەزەی تێدا بوو تاقم و مەخزەنیش بە تفەنگەوە (٧) کیلو دەبوون ئەوە(٢٢) کیلو، واتە پێشمەرگە لە کاتی مەفرەزەدا هەمیشە (١٥) بۆ(٢٢) کیلو خواردن و پێداویستی هەڵدەگرت. سەرەڕای ئەو ئەرکانەش بەبێ وڵاغ زۆرجار لەگەڵ ئاپۆرەی کاروانچییەکان تێکەڵاو دەبووین. هەروایان دەزانی ئێمەش قاچاخچین، لەڕووی خۆ پاراستن لە جاسووس و پیاوەکانی ڕژێم هێستر شتێکی زۆر بە کەڵك بوو. ئێوارە بە درەنگەوە گەیشتمە ناو مڵکی خۆمان ناو ڕەقەمان... مەبەست لەڕەقەمان سنووری مڵکایەتی ئەو زەویانە دەگرێتەوە کە بە پێی قانون لە شەستەکان بەسەر جووتیاراندا دابەشکرابوو، کە گوندەکانی(بەستەستێن)ی سەرێ و بەستەستێنی خوارێ، سوڵتانەدێ و خەندەکەو پارەپانێ دەگرێتەوە، ئەو موڵکانە هەموویان بە پرۆژەی ئاودێری

دۆڵی شەهیدان ئاودەدرێن. سەرەڕای ئەو گوندانەی سەرەوە، پڕۆژەکە مڵکایەتی ناحیەی سەنگەسەرو گوندەکانی زورکان، قادراوە، دەروەکۆتر و گوندی شەهیدانیش پاراو دەکات. ئەو پڕۆژەیە یەکەم پڕۆژەی گرینگ و ستراتیژی بوو لە دەڤەری پشدەر، ساڵانە بە سەدان جووتیار سوودیان لەم پڕۆژەیە وەردەگرت. بەڵام دوای ئەوەی توتن و شینایی تر برەوی نەما و، وشکە ساڵی سەرچاوەکانی ئاوی کەم کردەوە، ئەو پڕۆژەیەش پەکی کەوت. ساڵانە جۆگاکانی پڕ دەبنەوەو جۆماڵ ناکرێت. لەدوای راپەڕینەوە ئەو زەویانە کشتوکاڵیان تێدا ناکرێ، تەنیا بۆ ڕەنێوهێنانی دانەوێڵە سوودیان لێ وەردەگیرێت. ئێوارەی رۆژی دواتر قەدبڕ لە ڕەقەمانەوە بەرەو بەستەستێن ڕۆیشتم لە رێگایە دەیان کەسی گوندەکەی خۆمان و بەستەستێنی خواروم دەبینی یەکێك خەریکی پاراوکردن بوو ئەوی دیکە بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە، هەمووشیان منیان دەناسی هەربۆیە لە هەندێ جێگا ناچاربووم خۆم شەل بکەم یا خۆم خەریك دەکرد لەسەر ئاوی و بێڵکاری، چونکە ناچاربووم بە چاوی رووناکی بگەمە لێواری رووبارە وشکارۆکەی بەستەستێن، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە چاودێری دانانی کەمینی جاش و عەسکەری بم، کە لە ناو خەندەقەکەو لە دەوروبەری دادەنرا. وەرزی بەهار بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت دنیا گەرم بوو، جەمەدانەکەم وەك چارۆکە بە سەرشانم دادا بوو، بۆ ئەوەی چەك و تاقمەکەمی پیداپۆشم. گەیشتمە سەر لێواری چۆمی بەستەستێن، لێوارەو لێواری بەستێ بەسەر رێگا کۆنەکەی گوندی بەستەستێنی سەریدا دەڕۆیشتم، ساڵانی رابردووم وەبیردەهاتەوە، کە رۆژانە وەك دەوامی فەرمی، مام برایمی خاڵ مرادی و کاك حەمەی ڕەسوڵ مەحمودی، پێیدا دەچوون و دەهاتنەوە گوندی بەستەستێن، تەنیا لەبەر ئەوەی دەستێك یاری دۆمینە لە چایخانەی مەلای چایچیدا بکەن و، دوو شیشیش جگەری وەستا (فتح الله) نۆشی گیان بکەن. لەسەر کۆنە رێگایەکە، لە نزیك گۆلی کاك خدری مام وەتمانی، کەڵەکی مام وسوی گاوانم وەبەرچاو کەوت، مەولودی مام برایم هاتەوە یاد کە لە کاتی گەڕانەوەی بەو رێگایەدا هەورە تریشقە لێیداو دەسبەجێ مرد. هەر لەو دەوروبەرە بیری منداڵیم کردەوە کە لەناو گۆڵەکانی کاك خدری مام وەتمانی رەحەمەتیدا زستانان لە سەر بەستەڵەکی گۆلەکان خلیسکەمان دەکرد. زستانان گۆلەکان یەك پارچە دەبوون بە سەهۆڵ. ئەو گۆلانە گۆلی برنج نەبوون بەڵکو گۆلی راوی باڵندەی کێوی بوون. چۆمی بەستەستێنم کەوتەوە یاد، کە لە ناوەڕاستی بەهاراندا، لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆم وەك: برایمی ئەحمەد شیلانی و حوسێنی مام بایزی و عەبدوڵڵای حەمەدی

مام ڕەسوڵ و چەندانی تر مەلەمان تێدا دەکرد. بە منداڵی کاتی نۆرە گاڕانمان دەهات، دەچوومە بەر گاڕانی ئاوایی، ئیتر ئەو ڕۆژە لەدەست ڕەوینەوە و ڕاکەڕاکی ڕەشەوڵاخەکان کە مێشیان دەکردو بەرەو شینایی خەڵکی ئاوایی دەڕۆیشتن، بیزار دەبووم، سەرەڕای گلەیی و گازندەی خەڵکیش، بە تایبەتیش ئەگەر گاوان منداڵ یا مێردمنداڵ با گلەییەکان پتر دەبوون. خەریکبوو بیرکردنەوەی یادگارەکانم بیست ساڵ بمگەڕێننەوە دواوە و خۆم لە بیر بکەم کە پێشمەرگەم. ناهەقم نەبوو بیرەوەریم لەگەڵ بست بە بستی دارو بەردی بەستەستێندا هەبوو...

تا ئەو داڵغانە تەواوبوون سەیرم کرد وا خەریکە لە خەندەقەکە نزیك دەبمەوە، خێرا کلاشینکۆفەکەم داگرت، وەك چۆن راوچی پارێزی بۆ کەوان دەبات ئاوا هێدی هێدی دەڕۆیشتم. لە گۆشەیەکی باکووری ئۆردووگا خۆم فڕێدایە ناو خەندەقەکە، لەگەڵ خۆ فڕێدانم سەگێك پەلاماریدام، کاتێ ویستم لە خۆمی دوور بخەمەوە پتر شاڵاوی بۆ هێنام، ناچاربووم بە لولەی تفەنگ دووری بخەمەوە، ئەویش لولەی تفەنگی گرتبوو و دەیویست منیش بگرێت، پێم وابوو هاربووە، گازی سەگی هاریش مەترسیدارە، لەبەرئەوە لولەی تفەنگەکەمی بەرنەدەدا پەنجەم بە پیلکەی کلاشینکۆفەکەدا هێنا و ریزێك فیشەکی بەرکەوتو تۆپی. سێ چوار مەتر دوور لەو شوێنە سەیرم کرد چوار توتکەی بچووك هەروا نوزیان دێت، کە ئەو دیمەنەم بینی پێم وابوو دایکێکی بێ تاوانم کوشتووە، خەمێکی قووڵ سەرتاپای گیانمی داگرت. بەراستی ئەگەر بمزانیبا ترەکیوە و توتکەی لەبەرە، ئەگەر بشیگرتبام نەم دەکوشت، چونکە توتکەکان زۆر بچکۆلە بوون. لە خەندەقەکە سەرکەوتم، چووم بۆ ماڵی خزمێکم و پێم گوت کە هەندێك تلێت بۆ ئەو توتکە سەگانە ببات تا لە مردن رزگاریان دەبێ و گەورە دەبن...

## کیمیا، ئەنفال، راگواستن:

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٧ ەوە تا ساڵانی ١٩٩٠،١٩٨٩،١٩٨٨، قۆناغی جێبەجێکردنی سیاسەتی کورد قڕان بوو. عەلی کیمیایی بە فەرمانی سەدامی دیکتاتۆری ئامۆزای خوێنی هەموو زیندەوەرێکی لە کوردستان حەڵاڵ کردبوو، بە کوشتن، سووتاندن، کیمیاباران کردن و ئەنفال. کوردستان بۆنی خوێنی لێ دەهات، لە ١٩٨٨/٣/١٦ (هەڵەبجە) کیمیاباران کرا پتر لە(٥٠٠٠) هاووڵاتی شەهیدو(١٠/٠٠٠)یش بریندابوون. دوای کیمیابارانی شاری هەڵەبجە، پرۆسەی بەدناوی ئەنفال دەستی پێکرد. لە هەشت قۆناغی پرۆسەی ئەنفال دا، پتر

لە(١٨٢٠٠٠) هاوولاتی کورد ئەنفال و بێ سەرو شوێن کرا. لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٨ ئۆردووگای بەستەستێن گوندی بەستەستێن و ڕاگوێزران بۆ(حاجیاوا). ئەمە تەنیا ڕاگواستن نەبوو بەڵکو تۆڵە ساندنەوە بوو لە خەڵکی تێکۆشەری دەڤەری پشدەر، چونکە شۆڤینییەکانی عێراق هەمیشە لە دەڤەری پشدەر ترساون، بە درێژایی مێژوو پشدەرییەکان ملکەچی حوکمڕانی بەغدا نەبوون. پشدەر بە سێ قۆناغ ڕاگوێزرا: **قۆناغی یەکەم:** لە ساڵی ١٩٧٧ کە دێهاتەکانی پشدەریان ڕاگواست بەرەو ئۆردووگا زۆرە ملێکانی بەستەستێن، تووە سووران، پێمالك. **قۆناغی دووەم:** لە ساڵی ١٩٨٨ دا ئۆردووگای بەستەسیتن و چەند گوندێکی دەوروبەریان ڕاگواست بۆ حاجیاوا لە بیتوێن. **قۆناغی سێیەم:** لە ساڵی ١٩٨٩ هەموو ناوچەکەیان ڕاگواست وەك ناوەندی قەزاکە قەڵادزێ و ناحیەی ناودەشت و ئەو گوندانەی ڕانەگوێزرا بوون. دوو ساڵ دوای ڕاگواستنی پشدەر، کاولە خانووەکانی قەڵادزێ و شوێنەواری ناحیەو ئاواییەکانی دەڤەرەکە تەقێنرانەوە و لەگەڵ خاك یەکسان کران. ڕژێمی گۆڕ بە گۆڕی(بەعس) ئەوەندە ڕقی لە دەڤەری پشدەر بوو، کانیاو، ئەشکەوت و ڕووبارەکانیشی دەتەقاندەوەو مین ڕێژی دەکردن. پرۆسەی ئەنفال و ڕاگواستن و کیمیاباران، کەلێنێکی گەورەی خستە نێوان نەتەوەی باڵادەستی عەرەب و گەلی کورد، چونکە تاکە وڵاتێکی عەرەبی بە حکومەت و جەماوەر و ڕۆشنبیرەکانییەوە دەنگیان لێوە نەهات، تەنانەت لەرووی مرۆییشەوە، کەم تا زۆر ڕژێمی بەعسیان لەسەر ئەو تاوانانەی بەرامبەر کورد ئەنجامی دەدا، تاوانبار نەکرد. بە پێویستی دەزانم وتەیەکی جەلاد عەلی حەسەن مەجید واتە عەلی کیمیایی وەبیر خوێنەری بەڕێز بهێنمەوە کە وتبووی یا((لو احنا نلبسکم العگال، لو انتم تلبسوننا زی الکوردی! واتە یا ئێمە عەگالی بە ئێوە دەپۆشم یان ئێوە بەرگی کوردیمان پێ لەبەر دەکەن. بە کردەوە ڕژێم ئامانجی ئەوە بوو، کە نەوەکانی داهاتووی گەلی کورد عەگالی عەرەب بپۆشن...

### بەرەی کوردستانی:

کوردستانی باشوور بە گشتی لە بارودۆخێکی سەخت و دژواردا تێدەپەڕی، ناوچە ئازادکراوەکانی بۆنی خوێنیان لێ دەهات جەنگ لە بست بستی ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان لە ئارادابوو. جێبەجێکردنی هەرسێ پرۆسەی جینۆسایدی کورد، واتا کیمیاباران،

ئەنفال، راگواستن دۆخێکی ئەوهای دروستکردبوو هیچ مرۆڤێك نەیدەتوانی زەمانەتی یەك کاتژمێر بۆ ژیان و چارەنووسی خۆی بکات، بە سەدان خێزان سەرگەردان و ئاوارە بوون بەرەو سنووری بارەگا و ناوچە ڕزگارکراوەکانی پێشمەرگە، بەتایبەتی بۆ بناری **قەندیل**. چیای قەندیل وەك قەڵای بەرزی گەلەکەی پێگەیەکی سەربەرز و پتەوبووە، سەرپۆشی سپی و داوێن سەوزو پاراو، وەك هەمیشە باوەشی بۆ خەڵکی کوردستان گرتبۆوە. هەر لە گەرمیانەوەی بۆ زاخۆ، پێشمەرگە و هاووڵاتی ئاسایی، لە پاڵ تاشە بەردو کانیاوە سازگارو هەوراگە دڵگیرەکانیدا هەوای پاك و ئازادییان هەڵدەمژی. ئاوی ساردی (قەندیل) ماندووبوون و شەکەتی لە جەستەی دەربازبووانی ئەنفال و کیمیاباران دەردەکرد و ئارامی و ئاسوودەیی پێ دەبەخشین. جارێکی دیکە بناری(قەندیل) نیشتمانە هەمیشە یاخی یەکەی دژی داگیرکەران وەك مەکۆی شۆڕشگێڕان یەکەم کۆبوونەوەی بەرەی کوردستانی گرتە خۆ بەلاغی دامەزراندنی بەرەی کوردستانی لە هەوارگە دڵڕفێنەکەی **گوێزێ سەرێ** ڕاگەیەنرا، کە تەنیا بستۆێکی نێوانە لەگەڵ دەشتی وەزنێ، واتە دەکەوێتە سەر سنووری باکووری ڕۆژهەلاتی هەرێمی کوردستان. پێکهێنانی بەرەی کوردستانی لەو هەلومەرجە سیاسییە ئاڵۆزەدا ئومێدێکی زۆری بە خەڵکی شۆڕشگێڕی کوردستان بەخشی. نوێنەرانی حزبی شیوعی عێراقی هاوڕێ ئەبو حیکمەت و هاوڕێ رحیم عەجینە بوون. ئەو کاتەی بەرەی کوردستانی ڕاگەیەنرا، من لە پشت ئاشان بووم، لایەنەکانی بەرەی کوردستانی بە گشتی و بەتایبەتی پێشمەرگەکان زۆر خۆشحال بوون، پێکهێنانی بەرەی کوردستانی پەیوەندی نێوان لایەنە سیاسییەکان و مەیدانی خەباتی چەکداری پتەوتر کرد...

## بنکەی سوورەدێ و یەکەم کاری بەرەیی:

هاوڕێیانی گەرمیان و قەرەداخ و ناوچەکانی تر وەك پێشمەرگەی لایەنەکانی تر، لە بناری قەندیل کۆبوونەوە. خەڵکێکی زۆریش بەردەوام لە دەست شاڵاوی ڕاگواستن بەرەو بناری قەندیل ڕایدەکرد. بەندەش بۆ چاوەدێری بارودۆخەکە بە یاوەری مەفرەزەیەکی لقی پشدەر بەرەو پشت ئاشان و سوورەدێ چووم. بینیمان ئەو دۆڵە جمەی دێ لە خەڵکی ئاوارەی شاڵاوی ڕاگواستن، بەسەدان خێزان لەو بنارە سەرگەردانبوون، لایەنە سیاسییەکان زۆربەیان لەوێ بوون، لەگەڵ نوێنەری لایەنەکان قسەم کرد بۆ ئەوەی لیژنەیەك دروست بکەین و بە ناوی بەرەی کوردستانی

وەك یەكەم هەنگاوی بەرەیی، پێشوازی لە خەڵكە ئاوارەكە بكەین. رایەكەم پەسند كرا. نوێنەری لایەنەكان بریتی بوون: لە پارتی دیموكراتی كوردستان كاك نجات حەسەن، كاك مەسعود سالەیی، یەكێتی نیشتمانی كوردستان هەڵو ئەحمەد كوردە، ئەرسەلان عەبدوڵڵا، حزبی سۆسیالیستی كوردستان كاك محەسەن بایز، حزبی شیوعی بەندە نوێنەری بوو. پێشنیارەكەیان قبوڵ كردین بەڵام كاك هەڵو ئەحمەد كوردە بە شێوازێك دەدوا كە ئێمە وەكو لایەنەكانی تر واتا پارتی و شیوعی و سۆسیالیست میوانی یەكێتی بین وابوو، چونكە لە قسەكانیدا هەر باسی لە سنووری چالاكی یەكێتی دەكرد، بۆ نموونە دەیگوت ئێمە ئامادەین لە سنووری چالاكی یەكێتیدا رێگا بدەین بە لایەنەكان بارەگاو چالاكی خۆیان ئەنجام بدەن. منیش پێم گوت كاك هەڵو ئێوە واز لەو ئەقلیەتە بهێنن كە ئێوە ڕابەرو لایەنەكانی تر میوان بن. چەند رۆژێكی دیكە سوپای داگیركەر لێرەش دەرمان دەكات. پێویستە بەكردەوە دەسەڵاتی بەرەی كوردستانی بكەوێتە كار، هەم خەڵكەكە دڵی پێ خۆشتر دەبێ هەم خۆشمان لە گرێكوێرەی جەنگی ناوخۆ دەربازدەبین بەرەو مەیدانێكی تری خەبات دەچین. ئەمەش بە گیانی تەبایی و هاریكاری یەكتری نەبێ ناكرێ. لایەنەكانی تر هەڵوێستی ئێمەیان زۆر بەرز نرخاند، لە كۆبوونەوەكە ڕەشنووسی پەیڕە و پرۆگرامی بەرەی كوردستانی لە كۆڵەپشتەكەم دا بوو دەرم هێنا ئەو رستەیەم خوێندەوە كە باسی لە كاری هاوبەشی بەرەیی دەكرد... دووەم كۆبوونەوەی بەرەی كوردستانی بوو لە بناری(قەندیل) كاك مەسعود سالەیی پارتی، كاك هەڵو ئەحمەد كوردە یەكێتی، كاك محەسەنی بایز سۆسیالیست، بەندە نوێنەری حزبی شیوعی عێراقی بووم، بڕیاردرا، **یەكەم:** لیژنەیەكی ئاسایش پێك بێت بۆ پێشوازی لە جەماوەری ڕاكردو. **دووەم:** هەفتەی جارێك كۆبوونەوە سازبكرێت لە نێوان لایەنەكانی بەرە بۆ ئەوەی جموجۆڵی دوژمن هەڵبسەنگێنرێت و بڕیاری پێویست بدرێت بۆ بەرگری لە ناوچەكە. **سێیەم:** لیژنەیەك دروستكرا بۆ لێپێچینەوە و سزادانی كەسانی پیاو خراپ و سیخوڕ كە بۆ ئامانجی سوسەكردنی دەڤەركە دزەیان دەكرد...

لە رێگای نامەیەكەوە، هاوڕێیانم لە بارودۆخی ناوچەكە و پێكهێنانی لیژنەی بەرەی كوردستانی ئاگاداركردەوە، پێشنیاریشم كردبوو هێزێكی پترمان بۆ بنێرن بۆ ئەوەی بارەگایەك لە دۆڵی پشت ئاشان بكەینەوە. یەكسەر حزب پێشنیارەكەیان قبوڵ كردین هێزێك بە فەرماندەیی هاوڕێ حەسەن خدر و هاوڕێ حەمە شریف لە لقی پشدەر هاتن بۆ ناوچەكە،

ژمارەیەکی زۆریش لە هاوڕێیانی گەرمیان لەگەڵ هاوڕێ حەسەن و حەمە شریف هاتبوون. هاوڕێ حەمە ڕەشید قەرەداغی نامەیەکی بۆ ناردم، ستایشی کردبووم کە کاری بەرەیی هاوبەش ئەنجامدراوە، لیژنەکان فراوانتر کران من تەنها لە کۆبوونەی مەیدانی(بەرە) ئامادەبووم دوو لیژنەی ترمان پێکهێنان وەکو: لیژنەی ئاسایش هاوڕێ(کاروان بابەکر) خوی نوێنەری حزب بوو، لیژنەی سەربازی هاوڕێ حەمە شریف و هاوڕێ حەسەن خدر بە نۆرە ئاڵوگۆڕ دەکران. ئەگەرچی تەمەنی دەسەلأتی هاوبەشی بەرەی کوردستانی لە پشت ئاشان کورت بوو، بەلأم لە جێگایەك ئەو لیژنە دروستکرا کە چەند ساڵێك لەمەوبەر لە جەنگی ناوخۆدا قەسابخانەیەکی لێ بەرپابوو، کە بە کارەساتی پشت ئاشان چووە ناو مێژوو... مرۆڤ کە سەیری دیمەنی پشت ئاشانی دەکرد هەر بن دەوەنە، ماڵێکی ئاوارە بارگەو بنەی لێ خستبوو. کارەساتی رۆژانی جەنگی ١٩٨٣ی ناوخۆم وەبیر دەهاتەوە کە ناوچەکە لە بارێکی زۆر نائاساییدا بوو.

سوپای عێراق و جاشەکان بەرەو سنووری پشت ئاشان لەشکر کێشیان دەکرد. لە سنووری دێهاتەکانی بێپالأن و ورتە، بە ئامانجی پەلأماردانی دەڤەرەکە هێزێکی زۆریان مۆڵدابوو... رۆژانە دوژمن بە تۆپی قورس دۆڵی پشت ئاشانی بوردومان دەکرد. لەچەند قۆڵێکەوە هێرشی دوژمن دەستی پێکرد، هێزی پێشمەرگە وەکو لایەنەکانی بەرەی کوردستانی، لە سنووری ساوێن رووبەڕووی سوپاو جاشەکان بوینەوە. دوژمن لە قۆڵی بناری رەزگە و قەلأتوکان هێرشی کرد لەو قۆڵەش تێك شکا، هاوڕێیانی لقی پشدەرو پێشمەرگەکانی لیژنەی ناوچەی قەلأدزێی پارتی دیموکراتی کوردستان، بە توندی بەر پەرچی سوپای عێراقی و جاشەکانیان دایەوە. لەو جەنگەدا دوژمن چەندان تەرمی بەجێهێشت، ژمارەیەك چەك و تەقەمەنی دەست پێشمەرگە کەوت. کادرێکی لیژنەی ناوچەی قەلأدزێی پارتی لەو جەنگە شەهیدبوو، بە ناوی کاك عەبدوڵڵا پشدەری. برادەرانی بزووتنەوەی ئیسلامیش لە سەر گردی ڕەمکان (٤) شەهیدیان هەبوو. دیاربوو دوژمن بڕیاریداوە تەواوی ناوچەکە کۆنترۆڵ بکات، هەربۆیە پەیتا پەیتا هێرشی دەکرد. بۆردومانی رۆژانەی تۆپ و کاتیوشا ژیانی رۆژانەی بارەگاکانی شێواندبوو لەگەڵ تۆپ و کاتیۆشای دوژمن دا تۆپ و کاتیۆشای کیمیایی بەکاردەهات، چونکە هەموو جارێ بۆنی سیرو سێو لە دووکەڵەکانیان دەهات. لەبەر ئەوە پێشمەرگە بەرەو بەرزایی چیای(قەندیل) بارەگاکانیان گواستەوە.

## حەمامی ئیسلامی :

بارەگایەکی ئێمە لە سەرچۆمی **بەستەمەلێ** بوو لە داوێن شاخی **مۆلێ**. برادەرانی بزووتنەوەی ئیسلامیش بارەگایەکیان لەوێ بوو، لەمبەرو ئەوبەری چۆمەکە بووین. شەقی زەمانە شیوعی و ئیسلامی ناچار کردبوو دراوسێ بن، بەلأم چ دراوسێیەك؟ زۆر ڕەزاگران، نە سلأومان هەبوو نە هیچ پەیوەندی یەك. ئەوسا برادەرانی بزووتنەوەی ئیسلامی زۆر توندڕەو بوون. ئیسلامی ئاساییان بە ئیسلامی راستەقینە قبوڵ نەبوو چ بگا بە شیوعی!! هەستمان دەکرد زۆر بە دراوسێییەتی ئێمە سەغڵەت و نیگەرانن هەمیشە چەك بەدەست و ئامادەبوون، رۆژێك بە هاوڕێیەکی ئێمە دەڵێن بۆچی بارەگاتان بردۆتە سەروی بارەگای ئێمە؟ هاوڕێیەکە دەڵێ بۆچی پرسیار دەکەی؟ ئەی ئەگەر ئێوە لە سەروی ئێمەبان چی دەبوو؟ برادەری ئیسلامی دەڵێ خۆتان دەزانن ئێمە ئیسلامین و دەست بە دەست نوێژین. هاوڕێیەکەی ئێمەش پێی وتبوو کە واتە ئێمەتان پێ پیس و کافرە؟! ئەویش هیچ وەلأمی نەدابۆوە، کە وەلأمی نابێ، پێی دەڵێ ئەگەر حەزناکەن دراوسێ بین دەتوانن لێرە بڕۆن.

رۆژێك هاوڕێ حەسەن خدر، بێ ئەوەی هیچکام لە هاوڕێیان ئاگاداربن، خۆی بە حەمامی برادەرانی بزووتنەوەی ئیسلامیدا دەکاو خۆی دەشوات. هاوڕێیەك بانگی کردین وتی ئەرێ برادەرانی ئیسلامی بۆچی وا چەکیان بەستووە و سڵ بوون؟! ئێمەش لەبن کەپرەکە هاتینەدەرێ، بینیمان سەیری حەمامەکە دەکەن و بە دەستیش ئاماژە بۆ لای ئێمە دەکەن. منیش پرسیم ئەرێ هاوڕێ حەسەن خدر لە کوێیە؟ هاوڕێیان وتیان دیار نییە؟ وتم دوور نییە حەسەن خدر چوو بێتە ناو حەمامی برادەرانی بزووتنەوەی ئیسلامی خۆی بشوات، لەو قسانەدا بووین هاوڕێ حەسەن خدر لە حەمامەکەی ئەوان هاتە دەرێ. لێی کۆبوونەوە، دیار بوو گلەییان لێ دەکرد... کە حەسەن گەڕایەوە بارەگای خۆمان، برادەرانی بزووتنەوە کەوتنە پاك کردنەوەی حەمامەکە. ئەگەر نەبێتە زیادەرۆیی (٦) کاتژمێر پتر بە(٧) کەس خەریکی شووشتنی داروبەردی سەرشۆرکەکە بوون. وتمان هاوڕێ بۆچی چویی بۆ حەمامی برادەرانی بزووتنەوەی ئیسلامی، نازانی ئەوان ئێمە بە کافر دەزانن؟! (هاوڕێ حەسەن)یش بە سادەیی خۆی وەلأمیدایەوە وتی چی تێدایە؟ منیش وەك ئەوان موسوڵمانم و نوێژ دەکەم. لەڕاستیدا هەروا بوو حەسەن خدر بەردەوام نوێژی دکرد و رۆژوی دەگرتن ئێستاش ئەو شاهیدی یە بۆ حزبی شیوعی عێراقی دەدەم زۆر رێزیان لە ئایین و کەسانی نوێژکەرو رۆژوگر دەگرت. بۆ نموونە

ژمارەیەك هاوڕێی بە تەمەن لە بارەگای رەزگە بوون، وەك خاڵ هۆمەرو مام عەولای بایزی و چەندانی تر، لە مانگی ڕەمەزاندا لە هەموو ئەرکێك دەبەخشران، تەنیا لەبەر ئەوەی بە رۆژو دەبوون. حزبی شیوعی ئایینی وەك پەیوەندی رۆحی نێوان تاك و خوا سەیردەکرد. شیوعییەکانی کوردستان لە روانگەی کێشەی چینایەتییەوە پابەندبوون بە بیروباوەڕی شیوعییەت، هاوڕێیەکم نەبینی لە کوردستان بژی و لە ١٠٠٪ بێ بڕوا بێت. زۆر جار ناحەزانی حزبی شیوعی ئایینیان دەکردە هۆکارێك بۆ ناشیرین کردننی شیوعییەکان لەبەر چاوی خەڵکی سادە. بۆ نموونە پێیان دەگوتن: دارێك بۆخۆت بینێژیت دەبێ بەرهەمەکەی خۆت بیخۆیت؟! مەبەستیان خێزانی خۆیان بوو کە لەڕاستیدا بوختانێکی گەورە بوو بە شیوعییەکان دەکرا... ئەو پڕوپاگەندانە پتر لە دێهاتەکان دەکرا. دەرەبەگەکان رۆڵێکی خراپیان هەبوو بۆ ناشیرین کردنی شیوعییەکان، بەڵام ئەو پڕوپاگەندانە جەماوەری شیوعییەکانی لە ناو جووتیاراندا کەم نەکردەوە، بە پێچەوانەوە تا کۆتایی شەستەکان شیوعییەکان پێگەیەکی بە هێزیان لە ناو جووتیاراندا هەبوو...

رۆژێك لەگەڵ هاوڕێیەکی گەرمیانی بەرەو لوتکەی شاخی مۆڵی هەڵکشاین، بەڵام نەمانتوانی بگەینە سەر لوتکە بەرزەکە، لە پاڵ تاوێرێکی گەورەدا پاڵمان دایەوە. دووربینەکەم دەرهێنا و سەیری شوێنەواری گوندەکەی خۆمان(بەستەستێنی سەرێ)م کرد. لە بەرزایی چیای مۆڵی یەوە بۆ گوندی بەستەستێن مەودایەکی دوور بوو، گوندەکەمان لە دوورەوە لە زەوییەکی کێڵراو دەچوو، بیرو خەیاڵێکی قووڵ هەڵیگرتم بەرەو یادەوەرییەکانی سەردەمی منداڵی و مێردمنداڵی لە ڕەنێ بەستەستێنێ و گوندە خنجیلانەکەمان. ئەو گوندەی جاران لە تارای بووك دەچوو، هەر چوار دەوری تەنرابوو بە پەرژینی گوڵەباخ و درەختی جوان. ئێستا بە هۆی راگواستنی زۆرەملێ بووە بە کەلاوەیەکی راستەقینە... لەوبەرزاییەوە خۆزگەم دەخواست رۆژێك بێتەوە ئەو گوندە ئاوەدان بکرێتەوە ژیان بگەڕێتەوە دۆخی جارانی خۆی... دیاربوو ئەو برادەرەی هەر قسەی بۆ دەکردم، منیش هەر ئم ئمم بوو! ئەوە خەسڵەتی خۆمە هەرکە بەداڵغەکانمدا ڕۆچووم جگە لە وشەی (ئم) هیچی تر لە دەمم دەرناچێ، یەکسەر بێدەنگییەکی سەیر دەمگرێت. هاوڕێیەکە وتی هاوڕێ گیان تۆ بۆ وای!؟ خەمی خزم و کەست دەخۆیت؟ بۆ دڵدانەوەی من هەر دە پەنجەکانی دووجار ژماردەوە سەبارەت بە بزربوون و ئەنفالی خزم و کەسەکانی لە پرۆسەی ئەنفالدا... جارێکی تر دەستی خستەوە سەرشانم و وتی:

هاوڕێ گوێ مەدەرێ ئێمە پێشمەرگەین، هاکە خۆشمان لە جەنگێکدا شەهیدبووین. بەو وتەیە لە دالغەکەم دابڕام چەند وردە نانێکی ناو کۆڵەپشتەکەم دەرهێناو بە لەپی دەستم حەواڵەی ناو دەمم کرد و، قومێك ئاوی مەتارەکەم بەسەردا کرد، وتم کە هاوڕێ هەمزە سوور لێرە دەبوو دەیگوت دیسان برسیت بۆوە. چونکە زۆر جار لەگەڵ هەمزە لە ناوە ڕاستی هەوراز یا لە لێواری دەروویێکی هەڵدێردا هەمزەم رادەگرت کۆلەپشتەکەم دەردەهێناو دەستێکم تێرادەکرد، وردە نانم دەردەهێنا و دەمخوارد، ئینجا دەڕۆیشتین... بەرەو سەرەوژێری کانییە ساوێنی شۆڕبووینەوە بە رێگای باکووری کانی ساوێن دا دەڕۆیشتین، پێش ئەوەی بگەینەوە(بەستە مەلێ) بارەگایەکی تیپەکانی گەرمیانی یەکێتی لەسەر رێگاکە بوو لەسەر کانیاوێك بوون لە بن چیای مولّی. سەیرمان کرد پێشمەرگەکان شێواون، ئێمەش لێمان پرسین بۆچی وا شێواون؟ وتیان ئەمرۆ کاك نەوشیروان مستەفا هەردوو سەرتیپی بارەگای تیپی ڕەمی کردووە. پرسیمان لەسەر چی؟ وتیان خیانەتیان کردووە!، گوایە زانیاری بۆ کاك نەوشیروان هاتووە، کە ئەم دوو بەرپرسە پلانی کوشتنی نەوشیروانیان داناوە... لەو کاتەدا دیمەنی دیلەکانی پشت ئاشانم هاتەوە یاد، کە بە فەرمانی نەوشیروان مستەفا ڕەمی کران. ئەوان گوایا لەسەر تحریف لە رێبازی مارکسی لینینی کە خۆی هیچ ئیمانێکی پێنە بووە خەڵکی دەکوشت، ئەوانەی تر لەسەر سیخوڕی و ئەمانەش لەسەر خیانەت!!... شایانی باسە ئەو دوو تیپەی گەرمیانی یەکێتی، جەنگێکی زۆر جوامێرانەیان لەگەڵ سوپای عێراق و جاشەکاندا کرد...

لە شێوەی رێچکە مێروولە، بێ پسانەوە ئاوارەی گەرمیان و دەشتی کۆیەو پشدەر بە رێگاوە بوون. ئەوانەی لە چەنگالی سیاسەتی کورد قڕان قوتار دەبوون، روویان دەکردە ئێران. رۆژێك من و هاوڕێ حەسەن خدر پێکەوە بەرەو ئالوەتان دەگەڕاینەوە. ماوەی مانگێك بوو لە مەفرەزە بووین، لە نزیك گوندی ئەبوبەکرە ژن و مێردێکی گەنج، چوار منداڵی وردیلەیان پێ بوو منداڵەکانیان خستبووە ناو (تێڕێك) بە گوێدرێژێکیان داهێنا بوو، ژنەکە لە دوایان دەڕۆیشت پیاوەکەش رەشمەی گوێدرێژەکەی رادەکێشا. منداڵەکان دەگریان و دەمیان وشك ببوو، من و هاوڕێ حەسەن خدر رەشمەی گوێدرێژەکەمان لە کابرا وەرگرت و، خێرا مەتارەکانمان دەرهێنا و ئاومان بە دەمی منداڵەکاندا کرد و منداڵەکانمان لە تێڕەکە دەرهێنان. جارێکی تر تێڕەکەمان لە باری گوێدرێژەکە کردەوە و منداڵەکانمان سوارکرد. ژن و پیاوەکە تاقەتی قسەکردن و گفتوگۆیان نەبوو، ژنەکە هەر فرمێسکی هەڵدەوەراند پیاوەکەش لێوی

وشك ببوو، سەرو قومێك ئاویان لە مەتارەكانی ئێمە خواردەوە. دڵخۆشیمان دانەوە و پێمان وتن ئاگاداری منداڵەكانیان بن، ئێمەش ڕۆیشتین ژنەكە هەتا بزربووین لە ناو لێڕەوارەكە هەر سەیری دەكردین...

## هەوارگەی كەوڵان:

ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٨ لە هەوارگەی كەوڵان بووم. ئەو ڕۆژە بوو كە جەنگی عێراق — ئێران ڕاگیرا، هاوڕێ حەسەن خدر و هاوڕێ سوورەو كاك برایم زراریش لەوێ بوون. هەموومان میوانی مام موسا و مام ڕەسوڵی برای بووین. مام موسا و مام ڕەسوڵ مامی هاوڕێ حەسەن خدر، مێگەلە مەڕێكی گەورەیان هەبوو ساڵانە هاتوچۆیی كوێستانەكانی (قەندیل)یان دەكرد، ئەو ساڵە واتە ساڵی ١٩٨٨ بۆ ئەوانیش ساڵێكی شوم بوو.

ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٨ بە فەرمی جەنگی هەشت ساڵەی عێراق - ئێران كۆتایی هات، مام موسا وتی: گەردنمان ئازاد بكەن بە خوای رەنگە جارێكی دیكە یەكتر نەبینینەوە. مام موسا هەستی كردبوو كە زوركانیش ڕادەگوازرێت. من و هاوڕێ سورە خوا چارەنووسی وا لێكرد بووین، وەك دوو برا لە سەختترین بارودۆخی سیاسیدا یەكترمان دەگرتەوە. لە هەوارگەی كەوڵان، لەم لای هۆبەی رەشماڵی مام ڕەسوڵ، لە پەنای ئاو هەڵدێری مێرگێك ئاشگێرێك ئاو دەهاتە خوارێ. هەریەكە لەسەر بەردێك هەڵتوتەكابووین. هاوڕێ سورە ئەگەر دوودڵ و لە دڵەڕاوكێ دابا، دەستێكی هەر بە سمێلیەوە دەبوو دەیقرتاندن، وەك پاڵەی كارامە كە بەرە دروێنەیەكی مابێ و، پەلە بكات زوو بیدروێتەوە. هەر زوو قەفی سمێلەكانی لول دەدا بۆ ناو هەردوو پەنجەكانی وەبەر تیغی ددانەكانی دەدا. ئەوەندە لێكنزیك دانیشتبووین كڕكە ئەژنۆمان لە یەكتر دەگەڕایەوە. خۆمان وەك مەڕ دەهاتە بەرچاو، كە لە بەفر و كڕێوەدا بۆ ئەوەی سەرما كاریان تێنەكات، سەر دەخاتە سەرسەری یەكتر. هەردووكمان چاومان لە یكتر بڕی بوو، وەك ئەوەی لە رێگای چاوەكانمانەوە مەترسی بارودۆخەكە بۆ یەكتر بگوازینەوە. هاوڕێ (سورە) بێدەنگییەكەی شكاند و وتی پلانمان چی بێت؟ منیش وەكو سیاسییەك كە دوور بڕوانێ، كەوتمە شرۆڤە كردنی بارودۆخەكە، لەو كاتەدا وتەیەكی هاوڕێ مام عەولای بایزم هاتەوە یاد كە دەگوت (حەمە) هەمبانەی قسانە، قسەی لێ نابڕێن. دەمەویست لەڕووی دەروونییەوە كۆتایی هەرس هەرس بكەین و خۆمان سازكەین بۆ قۆناغی دوای جەنگ... هاوڕێ(سورە)ش

وەکو من درێژتر شەنوکەوی کردەوە، کە سورە دەدوا ئەو نوکتەیەم وەبیر دەهاتەوە کە دەگێڕنەوە دوو پیاوی باڵا بەرز لەسەر چۆمێك ڕادەوەستن ناوێرن بپەڕنەوە، پیاوێکی کورتە باڵا دەگاتە لایان پێیان دەڵێ ئەوە بۆچی راوەستاون؟ ئەوانیش دەڵێن ناوێرین بپەڕینەوە! کابرای خڕە پێیان دەڵێ هەی لە منتان کەوێ وەرن من دەتان پەڕینمەوە، دادەی دەستتان بێنن، خڕە بە هەردەستەی، دەستی یەکێکیان دەگرێ و دەڵێ یا الله بابڕۆین، لە ناو چۆمەکە خڕە لاقی لە عەردی دەبڕێ ودەکەوێتە لەقەلەق، دوو باڵابەرزەکەش دەڵێن سەیرکە خڕە کەوتە(مەلە). ئەوان بە غیرەتی(خڕە) خۆیان و خڕەش لە چۆمەکە دەپەڕیننەوە.. خۆم و سورەم وەك کابرای خڕە هاتە برچاو. لە کوێستانەوە من و هاوڕێ حەسەن خدر گەڕاینەوە بەرەو ئالۆەتان سورەو کاك برایم زراریش لەگەڵ کاك بابەکری برای هاوڕێ حەسەن خدر گەڕانەوە بۆ گەرمیان واتا بەرەو زورکان...

## کۆبوونەوەی بێ ئومێدی:

لەگەڵ هاوڕێ مەحمود حاجی فەقێ خدر خەریکی تاوتوێکردنی بارودۆخەکە بووین. کاك مەحمود پێی وابوو سیاسەتی(حزب) هەڵەیە کە دروشمی ڕاگرتنی دەستبەجێی جەنگی لەگەڵ رووخاندنی ڕژێمی دیکتاتۆری بەرز کردبۆوە. کاك مەحمود وتی ئەوە جەنگ کۆتایی هات سەیر کەن حکومەتی عێراق چیمان پێ دەکات، ناوبراو چاکی بۆ چووبوو، بەڵام لەڕووی مرۆڤایەتییەوە ڕاگرتنی جەنگ خواستێکی رۆژگارەکە بوو. هاوڕێ مەحمودیش وەکو ئێمە دەترسا، چونکە نەمان دەزانی چارەنووس بەرەو کوێمان دەبا... هاوڕێیان ئاگاداریان کردین لە گوێزێ خوارێ کۆبوونەوەیە و هاوڕێیەکی مەکتەبی سیاسی ئامادە دەبێ، من و هاوڕێ عەلی گۆران بەیەکەوە چووین بۆ گوێزێ خوارێ. هاوڕێ عەلی گۆران پیکابێك ئەرزاق و پێداویستی کڕی بوو بۆ بارەگاکانی(حزب) لە گوێزێ. هێشتا کاتی کۆبوونەوەکە نەهاتبوو هاوڕێیان دوو، دوو سەریان پێکەوە نابوو، ئەو بارودۆخەیان هەڵدەسەنگاند، ژمارەی هاوڕێیان لە سێ سەت هاوڕێ بالاتر، بوو کۆبوونەوەکە لە کۆنگرە دەچوو. هەریەکە بۆچوونێکی تایبەتی هەبوو لەسەر بارودۆخەکە، لە مشتومڕ دابووین، کە وتیان هاوڕێیان فەرموون بۆ کۆبوونەوە. وەك ڕانەمەڕ مۆڵ بووین. پیاوێکی کورتەبا لای ریشدار پالتۆیەکی چڵکن لەبەر، جەمەدانەیەکی گەورەی لەسەرو سیمای هالاندبوو. هاوڕێ (ئەبو فاروق) بوو ئەندامی مەکتەبی سیاسی، سەیرێکی ئەم

لاو ئەو لای خۆی کردو هیچی نەوت، تا ماوەیەك بێدەنگ بوو، تەنیا گڤەی (با) دەهات کە ئەو دۆڵەی پێی ناسراوە. بایەکی ساردی وەرزی پایز مرۆڤی سڕ دەکرد. هاوڕێیان وەك کەوی ژێر تەپکە خۆیان کروشم کرد بوو، سەیری جەمەدانی هاوڕێ مەحمودی حاجی نادرم دەکرد، بایەکە لچکی جەمەدانەکەی وەك کلکە تەشی دەهەژاند. هاوڕێ ئەبو فاروق بە زەردەخەنەیەکی تاڵەوە، دەنگی هەڵبڕی و پتر لە(٤٠) خولەك لەسەر سەختی بارودۆخەکە قسەی کرد، دواتر وتی هەر هاوڕێیەك خۆی رادەستی ڕژێم دەکاتەوە یا لە ئێران دادەنیشێ یا دەچێتە هەندەران ئازادە. کە هاوڕێیان گوێیان لەو قەسەیە بوو هاروژانێکی سەیر هاروژان، وەکو ئەوەی پێشتر گفتوگۆیان لەسەر کردبێ، وتیان ئەوە دەڵێ چی هاوڕێ؟ مەگەر شۆڕشی چەکداری کۆتایی هاتووە؟! ورەو ئیرادەی هاوڕێیان ئەوەندە بەرز بوو هاوڕێ ئەبو فاروق ناچاربوو پاشگەزبێتەوە، ئینجا وتی مەبەستم ئەوە نییە کە هاوڕێیان ناچاربکرێن بەڵام ئەوەی دەیەوێت رێگای لێ ناگرین و گلەیی لێ ناکەین خۆی رادەستی ڕژێم بکاتەوە...

دیسان لە دڵی خۆمدا گوتم(خڕە) جارێکی تر بکەوە(مەلە). گوتم هاوڕێ ئەگەر هەمووتان مەیدانەکە چۆڵ بکەن من چۆڵی ناکەم تایپێك و هاوڕێ(عەلی سەیدە)م بەسە، لە ناو حەساری مامەڕەش دا دەژین بۆ ئەوەی سەری(حزب) بەرز ڕاگرین... سەیری سیمای هاوڕێیانم کرد بە نیگاکانیان دەست خۆشیان لێ دەکردم. کربوونەوەکە کۆتایی هات. دواتر دەرکەوت کە ئەوەی هاوڕێ ئەبو فاروق لە کۆبوونەوەکە باسی کردووە بڕیاری کۆمیتەی ناوەندی بووە، بەڵام کە زانرا هاوڕێیان پێیان هەرس ناکرێ و قبوڵی ناکەن لە بڕیارەکە پاشگەز بوونەوە. هەمیشە ناوەند و بنکەکانی خوارەوەی حزبی شیوعی عێراقی لە سەرکردایەتی(حزب) وریاو بە ئاگاتر بوون، دەیان جار سەرکردایەتی(حزب) بە هەڵە سیاسەتی قۆناغەکانیان لێك داوەتەوە، بنکەکانی حزب باجەکەیان داوە...

### دوو ئێسکە گۆشتۆکە:

زوورکان یا واباشترە بڵێین شارەدێ زوورکان، پتر لە(٣٠٠) خێزان دەبوو. لە ناو عەشیرەتی مەنگوڕایەتیدا گوندی (زوورکان) ی ئێستا و (زونگێ) ی رابردوو تایبەتمەندی خۆی هەبووە. کۆمەڵێك کەسایەتی هەڵکەوتوو لەو گوندەدا هەبوون کە ڕۆڵێکی کاریگەریان گێڕاوە لە وشیار کردنەوەی خەڵکەکە، لەوانە شەهید مام ڕەسوڵ صۆفی کە بە رەسوە سوور ناو دەبرا، بنەماڵەی

مام پیرۆتی حەمە سەلکانی وەك هاوڕێ حەسەن خدر، هاوڕێ عەلی گۆران و ژمارەیەکی تر لە هاوڕێیان کە لە رابردوودا رۆڵێکی کاریگەریان هەبووە... مام باپیر پیاوێکی بەساڵاچووی گوندی زورکان بوو خوالێی خۆش بێت کۆچی دوایی کردووە، مام باپیر خەریکی دروستکردنی خانوو دەبێ یەکێك لە کوڕەکانی خەریکی گرتنەوەی تەناف دەبێ بۆ چوارچێوەی بناغەی خانووەکە مام باپیرش لە کوڕەکەی تووڕەدەبێ و دەڵێ ئەو بەنەی لابە لە بەنی شیوعییەکان بەم ئەمن خانووی خۆم وەکو جاران دروستدەکەم، مەبەستی مام باپیر لە شێوە هێلکە بووە، لە سەردەمی رابردوو گۆشەو چوارچێوە بۆ خانووەکان دروست نەدەکرا، دیارە شیوعییەکان دەستپێشخەر بوون لە بەرەوپێشەوە بردنی بیناسازی گوندەکەدا....کۆمەڵێك تیرەو بەرەباوك هەن کە سەرجەم عەشیرەتی خدر مامەسێنە پێکدەهێنن وەکو میرزایی، رۆستەمە، خدرە، قەڵاتی...هتد منیش دایکم خدرمامەسێنەیەو لە تایفەی رۆستەمەیە...

ئەگەرچی گوندەکە کوێخادێ بووە، خوالێ خۆشبوو کوێخا بابەکر بە کوێخا دانراوە، بەڵام بەکردەوە کوێخایەتی نەکردووە بەڵکو وەکو ریش سپی و پیاوماقول وابووە لە ناو عەشیرەتدا... حاجی ئەیوب کەسایەتییەکی وریا بووە، لە ساڵانی چلەکانەوە چووە بۆ سەربازی و زمانی عەرەبی بە باشی فێر بووە و، لە جەنگی عارەب و ئیسرائیل دا بەشداری کردووە، زۆرجار گوندەکەی پاراستووە، لە هێرشی حەرەس قەومییەکان و دەست درێژی سوپای عێراقی بۆ سەر گوندی زوورکان... لە رۆژگارێکی پایزدا لەگەڵ هاوڕێ هەمزە سوور سەردانی رێکخستنەکانم دەکرد لە سنووری سەنگەسەر و زورکان، لە ناو پەرێزە توتنەکانی ڕەقەمی ماڵی هاوڕێ مەلای حاجی پیرۆت کۆبووینەوە، دواتر چووین بۆ ناو (سەنگەسەر) و سەردانی مڵکایەتی سەنگەسەری خوارەوەمان کرد، چووین بۆ لای دێراوە بامیەکانی کاك برایم زرار، ناوبراو هەم لە ڕژێم قاچاخ بوو هەم ژیان و گوزەرانیشی خراپ بوو، ناچاربوو لە رێگای فرۆشتنی بامیە و هەندێك بەرهەمی تری کشتوکاڵی، ژیانی خۆی و خێزانەکەی دابین بکات، وەکو رێکخستنەکانی خۆمان دەمانچەی (عەقرەب) مان دابەشدەکرد. ئەو چەکە تەنها رێکخستنەکانی ئێمە هەیان بوو. یەکێك لەو دەمانچەش درابوو بە کاك برایم بۆ ئەوەی پارێزگاری خۆی پێ بکات، ئەویش بە ئاشکرا هەڵی دەگرت. ئەو رۆژە دیمەنێکی سەیرم لە کاك برایم بەرچاو کەوت، دەمانچەکە وەك جانتای برین پێچ وابوو بە کەلەکەیەوە دەهات و دەچوو، دوو گونییە بامیەی لە گوێدرێژەکەی بارکردبوو، دەیەویست بڕوات بۆ ناو بازاری

سەنگەسەر بامیەکانی بفرۆشێت، لێکدا لێکدا بە ئێمەی دەگوت یاخوا بەخێر بێن، ئاوازی هۆشە هۆش کەرە لەگەڵ بەخێرهاتنی ئێمە تێکەڵدەبوو، بەخێر بێن هۆش، گوڵستان بامیەکان بێنە، هۆش!. هەرچەند سەیری کارەکانی برایم دەکرد پێم لە کارێکی ئاقلانە نەدەچوو. ئاخر من کاك برایم زۆر خۆش دەویست، لە لایەك بەیەکەوە پێشمەرگە بووین، لە لایەکی تر ئامۆزای شەهید هیوا بوو، حەزم نەدەکرد هیچی بەسەر بێت. بەڵام هیچ رێگا روونییەکمان بەدی نەدەکرد ئێمەش چارەنووسمان دیار نەبوو... ماوەی کەمتر لە چارەگێك لای کاك برایم بە پێوە وەستاین، بۆ ئەوەی کاك برایم سەرقاڵ تر نەبێ بە جێمان هێشت. کەباسی سەنگەسەر دەکەین حەزدەکەم یادی هاورێیەکی خۆشەویست بکەینەوە کە من و هاورێ(سورە) پێمان دەگوت کەروێشك. بە داخەوە ئەو هاورێیە ئێستا لە ژیاندا نەماوە، ناوبراو ئاکاری زۆر لە کەروێشك دەچوو. جارێك لە دیدارێکی من و هاورێ سورە و کەروێشك دا وتم: هاورێ(سورە) ئەو هاورێیەمان هەم ئاکاری لە کەروێشك دەچێ، هەم وەك کەروێشکیش دەترسێت. ئەو ناونیشانە بوو بە نازناوی ئەو هاورێیە، کە ناوی لە ریزبەندی ئابوونە و پیتاکی(حزب) تۆماردەکرا دەنووسرا، کەروێشك بڕی ئەوەندە پارەی داوە...

ئێوارەیەکی درەنگ، لەگەڵ هاورێ سورە گەڕاینەوە بۆ گوندی زوورکان و، چووین بۆ ماڵی هاورێ مەلای حاجی پیرۆت، بڕیاربوو لەوێوە بەرەو شاخ بگەڕێنەوە. هاورێ هەمزە سووریش لە ماڵی مام حوسێن بوو، ئەویش هات بۆ ماڵی هاورێ مەلا، نازانم هۆیەکەی چی بوو ئەو رۆژە نەگەرینەوە و لە ماڵی هاورێ مەلا ماینەوە. هاورێ مەلا لەناو فەردە تووتنی داگیراودا جێگای بۆ راخستین. جێگاکە زۆر بەرتەسك بوو هەر لە جێگای پشیلەی ترەکیو دەچوو. لەڕاستیدا کێشم هەر بەقەت دوو پشیلە دەبوو، هەتا پێشمەرگە بووم (٥٥) کیلو بووم. کات نزیکەی(١١)ی پێش نیوەڕۆ بوو، هەستم کرد یەکێك بە ئەسپایی بەرەو شوێنی من دێت، سەیرم کرد دایکی هاورێ مەلا بوو، زۆر بە ئەسپایی هات لە پەنام هەڵتوتەکا و وتی: رۆڵە ئەگەر قسەیەك بکەم تووڕەنابی؟ منیش وتم نەخێر دایەگیان تووڕەنابم، وتی بۆخۆت دەزانی لە داری دنیایە هەر ئەو دوو ئێسکە گۆشتوکانە شك دەبەم (مەبەستی منداڵەکانی بوو)، زۆر دەترسم ئێوە ئاشکرا بن، جاش و جەیش بێنە سەرمان سەروماڵمان تێدا بچێ. پیرەدایی پێداچوو وتی: خۆ لە خەمی نان و خواردن نیم، بەڵام حکومەت زۆر هارە ئەگەر لە جێگایەکی تر بن، بە کۆلۆکێ خۆم خواردنتان بۆ دێنم. منیش وتم بە سەرچاو دایەگیان داوایەکەت

جێبەجێدەکەین. وتی خۆ لە لای مەلا شکایەتم لێ ناکەیت چونکە دەزانم دڵت ئێشاوە؟ پێم گوت دایەگیان چۆن دڵم لەتۆ دێشێ، ناو دڵت دەخوێنمەوە هەق بە تۆیە حکومەت دڕندەیە!.

هەر ئەو ئێوارەیە گوندی زوورکانمان بەجێهێشت، داوای پیرە دایکشمان بەجێ گەیاند و جارێکی تر نەچووینەوە ماڵی هاوڕێ مەلا... هاوڕێ مەلای حاجی پیرۆت یەکێك بوو لەو هاوڕێیانەی زۆر لێی رازی بووم، کوڕێکی هێمن و لە سەرخۆی رۆژانی تەنگانە بوو، مام حوسێن و فاتی خێزانی(مام حوسێن)یش لە هاوڕێ مەلا پتر دڵسۆز و چاونەترس بوون. ناوی(فات) لە کوردەواریدا کورتکراوەی فاتمەیە، عومەر هۆمەرە، حوسێن وسێنە، عەباس هەباسە،...هتد (فات) هەزار فاتی خراپی بە قوربان بێت ژنێکی سادە، دڵ پاك، بەغیرەت، بۆمن و هەمزە سوور وەکو خوشك وابوو. هەرگیز لەدەمی ئەو ژنەم نەبیست بڵێ ترس هەیەو کێشەمان بۆ دروستدەبێ، فاتێ و هاوڕێ هەمزە سوور نهێنییەکیان لە نیواندا بوو، کە هەمزە لە دەرگای دەدا دەیگوت پیاوە کوێرەکەم، فاتێ دەیزانی هاوڕێ هەمزەیە دەرگای دەکردەوە...

## مام جەبار:

مام جەبار نازناوی پێشمەرگایەتی هاوڕێ حوسێن بوو هەتا ئێستاش کەس بە ناوی خۆی بانگی ناکا، هەر پێی دەڵێن مام جەبار وەکو لە جێگایەکی تریش باسم کردووە جەبار هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویست قسە خۆش و جوێنفرۆش بوو، زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی قەلادزێ مام جەبار دەناسن، زۆر کەس لەوانەی دۆستی جەبارن شەڕە جوێنیان لەگەڵ مام جەباردا هەیە، جوێندان لە ناوچەی موکریان بە گشتی و لە ناو پشدەر بەتایبەتی زۆر باوە. هەر شتێك گرفتیان بۆ دروست بکات جوێنێکی پێ دەدەن، بەڵام لە ناو جوێندەرەکانی پشدەردا مام جەبار جیاوازە جوێنی مام جەبار بە شێوازێك دەدرێن ئەوەی جوێنەکەی پێ دەدات پێ سەغڵەت نابێت، مام جەبار هەرلە جوێن لە پێشەوە نەبوو بەڵکو پێشمەرگەیەکی ئازاو چاونەترس بوو، هاوڕێیەکی دڵسۆزو ئەمین بوو هەر کاتێك(حزب) پێویستی بە مام جەبار دەبوو بۆ ئەرکێکی بە پەلە بۆ نموونە بردنی پۆستێکی حزبی لە شاخەوە بۆ شار ئەگەر لە ١٠٠٪ تێدا چووبا کارەکەی جێبەجێدەکرد... ئەگەرچی تازە لە خوارەوە گەڕابوومەوە، بەڵام حزب بڕیاریدا بوو پیتاك کۆ بکرێتەوە وەکو نەریتێکی لێ هاتبوو ساڵانە(حزب) پیتاکی کۆدەکردەوە لە رۆژی ١١/٢٥/ ١٩٨٨ من و هاوڕێ کاکەڕەش بەیەکەوە بەڕێکەوتین هێشتا

زەردە هەر بە سەرانەوە بوو لە گوندی (بەردقسڵ)ەوە شۆڕبووینەوە بەرەو(خڕی زەندان) خڕێ زەندان ئەوبەرو ئەمبەری چۆمی سەرخانییە بەهۆی مینرێژکردنی شاخ و لێرەوار و چۆم و کانیاوەکانی بناری قەندیل، چیاو دۆڵەکانی شاخی مامەندە(خڕێ زەندان)ڕەواجیان پەیداکرد بوو. خڕێ زەندان رێگا نەبوو هەمووی تات و دەرو بوو، لەهەر کوێیەك مرۆڤ لاقی بترازابا یا دەکەوتە ناو کێلگەی مین یا چۆم دەیبرد. لە سەردانێك دا من و هاوڕێ هەمزە سوور لە خوارەوە دەگەڕاینەوە لە دەروویێکی خڕی زەندان خەریکبوو بەسەر مینێکدا بکەوم لاقم هەڵبڕی لەسەر مینەکەی دابنێم، هەمزە هاواری کرد نەڕۆیی مینە. هەر ئەو جارە تووشی پیاوێکی قاچاخچی بووین کۆڵێکی هەڵگرتبوو، پشووی دابوو پاڵی وەتاتە بەردێکی رێگاکە دابوو داوای لێکردین کۆڵەکەی بۆ هەڵبێنین، بۆ ئەوەی هەڵستێتەوەو بڕوات، کەچی من و هاوڕێ هەمزە بە ئەستەم توانای هەڵهێنانی کۆڵەکەمان هەبوو، لانی کەم (٨٠) کیلو دەبوو. بەڕاستی قاچاخچییەکانی رۆژهەلاتی کوردستان توانایەکی سەیرو لە رادەبەدەریان هەیە. لەگەڵ هاوڕێ کاکەڕەش بە رێگای دەروەکۆڵەدا ڕەتبووین ئەو دەروەکۆڵەیە جێگایەکی زۆر مەترسیدار بوو، سامدار سامی لێدەکرد. دەیان جار پێشمەرگە یا کاروانچییەکان لەو دەروەدا بەسەر کەمیندا دەکەوتن، بە دەروەکۆڵەدا برۆیی هەتا لوتت بە لوتی دوژمنەکەت نەکەوێ نایبینی، چونکە رێگاکە دەگاتە سەرچۆمی بەلکی، بەناو تاشە بەردو دەروە شاخی ڕکدا دەڕوات. لە دەروە کۆڵەوە بەرەو(ڕیشوان) پەڕینەوە، هێشتا خەڵکی قەڵادزێ نەخەوتبوون گەیشتینە ناو شار. چووین بۆ ماڵی مام جەبار، کە بەهۆی گرفتی ژیانی خێزانەکەی، نەیتوانی لە پێشمەرگایەتی بەردەوام بێ، خۆی رادەستی ڕژێم کردبۆوە. بەلام لە شاریش وەك پێشمەرگە وابوو، بە هەموو شیوەیەك خزمەتی حزبی دەکرد. بۆ نموونە یەك دەفتەر پسولەی مۆرکراوی حزبمان پێدابوو، بۆ ئەوەی پیتاکی سالانە کۆبکاتەوە، مام جەبار بە قەدەر هەموو رێکخستنەکان پیتاکی بۆ حزب کۆکردەوە. کاکەڕەش پەیوەندێکی زۆر خۆشی لەگەڵ مام جەبار هەبوو شەڕەجوێنی لەگەڵ مام جەبار دەکرد، ئەو جارەش بەهۆی کاکەڕەش کەبابی گەرم و بەتامی وەستا(عەلی)م پەیداکرد بەڕاستی کەبابی قەلادزێ واتا وەستا عەلی بۆ ئەوەی دەبوو بەتایبەتی سەردانی قەلادزێ بکرێت... دوا ئەوەی پسولەی پیتاکی(حزب) دابەشکرا گەڕاینەوە... هاوڕێ کاکەڕەش کۆڵەکەی پڕ بوو، لە گۆشتی مریشك و شیرینی و چەرەزات لەهەر کوێیەك پاڵمان دەدایەوە شتێکمان دەخوارد، کاکەڕەش لەگەڵ ئەوەشدا کە نەوسن بوو

زۆر دڵفراوانبوو. ئەو نەوسنییەی ئەو سوودی بۆ هاوڕێکانی هەبوو. کەگەیشتینەوە دۆڵە کۆگە خەریکبوو ساڵی ١٩٨٨ ماڵئاوایی لێ دەکردین بڕواناکەم لە مێژوودا هیچ ساڵێك ئەوەندەی ساڵی ١٩٨٨ شوم بووبێ. ئەو ساڵە(٤٥٠٠) گوند وێران و، (١٨٢) هەزار هاووڵاتی کورد لە گەرمیان و ناوچەکانی تری کەردستان ئەنفال کران، لە سەرانسەری کوردستاندا تەپۆلکەیەك نەمابوو سوپاو جاش و جیش شەعبی مۆڵگەی تێدا دروست نەکات. بە پێی بەرنامەیەك، هەموو ناوچە ڕاگوێزراوەکانیان کردە ناوچەیەکی یا ساغ کراو. هەموو سەربازێکی سوپای عێراقی فەرمانی پێ درابوو، لە هەر کوێیەك زیندەوەرێك ببینێ بیکوژێت چ مرۆڤ چ ئاژەڵ...

## قۆناغێکی نوێ:

ساڵی ١٩٨٩ سەرەتای قۆناغێکی نوێ بوو لە خەباتی چەکداری و چالاکی ڕێکخراوەییدا، ڕژێم پێش ئەوەی قەلادزێ ڕاگوازێت، پشتێنەیەکی سەربازی توندی بە دەورەی شاخەکانی پشدەردا کێشابوو، بە سێ قۆناغ بنارەکانی مینرێژ کردبوو، شاخ و تەپۆلکەکانی بنار، پێدەشتەکان بە ڕەبیە تەنرابوو، ئەگەر کەسێك بەرەو شاخ هاتبا دەبوایە لەهەر سێ پشتێنەکە دەرچێ، ئێنجا دەگەیشتە شوێنێکی ئەمین، کە سنووری دۆڵەکۆگەو هەوارگەکانی کوێستان بوو، ئەویش لە وەرزی زستانان ئەستەم بوو مرۆڤ بگاتە ئەو سنوورانە، بەڵام فرۆشگایەك لە سونێ کرابووە هەم ڕژێم خۆی سوودی لێ وەرگرت، بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر لایەنە سیاسییەکان و پێشمەرگە و ئێران، هەم خەڵکێکیش کاروکاسبی لەو فرۆشگایەدا دەکرد. حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانی ئێران بنکەو بارەگایان لە ناوچەکە هەبوو، بۆ بردن و هێنانی بەریدی(حزب) سوودمان لەو پەیوەندی یە وەردەگرت، پێویستە ئاماژە بە ڕۆڵی کاك خدری گوێزی بدرێت، کە خەڵکی کورستانی ڕۆژهەڵاتە، بێ بەرامبەر هاوکاری دەکردین زۆر جار پۆستی تایبەتی حزبی بۆ دەبردین و دەهێنایین، هەروەها هاوڕێ خالیدی فاتحی هاوڕێیەکی خۆمان بوو لە ناو ڕێکخستنەکانی حاجیاوا، بەهۆی ئەوەی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوون بە ئاسانی هاتوچۆی دەکرد، چەند جارێك چووم لە سونێ بەریدی خوارەوەم لێ وەردەگرت... هاوڕێ حەمە سووری کوڕی شەهید ڕەسوڵ، ڕۆڵێکی زۆر گەورەی هەبوو دەیان جار بەریدی خوارەوەی دەگەیاندە لای ئێمە لە ئاڵوەتان. ناوبراو لەگەڵ ژمارەیەك کاروانچی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە خڕی زەندان دا هاتوچۆی دەکرد، ئەو ساڵە

هەموو کەسێك نەیدەتوانی هاتوچۆی سنووری سونیٚ و دۆڵەکۆگە بکات، کاکە حەمە سوور تاماوەیەکی زۆر هاوکاری کردین، بەڵام کاتێ گوندی زوورکان گوازرایەوە ئەویشمان چوو...

لە ١٩٨٩/٣/٧ ڕێبواری کوڕم لەدایکبوو، لەدایکبوونی ڕێبوار چەپکە گوڵی خێزانەکەمی جوانتر کرد، منداڵەکانمان بوون بە دوو کوڕو دوو کچ. لەدایکبوونی ڕێبوار بەسەرهاتێکی ترە! ئێمەی پێشمەرگە بەتایبەتی ئێمەی شیوعی زۆر ڕقمان لە پارە بوو، ئەوەی لامان نرخی نەبوو پارە بوو، بەڵام زۆر جار پارە کەسایەتی مرۆڤ دەپارێزی و ڕەنەوقێکی تر بە مرۆڤ دەبەخشێ. لەسەروبەندی لەدایك بوونی ڕێبوار، دایکی فشاری خوێنی بەرز دەبۆوە، ناچاربووم بیبەم بۆ نەخۆشخانەی(خانێ)، لەوێ خەواندمان و خۆشم چووم بۆ ماڵی کاك ئەحمەدی خدری سەعیدی. بەیانی کە من و کاك عەلی دەریایی، برای کاك ئەحمەد بەیەکەوە گەڕاینەوە نەخۆشخانە، کیژۆڵەیەکی جوانکیلە بە پەلە بەرەو رووەمان هات، مژدەی پێداین کە کوڕێکمان بووە، کیژەکە چاوەڕوان بوو مژدانەی بدەینێ، کەچی نە من پارەم پێ بوو بیدەمێ نە ئاغای دەریایی، کچەکە بە هەناسە ساردی گەڕایەوە من و دەریایش بە ناچاری سەرمان شۆڕ کرد و چاومان داخست. ئێستاش کە ئەو دیمەنەم دێتەوە یاد بێز لە خۆم دەکەمەوە، داخی ئەوەم هەر لەدڵدایە کە نەمتوانی وەڵامی سۆزی ئەو کیژۆلەیە بە مژدانەیەکی کەمیش بێ، بدەمەوە. ئەگەر ئەو رۆژە بە کرێکاریان گرتبان دەچووم بۆ ئەوەی پارەیەك پەیدابکەم و بیدەم بەو خانمەی کە مژدەی لە دایك بوونی ڕێبواری پێدام، دەچووم بۆ ئەوەی ئەو سوکایەتییە بسڕمەوە کە رۆژگاری تاڵ بە من و ئەو کیژە خنجیلانەیەی کرد. لەو کاتەوە بۆم دەرکەوت سەرپەرشتی خێزان بێ پارەو توانای مادی نابێ. هەژاری لە ناو کۆمەڵگادا دەردێکە پێش هەموو شتێك یەخەی کەسایەتی مرۆڤ دەگرێ تا سووکی بکات. زۆر مرۆڤی مەزن لە بەرگی هەژاریدا بزرن و، بێ ناونیشان یا سەریان ناوەتەوە یا لە کونجێکی ئەم وڵاتەدا بێ ناز کەوتوون.

## هێسترو پۆستە:

هاوڕێیانی دۆڵەکۆگە ئەگەر بەریدێکی تایبەتیان بناردبا بۆ (تاران) ئاگاداریان دەکردین، ئێمەش بەریدەکەمان بە هاوڕێ عەلی گۆراندا دەنارد کە ئەرزاقی بۆ دۆڵەکۆگە دەبرد. وا ڕێکەوت هاوڕێ عەلی گۆران نەچوو بوو بۆ دۆڵەکۆگە، هاوڕێ ئەبو لینا، کە ئەندامی قاتعی سلێمانی - کەرکووك بوو بە دوایدا ناردم، کە چووم بۆلای پێی راگەیاندم بەریدێکی تایبەتی

هەیە بۆ هاوڕێیانی (تاران). بەریدەکەم وەرگرت و یەکێك لە هێسترەکانی بارەگایان بۆ ئامادەکردم بۆ ئەوەی هەم سواری بم، هەم بەریدەکە لە ناو کورتانی هێسترەکەدا بشارمەوە. ئەو کاتە سەرەتای مانگی نیسان بوو هێشتا ڕێگا نەکرابۆوە، سەیارە نەیدەتوانی هاتوچۆیی پێدا بکات. مانگی حوزەیران و تەموز لە دەشتی وەزنێ و کوێستانەکانی گوێزێ وەرزی بەهاری ئەو دەڤەرەن. کاتێك بەریدەکەیان هێنا، بینیم چ بەرید بەقەدەر سەلکی پەنیرێکی تەڕی بەهاران دەبوو. هەر نامە بوو لە نامەیەکی تر هالاَ بوو، لە خۆمەوە ترسێك دایگرتم، وتم ئەگەر تووشی گەشتی پاسداران بووم، چی بکەم چی بڵێم؟، هەر جارە داستانێکی خەیاڵیم دادەتاشی، جارێك دەمگوت دەڵێم من ئەفرادی بارزانیم، ئەوبەریدەش هی سەرکردایەتییە، هەر لەخۆمەوە وەلاَمی خۆمم دەدایەوە، باشە ئەگەر بەریدەکە بۆ سەرکردایەتی هاتووە بۆچی بەریدەکە بە عەرەبی نووسراوە؟ یا لە ڕێگای دەزگای بێتەلەوە پەیوەندیان بە برادەرانی پارتییەوە کردو، ئەوان وتیان هی ئێمە نییە چی ڕوو دەدات؟ ئەمانە و چەندان بیرۆکەی تر بە خەیاڵم دا دەهات. لە خۆمەوە وتم لێ خوڕە (حەمە) کەی تۆ ئەو هەموو قەللە و دەللەت لێکداوەتەوە، ریشمەی هێسترەکەم راکێشاو بەڕێکەوتم، سێبەری دوندە شاخەکانی ئەوبەرو ئەمبەری دۆڵەکۆگە لە قۆچی کەڵەنێری دەچوون، لیچولێوی هێسترە سووریش وەك دەمی زورنای چاوەشان لیکاوی پێدا دەهاتە خوارێ، هێندەی مژی جگەرەکێشێکی باش، هەڵم لە ناودەمی هێسترەکە دەهاتە دەرێ، لە بیدەنگی ئەو خڕودۆڵەدا پڕمەی هێسترە سوور و شڵتوشۆی بەفر تێکەڵدەبوو. کە پەلەپروزیی هێسترەکەم دەبینی، خۆم سەرزنشتی خۆمم دەکرد و دەمگوت:(حەمە) بۆچی لەو دەروانە دانابەزێت؟، ئاخر پێشمەرگەو سواری کوجا مەرحەبا، ئەی باشە بۆچی هێستری قاچاخچییەکان هەشتا کیلو بار هەڵدەگرن و خاوەنەکانیان سواریان دەبن، کێ دەڵێ کێشی ئەوان زۆر لە هی من کەمترە، خۆ من هەر بەقەدەر تورەکەیەك کاو جۆ قورسم! لە دڵی خۆم دا گوتم کوا هێستری کاروانچی و هێستری (حزب) وەکو یەکن، هێستری کاروانچییەکان سێ ژەمە ئالیکی باش دەخۆن جۆیان بۆ بژار دەکەن، زۆر جاریش بۆ ئەوەی بە خێرایی بڕۆن ئابجۆ واتە بیرەو شتی وایان دەدەنێ. بەلاَم هێسترە قور بەسەرەکانی(حزب)تەنها ئەو کاتە دێتەوە بیری هاوڕێیان کە ئیشیان پێ دەکەن. لەبەرئەوە هاوڕێ حەمە یوسف ناهەقی نییە کە ڕۆژانە چەندان جوێنی پشدەریانە دەکاتە شاباشی هاوڕێ (ئەبو ناتاشا) و هەزار جاری لە(فسێ) دەبا. جارێکیان دوو شەو و دوو ڕۆژبوو هێستریان لە دارەکەی بەردەم بارەگای حزب

لە نۆکانێ بەستبۆوە ئەقڵیان بەوە نەشکابوو، کە ئەو هێسترەش گیانلەبەرە و پێویستە ئالیك بخوات و ئاوبدرێ؟ هاوڕێ حەمە یوسف لە خۆرا نەبوو سوێندی خواردبوو، هێستریان نەداتێ. هاوڕێ ئەبو ناتاشاش لەرقی ئەو جارەی کە هاوڕێ حەمە یوسف هێسترەکەی نەداوەتێ، لە ڤیستیڤالێکی موسکۆ گۆرانییەکی لەسەر ئەو ڕکەبەرییەی هاوڕێ حەمە یوسف دانا بە ناوی ( حەمە یوسف مانطانا، لا البغل ولا الکورتانا...هەچچە وەرە، هەچچە). هەقی خۆی بوو هاوڕێ حەمە یوسف مەدالیای ماف پارێزی ئاژەڵانی بدرێتێ، چونکە گەورەترین کێشەی ناوبراو لەسەر برسی کردنی هێسترەکان بوو... تا دالغەی چیرۆکی هاوڕێ حەمە یوسف و هاوڕێ ئەبو ناتاشا تەواوبوو، سەیرم کرد خەریکە لە بستووی گوێزێ سەردەکەوم بەرەو دەشتی وەزنێ. کە شۆڕبوومەوە بەرەو دەشتی وەزنێ هێسترە سوور خێراتر دەڕۆیی، منیش سەرمەست و حەیران بووم بە دیمەنی ڕەش و بەڵەکی دەشتی وەزنێ، خەریکبوو تازە بەفر ڕەش دەبۆوە چوومۆلکەی دەشتی وەزنێ شلتوشۆی بەفری لول دەداو لەگەڵ چرپەو کرپەی شەختەی سەهۆڵ تێکەڵدەبوو. وەك ئەوەی لە ژوانی خۆشەویستەکەم دابم، ئاگام لەخۆم بڕابوو، لە ناکاو هێسترە سوور پڕمەیەکی کرد و هەر دوو گوێی وەك مەقەست جووتکرد. سەیرم کرد لە دوورەوە سەیارەیەکی(مێك زەمین)ی خاکی بەرەو ئێمە دێت. ماوەیەك هەر حەپەسام، وتم ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە چاوەڕوانم دەکرد. لەو کاتەدا بیرم لە دوو شت دەکردەوە لە زیندان و لە سەرزنشتی(حزب). لە زیندان کە بەند کرام دەربارەی بەریدەکە چی بڵێم؟ سەبارەت بە گرتنی بەریدەکەش، حزب چۆن بڕوام پێ دەکات کە کەمتر خەمیم نەکردووە لە شاردنەوەی بەریدەکە. هەر لە دڵی خۆم دا وتم هەر کورتانەکەی هێسترە سوورە هیچ کوێیەکی تر نییە بەریدەکە هەڵبگرێت، خۆ نامەیەك نییە هەتاکو وەکو جارێ گۆرین قوتی بدەم و حەوالەی گەدەمی بکەم... هەتا ئەو هەموو خەیاڵ پلاوەم کردن سەیارەکە گەیشتە بەردەمم، ئەفسەرێکی بالا بەرزی باریکەڵە دابەزی ئەستێرەیەکی لەسەر شان بوو، ئێستاش کە ئەستێرەی سەرشانی ئەفسەران دەبینم نوکتەی رەسوی نادریم دێتەوە یاد کە دەگێڕێتەوەو دەڵێ لە سەردەمی شاهنشادا ئەفسەرێك خۆی بە یەکێك گاوە بە کابرای گان کەری گوتووە دەست لە ئەستێرەکانم مەدە بەرپرسیاری لەسەرە، کابرای گان کەریش گوتویەتی هەمووم ڕەزگ ناوی مەسئولیەتی لەسەر نییە، ئەستێرەکانت مەسئولیەتیان لەسەرە؟!... ئەفسەرەکە هەشت سەربازی لەگەڵ بوو لێم نزیکبووە داوای بەرگەی لێکردم منیش بەرگەم پێ بوو بۆم دەرهێناو سەیرێکی کرد وتی لە

کوێوه هاتویت؟ وتم له واجب بووم دەگەڕێمەوە ئالّوەتان، وتی له ئالّوەتان کێ دەناسیت گوتم کاك حاجی مەسعود بەرپرسی پەیوەندییەکان، وتی تێڕەکەت چی تێدایه گوتم تورەکەی کاو جۆی هێسترەکەیەو هەندێ کەل و پەلی تره، وتی دایگره سەیری دەکەم تێڕەکەم داگرت تورگەکەی دەرهێنا له گۆشەیەکی تێڕەکەش دا گوریس و قیاسه دیار بوو، وتی باخەلت چی تێدایه دەری هێنه هەندێ پارەو نایلۆنی پارەم پێ بوو لەگەلّ بەریدەکه دەرم هێنا، وتی ئەوه چییه؟ وتم نازانم پێم وایه بەریده بۆ(حزب)ه وتی بەریدەکه بکەوه وتم ناتوانم بیکەمەوه، وتی من دەلّێم بیکەوه، بەریدەکەم کردەوه هەمووی به عەرەبی نووسراو بوو، وتی به کوردی نووسراوه وتم نەخێر به عەرەبی نووسراوه که وتم به عەرەبی نووسراوه بانگی سەربازێکی کرد عەرەبی ئەهواز بوو، ئەفسەرەکه وتی ئەو نامانه بخوێنەوه به عەرەبی نووسراون، سەربازەکەش وتی گەورەم راسته عەرەبم، بەلاّم عەرەبیم نەخوێندوه و نازانم عەرەبی بخوێنمەوه! که زانیم سەربازه عەرەبەکه ناتوانێ عەربی بخوێنێتەوه، ئاهێکم هاتەوه بەر و ترسم کەمتر بۆوه، ئینجا ئەفسەرەکه رووی له من کرد وتی تۆ عەرەبی دەزانی وتم بەلّێ دەزانم وتی بۆم بخوێنەوه. منیش وەکو ئەکتەرێك چۆن سیناریۆیەك دەخوێنێتەوه، به شڕه فارسی یەکی بێ سەروبەر، کەوتمەوه تەرجەمه کردنی نامەکه. دیسان خڕه کەوته مەله، بەلاّم ئەمجارەم مەلەی درۆ کردن بوو، قوربان درۆیی وام دەکرد له قوتوی هیچ عەتارێك دا نەبوو، بۆ نموونه دەمگوت: مەکتەبی سیاسی بەڕێز، ئەوه(حەمه) دێته لاتان به مەبەستی چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی، حەزدەکات بچێت بۆ (تاران)، داوا له بەڕێزتان دەکەین که مۆلّەتی بۆ نوێ بکرێتەوەو پارەی بۆ خەرج بکرێ و چارەسەری نەخۆشییەکەی بۆ بکەن. شایانی باسه(هەڤال حەمه) پێشمەرگەیەکی ئازاو تێکۆشەره هەرچی پێتان دەکرێت کەمتر خەمی مەکەن...ئیمزا لیژنەی ناوچەی قەلاّدزێی پارتی دیموکراتی کوردستان... سەیری ئەفسەرو سەربازەکانم دەکرد هەر زەردەخەنەیان دەهاتێ وەکو بڕوام پێ نەکەن وابوو، چونکه شێوازی خوێندنەوەکەم به پەله و، کورد گوتەنی تەرجەمەکەشم شەڕه کەرسەك بوو، له ده وشه هەشتیان کوردی بوون، ئەو دوو وشەی تریش به فارسییەکی سەقەت، ئەفسەرەکه رووی تێکردم، وتی درۆ ناکەیت؟ وتم درۆیی چی قوربان ئەگەر بڕواناکەیت فەرموو با بڕۆین بۆ لای ئاغای حاجی مەسعود له(ئالّوەتان). ئەفسەرەکه به گومانێکەوه سەیرێکی کردم و بەریدەکەی لێ وەرگرتم، دوو جار هەلّگێڕو وەرگێڕی به نامەکان کرد، هەموو نامەکانی کردەوه و وتی ئەوەیان بۆ کێیه؟ ئەدی ئەوەی تر...هتد منیش به بێ

ئەوەی دابمێنم، دەم گوت ئەوە هی هەڤاڵ (عەلی مام پیرۆت)ە ئەوی تر هی هەڤاڵ کامەران ئەحمەدە بۆ ماڵەوەیانی ناردەوە... جارێکی تر ئەو دەست و ئەم دەستی بە نامەکان کردەوە و، بەریدەکەی دایەوە دەستم. خێرا دەنگی سەربازەکانی دا وتی سوار بن، سەیارەکەیان وەرچەرخاند و ڕۆیشتن. منیش سواری هێستره سوور بوومەوەو ڕێگای خۆمم گرت بەرەو ئالوەتان...

## دیسان راگواستن:

پرۆسەی راگواستن پرۆسەیەکی زۆر مەترسیدار بوو، هەم خەڵکی ناوچەکانی پەرت و بڵاودەکرد بەسەر ئۆردووگاکان دا هەم پێشمەرگەشی لە جەماوەر دادەبڕی. ڕژێم قەڵادزێ و سەنگەسەرو ئۆردووگاکانی تووە سووران و پێماڵك و گوندەکانی تری ژاراوەو زورکان و...هتد لە قۆناغی دووەمی پرۆسەی راگواستنی پشدەردا، گواستەوە بەرەو ئۆردووگاکانی خەبات، جدیدە، کەوەرگۆسك، بازیانی یەك و دوو. پێش ئەوەی دەست بکرێت بە گواستنەوەی خەڵکی پشدەر، بۆ ئەوەی خەڵکەکە ڕانەپەڕێت، ڕژێم دەیان سیناریۆی هەمەجۆری سازکرد. بۆ نموونە لە ڕێگای وەفدێکی پیاوماقوڵانی ناوچەکەوە کە مامۆستا مەلا دەڵگەیی سەرۆکی شاندەکە بوو ویستیان یاداشت نامەیەك بدەن بە سەرۆك کۆماری عێراق سەدام حوسێن، بۆ ئەوەی قەڵادزێ رانەگوێزرێت، بەڵام راگواستنی پشدەر بڕیارێکی ناوەندی و بڕیاری دەسەڵاتی ڕژێم بوو، پاشگەز بوونەوەی نەبوو. لە مانگی حوزیران دا بڕیارەکە جێبەجێکرا. شاری قەڵادزێ و شارو شارۆچکە و گوندەکانی پشدەر راگوێزران و دەڤەری پشدەر بوو بە ناوچەیەکی یاساغ کراو. ئەو ڕۆژەی قەڵادزێ ڕادەگوازرا لەسەر چیای وشکەگۆمی بووم، لە سادرو چەکوچ لەگەڵ هاوڕێ حەسەن خدر باسمان لە سەردانێك دەکرد بەنیاز بووین لەگەڵ هاوڕێیانی تر خۆمانی بۆ سازبکەین. لەو کاتەدا گوێم لە گرمەی تەقینەوەی کاولەکانی قەڵادزێ بوو، حەسەن وتی ئەو تەقینەوەیە تۆپ بوو، وتم تۆپی چی ئەوە قەڵادزێیە بە T N T دەتەقێنرێتەوە، راگواستن و تەقاندنەوەی قەڵادزێ و ناحیەو ئۆردووگاکانی پشدەر زەبرێکی گەورە بوو، بەر پەیوەندی شاخ و شار و، شۆڕش و خەباتی چەکداری کەوت. لەسەر چیای سادرو چەکوچەوە، سەیری دیمەنی دەڤەری پشدەرم دەکرد، کەوتمە ناو خەیاڵ و بیری ڕۆژگار و چارەنووسی خەڵکی پشدەر، پێم وابوو بەڕاگواستنی پشدەر داینەمۆی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کوردستان لەبەر یەك دەترازێ،

چونکە جەماوەری پشدەر سەرقافڵە بوون لە شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کوردستان دا، هەمیشە پایەی شۆڕشی چەکداری گەلی کورد بوون. کە لەو بەرزاییەوە سەیری پانتایی پشدەرم کرد لە جەستەیەکی بێ گیان دەچوو. ئەو پشدەرەی لە مێژووی خۆیدا سەری بۆ دوژمنەکانی دانەنواندووە، وا بە ئاسانی وەك مەلێکی پەڕ و باڵ کراو، کەوتە ژێر تیغی ڕژێمی دیکتاتۆری و، خەڵکەکەی کرا بە **ئاردی ناو دڕووان.**

لەبیرمە، بە منداڵی لەگەڵ خەڵکی ئاوایی، هەر یەکەی بە دوو سەوە تەماتەی پڕەوە لەگەڵ تاریك و رونی بەیانی دەگەیشتینە قەڵادزێ و لە مەیدانی مەنگوڕان دەمان فرۆشت. دوو سەوەکە پتر لە(٤٠) کیلو تەماتەیان دەگرت، لە گۆترە بە دینارو نیوێك دەمان فرۆشت. ئەو دینارو نیوە هەموو پێداویستی رۆژانەی ماڵەوەی پێ دابیندەکرا. چەند بە تام بوو ناساجی گەرم و نەرم، چەند نەرم ونیان بوو گفتوگۆی خاڵ حەمەڕەش، ئەگەرچی بە نەخۆشی دەنگی نوسابوو، جار جار بە ئاماژە و پچر پچر باسی سەفەرەکەی بۆ دەکردین، کە چۆن چووە بۆ بولغاریا و حزب نادوویەتی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی. زۆر حەزم لە خواردنی کەباب بوو بەڵام دڵم نەدەهات، پارەی بارە تەماتەکە بە کەباب بدەم، چونکە دایکم ئامۆژگاری دەکردم دەیگوت رۆڵە دەست بە پارەوە بگرە، یا زۆر جار قسەیەکی دووبارە دەکردەوەو دەیگوت دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە. ئەگەرچی بە تەمەن منداڵ بووم بەڵام وەك پیاوێکی بە تەمەن بیرم دەکردەوە. بەداخەوە نە منداڵیم وەك منداڵ بەسەربرد، نە لاویەتیم وەك لاو، خوابکا پیریم وەك پێویستی قۆناغی پیری بەسەر بەرم. ئەمەش ستەمێك بوو رۆژگار لەسەردەستی زاڵم و ستەمکار لێی کردین. تەمەنم دە ساڵ بوو جوتی(گا) و هێستریشم دەکرد، دروێنە، دارهێنان، تەماتە فرۆشتن، هەموو ئەو کارانە هی پیاوی گەورە بوون بەڵام من ئەنجامم دەدان.

هەقم بوو خەمی گەورە بۆ پشدەر بخۆم. ئەو پشدەرە هەزاران نەوەی، بە بەفراوی کوێستانەکانی قەندیل و مامەندە و باژێر، پێگەیاندووە لە هەناوی خۆیدا پەروەردەی کردوون. سەدان قوربانیداوە بۆ ئازادی کوردستان و، بەردەوام پەناگەی شۆرشگێڕانی کورد و غەیری کورد و پشتیوانی شۆرش بووە. ئەوە نییە کەریم کاکەو سەدان کەریمی تر خەونی نەپساوەی قەندیل دەبینن، حەزدەکەن ساڵانە بە شوێن خەناوکە پساوەکەی ژنە ئاشقەکەدا وێل بن، کێ هەیە سەرمەست و ئاشقی پشدەر نەبێ سەیر کەن، پشدەرە دیسان پشتێنەیەکی سەوزی

لەکەمەر بەستەوە، قەندیل هەمیشە مەندیلی لەسەر، تەنانەت وشکە سالّی درێژخایەنیش ئەو مەندیلەی پیدانانێت، ئەدی ئەوە دکتۆر نەوزادی هاوڕێم نییە بە دروشمێکی هەمیشەیی بناری(قەندیل) وا (هەگبەی بناری) بە کۆڵ داداوەو هەوارگە بە هەوارگە دەگەڕێت نیشتمانەکەی خۆی قەندیل وەکو دەستی شێخی شێخان زیارەت دەکا، لە وێوە دیمەنی تاڤگەی جوان و مێرگ و مێرگوزاری نزاری بناری قەندیلمان وەکو متفرکی (قەندیل) لە هەگبەکەی دەنێ و، لە رێگای شاشە ڕەنگینەکەی زاگرۆس بەسەرماندا دابەشدەکات، لە رێگای بەخشینەوەی دیمەنی قەندیل پێمان دەڵێ هۆ کوڕینە هۆ قەندیلی یەکان هەرگیز (قەندیل) لە بیر مەکەن ئەگەر لە بیری بکەن دەمرن...

لە کوێ بۆکوێ، خراپ تێکەڵی ئەندێشەی ئێستاو رابردوو بووم...کاتێك وەهۆش خۆم هاتمەوە، بینیم لە ناو گەواڵە دووکەڵی جگەرەی هاوڕێ حەسەن خردرا تێکەڵبووم، دیار بوو ئەویش وەکو من لە خەم و پەژارەی راگواستنی پشدەردا نقوم بووە، بەتایبەتی لە خەمی گوندەکەی خۆیدا زوورکان، کە لەگەڵ قەڵادزیدا ئاوێزانی یەکتر ببوون، وەکو چۆمی(بەستێ) ببوونە چۆڵەوانی وشکارِو...

## مام یەدی پیری و قەندیل:

کورد دەڵێ کاڵەك بەرِەنگی نییە، ئەو پەندە بە تەواوی لەسەر خاڵە یەدی پیریدا جێبەجی دەبێ. یەدی ئەگەر بە باشترین قەپانی توتن کرِەکانی باقی حاجی جەلالی رانیەیی قەپان کرابا برِواناکەم کێشەکەی گەیشتبا (٤٠) کیلوگرام. پیاوێکی ریجەکە بوو، بە گازی نالبەندی تۆزێك گۆشتی لێدەپچرِا. لە سیرمەیەك دەچوو، سیرمە ئەو چەرمەیە کە دۆمەکانی کورد کاڵەی چەرمیان لێ دروستدەکرد. هەق بوو ئەو کاڵەیە لە ناو مۆزەخانەیەکی کوردستان دا بنرێت، چونکە هەزاران ساڵ لە لایەن خەڵکی کوردەوە لە پێی کراوە. کاڵەی چەرم لە کەوڵی گا، مانگا، گامێش دروستدەکرا. چەرمی کاڵە چەرمێکی تایبەت بوو، نەدە بوو (کرمە هەنگ) چەرمەکەی کون کردبێ یا چەقۆی کەوڵکردن سمیبێتی بۆ ئەوەی ئاو نەدات. سەری کاڵەکە وەکو کلاشەی(هەورامان) لە لایەن کاڵەچنەکان جوان دەتەنرا. کالا نموونەی زۆر لەسەر هێنراوەتەوە، وەکو(( کالا بە قەدەر بالا)) زۆر نموونەی تریش !... مام یەدی لە پاڵەوانی **رۆمانی شکەست** دەچوو کە لە سەردەمی شاخی خوێندومەتەوە، ئەو پاڵەوانە بەهۆی متمانەی

زۆربەی سەربازەکانی لەشکرەکەی بوو بە سەرۆك. ئەگەرچی هەموو جاریٚ شکستی دەخوارد و، خۆیشی دانی پیٚدا دەنا، کەچی سەربازەکان هەر متمانەیان پتر پیٚدەکرد. لە وەڵامی بیٚزاری سەرکردەکەیاندا سەربازەکان ئەیانگوت ئەو شکەستەشت بیٚ حیکمەت نییە. ئەو پاڵەوانە خەیاڵییەی رۆمانی شکەست، کە لەشکرەکەی بڕوایان پیٚ نەدەکرد سەرکردەیەکی فەشەلە، ئەوەندەی تر مەراقی دەخوارد. ئەوندە کز و باریك بوو، کە سواری ئەسپەکەی دەبوو دەمانچە بە کەلەکەیەوە گیر نەدەبوو. هەر لە پەیکەری ئیٚسقانی تاقیگەکانی پزیشکی دەچوو... ئەگەرچی مام یەدی بە قەدو باڵا لەو سەرکردەیە دەچوو، بەڵام لە ورەو ئیٚرادەدا ئەرزو ئاسمانیان نیٚوان بوو. مام یەدی مرۆڤیٚکی نیشتمانپەروەر و بە تەواوی مانا کورد بوو، ئەو بەکردەوە بڕوای بە خەباتی هەر چوار پارچەکەی کوردستان هەبوو. جیاوازی نەدەکرد لە نیٚوان تیٚکۆشەرانی رۆژهەڵات و باشووری کوردستان... پاڵەوانەکەی رۆمانی شکەست لە هاوڕیٚیەکی خۆشەویستم دەچیٚ کە هاوڕیٚ(خالیدی فاتحی)یە ئەویش قەد و باڵای چبڕ لە هی مام یەدی باشتر نەبوو. زۆر جار بە یادی ئەو رۆژانە بە هاوڕیٚ خالید دەڵیٚم تۆ پاڵەوانەکەی داستانی شکەستیت... رۆژیٚك لە گویٚزیٚ خواریٚ بووین لە ماڵی عەلی سەیدە هەمووومان واتا خیٚزانی هاوڕیٚ عەلی خاڵە حەمەدی سەیدە باوکی هاوڕیٚ عەلی، پوور ئایشیٚی دایکی و براژنی هاوڕیٚ عەلی و منداڵە سەلکە وپیٚچکەکانی شەهید حەسەنی رەحەمەتی، لە ژیٚر ڕەشماڵەکەی خاڵە حەمە سیدەدا یەکترمان گرتبۆوە. بەڕاستی گۆنگەڵ بوو، گۆنگەڵ بەوکۆبوونەوانە دەڵیٚن، کە هەمە چەشنەیە و هەر کەس تیٚیدا بەشداربیٚ دەتوانیٚ قسەی خۆی بکات... مام خدر دەرویٚش باوکی هاوڕیٚ هەمزە، هاوڕیٚ هەمزە و هاوڕیٚ عومەر و عەباسی برا بچووکیان، هاتنە ژیٚر ڕەشماڵی خاڵە حەمەد و، گۆنگەڵەکە خۆش تر بوو. هاوڕیٚ سەلیمە سووریش کە زۆربەی کاتەکانی هەر لە گویٚزیٚ بوو ئەویش لەژیٚر رەشماڵی خاڵە حەمەد سیدەدا پەیدابوو. ئەوەندەیان نوکتە گیٚڕایەو و قسەی خۆشیان کرد ئەوسەری دیار نەبیٚ. خاڵە حەمەد سیدە لەگەڵ نوکتەکان پیٚدەکەنی و کۆڵمەکانی سوور هەڵدەگەڕان، بەڵام چ پیٚکەنینیٚك هەر لە گریان دەچوو، سەری نەوی و خۆی کڕوشم دەکرد، ئینجا بە بیٚدەنگی پیٚ دەکەنی، زۆر بە وردی سەیریت نەکردبا نەتدەزانی پیٚدەکەنیٚ یا دەگری. بەتایبەتی کاتیٚك کە هاوڕیٚ عەلی نوکتەی شوانەی برادەری خاڵە حەمەدی دەگیٚڕایەوە، لەوانە باسی رازو نیازی ژنان لە سەر کانییە، قسە و باسی پیاوانی ئاوایی لە مزگەوت و کانییە پیاوان. بە کورتی و کرمانجی نهیٚنی شەخسی لە

ناو خەڵکی مەنگوڕایەتیدا بوونی نەبوو، ئاخ بۆ ئەو ڕۆژگارانە چەند خۆش بوون خەڵك چەند سادە و پاك بوون. کەریم کاکە واتەنی: چۆن ئەستێرەکان کوژانەوە. هاوڕێ سەلیم چەند سوور بوو هێندەی تر سوور هەڵگەڕابوو. سوور هەڵگەڕانی سەلیم گاڵتە نەبوو، لە سیمایدا دیار بوو بەتەمای شتێکە بۆیە هاتۆتە ئێرە. بۆچوونەکەم ڕاست بوو، هاتە پێشەوە وتی: حەمە دەڵێ چی مەفرەزەیك بکەین؟ هێشتا وەڵامم نەدابۆوە، وتی وەکو جاران ناکەین ئەمجارەیان بە سواری دەڕۆین، ئەگەر وانەکەین ڕێگاکە دوورە دەپسێین!. منیش سەری ڕەزامەندیم بۆ لەقاند. هەر ئەو سەر لەقاندنە بوو بە بڕیار، بۆ ڕۆژی دوایی مەفرەزەکە سازبوو، هەر ئەوەندەم زانی هاوڕێ عەلی سیدە، حەسەن خدر، هەمزە سوور، مام خدر دەروێشی باوکی هەمزە و بەندە، وەك بەوری بەیانی وەخۆ کەوتین و بەرەو باوەشی دوندەکانی قەندیل ڕێگامان گرتەبەر. شەوی یەکەم لە هەوارگە سازگارەکەی(ئاوە شخوێرە) لە دامانی چیای پانەسەر ماینەوە، پانەسەر ناوێکی پڕ بە خۆیەتی لەسەرەوە پان و پۆڕە. زۆر جار لە ناو عەشیرەتی مەنگوڕایەتی ئەگەر توانج لە کەسێك بگرن پێی دەڵێن فلان سەرپان هەر بۆ نموونە (ئەحمەد) سەرپان دیارە پانەسەریش لە ڕێگای ئەو توانجەوە مەنگوڕایەتی ئەو ناوەیان بە مل دابڕیوە.

لوتکەی چیای پانەسەر کەوتۆتە سنووری هەوارگەکانی خێڵی مەنگوڕایەتی، پانەسەر لەڕووی سەربازی یەوە بە لوتکەیەکی ستراتیژی دادەنرێت، بەڵام ئەوەندە ساردە، مەگەر هاوڕێ عەلی سیدە و گەریلا بتوانن خۆی تێدا ڕابگرن... لەو هەوارگە ساردەدا واتا لە(ئاوە شخوێرە) هەمزە بە لایەك دا و هاوڕێ سەلیم و حەسەن بە لایەکی تردا دەگەڕان بۆ ئەوەی گوێنی بۆ ئاگر کردنەوە کۆبکەنەوە. نازانم هۆی چییە گوێنی هەتا تەڕتر بێت باشتر ئاگر دەگرێت، هەروەکو نەوت وایە. سەیرمکرد مام خدریش چۆن دەستەچیلەی ئاگر لە گوێنی دروستدەکات. ئەو پیاوە کەسێکی زۆر بە توانا بوو ماندووبوونی نەدەزانی، ڕوومەتە چرچ و لۆچەکانی، لە ژێر تیشکی ڕۆژدا ڕەش هەڵگەڕابوون، وەك داخ کرابن وابوو. لە تووتنەوانیدا جووتیارێکی نموونەیی بوو زەوی خۆی بۆ نەدەگرت، ئەو پیاوە بەقەدەر دوو پیاو لە توتنەوانیدا کارامە بوو. سەرەڕای ئەوە باوکێکی میهرەبان بوو، هەمیشە خۆی بە قوربانی کوڕەکانی دەکرد. هەر کارێك مام خدر رووی تێ دەکرد دەست بەجێ تەواودەبوو. دەیگوت کوڕینە هەرگیز لە کارکردن مەترسن کار وەکو شێروایە بەڵام کە دەستت دایە دەبێتە ڕێوی. سێبەری چیای پانەسەر بەرەبەرە بەسەرماندا دەکشا و تیشکی هەتاوی ڕاو دەنا. ناچاربووین کیسەخەوەکانمان

دەربێنین لە شێوەی ڕەوە(کەت) هەر یەکە لە پەنایەك لە دەورەی ئاگرەکە خۆمان کروشم کەین. کترییە ڕەشیش وەکو دەروێش جەزم بوو دەکوڵێ ئەمما کوڵێن. هەمووممان چا خۆرەوەی چاك بووین، حەسەن قزلچی گوتەنی هەر بنە دۆلکەی مەتارە بوو لە نێوان سمێڵ و ریش دا ئاوەدیو دەکراو، یەکێکی تری بە دوایدا هەڵدەدرا. هەندێکمان ئەوەندە ئۆقرەمان نەبوو ڕاوەستین هەتا کترییە ڕەش دەم دەکێشێتەوە، بنە مەتارەمان پڕ لە ئاوی گەرم دەکردو پتە چایەکمان دەهاوێشتێ و، لەپەنا ئاگرەکەمان دادنا، هێندەی بڵێی یەك ودوو چایەکە مێرولەی دەکرد و ئەویش فڕ دەکرا... بە ئەندازەی چا خواردنەوەکە نوکتە دەگێڕدرانەوە، نوکتە چ نوکتە لە هیچ قسەیەکی قۆڕ نەدەپرینگانەوە، مەگەر کاك حەسەنی دانشفەر هەجوی وای پێ بکرێت... تریقە تریقی هاوڕێ عەلی و بەندە لە قاقای شەنگە بیریان دەچوو... هەمیشە هاوڕێ حەسەن خدر و عەشیرەتی خدر مامە سێنە دەکرانە ئامانج بۆ ئەوەی نوکتەیان لەسەر بگێڕنەوە، حەسەنیش خۆی تێك نەدەدا، وەك عادەتی خۆی دەستێکی بە لوتە گەورەکەی دادەهێنا کە لەقەدەر قەدوبالای بوو و دەیگوت: ئەوە بوختانە هاوڕێ (سورە) دروستی کردووە. لوتیش بۆ خۆی قسەو باسێکی لەسەر بوو، دەیانگوت لوت گەورەکان لوتی هاوڕێ حەسەن خدر یان بە سکرتێری یەکەمی ڕێکخراوی لوت گەورەکانی کوردستان داناوە، هاوڕێ حەسەن خدریش دەیگوت من هەو نیم هاوڕێ (هاوکار) هەڵبژێردراوە، جارجارەش ناوی هاوڕێ کاروان دەهاتە ناو ریزبەندی لوت گەورەکان...بە کورتی ئەگەر هیچ مەسەلەیەك نەدەما، باس دەهاتە سەر باسی(تڕ)، هاوڕێیەك بەئەوی تری دەیگوت تڕ هەر تڕ، موعجیزەیە تڕ. نازانم تڕ چ حیکمەتێکی تێدا بوو، هاوڕێی وابوو جەردی تڕی ئەو هاوڕێیانەیان دەکرد کە جارجارە لێرەولەوێ لە پەڕینەوەی چۆم، رووبار یا لە کەمیندا بەبێدەنگی لێیان بەر دەبوو. ئەو لێ بەربوونە گەورەترین کەرەستەی نوکتەی رۆژانە بوو، جارێ مام جەبارە کوێر زۆر بوختانی بە هاوڕێیان دەکرد، زۆر جاریش بوختانیان بەئەو دەکرد. هەندێك هاوڕێ، وەستا بوون لە ترش و خوێ کردنی ئەو بابەتە. خۆ هاوڕێ هەمزە سووریش بەڵایەك بوو، یاخوا کەس لە نزیك هەمزە لێ بەرنەبێ، ئەو نەگبەتە جارێك نورقۆچێك لە هاوڕێیەك دەداو هاوڕێیەکە تڕێکی لێ بەردەبێ، ئیتر ئەوەندە سەری کردە سەر، ناچاربوو خۆی رادەستی ڕژێم کردەوە. قور بەسەرە هەقی بوو هەمزە لەسەر نان خواردن، لە رێگاوبان، لە کاتی پیاسەی ناو کچ و کاڵان، چاوێکی لەسەر ئەو هەژارە بوو، ئەویش سەری دادەخست و بە خۆیدا دەشکایەوە، دیار بوو لە دڵی

خۆیدا دەیگوت: هەمزە راست دەکات ترکەنێکی وەکو من چییە؟! بۆئەوە نابم پێم بڵێین پێشمەرگە... هاوڕێ هەمزەو هاوڕێ جەبار بەڵایەك بوون لە کۆڵ ئەو برادەرانە نەدەبوونەوە کە رۆژێك لە رۆژان بایەکیان لە لای ئەو دوو بەڵایە لێ دەبۆوە. ئێستاش جەبار، کە هاوڕێیەك دەبینێ پێی دەڵێت لە ترِی هەورازی فلاَن چیایەت(...) جارێکیان لەگەڵ ئەو برادەرە بە هەورازیدا دەهاتینە خوارێ، برادەرێك بایەکی لێ بۆوە، ئەو بەستە زمانە رەنگی وەك بەهێی زەرد هەڵگەڕا و وتی حەمە گیان چی بکەین ئەوە بۆ لە پەنای ئەو دوو بەڵایە(بیبواندی)!! ئەو هاوڕێیە کادرێکی دڵسۆزو تێکۆشەربوو، حزبی لە چاوی خۆی خۆشتر دەویست ئەگەرنا هەر لەو سەفەرە نەدەگەڕایەوە و وەکو برادەرە هەژارەکە خۆی رادەستی ڕژێم دەکردەوە. وتم هاوڕێ دڵ لە دڵ مەدە ترِی گۆرین بەسەر جەباری دادێنین، وتی چۆن؟ پێم گوت من و تۆ ئەوە پێکهاتین، هەمزەش قەناعەت پێ دەکەم جەباری دەکەینە ترکەنی ڕاستەقینە... دوای مەفرەزەیەکی دوورو درێژ گەڕاینەوە بارەگا هاوڕێیان هەر وەکو جاران کۆبووینەوە، دیسان گۆنگەڵ بوو هەر هاوڕێیە سەرگوزەشتەیەکی خۆی دەگێڕایەوە هاوڕێ جەباریش چاوە کوێرەکانی ئەوەندەی تر بچووك ببوونەوە ددانەکانیشی کەل و کۆم وەکو فیشەکدانی شاش وابوون. هەر دەیگوت دەیڵێم... ئەو هاوڕێیەش نەیدەزانی جەبار شتی لەبیر ناچێتەوە بەتایبەتی ترِی گۆرین... هاوڕێیەکە وتی دڵم تۆقی دەبیلێ...! جەبار وتی لە ترِی فلاَن رۆژەت بەم... لەوێ بوو بە گۆنگەڵ و پێکەنین چ پێکەنینێك لە دڵەوە خۆشەویستی لێ دەتکا لە پڕ هاوڕێ سەلیم هاتە پەنام وتی:(حەمە) دەبێ حراسەت بگرین! وتم باشە لە دوای نان خواردنی ئێوارە حراسەت دادەنێم... دەڵێن(قەتێ) (کەت) باڵندەیەکی سەیرە کاتی بەڕەوە هەڵدەنیشن یەکێك لە دوورەوە چاودێریان دەکات هەر کاتێ ڕاوچی بەرچاو کەوت قیڕەیەك دەکاو باڵندەکانی تر بە ئاگا دێنێتەوەو دەفڕن... قازیش هەر وایە هەمیشە ئێشکە لە خۆیان دەگرن..ئەو شەوەی قەندیل ئێمە لە پۆلە(کەت) دەچووین هاوڕێیان لە دەورەی ئاگر کۆبووینەوە یەکێك لە هاوڕێیان دوور لە ئێمە لەسەر بەردێك حەرەس بوو...نیشتمانی قەندیل سروشتی خۆی بە خۆی وەیە هەر رێبوارێك رێگای بکەوێتە(قەندیل) دەچێتە ناو دنیایەکی تر دنیایەك پڕاوپڕ لە سروشتی جوان، نازانم بۆ مامۆستا هێمن بۆچی هۆنراوەی بەهاری کوردستانت ناو لێ نەنا بەهاری(قەندیل) قەندیلی دڵە گەورەکەی هەر چوار پارچەی کوردستان... مرۆڤ شاعیریش نەبێ وەکو دەروێشی خانەقا لەخۆیەوە شیعری بۆ دێت یا

هۆنراوەی مامۆستا هێمنی شاعیری دیتەوە یاد... هەوارگە بۆ هەوارگە ڕەتبووین بە تیشە شاخی دورودرێژی شێخ شەرۆ دا ڕەتبووین دواتر شۆڕبووینەوە بەرەو هەوراگەی (بێساران)، بێساران ناوی خۆی بە خۆوە بوو، بە دەیان کانیاو و مێرگی ڕەنگاوڕەنگ لە شێوەی تارای بووك سیمای بێسارانی رازاندبۆوە. لەو وەرزە سەختە سیاسییەدا کە وەرزی تاوانی ئەنفال و کیمیاباران بوو، بێساران بوو بە پەناگەی پێشمەرگە... بوو بە پێگەی کاسبکارانی گەرمیان و کوێستانی کوردستان... یەکێك لە کاروانچییەکان بەدەم جگەرە کێشانەوە بە خێرهاتنی کردین پیاوێکی دەستە پیاو بوو کەمێك ئەسمەر بوو دیار بوو هەفتەیەك بوو ریشی نەتراشیبوو زاراوەی لەهی عەشیرەتی ئاکۆ دەچوو لە قسەکانیدا وشەی برالە یا برای(خۆم)ی زۆر بەکاردەهێنا... چو بۆ سەر گاشە بەردێکی بڵند بە قەدەر خانوویەك دەبوو...وتی هۆهەی گۆمی کرمە سوورانە لەوێ ئاودیو دەبن، بەڵام ئاگاداربن لە ریزبەندی وڵاخی قاچاخچییەکان جێ نەمێنن، ئەگەر جێ بمێنن رێگاکە بزر دەکەن دوور نییە بەسەر مینە چێنراوەکانی رەبیەی سەر کونەکۆتریدا بکەون لەو رۆژانەدا کوڕێکی گەنج کە خەڵکی دۆڵەتوێ بوو مینێکی پێنج چوکڵە پێیدا تەقیەوە خۆی و ئەسپەکەی کوژران... ئەو رەبیەیە هی سوپایە هیچی لەگەڵ ناکرێت، رۆژانە مەفرەزە دەردەکا لە کوێ جێگای سمی وڵاخە بەرزە ببینن لەوێ مین دەچێنن تەنانەت مین لە گوێنی و تیرۆێیانیش دەبەستن... ئەو پیاوە قاچاخچییە کاتێك قسەی بۆ دەکرین بەدەست ئاماژەی دەدا بە ئاراستەی ڕێگا کە قسەکانی تەواوکرد و ڕۆیشت... پیاوە قاچاخچییەکە وەکو ئاسکە کێوی خۆی تێفڕێدا لەسەر گاشە بەردەکە دەستێکی بڵند کرد خواحافیزی لە ئێمە بکات بە دەستەکەی تریشی جگەرەیەکی لە پاکەتەکەی دەرهێنا خەریکبوو دایگرسێنێ هاوڕێ حەسەن خدر وەکو باشو داهاتە جگەرەکەی و بەبێ روخسەتی کابرا لە دەستی دەرهێنا... کابرای قاچاخچی زەردەخەنەیەکی هاتێ و هیچی نەگوت، منیش لە دڵی خۆم داو گوتم پیاوم دەوێ بە قەندیلدا بڕوا جگەرەکێش بێ و جگەرە نەداتە حەسەن خدر. هاوڕێ حەسەن کە بێ جگەرەبێ دووکەڵی جگەرە لە کوێوە هەستی خۆی دەگەیەنێتێ، جگەرەو هاوڕێ حەسەن خدر لێك مارەکراون هەرگیز بەبێ یەکتر هەڵناکەن... کابرای قاچاخچی ئاودیوی تاشە بەردەکە بوو و شوێنەواری نەما... ئێمەش بەسەر پێی کەمێك لە قسەو رێنوێنی کابرای قاچاخچی ورد بووینەوەو هاوڕێ سەلیم وتی ئەرێ ئالیك نەدەینە وڵاخەکان؟ مام خدریش هەرایەکی کرد وتی دەبێ وەلاخەکانمان تێر بکەین... ئێمەش

خەریکی گوێنی بڕین و کۆکردنەوەیان بووین، هاوڕێ عەلی سیدە وتی ئەو ژەمە گۆشت(گا) دەخۆین گۆشتی(قوتو) دەبێ، بەبێ ئەوەی وەڵام بدەینەوە هەریەکە یەك قوتو گۆشتی خۆی هەڵپچڕی و لە لێواری ئاگرەکەی دانا، هاوڕێ هەمزە سووریش خەریکبوو پیازێکی شیرینی ئێرانی پاك دەکرد، بەدەم پاککردنی پیازەکەوە دەیگوت هاوڕێیان بخۆن هەمووی(ئینێرژییە)!!...

لە شێوەی ریزبەندی ڕاوچییەکانی قەدیم خۆمان سازکرد لەگەڵ شۆڕبوونەوەی سێبەری بەرزایی چیای گۆمی کرمەسووران وەڕێکەوتین...کاروانی ڕێگاکە بیست، سەت، دوو سەت، پێنج سەت، سوار هێستر و ئەسپی باش بە ناو دەشت و هەڵدێری پڕ لە گوێنییە پان و بەرینەکانی گۆمی کرمەسووران و شێخ شەرو کونە کۆتر وەربووین...کاتێك مەترسی مین پەیدابوو لە حەقلی مینەکان نزیکبووینەوە وەکو لەشکرێکی نیزامی هەموو سوارەکان ریز بوون جگە لە فرمە فرمی لوتی وڵاخەکان و دەنگی سمی وڵاخەکان هیچ دەنگێکی تر نەدەبیسترا، هەتا شەو پتر تاریك دەبوو پتر تارمایی ریزبەندی کاروانچییەکان لە ناو گوێنییەکانی ڕێگاکە وون تر دەبوون هاوڕێ سەلیم و هاوڕێ عەلی سیدە لە لایەك بەندەو هاوڕێ حەسەن و هەمزەو مام خدر لە لایەکی تر یەکترمان ئاگاداردەکردەوە کە بە هیچ جۆرێك لە یەکتر بزر نەبین بەردەوام هی پێشەوە ئاگای لەهی دواوە بێت... کاتێ گەیشتینە ناو لێرەواری پشتی چیای گوندی(بۆڵی)بانگە بانگ پەیدابوو دیار بوو کاروانچی بوون یەکتریان بزرکردبوو... پێش ئەوەی بگەینە ناو گوندی(بۆڵی) ئاوایی یەکە لە لایەن پێشمەرگەو لایەنگرانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە ئاوەدان کرابۆوە... لەو ئاواییەدا پتر لە(٥٠) خێزان دەژی لە خێزانی پێشمەرگەو لایەنگرەکانیان وەکو جووتیارێکی ئاسایی شینایی و پەلەوەریان هەبوو، هەندێکیان کاروکاسبی قاچاخچییەتیشیان دەکرد... هاوڕێ سەلیم و هاوڕێ عەلی سیدە پشت ڕێگا بوون ئێمەش بە دوایاندا ڕۆیشتین... پێشتر وەسفی ماڵی مام(یەدی پیریان) بۆ کردبووین خۆمان ساغ کردبۆوە کە میوانی ئەو دەبین... بەڵام حەزمان دەکرد کاتی بڕۆین بۆ ماڵی خاڵە یەدی کەمترین کەس لە دراوسێکانی ئاگاداربن... ماڵی خاڵە یەدی لە خانوویێکی بچووکی قوڕدابوو، بەردەم ماڵەکەی دێبەری تەماتەو بامیە بوو. یەکێك لە هاوڕێیان وابزانم هەمزە سوور بوو بەرەو ماڵی خاڵە یەدی چوو تا ئاگاداری بکاتەوە کە میوانی ئەوین... کاتێ هاوڕێ هەمزە گەڕایەوە تارمایەکی لەگەڵ بوو لە تارمایی کڵەك

دەچوو  دەرپێیەکی سپی لە پێدا چاکەتێکی شۆڕی لەبەر بوو مینگەیەکی کردو بەزەحەمەت لێ حالّی بووین وتی ولاّخەکان جێ بێڵن خۆتان بڕۆنە ژوورەوە... بەبێ ئەوەیوەلاّمی بدەینەوە یەك بەدوای ئەوی دیکەدا ڕۆیشتین لە دەروازەی هالّی ژوورەوە ئافرەتێك لە تاریکیدا بە گەرمی بەخێرهاتنی کردین وتی باوە بۆ ئەو ژوورە...

مام یەدی ولاّخەکانی ئێمەی لە دەوروبەری گوندی(بۆلّی) لە جێگایەکی لە بارو بەرچاو بەستەوە، کە مام یەدی گەڕایەوە ژوورەوە لەبەر ڕووناکی چرا بینیم پیاوێکی خۆش مەشرەب و بە لوتف بوو، قسەکانی زۆر بەرێوجێ بوون، مام یەدی و خێزانەکەی خەڵکی خوارووی ڕۆژهەلاّتی کوردستان بوون، زاراوەکەیان هەورامی بوو. زۆر بە شیرینی و میهرەبانی دەدوان وەك ئەوەی لەگەڵ خزم و کەسوکاری خۆیان بدوێن. مام یەدی و خێزانەکەی شێوەیان لە یەکتر دەچوو، ئەگەر ژن و مێرد نەبان، بیرت بۆ ئەوە دەچوو خوشك و برای یەکتر بن. دەڵێن گڵی ژن و مێرد لە گلینجانێك هەڵهێنجەراوە. ئەو شەوە مام یەدی وەکو سیاسییەکی دووربین پێشبینی سەرکەوتن وئاسۆیەکی ڕوونی بۆ خەباتی شۆڕشی چەکداری دەکرد، نازانم مەبەستی ئەوە بوو ورەی ئێمە بەرز کاتەوە یا هەر خۆی بڕوای وابوو. لە سالاّنی دواتر بۆم دەرکەوت بە هەق مام یەدی خۆی خاوەنی بیروباوەڕێکی بەهێزە لە رووی نەتەوایەتییەوە. ئەو شەوە زۆر ماندووبووین مام یەدی بە تەواوی لاقی لە دەرگای ژوورەوە دەرنەچوو بوو هاوڕێ حەسەن خدر پرخە پرخی دەست پێکرد. خەوی ئەو شەوە وەکو خەوی شەوانی باران بارینی ژێر تاوڵ وابوو، کە خوناوەی دەکرد، لەبەرئەوەی ماندووبووین باش خەوتین... بەیانی کە لە خەو هەڵساین گوێبیستی دەنگی هەمەجۆرە بووین، زەرەی کەر، هۆڕەی مانگا، کورکە کورکی مریشك، گارەگاری مریشکی هێلکەکەر...مام یەدی بە زەردەخەنەیەکەوە سەرێکی بە ژوورەوە داکرد و وتی: بەیانیتان باش، هاوڕێیان جێگاتان ناخۆش نەوو... مام یەدی دوو ژووری هەبوو، خۆی و خێزانی و چەندە منداڵێکی وردیلە لە ژوورێکدا بوون، ئێمەش کە (٦) هاوڕێ بووین لەو ژوورەدا بووین، ناوبراو ئەوەندە بەرێکی کارەکانی ئەنجام دەدا، دراوسێکانی هەستیان نەدەکرد مام یەدی میوانی هەیە... مام یەدی زۆر وریا بوو، ڕژێمی بەعسی باش ناسیبوو ئەی گوت نابێ بڕوا بە هەموو کەس بکرێ، مام یەدی وەکو باسم کردووە پیاوێکی ڕەش ئەسمەری باریکەلەی قەد کورت تەمەنی خۆی لە(٤٠) سالّی دابوو. دەم وچاوی باریك و سمێڵی باریك و ڕەشی قەیتانی بوو چاوێکی وردیلەو کەمێك ددان(گڕ) بوو... ئەو پیاوە بە دیمەن زۆر نابووت

بوو، بەڵام بە هێمەت کێۆێك بوو دەکرا پشتی پێببەستی... ئێواریێ بەدرەنگەوە هەم وڵاخەکانی بۆ ئامادەکردین هەم سووسەی ڕێگای گشتی(بۆڵێ) ی کردبوو، کە مەترسی دانانی کەمین هەبوو. مام یەدی بەردەوام لە جموجۆڵ دابوو ئاو بوەستابا مام یەدی نەدەوەستا. ئەو ئێوارەیە بە دووربینەکەی هاوڕێ سەلیم بەردەوام چاودێری ڕێگاو بانەکانی دەکرد، هەموو جارێك کە دووربینەکەی هەڵدەگرت و پێی دەڕوانی دەیگوت دووربینێکی باشە..لە سەرو بەندی ڕۆیشتیندا هاوڕێ سەلیمیش وەك دیارییەك دووربینەکەی پێشکەش کرد...

## گۆڕبەنان:

ئەو ئێوارەیەی ماڵئاواییمان لە ماڵی مام یەدی کرد، ئێوارەیەکی ئارام و بێدەنگ بوو، مام یەدی و خێزانەکەی زۆر بە گەرمی بەڕێیان کردین. کە لە جادەی گشتی پەڕینەوە، سەرپێیی ئاراستەی ڕێگاکەمان دەست نیشان کرد. ملمان لە هەورازێکی ڕك و دوورو درێژ نا بەرەو **زینویێ ئەستیرۆکان،** دیارە ئەو بستووە یا وەکو عەشیرەتی(ئاکۆ) دەڵێن زینوە ئەستێرەی تێگیراوە، یا ئاسۆی ئەستێرە ئاوابوون بووە، بۆیە ئەو ناوەیان لێ ناوە. جگە لەوە بە زەنەئاو، خێراوکە، گۆمیلکە ئاوی پاشەکەوت کراو دەڵێن **ئەستێر،** ئەو شوێنە هەم بەرزە لەڕووی دەریاوە هەم ئەستێری درۆزنە ئاوی تێدا. جگە لەوە لەناو عەشیرەتی (ئاکۆ) و مەنگوڕاندا بۆ سەفەری شەوانە، شوێن، هەڵاتن یا ئاوابوونی ئەستێرە، دەست نیشان دەکرا، هەر بۆیە دەشێ یەکێك لەم دوو لێکدانەوەیە یا هەردووکیان بۆ زینویێ ئەستێرۆکان ڕاست بێت.

ئەو ڕۆژە لە ناو لێرەواری شاخی گۆڕبەنانێ، بارگەو بنەمان خستبوو دیمەنێکی خەمناك بوو، هیچ مرۆڤێکی خاوەن ویژدان، لە خواترس، بەبەزەیی، نەیدەتوانی خۆی لەبەر ڕابگرێ، و فرمێسکی نەیەتە خوارێ. گواستنەوەی بناری **پشدەرە ڕەقە** کە گوندەکانی ماخۆبزنان، گرتك، دوگومان، زەنگڵان، مەمکان، دوپانێ، پیرانەڕەشان دەگرێتەوە. تەنیا دوو کاتژمێر مۆڵەتیان پێدرا بوو بۆ ئەوەی ماڵەکانیان بگوازنەوە. زۆربەی خەڵکی ئاوایی نەپرژا بوونە سەر ئاژەڵەکانیان، بە ناچاری وێڵیان کردبوون بەرەو لێرەواری ناوچەکە بڕۆن... لە یەك کاتدا زەرەی کەر، حیلەی ئەسپ، میاوە میاوی پشیلە و... دەبیستران. هەرچەند ئەو ئاژەڵانە ڕەگەزیان جیاواز بوو، بەڵام بە ناچاری پێکەوە ڕەوەکی ببوون. ڕەوەکی بە وڵاخە بەرزانە دەگوترێت کە لە ئاوایی دادەبڕێن، وەك ئاژەڵی کێوی لە مرۆڤ دەترسێن... کە بەرەو ڕەوەکە دەڕۆیشتین،

لەسەر ئەرزی واقع هەستمان بە ئازارو مەترسی پرۆسەی راگواستن دەکرد. لەو ساتە وەختانەدا بیرم لەوتەکانی مام برایم دەکردەوە، ناوبراو بۆی گێڕاینەوە کە چۆن بە مێردمنداڵی چووە بۆ کوێستانی(وێجی) و لە لای ماڵی پوورە ئەستی خوشکە گەورەکەی باوکم ماوەتەوە، پوورم رۆژانە هەنگوین و رۆنە کەرەی دەرخواردی مام برایم داوە، بۆ ئەوەی لە ئازارو ڕەنجی مارانگازی رزگاری بێت. مام برایم ئەوەند بە تام و لەزەت، باسی خۆشی کوێستانەکانی وێجی و پیرانانی دەکرد، بەبێ ئەوەی کوێستانی وێجم بینیبێ خۆشم دەویست و حەزم دەکرد ببینم. ناهەقم نەبوو، ئاخر مام برایم لەو کوێستانە لە ئازاری مارپێوەدان چاك ببۆوە، ئەگەر شتێکی بەسەر هاتبا ئێمە بەدبەخت دەبووین. کە باوکمان بە گەنجی کۆچی دوایی کردبوو من و دوو خوشکە کلۆڵەکەم، تەمەنمان یەك تا سێ ساڵ بووە، لەبەرئەوەی من و خوشکەکانم باوکی خۆمان نەدیوە. کە دەستی چەپ و راستی خۆمان ناسیوە هەر(مام برایم)مان بە بابی خۆمان زانیوە، لە راستیدا مام برایم هەمیشە مامێکی باش بووە وەك باوکێکی دڵسۆز بووە بۆ من و خوشکەکانم، بەڵام باوك شتێکە و مام شتێکی ترە. بەبیرم نایات مامم ئازاری دابم. تەنها دوو جار بە منداڵی دڵم لە مامم ئێشاوە کە پێم وابووە غەدری لێکردووین. جارێکیان من و ئامانی خوشکم، داسی دروێنەمان لە ناو کرشە گەنم دا شاردبۆوە نەماندەزانی لە کوێمان شاردۆتەوە. مام برایم زۆر تووڕەبوو ئاگر لە چاوانی دەباری، ناهەقی نەبوو، لەسەر ئەو داس و گوریسە پەکی کەوتبوو، لەبەر ئەوە زللەیەکی لە بناگوێم سرەواند و پالێکی بە ئامانی خوشکمەوە نا، منیش گریام، نەك بۆخۆم پتر گریام بۆ ئامانی خوشکم، چونکە ئامان بەڕاستی پەپولەیەك بوو لەو گۆڕە، ئێستاشی لەگەڵی بێ ئامان هەروەك پەپولە وایە. زۆر جار لەگەڵ فاتمی خوشکم کە بە تەمەن ساڵێك لە من بچووکترە بەشەڕدەهاتین، بەڵام پێم شك نایەت رۆژێك لە رۆژان لەگەڵ ئامانی خوشکم بەشەڕهاتبین یاگلەیم لێ کردبێ، یا لە یەکتر زیز بوو بین...جارێکی تر مام برایم لە ماڵی مام سەعیدی دراوسێمان بوو منیش چووم لە تەنیشت مامم راوەستام بەبێ ئەوەی هیچ هەڵەیەکم کردبێ مام برایم دوو زللەی زۆر بەهێزی سرەواندە بناگوێم، لەگەڵ زللە لیدانەکەشدا قسەیەکی کرد ئەو کاتە حالی نەبووم، بەڵام دواتر مام برایم وتی مام سەعید بە منداڵان نارەحەت دەبوو بۆیە لێم داوی! منیش گوتم باشە نەدەکرا بە ئیشارەت پێم بڵێی برۆ و لێم نەدەیت؟!. کە دوو زللەکەم خوارد نەم کردە نامەردی و، ڕۆیشتم بەرەو قەڵادزێ. بەهۆی فرۆشتنی بارە تەماتەوە رێگای قەڵادزێ شارەزا ببووم.

چێشتەنگاوێکی درەنگ گەیشتمە ماڵی پوورە(ئامینە) کە لەگەڵ کوڕەکەی خۆی دەژیا. پوور ئامینە لەگەڵ دایکم دا لە باوکەوە خوشك بوون، ژنێکی زۆر نەرم و لە سەرخۆ بوو، توند لە باوەشی گرتم، دەستی بەسەر داهێنام و وتی تۆو رەفیقۆکەی کوڕم جیاوازیتان نییە. لەبیرمە ئەو رۆژە بۆ ژەمی نیوەڕۆ کەبابی کڕیبوو، لەو رۆژەوە بۆ یەکەمین جار تامی کەبابم چێشتووە... لە بیرم نایە چەند رۆژ لەوێ بووم، ئەوەندە دەزانم لەگەڵ رەفیقی کوڕیدا ناردمییەوە بۆ ماڵی خۆمان. ئەو ڕۆیشتن و تووڕەبوونە کۆتایی بە لێدانی من هێنا، ئیتر مام برایم جارێکی تر لێی نەدامەوە. لەوێ رۆژێوە کە لێم دراوە، بەڵێنم داوە هەرگیز دڵی منداڵ نەهێشێنم، چونکە منداڵ و روحی منداڵ لەپەڕەی گوڵ ناسکترە.

لەسەر تاشە بەردێك دەستم لە بناگوێم نابوو، خەریکبووم بە هەوراز و نشێوی خەیاڵی رابردوودا رۆدەچووم، کە هاوڕێ سەلیم وهاوڕێ عەلی سیدە بەرەو ڕووم هاتن، کاك عەلی وتی دەڵێ چی سەرو ولاخێك یا گوێدرێژێك بکڕین و لەگەڵ خۆمان دا بیانبەینەوە؟ منیش گوتم ئاش لە خەیاڵێکە و ئاشەوان لە خەیاڵێکی تر ... باشە هاوڕێ چۆنتان پێ باشە وادەکەین...

ئەو رۆژە ژەمی نیوەڕۆیەمان لەسەر کانی گۆڕبەنانێ خوارد، خەریکبوو سێبەری شاخی کێوەرەش تارمایی بەسەر ڕەنێ دارە زێوێدا دەکێشا، کە ئێستا وەکو زۆر شتی تر ناوی گۆڕاوە بۆ **بانوەقەل**، نازانم **قەل و زیۆ** چیان بەسەر چییەوەیە؟!. دیسان مام خدر دەروێش فەرمانی دا کەل وپەل و بارگەو بنە وەپێچین. دەستوور و فەرمانی مام خدر لەو سەفەرەدا هیچ گفتوگۆی لەسەر نەدەکرا، ئێمە هێشتا گوریس و قەیاسەی هێسترەکانمان نەپێچابۆوە، بینیم مام خدر لەسەر تاوێرە بەردێکەوە، وەك گەنجێك خۆی هەڵدایە سەر ئێسترەکەی خۆی و، سەری رێشمەکەی سرەواندە کەفەڵی هێسترەکە و لە ناو لێرەوارەکە بزربوو، ئێمەش یەك یەك و دوو دوو بە دوایدا ڕۆیشتین، بەڵام هاوڕێ حەسەن خدر خەریکی مناقشەیەکی سەیر بوو لەگەڵ هاوڕێ عەلی سیدە هەر دەیگوت: **واشە و واش نییە**؟!، منیش پێم سەیر بوو **واشە و واش نییە** مانای چییە؟ هاوڕێ عەلی سیدەش لەسەر ڕای خۆی سوور بوو، ئاخرەکەی هاوڕێ سەلیم تێڕاخوڕین وتی مام خدر وا ڕۆیشت بابڕۆین.

بە لابەلایەك دا ڕۆیشتین تا گەیشتینە هەوارگەی کوێستانی **وێجێ**، ئەو وێجەی وێردی زمانی مام برایمی مامم بوو. مام برایم وا بە خۆش و جوانی باسی دەکرد، والاتر لەوەی کە هەیە لە خیاڵی مندا وێناکرابوو. وێج لە لاپاڵێکی لێرەواری شاخی گۆڕبەنان هەڵکەوتووە.

ئاشگێرێك ئاوی سارد و زولاڵ لە ناو توێ توێی شاخەکە دێتە دەرێ، دەڵێی ئەندازیار دیزاینی جۆگاکەی کردووە، سروشتی شاخەکە لە شێوەی جۆگا دروست بووە. ئەگەر پسپۆری شوێنەوار ناسی چاوی پێ بکەوێت، ڕایەکی تری زەوی ناسانەی لەسەر دەبێ... مام خدر فەرمانی دا مەتارەکانمان لە ئاوی وێج پڕ بکەین، من لوێچێك ئاوی وێجم بە یادی مام برایم خواردەوەو مەتارەکەشم پڕ لە ئاو کرد. دیسان مام خدر وەك هەللوك خۆی هەڵدایە سەر ولاخەکەی و، لە هەورازەکەی ئەوبەری هەوارگەی وێجی تەپوتۆزی کرد، ئێمەش ریز بووین بە دوایدا ڕۆیشتین. هاوڕێ سەلیم وتی: کە شۆڕبووینەوە بەرەو دۆڵە ڕەقە دەبێ وریا بین نابێ کەس بمانبینێ بشمانبینن نابێ بناسرین...

## نۆرێ و قەلاسیدە:

کە شەو داهات بەرێڕەوێکی بناری کێوەڕەش دا دەڕۆیشتین تاکو گەیشتینە بەرامبەر بە گوندی نۆرێ و قەلاسیدە، لەو ئاقارەدا مام خدر فەرمانی نەدا، چونکە لە هەوارگەکانی(قەندیل) بڕیارمان دابوو، میوانی برادەرانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بین. ئەو مەفرەزەیە کەمترین کۆبوونەوەی تێدا کرا. بۆیە لە مەفرەزەکانی تر جیاواز بوو. لە ناو حزبی شیوعی عێراقیدا کۆبوونەوە وەکو هەوێن وایە، هیچ بڕیارێك بەبێ کۆبوونەوە دەرناکرێ. لە رووبارەکەی دۆڵە ڕەقە پەڕینەوە، لەو بەر ئیشك گرێکی برادەرانی رێبەرایەتی دەنگی داین. هاوڕێ هەمزە سوور خۆی و هاوڕێیانی پێ ناساند. ئێشك گرەکە بە تەلەفۆنی مەیدانی پەیوەندی بە بەرپرسانی خۆیەوە کردەوە، مۆڵەتمان پێدرا لە **دۆرێوە** بەرەو قەلاسیدە بڕۆین، لە ڕکە هەورازێك وەسەرکەوتین لەلاپاڵێك کۆمەڵێك خیوەتی پەرش و بلاو هەڵدرابوون ولاخەکانیان لێ وەرگرتین بۆ خۆشمان چووین بۆ ژێر خێوەتێك. بە زمانێکی زۆر شیرین بە خێرهاتنیان کردین. خەوی ئەو شەوەش لە خەوە خۆشەکان بوو. خەوێکی قووڵ کفتوکۆی سەفەری شەوانە و دوورو درێژ دەسڕێتەوە. بەیانی کە لە خەو هەڵساین جوانی دیمەنی قەلاسیدە و سێبەری تیشە شاخی چیای کێوەڕەش کە رووبەڕووی چیای ماکۆك وەستاوە، هەموو بناری دۆڵەڕەقەی داپۆشی بوو. دوو کاتژمێر بەر لە ژەمی نیوەڕۆ پیاوێکی دەستە پیاو عەینەك لە چاو، هاتە لامان و زۆر بە گەرمی بە خێرهاتنی کردین. لە هاوڕێ عەزیز محەمەدو برادەرانی تری سەرکردایەتی پرسی، دواتر دەستی کرد بە گفتوگۆی

سیاسی سەبارەت پروسترویکای(گۆرباچۆڤ) ڕای خۆی دەربڕی و، پێی وابوو، کە سیستەمی سۆسیالیستی لە ڕێڕەوی خۆی لا نەدات باشە...من چەند جارێکی تر کاك جەلیلی گادانیم دوور بەدوور دیتبوو، بەڵام هیچ جارێك لە نزیکەوە بە خزمەتی نەگەیشتبووم. من و هاوڕێ سەلیمیش ڕای خۆمان لەسەر گفتوگۆکە، دەربڕی دیار بوو کاك جەلیل حەزی دەکرد ڕای سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراقی سەبارەت بە ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بزانێ. هاوڕێ سەلیم وتی: ئێمە پێمان وایە دووکەرتبوونی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، زیان دەگەیەنێ بە بەرژەوەندی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی لە کوردستانی ئێران. کاك جەلیل بە درێژی باسی کێشەکانی ناوخۆی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کرد. ناوبراو سەرکردەیەکی زۆر خاکی و گونجاوە، لە رووی کۆمەڵایەتییەوە، تێکەڵاوی خەڵکە دیار بوو لە بنکەکەیان لای کادری هەمەجۆرو پێشمەرگەکان زۆر خۆشەویست بوو. من ئەو خەسڵەتەم لە هاوڕێ عەزیز محەمەدیش دا بەرچاو کەوتووە، هاوڕێ عەزیز لە ڕادەبەدەر خاکییە، تەنانەت لە کاتی سەفەری دوورو درێژیش دا، ڕێگای نەدەدا هاوڕێکانی کۆڵەپشتەکەی بۆ هەڵبگرن، لە کاتێکدا تەمەنی(٦٠) ساڵ بوو. قەڵاسیدە لە ساڵانی دوای ئەنفالەکان بوو بە قەڵایەك بۆ دەستە پارتیزانەکانی کوردستانی باشوور (پارتی و یەکێتی و سۆسیالیست). وەك ئێمە، لە لایەن برادەرانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (ڕێبەرایەتی شۆڕگێر)ەوە میوانداری دەکران. ئەو هەڵوێستەی ئەوێ ڕۆژێ جێگای شانازییە و بەرزترین هەڵویستە لەڕووی نەتەوەییەوە. سەرەڕای ئەوەی لەلایەن دەزگای مخابرات و ئستخباراتی ڕژێمەوە زۆر جار کێشەیان بۆ دروستدەکرا، تاتوانیان درێغیان نەکرد...

ئێوارەیەکی زۆر درەنگ وتیان حوسێن شیوعی هاتووە... نەمزانی حوسێن شیوعی کێیە، وەژوور کەوت حوسێن شیوعی هاوڕێ حوسێنی ماخۆ بزنان بوو، هاوڕێ حوسێن یەکێك بوو لە هاوڕێیانی لقی(بیتوێن) لە ساڵی **١٩٧٩** لە سەرەتای خەباتی چەکداری حزبی شیوعی پەیوەندی بە هاوڕێیانی(خڕی ناوزەنگ)ەوە کرد. ڕۆژێکیان کاتێك ناوبراو لە ژێر سێبەری دار گوێزەکانی توژەڵەدا خەوی لێدەکەوێ، هاوڕێ حەمە چکۆڵ، هەر دوو سمێڵی کە زۆر درێژبوون بە بنچکێکەوە دەبەستێتەوە و دەرۆا لە دوورەوە بانگی دەکات، ئەویش لەخەو ڕادەپەرێت کە دەبینێ بە سمێڵان بەستراوەتەوە، زۆر تووڕەدەبێ و کێشەیەکی گەورە دەنێتەوە. حەمە چکۆل ناهەقی نەبوو، سمێڵەکانی هاوڕێ حوسێن بە قەدەر دەستکە کەوەرێك گەورە بوون، لە

خواردنەوەی شلەمەنیدا چۆڕاوکەیان دەکرد. لە چلەکاندا شیوعییەکانی عێراق، لە خۆشەویستی هاوڕێ ستالین سمێڵەکانیان گەورە دەکرد. ئەو لاسایی کردنەوە تا حەفتاکانیش باو بوو. حوسێن ئەگەرچی خۆی رادەستی ڕژێم کردبۆوە بەڵام بیروباوەڕی نەگۆڕابوو، خەڵك ئێستاش هەر بە حوسێن شیوعی بانگی دەکەن...لەو مەفرەزەیەدا ئەو بوو بە رێگانیشان دەرمان و بە رێگای سەرکەبکاندا شۆڕبووینەوە، لە زار دۆڵێ کە بەرەو گوندی ئەستیریلان دەڕوات، رەبیەکی جاشەکانی **ئاکۆی عەباسی ئاغا** جیگیر بوون، بەڵام کێشەیان بۆ کاروانچی و پێشمەرگە دروست نەدەکرد. کاك ئاکۆ ئەگەرچی چەکی ڕژێمی هەڵگرتبوو، بەڵام خراپەی پێشمەرگەی نەدەکرد، بە پێچەوانەوە هاوکاری دەکردن

لە ناو ئۆردووگای حاجیاوا هاوڕێیان بوون بە چەند دەستە من لەگەڵ لیژنەی شەهید هیوا لە لاپەرێکی رۆژئاوای حاجیاوا کۆبوومەوە. لیژنەی شەهید هیوا پێکهاتبوو لە هاوڕێیان بەکر ئالایی، قادرە سوور، خدر مینە، ئەو شەوە ١١/١٠ - ١٩٨٩/٧ کاتژمێر ٩/٣٠ زۆر گەرم بوو. کزە بایەکی گەرم جار جارە لە دەم وچاوی دەداین، ئەو کزەبایە و رووناکی گلۆپەکانی ناو ئۆردووگا، بولێڵێکی خولڤاندبوو، دەتگوت بەدەست بۆ فلیمی سینەمایی دروستکراوە. هەر چوارمان، لەمبەرو ئەمبەری ئاودرێك خزابووین، هەر وەك ئەوەی لە ناو سەنگەردا چاوەڕوانی هێرشی دوژمن بکەین، تەنها چوارسەر دیار بوو، وەك چوار کەرسەك لە سەر لێواری جۆگایەك دانرابن. ئەوە یەکەم جار بوو بەو شێوازە کۆببینەوە. هاوڕێیان پێیان وابوو شەوانە سیخوڕەکان دەگەڕێن بۆ ئەوەی سوسەی پێشمەرگە یا کۆبوونەوەی رێکخستنەکان بکەن، بە گوتەی هاوڕێیان جار جارە ئەمنە عەرەبەکانیش بە شەو دەگەڕێن...ماوەی یەك کاتژمێر پتر بوو دیسان خڕە کەوتە(مەلە) بارودۆخی سیاسی و باری رێکخراوەیی و ...هتد تاوتوێ کرا. هاوڕێیان ورەیان بەرز بوو. ئەوانیش بە گشتی باسی بارودۆخی بیتوێنیان کرد، باسی بێزاری جەماوەر لە بەرامبەر ئەو زوڵم و ستەمەدا، کە رۆژانە لە لایەن دەزگاکانی ڕژێمەوە لە خەڵك دەکرێت. وێڕای ئەنجامدانی ئەرکی حزبی سوکە بارێك لە پێداویستی ماڵەوەمان لەگەڵ خۆماندا هێنا و، لەگەڵ هاوڕێیانی تر بۆ وەرزی زستان سوودێکی زۆرمان لێ وەرگرت. پێداویستییەکان بریتی بوون لە خواردەمەنی وەك چا، رۆن، سابوون...هتد. هەریەك لەو سوکە بارانە بەقەدەر موچەی شەش مانگی(حزب) پارەیان دەکرد، زۆر جاری تریش دەمانتوانی ئەو سوکە بارانە لەگەڵ خۆماندا بۆ پێداویستی خاوخێزانی خۆمان ببەین، بەڵام ئەو جۆرە کارانە لای ئێمە نەنگ بوو ...

## ئاڵوەتان:

ناوی ئاڵوەتان بەردەوام لە گوێم دا دەزرینگێتەوە. زۆر جار لە ناو ڕستەی قسەکانمدا لەخۆوە ناوی (ئاڵوەتان)م دێتە سەرزار. ئاڵوەتان ئەو گوندە خنجیلانە بوو کە بە دەیان خێزانی پێشمەرگەی تێدا دەژیا. ژمارەیەك بارەگای لێبوو، وەك بارەگای پەیوەندییەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، یەکێتی نیشتمانی کوردستان، حزبی سۆسیالیستی کوردستان. ئێمەی هاوڕێیان بە فەرمی پەیوەندیمان بە کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە نەبوو، بەڵکو وەکو **ئەفرادی بارزانی** بە ناوی پارتییەوە پسولەی هاتوچۆمان بۆ دەکرا. لەوێش هەر قاچاخ بووین زۆر جار ئاگاداردەکراینەوە کە(ئیتلاعات) ماڵەکانمان دەپشکنیّ، بەڵام هەرگیز ئەو پشکنینە ئەنجام نەدرا، چونکە دەیانزانی ئێمەی هاوڕێیان هیچ زیانێك بە کۆماری ئیسلامی ناگەیەنین... وەرزەکانی ئاڵوەتان زۆر خۆش بوو. بەهار لە کۆتایی مانگی ئایار دەستی پێدەکرد و لە سەرەتای تەموز کۆتایی دەهات. وەرزی هاوین لە سەرەتای مانگی تەموز بۆ سەرەتای مانگی ئەیلول درێژەی دەکێشا. بەڵام هاوینی ئاڵوەتان وەکو بەهاری گەرمیان وابوو، هیچ کەس شەوانە نەیدەوێرا لەبەر سەرما لە دەرەوە بخەوێت. وەرزی پایز لە سەرەتای مانگی ئەیلول دەستی پێدەکرد ئیتر تا سەرەتای بەهار هەر زستان بوو. ئەوساڵە لە ١٩٨٩/١٠/١٥ بیست سم بەفر باری بوو. وەرزی پایزان وەرزی کۆکردنەوەی ئەرزاق و داری سووتەمەنی بوو سووتەمەنی لە لێرەواری قازان. ماوەی بیست ڕۆژ پتر خەریکی بڕینی داری تەڕ دەبووین. هەر ماڵێك پتر لە دوو عارەبانەی تراکتۆر داری پێویست بۆ سۆبەڕەش دەکردە لیژنە. من و هاوڕێ عەلی گۆران لەوەرزی زستان بەیەکەوە دارمان دەکرد. لە مەفرەزەی مانگی تەموزی ساڵی ١٩٨٩ بارگینێکم لە ڕەوەی لێرەواری گۆڕبەنانیّ هێنا بوۆە کە لەو وەرزەدا باش فریامان کەوت. لە ناو لێرەوارەکە دارمان دەبڕین و دەمان کردن بە قەڵاشکەری و، لە بارگینەکەمان باردەکرد بۆ سەر ڕێگای سەیارە، لەوێشەوە بە تراکتۆر بارمان دەکرد بۆ ماڵەوە. لە ماڵەوەش لە شێوەی قۆرییە گیا یا قۆرییە پوش هەڵمان دەچنی و دەمان کرد بە لیژنە. لە وەرزی زستان دا ڕۆژانە دارمان لەو لیژنە یا قۆرییە دارە دەردەهێنا و، جارێکی تر پارچە پارچەمان دەکرد بۆ ناو(سۆپا). مورووە دارەکان کە قەڵاشتنیان زۆر زەحمەت بوو، هەڵدەگیران بۆ مانگی ڕێبەندان بۆ ئەوەی شەختەیان لێبدا و بە ئاسانی لەت و پەت بکرێن. سەرەڕای ئەوەی یەك بۆ دوو مەتر بەفر دەباری، وەرزی زستانی ئاڵوەتان بەلای منەوە زۆر خۆش بوو. مام حوسێن

کالانی دراوسێمان، هەموو جارێ دەیگوت نوایەك بەفر باریوە، کەچی ئێستاشی لەگەڵ دابێت بۆم روون نەبۆوە(نوایەك) چەند سانتیمەترە؟!. دیارە باوك و باپیرانمان لە رابردوودا لە جیاتی(سم) نوایان بۆ ئەندازەی زۆری بەفر بارین بەکارهێناوە، (نوا) بەو جێگایە دەگوترێت کە باران نایگرێتەوە. بۆ نموونە کەوڕگە شاخێکی کوڕ کە باران نایگرێتەوە پێی دەگوترێت (نوا). زۆر جار راوچی یا پێشمەرگە لەو نوایانە دا خۆیان لە تەڕ بوونی بەفرو باران دەپاراست.

عەلی گۆران، نە گۆران بووە و نەگۆرانی بێژ، نە هیچ سەروکاری لەگەڵ عەشیرەتی(گۆران)دا هەبووە و هەیە، کەچی نازانم ئەو گۆرانە چییە بە ملی دابڕاوە. ناوبراو مرۆڤێکی زۆر دەگمەن هەڵکەوتووە، تایبەتمەندییەکی سەیری هەبوو، خۆی نەدەشووشت لە وەرزی زستاندا بەردەوام جەمەدانەی لە دەم و چاوی وەر دەپێچا. جارێکیان لێم پرسی بۆچی وا دەم وچاوی خۆت پێچاوە؟ وتی لە لەشی مرۆڤدا، ژێر هەر موێك کونێکی وردی تێدایە، واتا بە سەدان هەزار کون لە ناو جەستەی مرۆڤدا هەیە، لە کاتی خۆشووشتندا ئەو کونانە دەکرێنەوە و سەرما پێیاندا دەڕوات، لەبەرئەوە مرۆڤ سەرمای دەبێ. ئەوکاتە زانیم عەلی گۆران بۆ دژی خۆشووشتنە! بە گۆرانم دەگوت مرۆڤ نۆ کونی تێدایە. پێدەکەنی پێدەکەنی... چاوە کوێرەکانی هێندەی تر بچووك دەبوونەوە... دەیگوت چی...چی؟! ئەوە بەڕاستیتە یا گاڵتە دەکەیت مرۆڤ سەدان کونی تێدایە!! منیش ناچاربووم بڵێم راست دەکەیت چونکە گۆران ئەوەی بڕوای پێ دەهێنا هێز نەبوو بیگۆڕێت...پێم دەگوت گۆران تۆ بویتە میکرۆب خۆ میکرۆب کارت تێ ناکات، ئەویش دەیگوت کە لەدایکبووم جارێك شۆراوم کە مردیشم جاریکی تر دەشۆرێم چۆن خۆم دەشۆم خۆم ناشۆم کونم دەبنەوە کون...؟! گۆران دەیگوت لەبەر یەك شت پێم خۆشە بچمە هەندەران، منیش دەمگوت لەبەر چی هەندەرانت پێ خۆشە گۆران دەیگوت کە چوومە هەندەران هەر بۆ خۆم دەزانم چی دەکەم !؟ گۆران لە وەرزی زستاندا قسەی خۆشی هەبوو وشەی سەیر سەیری لێ دەپرسیم بۆ نموونە دەیگوت: پامپیدۆ کێیە؟ وەڵامی ئەویشم دەدایەوە وەڵلا نەتزانی... پێ بکەنە پێ بکەنە... دواتر هەڵدەستا بە دەست و لاقەکانی جوڵانەوەی دەکرد...دەیگوت بۆ نموونە کە ئەوها دەبێ وا جلّقەی دێت ئەوهایش فلّقەی دێت... گۆران کۆڕو مەجلیسی زۆر خۆش بوون... گۆران هاوڕێیەکی دەست و داوێن پاك و دڵسۆزو بە وەفا بوو بۆ ئێمەی هاوڕێیان... لە ١٩٨٩/٣/٧ رێبواری کوڕم لەدایکبوو بە لەدایکبوونی رێبوار سێیەم منداڵمان لە ئاڵوەتان پەیدابوو، هاوێر، رەوەند، رێبوار ماوەی پێنج ساڵ لەو گوندە خنجیلانە ژیاین خەڵکی ئاڵوەتان وەکو خزمە نزیکەکانمان وا بوون، رۆژێك لە رۆژان دڵمان لە هیچ کەسیان نەهێشاوە...

## پرۆسترۆیکاو بیرۆکەی کوردستانی :

لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٨٩ کۆبوونەوەیەکی فراوان لە بارەگای هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی عێراقی سازکرا. ژمارەی ئەو کادرانەی بەشداربوون(٦٠) کادر دەبوو. ئاستی پلەی حزبی کادرەکان، ئەندامانی هەرێمی کوردستان، ئەندام و کارگێڕەکانی لیژنەی محەلییەکان، فەرماندە سەربازییەکانی وەکو ئامر بەتالیون و سەر لق تیایدا بەشدا بوون. ئەگەرچی کۆبوونەوەکە بە ناوی کۆبوونەوەی فراوانبوو، بەڵام لەڕاستیدا لە کۆنفرانس دەچوو. ئەو بابەتانەی گفتوگۆیان لەسەر کرا بریتی بوون لە: پرۆسترۆیکا لە یەکێتی سۆڤیەت، بارودۆخی دوای پرۆسەی تاوانەکانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە، پاشەکشێی هێزی پێشمەرگە لە ژێر گوشاری سیاسەتی کوردقڕانی ڕژێم بەرەو سەرسنوور لە قاسمەڕەش و دۆڵەکۆگە، هەلومەرجی خەبات و گۆڕانکارییەکانی ناو خۆی(حزب). هاوڕێ ئەبو فاروق کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی عێراقی بوو، بەخۆی چاکەتە چڵکنەکەیەوە کە لە لێفەیەکی شڕی کۆن دەچوو، هاوکات لەگەڵ هەڵسوروداسوڕی دەستەکانی، لەبەر چلکنی قۆڵەکانی دەبریسکانەوە، جەمەدانییەکەشی بە نارێکی بەسەرو ناو شانیدا هاتبۆخوارەوە، وەك ئەوەی ناوبژیوانی شەری دەستە و یەخەی دوو کەسی کردبێ. بە جل و بەرگێکی شەپڕێو کە هەر لە کفتەی هەڵوەشاوە دەچوو، سەرپەرشتی کۆبوونەوەکە بوو، بە زمانی عەرەبی تێکەڵ بە کوردی قسەی دەکرد. ناوەرۆکی قسەکانی هەمان بیر و بۆچوونی کۆبوونەوەی ساڵی ١٩٨٨ بوو کە لە هەوارگەی گوێزێ بەسترا. لەوبابەتانەش هەلوەشانەوەی مەکتەبی عەسکەری و هێزی پێشمەرگە بوو، بە واتایەکی تر گۆڕینی دروشمی سەرەکی(حزب)، لە خەباتی چەکدارییەوە بۆ شێوازی خەباتی ژێرزەمینی و، گرینگیدان بە رێکخستنەکانی ناوەوە. لە وتەکانیدا ئاماژەی دا بە بەڕێکردنی هاوڕێیان بەرەو هەندەران. گفتوگۆ دەستی پێکرد گفتوگۆیەکان لە ئاستێکی زۆر بەرزدا بوون، هاوڕێیان، شێخ سەعید، مام سالح، مامۆستا لەشکر سەر سپی ئەندامی محەلی هەولێر کە زۆر بە هێمنی ڕایەکانی دەردەبڕی، مام سالح کە دەروێشی پرسترویکا بوو، شێخ سەعید، کە بە توندی پێی دادەگرت لەسەر پێکهێنانی حزبی شیوعی کوردستانی، تا ئامانجە نەتەوەییەکان بکاتە دروشمی سەرەکی، بەشداری گفتوگۆکان بوون. هاوڕێ ئەبو فاروق وەڵامی هەموو ڕاو سەرنجەکانی لە سەر کاغەزێك دەنووسی، دایکی بەهاریش جارجارە مژێکی قووڵی لە جگەرەکەی دەدا و لە ئەبو فاروق رادەما. هاوڕێ محەمەد حەلاق، مام کانەبی گەورە، محسین

یاسین، مامۆستا ڕەوەند و ئەبو دڵشادیش یەك بە دوای یەكدا ڕاو سەرنجی خۆیان دەربڕی. بەندەش كەوتمەوە مەلە، جارێكی تر پێمداگرت لەسەر هەڵوێستی خۆم دژی چوونە هەندەران، هەروەها درێژەدان بە خەباتی چەكداری وپشتیوانی پێكهێنانی حزبی شیوعی كوردستانی لە چوارچێوەی حزبی شیوعی عێراقیدا. جارێكی تر دووپاتم كردەوە ئەگەر تاییێك و هاوڕێ عەلی سیدەو حەساری مامەڕەشم هەبێ مەیدانەكە چۆڵ ناكەم. تا دەهات گفتوگۆكان گەرمتر دەبوون، دواتر هاوڕێ ئەبو فاروق بەو شێوازەی كە پێناسراوە، وەڵامی هەموو هاوڕێیانی دایەوە و، لە ناو وەڵامەكانیدا كاكڵەی مەبەستەكەی دركاند و وتی: هاوڕێیان، (حزب) تەنها(٣٠) كادری بەسە لە نۆكان بمێننەوە، هاوڕێیانی تر یا دەنێرینەوە خوارەوە یا ڕەوانەی هەندەرانیان دەكەین. بڕیاری حزب بوو كە قەرە بالغی لە دۆڵەكۆگەو نۆكان نەمێنێ، چونكە هەمیشە چاوەڕوانی هێرشی سوپای عێراقی دەكرا. هاوڕێیانی تریش واتە كادرەكانی خوارەوەی سەركردایەتی حزب، بە جۆرێكی تر بیریان دەكردەوە دەترسان سەركردایەتی(حزب) بە تەواوی پشت لە دروشم و شێوازی خەباتی چەكداری بكات. ئەوكاتە رۆژگارێكی سەخت و دژوار بوو، جەنگی هەشتساڵەی عێراق و ئێران كۆتایی هاتبوو، هەی لەوەی خۆی دەربازبكا بەرەو هەندەران. هەر لێبوردنێكی گشتی دەدرا، بە سەدان پێشمەرگە خۆی رادەستی ڕژێم دەكردەوە. جۆرێك لە بێ ئومیدی باڵی بەسەر تێكۆشەرانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی گەلی كوردستان دا كێشا بوو. بەڵام ئەو بێ ئومیدییە كەمتر پێشمەرگە و كادرە ناوەندەكانی لایەنە سیاسییەكانی كوردستانی دەگرتەوە. لە بەرامبەر ئەو بێ ئومێدییەدا تێكۆشەری ئەوتۆ هەبوو ئیرادەی لە چیای قەندیل بەهێزتر بوو، بەڵام ئەو تێكۆشەرانە ڕەنگە بە پەنجەی دەست بژمێردرابان، هەر ئەوان لەو رۆژگارە سەختەدا ورەو ئیرادەیان بە تەواوی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی گەلەكەیان دەبەخشی، بەتایبەتی دەستە پارتیزانەكانی دەشتی گەرمیان و دەشتی هەولێر ئەگەرچی دەستی خیانەت و خۆفرۆشان بەشێك لەو تێكۆشەرانەی لە ناو دەبرد، بەڵام ئەو دەستە پارتیزانە تێكۆشەرانە نموونەی مرۆڤی گەورە و تێكۆشەری گەلەكەیان بوون و هەن.

## شەڕی سادر و چەكوچ:

ئێوارەیەكی زۆر درەنگ، هاوڕێ عەلی گۆران وەژوور كەوت. سەیرم كرد چاوە بچووكەكانی ئەوەندەی تر بچووك ببونەوە. وتم كوێرە پیاو چییە وا بێ زەوقی؟ وتی ئەمرۆ

هاوڕێیان هەواڵیان پێگەیشتووە کە هێزێك لە سوپا و جاشی عێراق، لە ڕێگای جۆگای **کۆلەسەوە** بەرەو سەری چەکوچ و سادر هەڵکشاون و، هاوڕێیان و برادەرانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لێیان هاتوونە دەست و، ڕێگایان نەداوە بگەنە سەر تیشە شاخی **کانی کەنێرێ**. کە ئەو هەواڵەم لە عەلی گۆران بیست منیش خەم دایگرتم، چونکە لە هەموو کوردستانی باشوور بەتایبەتی بەشی سۆران، هەر دۆڵەکۆگە مابوو پێشمەرگە تیایدا سەربەست بێ، بە ئازادی و دوور لە چاوی ئیتلاعات هەڵسوکەوت بکات. ئەو شەوە هەر بەو دالغەوە نووستم، بەیانی زوو خۆم پێچایەوە خواحافیزیم لە دایکی هاوێر کرد، وتم ڕەنگە بەم زووانە نەگەڕێمەوە، وتی خۆ هاوڕێیان بە دوایاندا نەناردویت! وتم بە دواداناردنی بۆچییە ئەوە شەڕە چۆن ئۆقرە دەگرم هاوڕێیان لە شەڕدابن منیش لە ماڵەوە بم. دیار بوو دایکی هاوێر دەترسا لەو شەڕەدا بکوژرێم و ئەویش بە خۆی و منداڵەکانی سەرگەردانبێ.

لە ئاڵوەتانەوە دەنگی تۆپبارانی تۆپخانەکانی سوپای عێراقی دەهات، کە یەك بە دوای یەك دا زرمەیان دەهات. گەیشتمە بارەگای(حزب) لە گوێزێ خوارێ هاوڕێ (ئەلوەند) ژن برای هاوڕێ حەمە ڕەشید قەرەداغی خەریکی بارکردنی پێداویستی بوو لە فیشەك و ئەرزاق، لە ناکاو دوو گوللە تۆپ لەو بەری بارەگای حزب تەقینەوە، ساچمەی گوللە تۆپەکان بە سەر سەرماندا فڕکەیان هات، ترسام وامزانی ساچمە بەر هاوڕێ ئەلوەند کەوتووە. ئەلوەند گەنجێکی قۆز و ڕێکوپێك بوو، لاوێکی سوورو سپی موو زەرد لە سەرخۆ و بە ئەدەب زۆر جار، لە نزیکتەوە دەدوا لێی حاڵێ نەدەبووین. هاوڕێ حەمە ڕەشید وتی هاوڕێ حەزدەکەم بەیەکەوە سەرێك لە برادەرانی پارتی بدەین. بەبێ ئەوەی بڵێم چی بکرێت، بەیەکەوە ڕۆیشتین بەرەو هەوارگەی گوێزێ سەرێ کە بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستانی لێ بوو. هاوڕێ حەمە ڕەشید سەبارەت بە ئامادەکاری شەڕەکە قسەی لەگەڵ کاك حەمید ئەفەندی کرد، ناوبراو ئامادەیی تەواوی دەربڕی کە پارێزگاری لە ناوچەکە بکەین. دواتر گەڕاینەوە بۆ بارەگا و، من چووم بۆ لای هاوڕێیانی لقی پشدەر کەچی زۆربەی هاوڕێیان وەسەر چیا کەوتبوون، لە **گۆمەوشکە** و سەرچیای چەکوچ و سادر وێڕای برادەرانی یەکێتی سەنگەریان گرتبوو. منیش ڕاستەوخۆ وەسەرچیا کەوتم لەوێ هاوڕێ سەلیم و هاوڕێ حەمە شریف سەرقاڵی شەڕەکە بوون، هاوڕێ سەلیم وتی حەزدەکەم من و تۆ و هاوڕێ حەمە شریف ئاڵوگۆری یەکتر بکەین، هاوڕێ سەلیم لەو کاتەدا قسەی لەگەڵ مندا دەکرد بە دەست ئاماژەی دەکرد بۆ زنجیرە چیای سادرو

چەکوچ وتی هاوڕێ حەمە سەیر بکە لێرەوە بۆسەر ئەو بەرزاییە برادەرانی یەکێتی تێیدا جێگیربوون ڕەبیەی یەکەم دراوە بە ئێمە هەر کاتێ ڕەبیەیی ئێمە بگیرێت هەموو زنجیرە چیایەکە داگیر دەکرێت، هاوڕێ سەلیم پتر لەسەری رۆیی وتی: هاوڕێیانی کۆیەش لەگەڵ ئێمە ئەرکیان وەرگرتووە، ئینجا بە پێکەنینەوە وتی: بەرپرسەکانی ئەو شەڕە، هەمووی کادری نەوعین وەکو هاوڕێ ملازم شێرزادو شاخەوانە سوور و ملازم چەتۆ، حەمە دەبێ پیاو بین، هەر چەند دڵنیام لە تۆ و هاوڕێ حەمە شریف بەڵام ئەو شەڕە چارەنوس سازە. دواتر لە یەکتر جیا بووینەوە، کارەکان وا ڕێکخرابوون کە هەر سێ رۆژ جارێك من و هاوڕێ سەلیم و هاوڕێ حەمەشریف یەکتر بگۆڕین...

سوپاو جاشەکان گەرەکیان بوو بە خشکەیی بن دار بە بندار بێنە پێشەوە تا رەبیەی یەکەم داگیر بکەن کە رەبیەی ئێمە بوو. هێزێکی گەورەی پارتی دیموکراتی کوردستان، کە لە لیژنەی ناوچەی قەڵادزێ و چەند هێزێکی تر پێکهاتبوو، لە چیایەکی داوێنی سادرو چەکوچ دامەزران لە شوێنێك بە ناوی رێگای **کەشك.** مەفرەزەیەکیان لەو هێزە، ماوەی چەند رۆژێك لەگەڵ هێزێکی یەکێتی و سۆسیالیست و هاوڕێیانی ئێمە، ئەرکیان وەرگرت لە چیای چەکوچ و کانییە کەنێرێ. تۆپخانەکانی سوپای ڕژێم لە مەعسکەری قادراوە، شەروێت، سەید ئەحمەدان، سەری بەردقەڵشی و گۆڕستانی بەستێ، رۆژانە بست بە بستی مەیدانی جەنگەکەیان دەکوتا، وەك زنجیرە چیای سادرو چەکوچ کاتیۆشاو تۆپی دوور هاوێژ و دەبابە. بەڵام زنجیرە چیای سادرو چەکوچ وەکو پشتی گوێدرێژ هەڵکەوتووە تۆپەکان کەمتر بە تیخە چیایەکە دەکەوتن. هەر تۆپ و کاتیۆشا کە دەهاوێژرا یا بەر لێواری لوتکەکان دەکەوتن یا سەری دەکرد. یەکەم شەو بوو هاوڕێ حەمە شەریفم دەگۆڕی کاتژمێر ١٠/٣٠ بوو، ڕەتلێك کاتیۆشا لە دەوروبەری رەبیەکەی داین، ئێمە لە ناو سەنگەرەکاندا هەڵدەبەزینەوە. ملازم شێرزاد جەنگاوەرێکی بە ئەزموون بوو، هاتە تەنیشتمەوە بە چرپە پێی وتم: پێم وایە خەریکە هێرش دەکرێتە سەرمان، گوتم چۆن دەزانی وتی شەوی رابردوو وا بوو. منیش بڕوام کرد، چونکە دڵنیابووم هاوڕێ ملازم شێرزاد لە خۆیەوە قسە ناکات. ئێمە لە ناو سەنگەرەکەدا خەریکی گفتوگۆ بووین کە حەرەس بەردوچکەیەکی بۆ هەڵداین، شێرزاد وتی: نەمگوت! تۆ لێرە وریابە من دەچم بۆلای هاوڕێیانی ئەو سەر، وتم خەمت نەبێ. ئەم لام هاوڕێ بێستون بوو کە گەنجێکی سەرکێش بەڵام ئازا، ڕەشاشێکی بیکەیسی پێ بوو، ئەولام هاوڕێیەکی هەولێری

بوو بە ناوی سەرکار ئارپیجی پیێ بوو. هەموومان هەستمان لە خۆمان بڕی و چاوەڕوان بووین. خشپە خشپ زۆر نزیکبوو، بیستون ویستی هەڵسێ بە پێوە لێیان بدات، وردکە بەردێکم بە پشتی دادا بۆ ئەوەی ئارام بگرێت... لە ناکاو گوێم لە یەکەم دەستڕێژ بوو، کە ملازم شێرزاد کردی، ئینجا ئێمەش هەڵساینە سەر پێ، تەقەی بیکەیسی و گرمەی R.B.G وکلاشینکۆف هاشەی دەهات، ڕاکە ڕاك و بانگە بانگی جاش و هات و هاورای سەربازەکان تێکەڵی تەقەی ئێمە بوو. یەکێك لە بیکەیسی یەکانی دوژمن، کە بۆ هێڵی پشتگیری دانرابوو سەرکوێری کردبووین، گوتم سەرکار دەتوانی R.B.G یەك لەو بیکەیس یە بدەیت وتی با تەقە بکاتەوە بڵێسەکەی دەرکەوێت، لە قسەکە نەبووینەوە کە یەك ریز فیشەکی ئاگرداری ڕووبەڕووی ئێمە تەقاند. هاوڕێ سەرکار دروست گوللە ئارپیجییەکی لەو شوێنەدا، کە بیکەیسییەکە تەقەی لێوە دەکرد. بیکەیسییەکە جارێکی تر تەقەی نەکردەوە. لەگەڵ تەواوبوونی هێرشەکە لە هەر چوار پێگەوە تۆپ و کاتیۆشا بارانیان کردین. بەڵام سەنگەرەکانی ئێمە زۆر بە مەحکەمی هەڵکەنرابوون گوللە تۆپ و کاتیۆشا نەیدەگرتەوە... بەیانی کە ڕۆژ بۆوە سەیرمان کرد، تۆپێك هاویژراوە داوی وەك تەناف بە ناو دارو قەنگلاشکەکانی داوێنی رەبییەکەدا رایەڵ کردبوو کە لە داوی تەپکە دەچوو، بۆ ئەوەی دوای پاشەکشێی هێزە هێرش بەرەکەدا، پێشمەرگە بکەوێتە ناو داوی ئەو تەپکانەوە، کە وەکو دڕو لە لاقی مرۆڤ گیردەبوو... لەو شەڕەدا شەوانە خەو نەبوو، بە ڕۆژیش بوردومانی تۆپ و کاتیوشا بوو، کەچی سەرەڕای ئەو ماندووبوون و ناخۆشییەی ڕۆژانە، کە سەیری ورەی پێشمەرگەکانی بەرەی کوردستانیمان دەکرد، ئایندەیەکی گەش و پڕ ئومێدم لە ئیرادەی تێکۆشەرانی ئەو شەڕەدا دەخوێندەوە. ئەو شەڕە هەم بۆ ڕژێم هەم بۆ لایەنەکانی بەرەی کوردستانی ئەزموونێکی نوێ بوو. ڕژێم پێی وابوو پێشمەرگە بەرەو کۆتایی دەڕوات، بەتایبەتی لە دوای پرۆسەی ئەنفال و راگواستن و کیمیابارانی هەڵەبجە و ناوچەکانی تری کوردستان، جگە لە دۆڵەکۆگە و خوارکورك هیچ شوێنێکی تر نەمابوو ڕژێم داگیری نەکردبێتەوە. بۆ بەرەی کوردستانیش ئەو شەڕە زۆر گرینگ بوو. لە لایەك تەمومژی نائۆمێدی ڕەواندەوە، کە لە دوای پرۆسەکانی ئەنفال باڵی کێشابوو بەسەر هەموو کوردستانی باشووردا، لە لایەکی تر شەڕی سادر و چەکوچ سەلماندی کە هێشتا هێزی پێشمەرگە هێزێکی کاریگەرەو ورەی بەرنەداوە، ئەوە تەنیا هێندێك ڕابەری سیاسین ورەیان بەرداوە و، دەیانەوێت مەیدانەکە چۆڵ بکەن و بەرەو هەندەران ڕابکەن.

پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی عێراقی وەکو لقی پشدەر، کۆیە، خوارکورك، مەڵبەندی سلێمانی، تەرخانکران بۆ شەڕی سادر و چەکوچ. هاوڕێ عەتا سوور و ژمارەیەك هاوڕێی تر ئەرکیان وەرگرت. لە ڕووی داراییی و بەڕێوەبردنی شەڕەکەوە، حزبی شیوعی پشکی شێری وەبەر کەوتبوو. شەڕی سادر و چەکوچ بەکردەوە، بوو بەشەڕی جەبهەیی لە نێوان پێشمەرگە و سوپاو جاشەکانی ڕژێم. بەرەی کوردستانی سەرپەرشتی شەڕەکەی دەکرد. نوێنەری لایەنەکانی بەرەی کوردستانی، ڕۆژانە سەرقاڵی کۆدەبوونەوە بوون بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخی شەڕی سادر و چەکوچ. بەرپرسەکانی بەرە بریتی بوون لە: حاجی دێلویی پارتی دیموکراتی کوردستان، حەسەن کوێستانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، حزبی شیوعی عێراقی هاوڕێ حەمە رەشید قەرەداغی، حزبی سۆسیالیستی کوردستان شێروان شیروەندی. ئێمەش هەندێك جار دەچووین بۆ هەندێك کۆبوونەوە... ڕۆژێك پشتم بە تاوێرە بەردێکەوە دابوو، سەیری بناری ڕەزگە و پانتایی پشدەرم دەکرد، ڕاگواستنی پشدەر و یادەوەری ڕۆژانی ڕابردووم دەهاتەوە یاد کە ڕۆژگار بە ئارەزووی مرۆڤ وەرناچەرخێ. بیرم لە دڕندایەتی ڕژێم دەکردەوە کە دەرەفەتی بۆ تاکی کۆمەڵگای کوردەواری نەهێشتبۆوە لە سەرخاك و زێدی باو باپیرانی بژی. لە کاتێکدا نیگای چاوەکانم وێڵ بوون بە دوای کەلاوەی گوندەکانی ڕەزگە و مارەدوێ و لێرەواری گردی رەمکاندا، جار جارە تیشکی ڕۆژ لە جامی سەیارەکانی سوپای عێراقی دەدا و دەبریسکانەوە، گۆڕستانی بەستێ و دەشتی تاقێ، دیمەنێکی سەنجراکێشیان هەبوو، چۆمی مارەدوەش پێچاو پێچی دەکرد، دەبریسکایەوە و بەرەو دەراوی دوو چۆمان دەخشا و تێکەڵ بە چۆمی بەلکی دەبوو.

ڕقێکی ئەستوور دایدەگرتم دەمگوت بۆچی دەبێ پشدەر ئەوهای بەسەر بێ؟ تاوانی ئەو خەڵکە چی بوو بەم چارەنووسە گەیشت، ئاخر زوڵم هەتاکەی؟ ڕەمبەی ڕەتڵێك کاتیۆشا لە داڵغەکەی دابڕیم، هاوڕێ بیستون لە سەنگەرەکەی خۆی نارازی بوو دەیگوت ئەمشەو ئەگەر تێدا بچم سەنگەرێکی تر لێ دەدەم لەڕووگەی ئەم دیوی جاش و جەیشیش بوو بۆ ئەوەی لە کاتی هێرش کردندا باشتر چیغمالیان بکات بە شریتی بیکەیسی، بیستون لە شەڕکردن وەکو چیای بیستون بوو شەوێك هێرش کرایە سەر هێڵی پێشەوە لە هێرشی ئاخریدا فیشەکێك لە ناو سەبەتانەی بیکەیسییەکەی داگیربوو، لولەی بیکەیسی یەکەی گرتوو بە ئەرزی کێشا وتی ئێستا کاتی ڕاوەستانە... بیستون لە نۆرە وەجبەکانیشدا رازی نەبوو ئاڵوگۆڕی پێ بکرێت هەر

دەیگوت ئێوە لە خواردن لێم بێ خەم مەبن ئیتر هەقتان نەبێ. سەرکار لە بەکارهێنانی R.B.G دا پسپۆر بوو، وەك چەکی ئاسایی دەیتوانی نیشانە بپێکێ. ناوبراو گەنجێکی بالاّ ناوەندی بەخۆوە بوو، پەنجەکانی ئەوەندە ئەستوورو پتەو بوون وەکو بۆ ئاربیجی دروستکرابن وابوو. هاورێ ملازم شێرزاد کە بوو بە شەهیدی رزگاری کەرکووك لە ساڵی ۱۹۹۱ خۆی و(٥) لە هاورێکانی هەتا دەبابەی دوژمن نەیشێلان سەنگەریان چۆڵ نەکرد. شێرزاد گەنجێکی دەستە پیاوی قەد باریك بوو لە دەورەیەکی یەمەنی خوارو گەڕابۆوە، بە هەق شایستەی ملازمی بوو، برایەکی لە خۆی بچووکتر لە ساڵی ۱۹۸۸ لە شەڕێکدا گوللەیەك بەر سەری دەکەوێ، ماوەی ساڵێك بوو قسەی بۆ نەدەکرا، ئەقلی بەرەو تەمەنی منداڵی گەڕابۆوە دیار بوو گوللەکە کاری لە مێشکی کردبوو... بنەماڵەی شێرزاد بنەماڵەیەکی تێکۆشەرو زەحمەت کێش بوون. شاخەوانە سووریش یەك پارچە جەرگ و ئیرادە بوو، هاورێیان باسی ئازایەتی شاخەوانیان دەکرد. شاخەوان لە سنووری چالاکی مەڵبەندی هەولێری حزبی شیوعی عێراقی بە مەفرەزە دەردەچێ. ناوبراو لەسەر بەرزاییەك حەرەس دەبێ و هێلی کۆپتەرێکی پیلاتوز کە بە ژەنگەسورەی پێشمەرگە ناوبانگی دەرکردبوو، لە بەردەم شاخەوان نەوی دەبێ و لولەی دۆشکە دەکاتە سینگی شاخەوان، پیلیژە بەردەداتەوەو دەڵێ سوار بە، شاخەوانیش جولاّنەوەیەك دەکات بۆ ئەوەی سەرنشینەکانی هێلی کۆپتەرەکە بڕوا بێنن کە خۆی دەدات بە دەستەوەو سواری هێلی کۆپتەرەکە دەبێ، لەگەڵ نزیکتر بوونەوەی هێلی کۆپتەرەکە یەك ریزە فیشەك بە کلاشینکۆفی ژێر پالتۆیەکەی لە فرۆکەوانەکەو ڕامی دۆشکەکە دەدات، یەکسەر هێلی کۆپتەرەکە دووکەڵی لێ دەردەچێ و بەرز دەبێتەوە لە نزیك ترین مەعسکەر دەنیشێتەوە. بە پێی هەواڵەکان ڕامیەکە دەکوژرێت و فرۆکەوانەکەش بریندار دەبێت، هێلی کۆپتەرەکەش پەکی دەکەوێت. شەڕی سادرو چەکوچ بوو بە شەڕی جەبهەیی، لە شەوی ۱۷-۱۸/ ۱۹۸۹/۹ بۆ کۆتایی مانگی کانوونی دووەم درێژەی کێشا. پێشمەرگە ماوەیەك هەندێك لە هێزەکانی دادەبەزێنێ بۆ خوارەوە تا پشوویەك بدەن، کەچی دوژمن دەرفەت وەدەست دێنێ سەرکەوێ بۆ سەر شاخی چەکوچ و سادر، هەواڵەکە بە هاورێیانی دۆڵەکۆگە دەگات و، ئەوانیش یەکسەر سەر چیا دەکەون و رووبەڕووی شەڕێکی دەستە ویەخە دەبنەوە، جاش و سوپای ڕژێم ڕادەکەن و تەرمی جاشێکیش لە دوای خۆیاندا بە جێدەهێڵن. سەر چیای سادرو چەکوچ پتر لە(٤٥) جار لە لایەن سوپاو جاشەکان هێرشی کرایە سەر، بەلاّم نەیانتوانی بیگرن. چەند جارێکیش

هەولّیاندا چەکی کیمیایی بەکاربهێنن بەلاّم لەبەر ئەوەی هەمیشە(با) ڕووەو خۆیان واتا دوژمن بوو نەیانتوانی ئەو تاوانە ئەنجام بدەن. دۆڵەکۆگە وەکو قەلاّیەك مایەوە... چۆکی بە ڕژێم دادا، ڕژێم ڕووخا دۆڵەکۆگە نە ڕووخا...

## لێبوردنی (خەنە):

وەرزی زستانی ساڵی ١٩٩٠ وەرزێکی ئارام بوو، بەلاّم لەسەر ئاستی سیاسی و رەوشی بزووتنەوەی چەکداری رۆژبە رۆژ بەرەو نائۆمێدی دەچوو. ڕژێم لێبوردنێکی گشتی ڕاگەیاند کە لە ناو خەڵکی کوردستان و پێشمەرگە بە( لێبوردنی خەنە) ناو دەبرا، هەرکەسێك خۆی رادەستی ڕژێم دەکردەوە پەنجا کیلو پتر خەنەی لەگەڵ خۆیدا دەبردەوە، ئەو کاتە خەنەی ئێران نرخێکی باشی هەبوو، سەدان کەس لە بەرپرس و فەرماندەی دیار خۆیان و خێزانەکانیان ڕادەستی ڕژێم کردەوە، ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەش کە خۆیان رادەستی ڕژێم کردەوە کە لە شۆڕشی ئەیلول دا ئاوارەی ئێران بوو بوون... ئێستاش خۆشم لە گۆرانییەکی مەزهەری خالقی نایەت کە ئەو کاتە کلیپ کرابوو، کە دەڵێ: **دوژمن پێی خۆش بێ یا پێی ناخۆش بێ دەگەڕێمەوە بۆ ولاّتەکەم**. ئەو سرووده رۆژانە چەندان جار لە رادیۆی کوردی بەغداد پەخش دەکرایەوە، لێبوردنی خەنەکە چەند جارێك درێژ کرایەوە. رێژەی پێشمەرگەو کادری دیاری رۆژانی پێشمەرگایەتی لە ناو هەموو لایەنەکان بەرەو کەم بوون دەچوو. لە ناو حزبی شیوعی عێراقیدا بە مەفرەزە کادر و پێشمەرگە، لە سنووری ئێرانەوە بەرەو هەندران بەرێ دەکران. بارەگایەکی هاوڕێیانی عەرەب لە دۆڵەکەگە بوو، پارێزەری مەکتەبی سیاسی(خوارکورك) بوو. لە دوای داگیرکردنی خوارکورك کاتێك ئەو هاوڕێیانە ئاگاداردەکرێنەوە کە بەرەو هەندەران بەرێ دەکرێن . بێ ئەوەی لقی پشدەر و مەڵبەندی سلێمانی ئاگاداربکەنەوە، کە تەنیا دوو خولەك لە بارەگای ئەوان دووربوون، بارەگایەکە بەجێدەهێڵێن. جلی پێشمەرگایەتی لەوێ فڕێدەدەن و خواردەمەنی و کەل و پەلی بارەگاکەیان بە پەرش و بلاّوی بەجێدەهێڵن. مانگایەکی مەڕدارەکانی هەوارگەی گوێزێ ئەوەندە فاسۆلیای ناو بارەگای ئەو هاوڕێ عەرەبانەی خواردبوو، شەقی بردوو مرد. کە هاوڕێیانی پشدەر لە لایەن کابرای مانگا مردوو ئاگاداردەکرێنەوە، هاوڕێیانی پشدەر و مام ئەسکەندەری دەربەندیخان دەگەنە ئەوێ، چ ببینن؟! دیمەنێك لە بارودۆخی راستەقینەی بێ ئومیدی. مام ئەسکەندەر پیاوێکی دنیا دیتەو

خۆشەویست بوو، هەم بۆ دۆزینەوەی شوێنەواری دزو پیاو خراپان، هەم لە کەشناسیدا شارەزا بوو. بۆ نموونە لە دۆڵەکۆگە ئەگەر وتبای ئەمڕۆ بای دێت یا بەفر دەباری، وا دەردەچوو! بەبێ ئەوەی سەیری هۆکارەکانی راگەیاندن بکات دەیزانی کەش و هەوا چۆنە، لە دەست نیشان کردنی تەمەنی مرۆڤیش دا زۆر ورد بوو، سەیری دەم وچاوی هەر کەسێکی دەکرد دەیزانی تەمەنی چەندە؟ لە ناسینی سروشت و تەبیعەتی مرۆڤ پسپۆرێکی میللی بێ هاوتا بوو. لە خێزانەکەی خۆیدا برایەکی قارەمانی بە ناوی هاوڕێ جەوهەر، و کوڕێکی خۆی لە خەباتی چەکداریدا شەهیدکراون. بە داخەوە مام ئەسکەندەر ئیستا زۆر پیرو کەنەفت بووە هیوای تەمەن درێژی بۆ دەخوازم. مام ئەسکەندەر کەل و پەلەکانی هاوڕێیانی عەرەب کۆدەکاتەوە و دەیانهێنێتەوە بۆ بارەگای مەڵبەندی سلێمانی و کەرکووك. زۆر جار مام ئەسکەندەر بە زاراوەی خۆی بە گاڵتە دەیگوت ئەو تڕانە!! بۆ وایان کردووە، وەخوا قەسەم تۆسقالێك بڕوایان بە خەباتی چەکداری نەووە، ئەگینا بەرگی پێشمەرگایەتیان ئەوها بە سووکی فڕێ نەدەدا.

بۆ رێکخستنەوەی هاوڕێیانی ئاوارە، کە ژمارەیەکی زۆریان لەناو ئاوارەکانی گوندی موسالانی میراوێ و ترکەش و کەوپەرو ئۆردووگای دێلزێدابوون، بە راوێژ لەگەڵ هاوڕێ مەحمود حاجی فەقێ خدر، هەموویانمان لە رێکخراوێکی حزبدا کۆکردەوە. مانگی دوو جار سەردانی ئەو هاوڕێیانەم دەکرد، لەگەڵیان کۆدەبوومەوە و دەنگوباس و سیاسەتی حزبمان بۆ باس دەکردن. ئامانجمان لەو رێکخستنە ئەوە بوو کە ئەو هاوڕێیانە هەست بە بێ ئومێدی و نامۆیی نەکەن بەتایبەتی لەو سەردەمەدا کە خەریکبوو لێبوردنی(خەنە) زۆربەی خەڵکانی ئاوارەی دڵ سارد و بێ ئۆمێد دەکرد...

## کۆبوونەوەی فراوان:

ئاگادارکرامەوە لە بارەگای هەرێمی کوردستانی لە(نۆکان)، کۆبوونەوەیەکی فراوان دەکرێت. ئەوە دووەم کۆبوونەوە بوو لە ماوەی کەمتر لە ساڵێك، تەواوکەری کۆبوونەوەی یەکەمی ساڵی رابردوو بوو. بەڵام ئەو کۆبوونەوەیە لە لایەن هاوڕێ کەریم ئەحمەد سەرپەرشتی دەکرا، کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی عێراق بوو، یەکێك بوو لەو هاوڕێ کوردانەی بە ئاشکرا دیفاعی لە پێکهێنانی حزبێکی شیوعی کوردستانی دەکرد. لەو کۆبوونەوە فراوانەدا، کە لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٠ پێکهات، زۆر بە

راشكاوی سیاسەتی حزبی شیوعی عێراقی لەسەر ئاستی ناوخۆی و دەرەوە روونكردەوە. ناوبراو چاویلكەكانی داگرت و بە هێمنی و لە سەرخۆ وتی: هاوڕێیان بە راشكاوی پێتان رادەگەیەنم كە گرانایی(حزب) دەخەینە ناوەوە، ئەو هاوڕێیانەی دەتوانن لە ناوەوە بمێننەوە دەیان نێرینەوە، ئەوانەی نەتوانن بچنەوە ناوەوە، ئەوا بەرێی دەكەین بۆ هەندەران. لە درێژەی وتەكانیدا وتی: ئەو سەر سنوورە وەكو ئێستای خۆی نامێنێ، ئەگەری ئەوە هەیە عێراق و ئێران رێكەوتننامەیەك لەسەر كەوڵی ئێمە واژوو بكەن. هەربۆیە ژمارەیەكی زۆر كەم لە هاوڕێیان لە ناو بارەگاكاندا دەهێڵینەوە. ئەو كاتەی كە هاوڕێ كەریم قسەی دەكرد هاوڕێیان كە پتر لە(٧٠) كادر دەبووین متەقیان نەكرد. هاوڕێ كەریم خاڵێكی تری وروژاند، ئەویش دەسەڵاتی پتر بوو بۆ هەرێمی كوردستان، بۆ ئەو مەبەستەش هەموو بارەگاكانی پێشمەرگە لە مەكتەبی عەسكەرییەوە رادەستی هەرێمی كوردستانی حزبی شیوعی عێراقی دەكرێن. دوای ئەوە هاتە سەر خاڵێكی تر ئەویش برویسترویكا بوو، هەر سێ بابەتەكە لە لایەن هاوڕێیانەوە گفتوگۆیان لەسەر كرا. وەلێ ئەم جارەیان وەكو جاری پێشوو هەڵچوون و تووڕەبوونی تێدا نەبوو. زۆربەی هاوڕێیان هەستیان بە مەترسی بارودۆخەكە دەكرد، بەندەش بە هەمان نەفەسی ساڵی رابردوو سوورتر بووم لەسەر هەڵوێستی خۆم زۆر دژی چوونە هەندەران بووم، زۆر دژی چۆڵكردنی مەیدانی خەباتی چەكداری و پێشمەرگایەتی بووم. بە پێچەوانەوە، زۆربەی هاوڕێیان داوایان لە حزب دەكرد كە بەرەو هەندەران بەرێ بكرێن، لەوانە: هاوڕێ مەحمود حاجی فەقێ خدر و هاوڕێ ئەحمەد كەریم باوكی(تارا) هاوڕێ عارف و هاوڕێ حەمە بچكۆلی برای و ژمارەیەكی تر لە هاوڕێیان. لەسەر خواستی ئەو هاوڕێیانە لە مانگی /٩ / ١٩٩٠ خۆیان و خێزانەكانیان بەرەو هەندەران ڕۆیشتن. ناهەقیان نەبوو، چونكە هیچ ئومێدێك نەمابوو، (**لێبووردنی خەنە**) بە لێشاو خەڵكی بەرەو شارەكانی عێراق راپێچ دەكرد. ئەوەی بیری لە هەندەران نەدەكردەوە ماڵی ئێمە و هاوڕێ سەلیم و هاوڕێ حەمە ئەمین عەبدوڵڵا زوركانی بوو كە لە ئالۆەتان نیشتەجێ بووین. ئێستاش هاوڕێ عەلی گۆران گلەیی لە من دەكات دەڵێ تۆ لێنەگەڕای(حزب) بم نێرێت بۆ هەندەران. لەسەر هەندەرانیش كۆمەڵێك قسەی قۆڕی هەبوو، دەیگوت بۆ رێگا نادرێت بچم بۆ هەندەران، ئەگەر خەڵك تا بەلەكان خۆی رووت بكاتەوە من هەتا كەمەرم خۆم رووت دەكەمەوە، ئاخر بۆچی بە كەڵكی هەندەران نایەم؟ وێدەچوو هاوڕێ مام قادر بە هاوڕێ عەلی گۆرانی وتبێ، تۆ و خاریج كوجا مەرحەبا ؟! گۆران

هەزار جار ئەو قسەیەی دەگوتەوە، ئاخر فلان و فیسار لە من مسەقەف ترن؟ بۆچی ئەوان دەنێرن بۆ هەندەران من نانێرن، ئێستاش یەکێك لە ئاواتەکانی گۆران چونە هەندەرانە، کەچی ئەو ئاواتەی هەر نەهاتە دی. لە ڕاستیدا من دژی هیچ هاوڕێیەك نەبووم بچێ بۆ هەندەران بەلام خۆم حەزم نەدەکرد بڕۆم ...

ڕۆژێك لەگەڵ گۆران و کاك ئەحمەد مەحمود، پێشمەرگەی لیژنەی ناوچەی قەلادزێی پارتی و هەندێك پێشمەرگەی تر، لە کونە مشکەی دەشتی وەزنێ خەریکی ڕاوە ماسی بووین، لە وێندەرێ لە بن کەورگ و گۆمەکاندا ماسی ڕاو دەکرا. یەکێك لە پێشمەرگەکان نارنجۆکێکی دەستی خستە ناو گۆمێکەوە، ژمارەیەکی زۆر ماسی کوشت، سەری گۆماوەکە سپی هەڵگەڕا. لەو کاتەدا بیرم لە جوانی دەشتی وەزنێ و کوشتنی ماسی دەکردەوە ئەویش بە نارنجۆك، دەشتی وەزنێ دەشتی بەهەشت چۆن دەبێ بە نارنجۆکی دەستی ماسی تێدا ڕاو بکرێت. بەلام چارەنووسی دەشتی وەزنێ و سروشتە جوانەکانی تر بەتایبەتی سنوورە دەستکردەکان هەر وادەبێ، پێشمەرگەش ناچاربوو. بەندەو گۆران یەك(شوە) ماسی دەشتی بەهەشتمان بردەوە، بۆ ژەمی ئێوارە هەندێکمان برژاند هەندێکی ترمان سوور کردەوە، تامی گۆشتی ماسی دەشتی وەزنێ، تامێکی تایبەتی بوو، دیارە ئەوەش بۆ ئاو هەوا سازگارەکەی ئەو دەڤەرە دەگەڕێتەوە...

### قەندیل و ماهی ئەسترۆکان:

هاوڕێ عەلی گۆران لە پشتێنێ بەرەو ژوور، سەری وە ژوورێ نا، وتی ئەو نامەیان داومێ بیدەم بە تۆ، خەندەیەکی هاتێ و ڕۆیشت. سەیرم کرد نامەکە بە قەدەر دەنکە نۆکێك دەبێ، لە کاغەزێکی تەنکی سەوز وەرپێچراوە، کە کردمەوە لە سێ دێر زیاتر نەبوو، نووسرابوو هاوڕێ محەمەد، هاوڕێ ئەبو فاروق کارێکی تایبەتی بە تۆیە بەیانی وەرە بۆ بارەگای(مەکتەبی لیژنەی هەرێمی کوردستان)... مام قادر پیاوێکی قەد بلند و بە شانوباهۆ بوو ئەندامی مەکتەبی هەرێمی کوردستان بوو، پیاوێکی زۆر خاکی و دابڕاو بوو لە ژیانی ئاسایی، وێنەدەچوو وەك خۆی دەیگوت ژیانێکی زۆری لەگەڵ مەلاژنی خێزانیدا بەسەربردبێ، هەموو ژیانی گەنجایەتی خۆی و تەمەنی پیری هەر لە ناو بارەگاکانی حزب و، لە ژێر بەتانی بارەگای حزبدا بەسەربرد... هاوڕێ مام قادر مرۆڤێکی هێمن و لە سەرخۆبوو ئەو کاتەی قسەت بۆ

دەکرد یا پرسیارت لێدەکرد، بەدەگمەن هەڵدەکەوت هەر ئەو کاتە وەڵام بداتەوە، تا زۆر بیری لێ نەکردبایەوە وەدەنگ نەدەهات... لە کاتی راپەڕینی ئازاری ساڵی ١٩٩١ نامەیەکم لە رانیەوە بۆ مام قادر نارد تیایدا نووسیبووم کە رانیە ڕزگارکراوەو ئێمەش دەبابەیەك و ژمارەیەکی زۆر سەیارەو چەك و تەقەمەنیمان دەست کەوتووە، هاوڕێیەك بۆی گێڕامەوە وتی مام قادر بڕوای نەدەکرد رانیە رزگارکراوە، بە گوتەی ئەو هاوڕێیە مام قادر وتبووی ئەوە پڕوپاگەندەی یەکێتییە دەڵێ رانیە ڕزگارکراوە، نامەی مام قادرم لەگەڵ خۆم برد و ڕۆیشتم بۆ بارەگای(حزب) لە نۆکان. هاوڕێ ئەبو فاروق بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم، ئینجا شانێکی هەڵتەکاند و بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: دەزانی بۆچی بە دوای تۆمان دا ناردووە؟ وتم هاوڕێ تۆ هەرگیز بۆ کاری خێر بە دوای مندا نانێریت، دیارە کارێکی حزب هەیە ئەنجامی بدەم؟! هاوڕێ ئەبو فاروق پتر پێکەنی وتی راستە، بەڵام ئەرکی (حزب) هەر کاری خێرە! وتی هاوڕێ(حەمە) پێویستە هاوڕێ د. ئەبو یەسار و هەندێك پارە بە دۆلار لەگەڵ خۆتا ببەیت بۆ گوندی سلێ، لەوێ د.ئەبو یەسار و بڕە پارەکە رادەستی برادەرانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دەکەی. بەڵام وتی: ئەو هاوڕێیانەی یاوەری ئەو سەفەرەت دەبن، دەبێ خەڵکانی زۆر ئەمین و زمان قایم بن، ئەو کارەش نەهێنی دەبێ لە نێوان خۆم و خۆتدا، جارێکی تر شانێکی هەڵتەکاندو وتی خۆشت دەزانی چۆن دەڕۆیی. هاوڕێ ئەبو فاروق پیاوێکی زۆر خاکی و کەم دوێ بوو، وەلێ ئەگەر خۆشحاڵبا نوکتەی زۆر خۆش و سەمەرەی دەگێڕایەوە و، لە دڵەوە پێدەکەنی، هەموو جەستەی لەگەڵ پێکەنینەکەی هەڵدەبەزییەوە...

پیاوی ئەو سەفەرانە هەر هاوڕێ هەمزە سوور بوو، هەم نهێنییەکانی دەپاراست و هەم شارەزا بوو، کە لە بارەگای هەرێم هاتمە خوارێ چووم بۆ ماڵی مام خدر باوکی هاوڕێ هەمزە، هاوڕێ هەمزە لە ماڵی خۆیان بوو لە نزیك پردی نۆکانێ، کە گەیشتمە ئەوێ هاوڕێ هەمزە سوور قاپێك پەتاتەی سوورکراوەو پیازێکی شیرینی سووری لەخۆی سوورتری ئێرانی لەبەردەم بوو. خولقی کردم نانی لەگەڵ بخۆم، وتم نانی نیوەڕۆم لای ئەبو فاروق خواردووە، هەمزە لەکاتێکدا پڕی ناو دەمی پارو بوو وتی خێر بێت! منیش پێکەنیم!، هەمزە وتی بەیانی یا ئەمڕۆ سازبم وتم بەیانی لە هەوارگەی گوێزێ دەبی خۆت و هاوڕێ ئەبو یەسار، وتم پێم وایە کاروانیش حەزدەکا لەگەڵمان سەفەرێك بکا، یارمەتی دەرێکی باش دەبێ بۆ ئەو سەفەرە، کاروان وڵاخی خۆیشی هەیە، هەم هاوڕێیەکی ئازایە و هەم نەهێنی پارێزە. هەر ئەو ڕۆژە

گەڕامەوە ئالوەتان. کاروان ماوەیەك بوو لە بارەگاکانی حزب دابڕابوو خەریکی کاروانچییەتی بوو بۆ ئەوەی پارە پەیدابکات خێزان پێك بێنێ. بەڵام وێدەچوو هیچی بە هیچ نەکردبێ. کاروانیش ئامادەیی خۆی بۆ سەفەرەکە نیشادا. لە رۆژی ١٩٩٠/٦/١٢ چوار قۆڵی، واتا بەندەو د.ئەبو یەسار و هاوڕێ هەمزەو کاروان لە دۆڵەکۆگە ئامادەبووین. رۆژی ١٩٩٠/٦/١٣ وەڕێکەوتین، هەر چوارمان سواری هێستر بووین، هێشتا ڕەش و بەڵەکی بەفر بە لاپاڵ و هەوارگەکانی(گوێزێ و خوارو کۆترەل)ەوە مابوو. کاتی بەسەر هەوارگەکانی قەندیلدا دەڕۆیشتم هەستم بەدڵتەنگی و خەمباری دەکرد، کە هەوارگەکانی خوارو کۆترەل و مەزرێڵی و ئاوەشخوێرەو... تاد چۆڵ بوون، هەستم بە قوڵایی کارەساتی راگواستنی کوردستان بە گشتی و دەڤەری پشدەر بەتایبەتی دەکرد. خەیاڵی رۆژانی رابردوو هەڵی گرتم بە ناو دێڕ بە دێڕی هۆنراوەی بەهاری کوردستانی مامۆستاهێمنی شاعیردا وێڵ بووم. لە خۆمەوە ئیرەیم دەبرد بە جوانی و سازگاری قەندیل بەسەر دڵی هەر هەوارگەیەك دادەڕۆیشتم بیرەوەرییەکی رۆژانی رابردووم دەهاتەوە یاد... دەمگوت کوا ژن و کچە شۆخ و شەنگەکانی خێلانی ئاکۆ، مامەش، مەنگوڕ، کوا هۆبەی ماڵی بابی پیرۆت بۆچی هۆ...هۆی شوانکارەکان نایەت، کوا ماڵی مام شریف و خاڵ مەحمود، بۆ چوومەو بەستە مەڵێ چۆڵ و هۆڵن، کوا بالای هاوڕێ رەسووە سوور کە بەرەو هەوارگەی ئاغاسەر هەڵدەکشا و بەسەر شاخان دا شۆڕدەبۆوە بەرەو هەوارگەی کەولان، بۆچی شەققەی مەشکەی سەیدزادە کوبرا نایەت، هەوارگەی کەولان بۆ چۆڵە، ماڵی خالە سەید ڕەسوڵ لەبەر چی لە قەندیل و کەولان تۆراون؟! کوا نەغمەی ئاوازی شمشاڵی شوانکاران، کوا دەنگی بالۆرەی کچە ئاشقانی بیری، ئەدی بۆ دەنگی کاك محەمەدی خدرە شینە نایەت، لەسەر بستوی ئاوی سپی هاوار بکا و بلێ باران تێکنێن باران تێکنێن، قەندیل ئەو ساڵ بۆوا بێ نازی؟!... هاوڕێ هەمزە سوور لێم نزیك کەوتەوە وتی هاوڕێ مزڵی نیوەڕۆیە دەبەینە کوێ؟ منگەیەکم لێ هات جارێکی تر وتی بۆ وای؟ وتی دیسان برسیت بووە؟ وتم دەچینە هەوارگەی(جاران)...هاوڕێ ئەبو یەسار لە هەمزە نزیکبۆوە بە زمانی عەرەبی وتی هەندێك پشوو نەدەین، هەمزە بە پێکەنینەوە وتی حزب دەزانێ؟! ئەبو یەسار وتی حزب کێیە؟ هەمزە وتی: پیاوێکی سوورو سپی یە سواری هێسترێکی بۆز بووە؟ مەبەستی هەمزە ئەبو یەسار خۆی بوو... کاتێ گەیشتینە هەوارگەی ژێر پانەسەر بارگەو بنەمان خست. دەستبەجێ گوینییەك ئاگری تێبەردراو بنە مەتارە پڕ لە ئاو کران و چا دەمکرا. ژەمی

پێشمەرگە بەتایبەتی لە کاتی مەفرەزەدا هەر گۆشتی قوتوو بوو لەوانەش گۆشتی مانگا، هەمزە هەروەکو هەمیشە قسەی خۆی دەکرد وتی هاوڕێیان ئەو گۆشت مانگایە هەر شەهوەتە! هاوڕێ دکتۆر ئەبو یەسار بە قسەی هەمزە پێکەنی بە عەرەبی وتی بە کەڵکی چی دێت؟!... دوای پشوودانێکی کورت کورتان لە وڵاخەکان کرایەوە خۆشمان خەریکی کۆکردنەوەی گوێنی بووین، ئەگەرچی ئەو شەوە دەتوانرا زیاتر بڕۆین بەڵام نەڕۆیشتین. وەك جاری رابردوو حەراسەتمان دانا و، بەدەم نوکتەو فشقیاتی هاوڕێ هەمزەوە رۆژمان کردەوە. ئەو شەوە کە چاوم بە کیسە خەوی دکتۆر ئەبو یەسار کەوت، وتم: هاوڕێ ئەبو یەسار کیسە خەوەکەت کیسە خەوێکی باشە، وتی سبەی کە لە یەکتر جیا بووینەوە پێشکەشی تۆ بێت، منیش وتم سوپاست دەکەم کیسە خەوەکە بۆ تۆش زەرووره، وتی ئەگەر تۆش لێم وەرنەگریت برادەری تر لێم وەردەگرن، حەزدەکەم بۆ تۆ بێت. کیسە خەوەکەیدا بە من تاکو ئێستاش ئەو دیارییەم پاراستووە، چونکە کیسە خەوەکە هەم دیارییە و هەم کیسە خەوێکی باشە. ئەو شەوە شەوێکی سارد بوو، ئەگەر بەتانی نووستن هەبا هەر یەکەی پێنج بەتانیمان بە خۆماندا دەدا، ئای خەو لە شەوی ساردا چەند خۆشە، بەتایبەتی کە مرۆڤ لەگەڵ خۆشەویستەکەی خۆیدا دەخەوێت، لە ژێر نوێنی گەرم و نەرم. هاوڕێ هەمزە بەیانی زوو وەکو سەرمازەڵە سەری بەرز کردەوە وتی هاوڕێیان ئەم شەو بستێك لە لەشم ڕەق بووە؟ هاوڕێ ئەبو یەسار بە شڕە کوردییەکەی وتی ها رەفیق هەمزە چی بووە؟ کە پێمان گوت زۆر پێکەنی وتی هاوڕێ هەمزە ژنی دەوێ. بەیانی هێشتا تازە زەردە لە سەرانی دابوو وڵاخەکانمان ئالیك دان و کورتانمان کردن، بارگەو بنەمان پێچایەوەو سوار بووین بەرەو فرۆشگای شێخ شەرۆ. فرۆشگای شێخ شەرۆ لە داوێنی گۆمی کرمەسوران بوو، بنکەو بارەگای حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و فرۆشگا تێکەڵبوون. ئەوانەی هاتوچۆیی ئەو فرۆشگایەیان دەکرد کاروانچی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و کاسبکارانی عەشیرەتی ئاکۆیان بوون. برادەرانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەوێ گومرگیان وەردەگرت، ڕژێمی عێراقیش بۆ زانیاری لەسەر جموجۆلی پێشمەرگە سوودی لەو فرۆشگایە وەردەگرت، بۆیە چاوپۆشی لێکردبوو. رۆژ بەرەو ئاوا بوون دەچوو، پێشمەرگەیەکی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، وەکو چاوساغ بڕیار بوو یارمەتیمان بدات، بەڵام کە شەو دادەهات، رێگاکە لە ناو گوێنییە گەورەو بڵاوەکانی گەوەو لاپاڵی کونە کۆتر بزر دەبوو، رێگاش نەبوو ناچار ملمان لەو ئاراستەیەدەنا کە پێمان وابوو بەرەو مەبەستمان

دەبات. ڕژێم هەستی کردبا هاتوچۆ بەو ڕێگایەدا دەکرێ مینرێژی دەکرد. کاروانچییەکان ناچاربوون لە ترسی کێڵگەی مین هەر شەوە بەڕشت و هەڵدێرو نەدیوێکدا ڕێگا بکەنەوە. پێش ئەوەی بەڕێ بکەوین ماوەیەك قسەم لەگەڵ هاوڕێ ئەبو یەسارو هاوڕێ هەمزە و هاوڕێ کارواندا کرد، بە هاوڕێ ئەبو یەسارم گوت، ئەو ڕێگایە ڕشت و هەڵدێرە مەترسی هەیە، دوور نییە لە هێسترەکە بەر بیتەوە، ئەگەر بەر بوویتەوە هەم خۆت هەڵدەدێرێت هەم هێسترەکەش بەرەڵلا دەبێ و تێکەڵاوی ریزبەندی سەدان کاروانچی دەبی، بەو تاریکە شەوە کەس ناوێرێت لە ترسی رەبیەکانی سوپای عێراق ئاگر یا لایت هەڵبکات. ماوەی سێ چارەگ فرکان فرکانی کاروانچی و رێبوارەکانە کەس ناگەڕێتەوە سەر کەس هەموو لە یەکتر دادەبڕێن، لەم دیو و ئەودیوی پۆلە گوێنی، ئەسپ سوار بزر دەبێ، رەنگە ئێمەش لە یەکتر بزربین. رووم کردە هاوڕێ هەمزە سوور، وتم: هاوڕێ بۆ زانیاریت کۆڵەپشتی من ئەمانەتێکی زۆر گرینگی تێدایە، هەر شتێك ڕوویدا ئەو کۆڵەپشتە بەبێ دەستکاری دەبەیتەوە بۆ ئەبو فاروق. کۆڵەپشتی من پڕ بوو لە دۆلارو بەریدی تایبەت بە ناوەوە. بە هاوڕێ کاروانم گوت تۆ و هەمزە هەوڵ بدەن من و هاوڕێ دکتۆر ئەبو یەسار بزر نەکەن، کە بزریش بووین دوور نەکەونەوە، لەکاتێکدا کە قسەم دەکرد هاوڕێ هەمزە زۆر بە دیقەت سەیری دەکردم، لە سەفەرو مەفرەزەکانی تردا بەو جۆرە نەدەدوام... قسە تەواوبوون و وەڕێکەوتین، لە سنووری کوێستانەکانی قەندیل دنیا رووناك بوو، کە چووینە کوێستانەکانی باڵەکایەتی و پەڕینەوە بەرەو هەورازی ئەودیوی کۆنەکۆتر، دەیان هەوارگەی سازگار و جوانمان بەر چاو کەوت، کە هەمان کەش و هەوای هەوارگەکانی خیلاتی مەنگوڕو مامەش و ئاکۆیەتی هەبوو. بە ناو لێڕەوارێکی چڕو گوێزەڵێنێکی زۆردا تێکشاین، پێش ئەوەی لە هەورازەکە سەر کەوین دنیا تاریك ببوو، سەگ و گورگ بە چاو لە یەکتر جیا نەدەکرایەوە، کە سەرکەوتین دنیا تاریك داهات و بوو بەتاریکە شەو، وەکو پێش بینیم کردبوو وا دەرچوو، بوو بە هەچە هەچە و شڵپە شڵپی قامچی لێدانی کاروانچییەکان. هەر کەس وڵاخی خۆی تاودەدا، کەس نەدەگەڕایەوە سەر کەس. ئێمە هەر چوار هاوڕێ لە دوای یەکتر دەڕۆیشتین. کاتێ کە شۆڕبووینەوە بەرەو ڕشت و هەڵدێرێکی شینکاڵ و ڕووتەن، وەدوای هەست و دەنگی سمی وڵاخی قاچاخچی یەکان کەوتین. هاوڕێ هەمزە و هاوڕێ کاروان لە من و هاوڕێ دکتۆر ئەبو یەسار دابڕان، من لە دوای هاوڕێ دکتۆر ئەبو یەسار دەڕۆیشتم کەفەڵی هێسترە سپیم بزر نەدەکرد، لە ناو ئەو هەموو گوێنیانەدا هێسترە بۆز دیار بوو، لەو

دالّغانەدابووم شلّپەیەك هات، سەیرم کرد تارمایی دکتۆر ئەبو یەسار لەسەر پشتی هێستره بۆز دیار نەما، خێرا ڕامکرد ڕێشمەی هێستره بۆزم گرت، نەم هێشت بڕوات و لە گوێنییەکم بەستەوه. هەستم ڕاگرت(٥٠) مەتر دوور لە هێستره بۆز، لە ناو بیشەی گوێنییەکانی دەوروبەرم بۆڵە بۆڵێك دێت، کە سەرەو ژێر بوومەوه سەیرم کرد هاوڕێ ئەبو یەسار لە ترسی هەڵدێران، سەری گوێنییەکی توند گرتووه و لاقی لە ژێر گوێنییەکە گیرکردووه. دەستم گرت وتم هاوڕێ سەلامەتی؟ وتی ئەوه هاتیت؟ خۆ نەهاتبای تا بەیانی سەربازەکان دەیانگرتم، نەمدەوێرا دەست لەو(گونه) بەردەم، ناوبراو بە گوێنی دەگوت(گون)!. دەستی هاوڕێم گرت وەکو عارەبانه بەو هەورازدا پەلکێشم کرد. من هەندێك جار گوێنیم دەگرت و هاوڕێش پشتێنی منی دەگرت. بەم شێوەیه بە چەنگەڕنێ گەیشتینە نزیك هێستره بۆز، هێستره بۆزیش کە ئێمەی بینی ئاوا لەسەر چەنگان دەڕۆین، لێمان ترسا و ڕەویەوه، بەرەڵلا بوو و بە جیفرك هاویشتن لە ناو گوێنیان دا بزربوو. کە هێسترەکە ڕایکرد زۆر دڵتەنگ بووم، هاوڕێ هەمزه و کاروانیش ڕۆیشتبوون ئێمەیان بزرکردبوو. هاوڕێ ئەبو یەساریش نەیدەتوانی(١٠) مەتر بەو هەڵدێر و تەلانەدا بڕوات، بە کۆڵیش هەڵ نەدەگیرا، چونکە هێندەی یەك فەردە خوێ گران بوو، بالاّ بەرزو بە خۆووه بوو، کێشی لە سەرووی(٨٥) کیلو دەبوو. ناچاربووم بە دکتۆرم گوت تا دێمەوه تۆ لێره بمێنەوه بۆ هیچ کوێیەك مەڕۆ، ئەگەر ڕۆژیش داهات دەتوانی هەر لە ناو ئەو گوێنییانەدا بمێنییەوه، کە هاتمەوه و ئاوەها فیتوم لێدا مانای وایه ئەوه خۆمم، فیتوەکەم بە جۆرێك لێدا کە پێی ئاشنا بێت. وتی باشه تۆ چۆنت وت وا دەکەم. منیش وەك هێستره بۆز هێزم دایه بەرخۆم و، بە سەرەوژێرەکەدا شۆڕ بوومەوه. بەو تاریکه شەوه پتر لە نیو کاتژمێر بە ناو بیشە گوێنی و سەرەوژێرەکەدا بەملاو ئەولادا رامدەکرد، بێ ئەوەی بزانم ڕێگایەکە لە چ راستێکه دەڕوات. چەند جار بەدەم راکردنەوه بە دەمدا کەوتم و هەستامەوه، هەر جارێك کە دەکەوتم شەققەی چەك و مەخزەنەکانم دەهات، لە ناو ڕاکە ڕاك و ماندووبوون و ئارەق سڕینەوەدا گوێم لە پڕمەی هێسترێك بوو، باوڕبکەن ئەو پڕمەیەم پێ لە دەنگی ناسکی شۆڕه ژنێکی جوان خۆشتر بوو، چونکە جارێکی تر ئومێدم پەیداکردەوه و، لە سەرخۆ بەرەوپڕمەکە چووم شتێکی سپی دەرکەوت، لاقم کەمێك ڕۆچوو، هەستم کرد جێگاکە تەڕگەیە، زانیم ئەوه پڕمەی هێستره بۆزه دەلەوەڕێ، خەریکبوو ڕا بکات فریا کەوتم ریشمەکەیم گرت و خێرا وەکو هەللوك خۆم فڕێدا سەر پشتی دوو قامچی بەهێزم سرەواندە ئەم لاو ئەو لای، کەنەدەبوو ئەوه

بکەم، بەڵام زۆر جار مرۆڤ ناچار دەبێ بۆ پاراستنی شتێکی گەورەتر هەست و سۆز بەلاوەبنێ، توند و تیژی بەرامبەر بەکاربێنێ. هەر بەو ئاراستەیەی هاتبوومگەڕامەوە، بە فیتو لێدان هاوڕێ ئەبو یەسارم دۆزییەوە، خێرا سواری هێسترە بۆزم کردەوە، بەندەش لە پێشەوە ریشمەی هێسترەکەم ڕادەکێشا. هێستر چوارپێیەکی باری زۆر وریا و هەستیارە چاویشی لە چاوی مرۆڤ تیژتر و لە تاریکیدا رووناکە، زۆرجار لاقم دەترازا بەڵام بە هۆی ریشمەی هێسترەکەوە خۆم دەگرتەوە. نازانم چەندمان پێچوو، هەر ئەوەندەم زانی لە ناو لێڕەوارێك داین. جار جارە گوێم لە دەنگە دەنگ دەبوو، لە دەنگە دەنگەکە نزیکبووینەوە هاوڕێ هەمزە سوورو کاروان بوون، یەکێك وتبووی بگەڕینەوە ئەوی دیکە وتبووی با چاوەڕوان بین، وتم باشتر بوو چاوەڕوانتان کردین...

کاتژمێر لە دووی شەو نزیك دەبۆوە. بە هاوڕێ هەمزەم وت: تۆ لە ناو بارەگاکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران شارەزای، پێش کەوە. ئەو شەوە وەکو بڕیار بوو هاوڕێ ئەبو یەسارمان بە سەلامەتی رادەستی برادەرانی دیموکرات کرد. هەر ئەو شەوە گەڕاینەوە بەرەو ماڵی برادەری دێرین و دڵسۆز( خاڵ یەدی پیری) وەکو جاران وڵاخەکانی لێوەرگرتین و، جێگاو رێگای خەوتن و حەسانەوەی بۆ خۆشمان دابینکرد... کاتێ لەسەر جێگا راکشا بووم لەبەر ئازاری جەستەم خەوم لێ نەدەکەوت، کە پانتۆڵەکەم داکێشا سەیرم کرد لە ئەژنۆم بەرەو خوار پێستی لاقەکانم وەك گروا بێت وابوو، هەموو برین ورووشان بوو، بەڵام کە ئەرکەکەمان بە باشی ئەنجامدا هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد، چونکە ئەبو یەسار کادرێکی سەرکردایەتی(حزب) بوو، دکتۆرێکی پسپۆر بوو شتێکی بەسەر هاتبا شەرمەزار دەبوین... لەو دالغەو بیر کردنەوانە دابووم خەوم لێکەوت. هەتا چێشتەنگاوێ مام یەدی وەخەبەری نەهێنابین خەبەرمان نەبۆوە، ئەو رۆژە خاڵە یەدی خزمەتی کردین، دوای نیوەڕۆ لەسەر دەرچوون و چۆنییەتی قۆناغی دووەمی مەفرەزەکە دواین، پێمان باش بوو وڵاخەکان لە لای خاڵە یەدی جێ بهێڵین... ئێوارەیەکی درەنگ بوو خاڵ یەدی بە دووربین چاوەدێری رێگاکەی دەکرد، تا شوێن و جموجۆڵی کەمینی سەربازو مۆڵگەکان بزانێت. دوای نان خواردنی ئێوارە لە رێگای قیرتاوی کورتەك قەسرێ پەڕینەوە و، بە هەورازەکەی ئەوبەری (بۆڵێ)دا بەرەو بستوی **زیندوێ ئەستێرۆکان** هەڵکشاین. هەورازێکی دوورو درێژ بوو بەڵام پێشمەرگەی گەنج و تێر ماندبوون نازانێ. ئەمجارەیان وەکو ساڵی پار نەچووینەوە گۆڕبەنانی و هەوارگەی وێجی.

ڕەشهاوێژی بەرەو ئاڕاستەی دۆڵە ڕەقە ملممان لێنا. کە سەرکەوتین ڕۆژ بوو لە ناو هەوارگە بەهارانی عەشیرەتی ئاکۆیان نانێکی سەر پێیمان خوارد. یەکەم جار بوو بەسەر ئەو چیایەدا بڕۆین. چیایەکی زۆر وشك و دیمەکارو ڕەقەن بوو. مەتارەکانمان ئاویان تێدا نەمابوو. ماندوو و شەکەت بووین. بە سەرەو ژێرێکی زۆر لێژدا شۆڕبووینەوە. خۆمان وەخڕ دەکرد و غارمان دەدا بۆ ئەوەی زوو بگەینە سەر ئاویٚ. کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ بوو کە گەیشتینە ڕۆژهەڵاتی پڵێنگانی دۆڵەڕەقە. نەمانتوانی بوو پشوو بدەین لەبەر برسێتی شەپرزە بووین، هاوڕێ هەمزە بە ئاماژە وتی ئەوە مێگەلە بزنە، خۆمان لە چرپی دەوەنێکدا شاردەوە کەچی مێگەلە بزنەکە هەر نەدەرۆیی، سەیرم کرد هاوڕێ هەمزە پێدەکەنی و ئەوەندەی تر سوور هەڵگەڕاوە، وتی شوانەت نەدیوە چی دەکات؟ وتم چی دەکات؟ (...)، ئاخر پشت ئاوو ئەوکارە!! شوانە بەکاوە خۆ کاری خۆی کردو مێگەلە بزنەکەی ڕادا، ئێمەش چووینە سەر چۆمەکە کە ئاش گێرێك ئاوی پێدا دەرۆیی، لەپاڵ تاوێرە بەردێکی قەراخ چۆمەکە کۆڵەپشتەکانمان کردنەوە، نانمان پێ بوو هەر ئەو نانەی ماڵی خاڵە یەدی پیری بوو. پێم سەیر بوو لەبەر هیلاکی نانم بۆ نەدەخورا. عەسریٚ بە بناری کێوەڕەش دا ڕۆیشتین. ئێوارەیەکی زۆر درەنگ گەیشتینە بەرامبەر گوندی دۆریٚ و قەڵاسیدە. هاوڕێ هەمزە لە پێشەوە دەرۆیی پاسەوانێکی بارەگای حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ لە هاوڕێ هەمزەی ڕاخوری، هاوڕێ هەمزەش خۆی پێ ناساند، داوامان کرد کە ئەو شەوە جێگامان بکەنەوە، لە وەڵامدا گوتیان دەبێ حزب دەستور بدات...

دوای نیو کاتژمێر وەڵامیان داینەوە و وتیان داوای لێبوردن دەکەین، ناتوانین میوانداریتان بکەین، چونکە لە لایەن دەزگای مخابراتی عێراقییەوە گوشارێکی زۆر لەسەر حزبە، سیخوڕەکانی ناوچەکە گوزارشتیان لیداوین، کە پێشمەرگە هاتۆتە بارەگاکانمان. هاوڕێ هەمزە جاریکی تر داوای لێکردن کە یارمەتیمان بدەن ئەو شەو لەویٚ بین، داوای دووەمم پێ ناخۆش بوو، حەزم دەکرد لە شاخی ماکۆك بخەوین دووەم جار داوا نەکەینەوە چونکە دەمزانی ڕاست دەکەن گوشاریان لەسەرە. بەڵام هاوڕێ هەمزە ئەم جارە زۆر ماندوو بێزار دیاربوو...دووەم جار ڕەزامەندیان دەربڕی چووین بۆ ماڵی پێشمەرگەیەك بە ناوی کاك حەسەن خێزانەکەیشی ناوی باجی عایشێ بوو، زۆر بە گەرمی پێشوازیان لێکردین. دوا ئەوەی نانی ئێوارەمان خوارد حەساینەوە بە هاوڕێ کاروان و هاوڕێ هەمزەم گوت: حەزدەکەم هەر ئەمشەو لێرە بڕۆین بۆ

حاجیاوا، هاوڕێ هەمزە وتی کەسمان شارەزا نین چۆن بڕۆین؟ جاری رابردوو هاوڕێ حوسێن شیوعی دەلیل بوو ئەم جارە چۆن بڕۆین؟ پیویستە پەلە نەکەین بە دوای حوسێن شیوعیدا بنێرین، بۆ ئەوەی لە رێگاکە(دەلیل) مان بێت، گوتم تۆ راست دەکەی بەڵام برادەرانی دیموکرات حەزدەکەن تەنها ئەم شەو لێرە بین؟ هاوڕێ هەمزە وتی هیچ چارە نییە رێگای ماکۆك و سەرکەبکان بە رەبیەی جاش گیراوە، نەشارەزاین چۆن بە نەشارەزایی بڕۆین بەتایبەتی بە شەو. کاروان هیچ قسەیەکی لە مشتومڕی نێوان من و هاوڕێ هەمزەدا نەکرد. ماوەیەك بێدەنگ بووین، ڕووم لە هاوڕێ هەمزە کرد وتم من دەڕۆم و هەوڵدەدەم شەوێك دوو شەو کارەکانمان تەواوبکەم، ئەگەر تووشی شتێك بووم با تووش بم، حەزناکەم ئەو شەو لێرە بم. هاوڕێ کاروانیش وتی منیش دێم. یەکەم جار بوو لەگەڵ هاوڕێ هەمزە بۆ ئەرك و کاری حزبی تووشی هەڵوێستێکی لەو جۆرە بم، هاوڕێ هەمزە وتی لێرە دەبم نایەم، چونکە ئەو ڕۆیشتنە بە شێتی دەزانم! هەمزە ناهەقی نەبوو بەڵام مردن خۆشترە نەك خانەخوێ بە میوان بڵێ جێگامان نییە بمێننەوە. لەگەڵ کاروان بنارە و بناری چیای ماکۆك ڕۆیشتین پوش و قانگلاش بە قەدەر باڵای ئێمە بەرز بوو، ماکۆك شاخێکی پڕ لە تاوێری گەورە ڕەوەزە شاخە. لە ناکاو خشپەیەکی زۆر گەورە هات لە خشە خشی ڕەوە بەراز دەچوو لەگەڵ خشپە خشپدا هاشەیەکی زۆر نزیك دەهات، کاروان وتی ڕاکە ئەوە مارە مار! وەك عەزیا گەورەیە دەتوانی هەڵمان لوشێ. لەبەر مارەکە ڕامان کرد. رێگا نەبوو هەر بەو ئاراستەیەدا دەڕۆیشتین کە پێمان وابوو رێگایەك دەدۆزینەوە. ئەوەندە لە ناو هەڵەت و رەوەزە شاخەکانی ماکۆکدا ئەو سەرو ئەوبەرمان کرد، تا رۆژمان بەسەر داهات. زەردە لە سەرانی دابوو بەرەو گوندی **ئەستریلان** شۆڕبووینەوە. بە بن رەبیەی جاشەکانی سەر چیای ماکۆك دا تێپەڕین. زۆر بە جوانی سەیریان کردین، دڵنیام زانیان پێشمەرگەین، چونکە جل و بەرگ و رەنگ و رووی پێشمەرگایەتیمان لە دوورەوە دیار بوو، بەڵام بۆ رێگایان پێ نەگرتین یا تەقەیان نەکرد نازانم، ئەوەندە دەزانم ئەو کاتە جاشەکانی ئاکۆ خراپەی کەسیان نەدەکرد، کاك ئاکۆ خۆیشی پیاوێکی خۆشەویست بوو لای خەڵکیش و لایەنە شۆڕشگێڕەکانی کوردستانیش.

کاتێ گەیشتینە دەوری ئوردوگای حاجیاوا کاتژمێر حەوتی بەیانی بوو خەڵکی ئۆردووگای هەمووی لە دەرەوە بوو، نەمانزانی چی بکەین، کاروان وتی ئەو جارە بەرەو کوێ بڕۆین؟ وتم ماڵی خاڵم لە یەکەم گەرەکی ئۆردووگایە، وەکو دەڵێن لە نزیك بیرە ئاوەکەیە، ئەوتا ئەوەش

بیرە ئاوەکەیە. من دەچم لەو ماڵە دەپرسم بەڵکو ماڵی خاڵم دەرچێ. کاروان خۆی مەشغول کرد منیش چووم لە دەرگای ماڵەکەم دا، کەچی ماڵەکە دراوسێی خاڵم دەرچوو. ژنێك هات وتی ئەوە ماڵی خدر حوێزە، بە ئاماژە ئاگاداری کاروانم کرد بێ ئەوەی لە دەرگا بدەین خۆمان بە ژووردا کرد. کە چووینە ژوورەوە خاڵم زۆر پێی سەیر بوو، ئەو رۆژە لەوێ بووین، شەوێ کاروان چوو بۆ ماڵی کاك خالیدی برا گەورەکەی، منیش چووم بۆ ماڵی مامم، دایکم یەکسەر وتی ئەم شەو خەونم پێوە بینیوی دەمزانی دێیەوە...

ناردم بە دوای هاورێ(سورە) دا کە ئەو کاتە ماڵی لە ئۆردووگای **پیرەمەگرون** بوو. لەو مەفرەزەیەدا هەڵوێستی هاورێ( سورە)م وەرگرت، بۆ ئەوەی لەمەودوا رێکخستنەکانی بیتوێن و پشدەر پەیوەندییان بە لیژنەی محەلی سلێمانییەوە بێ. هاورێ سورە وتی لەم رۆژانەدا هاورێ مامۆستا قادرم چاو پێکەوتووە، ئەویش ئاگاداری کردووم. بە هاورێ سورەم وت رەنگە جارێکی تر سەردانتان نەکەم، بە ئەرکێکی حزبی بە ماڵەوە دەچم بۆ شاری (نەغەدە) بەڵام پەیوەندیمان هەر دەبێ و دەمێنێ، تەنها وەکو بازنەی رێکخستن پشدەر و بیتوێن پەیوەندی بە محەلی سلێمانییەوە دەبێ. من وهاورێ سورە لە دوو برای یەك خێزان زیاتر متمانەمان بە یەکتر هەبوو، پتر لە(١١) ساڵ بوو لە سەختترین بارودۆخ دا کاری رێکخستن و نهێنیمان بەیەکەوە دەکرد. سەدان جار تووشی هەڵوێستی وا بووین مەرگ بە چرکە لێمانەوە دوور نەبووە، کاتێ ویستی بڕوات بە پەرۆشەوە ماڵ ئاوایم لێکرد.

## شەوی مەرگ:

هاورێ سورە رۆیشت، ئێمەش هەر ئەو ئێوارەیە لە رێگای ماڵەوە هاورێ کاروانم ئاگادارکردەوە کە ئامادەبێ. کاك خالیدی برا گەورەی کاروان سەیارەیەکی جێب وەسەتی هەبوو، بەو سەیارەیە هەتا گوندی ئەستریلانی دۆڵی سەرکەبکانی بردین، لەوێشەوە بە داوێنی چیای ماکۆك دا گەڕاینەوە گوندی دۆرێ بۆ ماڵی کاك حەسەن و باجی ئایشێ. هەر ئەو شەوە بەرێکەوتین و گەڕاینەوە. بە بناری کێوەڕەش دا هاتین بەرەو دۆڵی **پلینگان**، بەری بەیانی لە بستوێ ئەستێرۆکان سەرکەوتین. مەتارەکانمان ئاویان کەم تێدا بوو، ئەو شاخە دێمەکارەی ئەستێرۆکان لە وەرزی هاوینان تاقەت پروکێنە، مرۆڤ ناچار نەبێ بۆ ئەوە نابێ پێیدا بڕوات. بەرەو ئەودیوی گوندی **ئیندزێ** شۆڕبووینەوە. هاورێ هەمزە وتی نابێ رێگای لێڕەوارکە

بگرینەبەر، خاڵە یەدی وتی ئەوەی گاکێڵ بێت لە شاخ و لێڕەوارەکە هەمووی مین چین کراوە، لە گەڕانەوەتاندا بە ڕێگای دیاریکراودا مەگەڕێنەوە. ساڵی رابردوو ئاشکرابووە کە پێشمەرگە بەو ڕێگایەدا هاتوچۆ دەکات بۆ دۆڵەڕەقە... وتم هاوڕێ هەمزە لە ڕێگادا خۆت دەزانی چی دەکەی، بۆ ڕێگاوبان هاوڕێ هەمزە نموونەی نەبوو... هەمزە وتی مارکس دەڵێ بە دۆڵدا (ئەمە وتەی ئەو کەسانە بوو جەماوەریان بە ناوی مارکسیزمەوە فریدەدا)! وتم بە دۆڵ دا بە دۆڵ دا؟! هەمزە دۆڵاو دۆڵ ڕۆیشت هەتا پتر شۆڕدەبووینەوە شەو تاریك ترو دۆڵەکە تەنگەبەرتر دەبوو. کاتی گەیشتینە داوێنی دۆڵەکە هاوڕێ هەمزە وتی هاوڕێ تووشی(ماهی واتا هەڵدێر یا دیوارە شاخ) بووین. کە هەمزە وتی تووشی ماهی بووین زۆر خەفەتم خوارد چونکە هیچمان ئاومان پێ نەمابوو، ئەودیوی دۆڵەکەش تەونی مین و بەردەممان ماهی شاخ بوو، نەماندەزانی چی بکەین؟ وتم هەمزە ئەو ماهییە زۆر بەرز دیار نییە هەر(٧) مەتر دەبێ پشتێنی خۆت یا هی من دەکەینە گوریس و خۆمانی پێدا شۆڕدەکەینەوە. بیرۆکەکەی منیان قبوڵ کرد، پشتێنی یەکێکمان کردە گوریس، ئەو کاتە هیچ پشتێنێك لە(٧) مەتر کەمتر نەبوو، خۆمان پێدا شۆڕکردەوە، کەچی پشتێن بە ماهییە کەوە بەجێ ما. پەنجا مەتر نەڕۆیشتین هاوڕێ هەمزە هاواری کردەوە وتی هاوڕێیان دیسان ماهییە، بەڵام چ ماهی؟! بە خوا کەس ناتوانێ خۆی پێدا فڕێ بدات، کە هەمزە وتی ماهی یە خەریکبوو لە جێگای خۆم وشك بم، وردە بەردمان لە ماهی یەکە فڕێ دەدا ماوەیەکی دەخایاند هەتا دەکەوتە سەر زەوی، بە مەزەندەی هەر سێکمان ئەو ماهییە هی ئەوە نەبوو پشتێنەکانی ئێمەی بگاتە نیوەی. وتم چی بکەین تازە ناتوانین بگەڕینەوە؟!، هەندێك بەم لای تەنگە دۆڵەکە هەڵگەڕاین و کەمێك چەنگەڕنەمان کرد تا بە دیواری دۆڵەکەدا هەڵگەڕێین، بە مین بمرین باشترە نەك بەدەستی خۆمان فجو بکەین و هەڵدێرین. هەر چەندە هەوڵماندا بێ سوود بوو هیچ چارەیەکمان نەبوو هەر دەبوو بەو هەڵدێرەدا خۆمان فڕێ بدەین... ماوەیەك هەرسێکمان بێدەنگ و ئارام پاڵمان وەپاڵی یەکتردا بوو، بیرمان لە چارەنووسی خۆمان دەکردەوە، بڕواناکەم پێشمەرگەی تێکۆشەرو دڵسۆز لە مردن ترسابێ، ئەگەر ترسابا ئارەزوومەندانە ئەو ڕێگایەی هەڵنەدەبژارد کە لە١٠٠٪ دەیزانی پێشمەرگە واتا(مەرگ). بەڵام مردن لە ڕێگای خۆ فڕێدان لە شاخێکی ئەوها، هەزار لێکدانەوەی هەڵەی بۆ دەکرا، دەیان ساڵی تریش هیچ کەس لاشەی نەدە دۆزینەوە، لەو کاتەدا بیرم لە هەرچوار منداڵەکانم و لە دایکی منداڵەکانم و لە دایکم

دەکردەوە، پێم وابوو ئەگەر شتێکم بەسەر بێت منداڵەکانم سەرگەردان دەبن کە تەمەنی هۆنیای کچم ئەو کاتە تەنها(٥) ساڵ بوو. ڕێبواری کوڕم بچووکەکەیان ساڵێك و سێ مانگی تەواو نەکردبوو. وەکو شریتێك ڕۆژانی ڕابردووم دەهاتەوە یاد لە هەمووی ناخۆشتر سزادانی حزب بوو. دوای مردن کەس ناتوانێ ڕاستییەکان ئاشکرا بکات. چەندان خەیاڵی هەمەجۆر بە مێشك و دەروونمدا گوزەریان دەکرد. وێدەچوو هاوڕێ هەمزە و کاروانیش هەمان بیرکردنەوەیان هەبێ. هاوڕێ کاروان بێدەنگی یەکەی شکاند و وتی چی بکەین؟ گوتم هەمزە پشتێنەکەت بێنە، هاوڕێ هەمزە وتی شریتێکم پێیە لەگەڵ پشتێنەکەم دایە، بیست مەتر زیاتر دەبێ، منیش پشتێنی خۆم دانا هەرسێکمان تێککردنەوە، بە بۆچوونی خۆمان پتر لە(**٣٥**) مەتر دەبوو، چونکە سی و پێنج باڵ زیاتر بوو. وتم من لە هەردووکتا**ن** بە هەیکەل بچووکتر و سووك ترم من خۆم شۆڕدەکەمەوە، سەری پشتێنەکەم ڕاکێشا لە خۆمی ببەستم هاوڕێ کاروان وتی نا من خۆم شۆڕدەکەمەوە، ئەگەر مردیشم ژن و منداڵم نییە لە دوام بە جێبمێنن. بەڵام تۆ ژنێك و چوار منداڵی وردیلەت هەیە سەرگەردان دەبن... هەرسێکمان دەممان وشك و ڕەنگمان هەڵبزرکا بوو بەڵام وڕەمان بەرز بوو. زۆر هەوڵم دا نەهێلم کاروان یەکەم کەس بچێتە خوارێ، بەڵام بێ سوود بوو...کاروان هەردوو لاقی بە ماهی یەکەدا شۆڕ کردنەوەو پێکەنینێکی سەیری کرد وتی مردن مردنە لینگە فرتێی بۆچییە؟ پشتێنەکە بێنن لە بن هەنگلانمی توند بکەن، یا دەمرم یا هەموومان دەربازدەبین، وتم مردنەکە سێ قۆڵی دەبێ ئێمەش بە دوات دا دێین، پشتێنەکەمان لە بن هەنگڵی کاروان بەست هێدی هێدی بە ماهی یەکەدا شۆڕمان کردەوە، کات ١١:٣٠ چرکەی شەو بوو، بەروار **١٩٩٠/٦/٢٩** بوو، ئەو ڕێکەوتە وا لە مێشکمدا چەسپاوە هەرگیز لە بیری ناکەم چونکە ئەو شەوە شەوی مەرگ بوو مەرگێکی ڕاستەقینە، کاتێ کاروانم شۆڕدەکردەوە لەگەڵ هەر تەکانێکی شۆڕ کردنەوە جارێك بانگی کاروانم دەکرد پێم دەگوت ئەگەر زۆر بەرزە ڕات دەکێشینەوە سەرێ، هەر چەند ڕاکێشانەوەش بەرەو سەرەوە هەر مەترسیدار بوو، زۆر نزیکبوو پشتێنەکان یا شریتەکە بپچڕێت و کاروان هەڵدێرێت، بەڵام بۆ بەرز کردنەوەی وڕەی کاروان پێویست بوو. کاتێ بە ماهی یەکەدا شۆڕمان کردەوە، تا (١٠) مەتری سەرەوەی ماهی یەکە کاروان دیار بوو، چەندە پتر شۆڕدەبۆوە کاروان دەنگی دەبڕا، من و هەمزە لێکدا لێکدا بانگمان دەکرد کەچی کاروان نەدەنگی ما نەڕەنگ، لەو کاتەدا بیرم لە کاروان دەکردەوە دەمگوت بۆچی ڕێگام دا کاروان یەکەم کەس خۆی فرێ

بدات و بمرێت، چی بە کەس و کاری بڵێم، کێ بڕوا دەکات ئێمە تووشی حاڵاتێکی وا بووین؟!
لە خۆمەوە وتم بە خوا سەیرە ئەی ئێمەش وەکو کاروان نامرین سەرزەنشتی چی و لۆمەی چی، دوای مردن چی دەگوترێت با بگوترێت؟، هاوڕێ هەمزە زۆر بەهێز بانگی کاروانی دەکرد، کاروان هاواری دەکرد وتی گوریسەکە تەواوبوو ماهی یەکە کۆتایی نەهاتووە؟!... من و هەمزە حەپەساین، بەڵام بۆ ئەوەی کاروان نیگەران نەبێ بانگمان کرد کە ڕایدەکێشینەوە سەرێ، کاروان وتی خۆم فڕێ دەدەم یا دەمرم یا ڕزگاردەبم، ئەمەی گوت خۆی فڕێدا... کاروان(١٠) چرکە بێدەنگ بوو، دوای ماوەیەك دەنگێکی نووساو نوزەی دەهات ئۆخەی، ئۆخەی، ئۆخەی کاروان گیان نەمردووی، خەریکبوو لە خۆشیان باڵ بگرم، ئێنجا بەرزتر بانگی کرد وتی ئێوەش یەك بە یەك خۆتان شۆڕکەنەوە... خێرا سەرە پشتێنەکەمان ڕاکێشایەوە سەرێ و لە قەدی خۆم توند کرد وتم هاوڕێ هەمزە سەرێکی لەم دەوەنە ببەستەوە تۆ بە تەنها ناتوانی شریتەکە بگریت ئەویش بە گوێی کردم، منیش گورج خۆم شۆڕ کردەوە و چەرمی لەپی دەستم هەمووی داماڵا، پشتێنەکان هەر چرپە چرپیان بوو، هێشتا لاقم لە ئاسمان بوو کاروان وتی خۆت بگرە تاکو لەپی دەستم بۆ لاقەکانت ڕادەگرم دواتر خۆت فڕێدە، کاروان بەردێکی لە ژێر پێی خۆی دانا بوو، وتی ئێستا هەست دەکەی پەنجەی دەستم لە ژێر پێتە؟ وتم بەڵێ وتی خۆت فڕێدە، خۆم فڕێدا وەکو لەسەر بانێکی بەرز بەربمەوە وا بوو، دوای من هاوڕێ هەمزە چەك و تاقمەکانی بە پشتێنەکەدا ناردە خوارەوە دواتر خۆیشی شۆڕ کردە خوارەوە... بەم جۆرە پتر لە چوار کاتژمێر لە نێوان مەرگ و ژیاندا پەلەقاژەی دەربازبوونمان دەکرد. کاتێ دەربازبووین و پشتێن و گوریسەکە بە ماهی یەکەوە بەجێمان، ئەوەندە ماندوو شەکەت بووین زمانمان بە تەواوی گۆی نەدەکرد، تف لە دەمماندا وشك بوو، تاقم و مەخزەنەکانمان بە شەیالەکان بە شانماندا کرد، سێ پێشمەرگەی بێ پشتێن سێ پێشمەرگەی شەپرزەو تینو بەرەو گوندی **سلێ** ڕێگامان گرتەبەر. لەگەڵ حەرەسەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لێك ڕاساین سەرەڕای ئەو ماندووبوونە خەریکبوو تووشیشەڕ و کێشەی دۆستانیش بین. ئەوان ناهەقیان نەبوو، دەنگیان داین نەماندەتوانی بە باشی وەڵامیان بدەینەوە دەنگمان دەرنەدەهات، ئەوانیش پێیان وابوو پیاو خراپین، باش بوو لەو کاتەدا کاك محەمەدی حەسەن پوور کادرێکی پێشکەوتووی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەوێ بوو، لە هەراو هۆسەی ئێمەو ئەوان بەخەبەر هات، لەگەڵ حەرەسەکاندا ئاشنای کردین، کاك محەمەد حەسەن پوور زۆر

خولّقی کردین بمێنینەوە، سوپاسمان کرد پێمان گوت جێگامان هەیە، ئەو شەوە چووینەوە ماڵە گەورە، کە مام یەدی ئێمەی ئاوا بەم شپرزەییە دی زۆر دڵ گران بوو... ئەو شەوە خەوێکی قوولّ وخۆشمان کرد. خەو لە دوای ماندووبوون و هیلاکی ئارام بەخشە و گیانێکی تازە بەبەر مرۆڤدا دەکاتەوە. ئەو رۆژە هەر خەریکی‌خواردن و خەوتن بووین. کە ئێواریّ سێبەری ماهییەکەی ئەوبەر شۆڕبۆوە مام یەدی ولّاخەکانی بۆ ئالیك داین، تەنانەت کورتانیشی کردن، ئینجا بەرەو هەمان رێگا بەرێکەوتین کە پێدا هاتبووین. لە گەڕانەوەدا هەم شارەزاتر بووین هەم حەساوەتر، شەوێك لە قەندیلماینەوە، بەیانی هاوڕێ هەمزە لە خەو هەستاو وتی ئەمشەو شەیتانی بووم وتم: شەیتان چی دەکات لە قەندیل؟!

ئەو شەوەی لە قەندیل بووین بیرم لەو رێگایەو مەفرەزەکە دەکردەوە، سەیری ئەو هەموو شاخ و دەشت و لێڕەوارەم دەکرد، بستولکەیەك نەمابوو دوژمن رەبیەکی لیدانەمەزراندبیّ، مرۆڤ چۆن دەبیّ لەو ولّاتە پان و بەرینەی خۆیدا لە چوارچێوەی ماهی یە شاخێك دا عاسیّ بیّ و، بە پشتێن خۆی هەڵواسیّ تا ئەرکێکی سادەی پێشمەرگایەتی ئەنجامبدا. ڕژێمێك ئاوا هەڵسوکەوت بکات ئایندەی خەڵکی کوردستان بەرەو کویّ دەڕوات...

## ماڵ ئاوا ئاڵوەتان :

ماوەی شەش سالّ بوو لە ئاڵوەتان جێگیربووین، هەروەکو لە شوێنێکی تری ئەو پەرتوکە باسم کردووە. ئاڵوەتان بۆ من و زۆربەی پێشمەرگەکانی کوردستانی باشوور بوو بە زێدێکی خۆشەویست، سیّ جگەر گۆشەم لەویّ لەدایکبوون، هاوێر، رەوەند، رێبوار. پرێسکەی ئاوارەیم لەو گوندەدا کرایەوە، رۆژیّ لە رۆژان هەستم نەکرد لە ئاوارەییدا دەژیم، چونکە خەڵکە کە لەگەڵ ئەوەشدا هەژار بوون تا بۆیان کرابا یارمەتیان دەداین و پەیوەندییان لەگەڵمان باش بوو.

لە نۆکانەوە مام قادر نامەیەکی لە نوشتە بچووکترو لە چوار دێر کەمتری بۆ ناردم. لە نامەکەدا نووسرابوو کە بۆ کارێکی تایبەت سەردانی بکەم. دەمزانی کارەکانی هاوڕێ مام قادر هەر ئەرك وکاری حزبە بەڵام ئەمجارە چ کارێکە نەم دەزانی. لە رۆژی ۱۹۹۰/۹/۱۵ چووم بۆ بارەگای سەرکردایەتی حزب لە مەکتەبی هەرێمی کوردستان لە نۆکان، هاوڕێ مام قادر لەسەر گرینگی وێستگەی (نەغەدە) قسەی بۆ کردم و وتی ئەرکی تۆ بەڕێکردنی هاوڕێیان دەبیّ، لەگەڵ هاوڕێ سەرۆ قادر دا کار دەکەیت. دوور نییە لە داهاتوودا هەر خۆت

سەرپەرشتی ئەو وێستگەیە بکەیت. لە دوای ڕۆیشتنی هاوڕێ سەرۆ بەرەو هەندەران... هاوڕێ مام قادر وتی ئەو پێشنیارە هی سەرۆ خۆیەتی تۆ بچی بۆ نەغەدە. ڕەزامەندیم نیشان دا کە بە ماڵەوە بڕۆم بۆ(نەغەدە). لە ڕێکەوتی ١٩٩٠/٩/٢٦ ماڵ ئاوایمان لە گوندی ئالۆەتان کرد. ئەو ڕۆژە چووین بۆ ماڵی کاک حەمەدی شێخە و، کاک محەمەدی مەلا ئەحمەدی دراوسێمان تا خواحافیزییان لێبکەین، هەر دووکیان زۆر نیگەران بوون، کاک حەمەدی شێخە خاوەنی خانووەکەی ئێمە بوو، ئێمە کرێچی ئەو بووین. کاک حەمەد پیاوێکی کەم دوێ و هێمن بوو. زۆر کەیفی بە دۆستایەتی و تێکەلاوی ئێمە دەهات. کاک محەمەدی مەلا ئەحمەدیش پیاوێکی قسە خۆش و خۆش خولق بوو. زۆر ئارەزووی ئافرەتی جوانی دەکرد. لە سەردەمی گەنجایەتیدا، باوکی ئامۆزایەکی خۆی لێ مارە کردبوو بێ ئەوەی خۆشیویستبێ. ئەمەش لەلای ئەو ببوو بە گرێی دەروونی. بێ پەردەو ڕەتووش گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی خۆی دەردەبڕی، هەمیشە دەیگوت هەموو دنیات هەبێ کە ژن بە خواست و خۆشەویستی خۆت نەبوو ژیان نرخێکی نییە. کاک محەمەد تەنها حەسوودی بەو کەسانە دەبرد کە ژنەکانیان جوانە!. لەگەڵ ئەوشدا تەمەنی بەرەو(٥٠) ساڵ هەڵکشابوو، بەڵام هێشتا لەتین و تاقەتی گەنجایەتی نەکەوتبوو.

ماڵەکەمان گواستەوە بۆ شاری(نەغەدە) یەکەم ڕۆژ هۆنیایی کچم برد بۆ قوتابخانە کە وەرزی خوێندن دەستی پێ کردبوو، جیهانی شارو لادێ دوو دنیایی لێکتر جیاوازن. لە ئالۆەتان دار کردن، بان گێڕان، بەفر ماڵین و ڕاکەڕاکی ڕۆژانەی ژیانی دێهات ئەرکێکی گران بەڵام خۆش بوون. لە شار بەپێچەوانەوە لە جیاتی داربڕین و بان گێڕان و بەفر ماشتن، سووتەمەنی پاشەکەوت دەکرا، لە ئالۆەتان تەلەفزیۆنمان نەبوو لە نەغەدە تەلەفزیۆنێکی ڕەش و سپیم کڕی، وردە وردە لەگەڵ ژیانی شار ڕا هاتین...

## سەرۆ قادر:

لە ساڵی ١٩٨٥ وە کاک سەرۆ قادر دەناسم. یەکەمجار کە چاوم پێکەوت بینیم گەنجێکی عەینەکی قژ ئاماڵ لول، گفت و لفتی شیرین زۆر زیتەڵەو وریایە، کە پرسیاری دەکرد بە دیقەت وەڵامی پرسیارەکەی وەردەگرتەوە. زۆر خولیایی بیرو بۆچوون و تێڕوانینەکانی بووم. کەسێکی زۆر بە بەزەیی و بە ویژدان و ڕۆشنبیرێکی نوێخواز بوو، ناوبراو وەك هاوڕێیانی تر

بیری نەدەکردەوە، بە ڕاشکاوی هەڵوێست و ڕایەکانی خۆی دەردەبڕی، هەمیشە وەکو سەرکردەیەکی بابەتی و مەیدانی هەڵسوکەوتی دەکرد. لە گفتوگۆی تیۆریدا لایەنگرێکی سەرڕاست و دروستی پێکهێنانی حزبی شیوعی کوردستانی بوو. دەیان، وتار، نامیلکە و نووسینی بە ناوی(ئومید) بۆ سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراقی و سەرکردایەتی هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی عێراقی دەنارد و، پێی لەسەر بیرۆکەی کوردستانی دادەگرت، هەوڵی دەدا بۆ پێکهێنانی حزبی شیوعی کوردستان. کاك سەرۆ لە نزیکەوە سەروکاری لەگەڵ هاوڕێ عەزیز محەمەد سکرتێری حزبی شیوعی عێراقی و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی حزب هەبوو، بۆ ئەنجامدانی کاروباری (حزب) لە ناو ئێران دا کاك سەرۆ داهێنەرێکی سەر سوڕهێنەر بوو، دەیان ئەرك و کاری ئەوتۆی جێبەجێدەکرد کەم کەس دەوێرا و زاتی دەکرد بەو جۆرە خۆی بخاتە مەترسییەوە، لە هەموو کارەکانیشدا سەرکەوتوودەبوو. یەکێك لە خەسڵەتەکانی کاك سەرۆ بە وەفایی بوو بۆ هاوڕێیەکانی، بەتایبەتی برادەرانی خۆی، زۆر جار هاوڕێ و برادەرانی لە ناو زیندانی ئێراندا بە پارە دەربازدەکرد، بۆ دەربازکردنی هاوڕێیانی سەرکردایەتی هەموو توانایەکی مادی و مەعنەوی حزبی تەرخان دەکرد. لە دژوارترین بارودۆخ دا هاوڕێیانی سەرکردایەتی و کادری پێشکەوتووی حزبی لە ناو ئێراندا دەشاردەوە، کاتێ لەگەڵ سەرۆ کەوتمە ناو ئەرك و کاری رۆژانەی(حزب) ئەوەندەی تر کاك سەرۆم بە دڵدا چوو خۆشم ویست و رێزم لێ دەگرت. لەو ساوە هەتا ئێستاش ئەو خۆشەویستی و برادەرایەتییە درێژەی هەیە.

بۆ ئەوەی کارەکانی(حزب) لە ناو شاری نەغەدە لە چوارچێوەی هەیئەتێکی حزبدا تاوتوێ بکرێن، لیژنەیەکی حزبی پێکهات لە هاوڕێیان: حوسێن دەشتی، شەپۆل فەتحی و بەندە، بە سەرپەرشتی هاوڕێ سەرۆ. ناوبراو دەیویست لە دوای خۆی ئەو لیژنەیە سەرپەرشتی ئەرك و کارەکانی(حزب) بکات. خۆشەویستی نێوان هاوڕێیان و پەیوەندیی کۆمەڵایەتییان زۆر بەهێز بوو. هاوڕێ محسین یاسین ژنی دووەمی لە شاری شنۆ خواست، گواستییەوە بۆ نەغەدە بۆ ماڵی من و، ئێمە بووین بە خانە خوێی بووك و زاوا. خوشکە نازدار و هاوڕێ محسین یاسین بوون بە هاوسەری یەکتر. دوور لە گرمەی دەهۆڵ و زوڕنا بە بەشداری هاوڕێیان و مشوری خوشکە حەلیمەی کەریمی مام والی، ئاهەنگێکی خنجیلانەیان لە حەوشەی ماڵی ئێمەدا سازکرد. ماڵی کاك کەریمی مام والی و هاوڕێ حەسەن خدر لە یەك حەوشەدا بوون دراوسێی ماڵی

ئێمە. ماڵی کاك کەریم والی وەك ماڵی هاوڕێیانی خۆمان، دەیان ئەرك و کاری حزبی شیوعی تێدا ئەنجام دەدرا. کاك کەریم سەیارەیەکی هەبوو هاتوچۆیی قاسمەڕەشی دەکرد. زۆر دڵسۆزو بە سوود بوون بۆ هاورێیان بە گشتی و بە تایبەتیش بۆ من و منداڵەکانمان. خۆشکە حەلیمە ژنێکی زۆر رووخۆش و میهرەبانە، هەمیشە پرێسکەی دڵی خۆمان لای خوشکە حەلیمە دەکردەوە.

بارودۆخی سیاسی کوردستان و عێراق، خەریکبوو لە نائومێدی یەوە دەگۆڕا بۆ گەش بینی و ئاسۆیەکی ڕوونتر. مانگێك پتر بوو ڕژێمی سەرەڕۆی سەدام حوسێن کوێتی داگیرکردبوو. داگیرکردنی کوێت، لەسەر ئاستی ناودەوڵەتی هەرایەکی زۆر گەورەی لێ کەوتەوە. ئەمریکا و رۆژئاوا و وڵاتانی عەرەبی بە تێکڕایی داوایان لە ڕژێم کرد سوپاکەی لە(کوێت) بکشێنێتەوە، بەڵام سەدام لە جیاتی پاشەکشێ کردن، کوێتی کردە نوزدەمین پارێزگای عێراق. مێدیاکان رۆژانە سەرقاڵی گواستنەوەی هەواڵی داگیرکردنی کوێت بوون، کە ناونرا قەیرانی کەنداوی عەرەبی.

دوو مانگ بوو هاورێ هۆگر بە رێگای قاچاغی (ئێران- باکو) دا بەڕێ کرابوو، بەڵام نەگەیشتبۆ مۆسکۆ. هاورێ سەرۆ زۆر نیگەران بوو، وتی هەر چۆنێك بێت پێویستە سۆراغێکی بکەین، بۆ ئەوەی دڵنیابین ورچ خواردویەتی یا ئێران گرتوویەتی. بە مەبەستی سوسەکردنی رێگاکە، من و هاورێ حەسەن خدر، لەگەڵ ئەو دەلیلەی شۆفیری رێگاکە بوو، بڕیارمان دا بە وردی سۆراغی رێگاکە بکەین. شوفێرەکە ناوی هیوا بوو خەڵکی شاری مهاباد بوو. هەر ئەویش هۆگری بەڕێ کردبوو، لەبەرنامە دابوو هاورێیانی تریش بەو رێگایەدا بەڕێ بکات.

لە رۆژی ١٩٩٠/١٢/٩ هەرسێکمان وەرێکەوتین. هاورێ(هیوا) سەیارەیەکی ڕێنوی بچووکی پێ بوو. وابزانم (حزب) سەیارەکەی بۆ کڕی بوو. هیوا شۆفێر و ئێمەش یاوەری بووین. (٩) کاتژمێر رێگامان بڕی، کاتی گەیشتینە سەر سنووری باکو ناوچەیەکی خۆش و کەش و هەوایەکی شێداری هەبوو، دارستانێکی زەبەند و چڕوپڕ بوو. هاورێ حەسەن خدر لای سەیارەکە مایەوە، من و هاورێ هیواش بە ناو لێرەوارێکە ڕۆیشتین. هیوا وتی هۆگر لێرەوە سەرەو ژێر بۆوە. بەو باریکە رێیەدا ڕۆیشتین تا گەیشتینە سەر سنووری ئازربایجان، لە تەلی درکاوی سنوورەکە گەڕاینەوە. هاورێ هیوا وتی وریا بە دەستی لێ نەدەی، ئەگینا زەنگ لێ

دەدات و، پاسەوانەکانی سنووری سۆڤیەت بۆمان دێن زیندانیمان دەکەن. لە لێواری سیمی سەر سنوور بسکویت و قوتوی معەلەباتی لێ بوو کە هاوڕێیان خوارد بوویان. بە داخەوە هیچ شوێنەوارێکمان نەدۆزییەوە، کە دەریخات هاوڕێ هۆگر دڕندە پەلاماری دابێ. هەرسێکمان پێمان وابوو ئێران زیندانی کردووە. بەڵام بۆچی لە ئێرانیش سۆراغی نییە و کەس نازانێ لەکوێیە؟!. هۆگر بووە بەردی ناو گۆم و بزربوو. هاوڕێ هۆگر یەکێك بوو لە نووسەرو رۆشنبیرە ناسراوەکانی ئەو رۆژگارە، دەیان بابەت و وتاری سیاسی لە رۆژنامەی بەرەی کوردستانیدا بڵاوکردەوە. ناوبراو ژیانی هاوسەری لەگەڵ ژنێکی ڕووسی پێکهێنابوو، دەیەویست بگەڕێتەوە مۆسکۆ بۆ لای هاوسەرو منداڵەکانی، کەچی بەو چارەنووسە گەیشت.

## پەلاماری هاوپەیمانان:

شەوی ١٧-١٨ /١٩٩١/١/، ئەو شەوە بوو کە هەموو مرۆڤایەتی چاوەڕوانی ڕووداوێکی گرینگیان دەکرد، کە پەلاماردانی وڵاتانی هاوپەیمان بوو بۆ سەر سوپای عێراق لە ناو(کوێت). شەوی ١/١٧، بە ئەرکێکی(حزب) سەردانی بارەگای (نۆکان)م کرد بوو، ئەو شەوە لەوێ مامەوە. زۆربەی بارەگاکانی(حزب) لە نۆکان و دۆڵەکۆگە ئامێری تەلەفزیۆنیان هەبوو. هەموو هاوڕێیان ئەو شەوە نەخەوتین، بە رادیۆ و (TV) چاوەدێری بارودۆخەکە و گوێبیستی هەواڵەکان بووین. هەموو هەواڵەکان بە دیقەت وەردەگیران. کاتژمێر بوو بە٢:٣٠ی شەو، فرۆکەکانی هاوپەیمانان پایتەختی عێراق بەغدایان بوردومان کرد. لەو کاتەوە قۆناغێکی نوێی سیاسی لە عێراق و کەنداوی عەرەبی هاتە ئاراوە. ماوەی(٤٠) رۆژ لەسەر یەك فرۆکە و ڕۆکێتی دورهاوێژی دەریا-زەوی هەمەجۆر، پێگەی موشەك و مۆڵگەکانی سوپا، دەزگاکانی مخابرات، ئیستخبارات و گاردی کۆماری ڕژێمیان بوردومان کرد ...

لە سەرەتای جەنگی کەنداو هاوسەنگی جەنگەکە گۆڕا، بە ئاشکرا ئەنجامەکەی دیار بوو. کاك سەرۆ بڕیاری حزبی وەرگرتبوو بەرەو هەندەران بڕوات، بەڵام کە جەنگ دەستی پێکرد پاشگەز بۆوە نەرۆیی. هاوپەیمانان بەردەوام لە کوێت و ناو خۆی عێراق، بۆردومانی پێگەکانی ڕژێمی عێراقیان دەکرد. لیژنەی حزبی نەغەدە کۆبووینەوە، لە کۆبوونەوەکەدا چەندان پێشنیاری بە سوودمان لە کۆبوونەوەکەدا تۆمارکرد. مەحزەرەکەم برد بۆ لیژنەی هەرێمی کوردستان، کە هاوڕێ مام قادر، مەلا حەسەن، مام سالح بوون. مام قادر پێی وابوو

هاوپەیمانان هێرشی پیادە ناکەنە سەر سوپای عێراق، بەڵکو بەهۆی پەلاماری ئاسمانی و ڕۆکێتەوە، ڕژێم ناچار دەکەن پاشەکشێ بکات و، بەمجۆرەش جەنگ کۆتایی دێت...

بارودۆخی ناوخۆی عێراق ڕۆژبەڕۆژ بەرەو خراپی دەڕۆیشت. قەیرانی ئابووری زۆر بە خێرایی پەرەیساند، چونکە ئابووری عێراق پێشتر بەهۆی جەنگی عێراق – ئێران داهێزرا بوو. ڕۆژانە بە سەدان کەس، لە ترسی سەربازی و ڕاپێچ کردنیان بەرەو بەرەکانی جەنگ، بەرەو ئێران ڕایان دەکرد. سوپای عێراق شیرازەی لەبەریەك ترازا بوو. ڕاکردووانی جەنگ ئەوەندە زۆر بوون، لە ناو شاخ و دەشت و دەوروبەری شارەکان، خۆیان دەشاردەوە. کێوەڕەش یەکێك بوو لەو شوێنانەی ڕاکردوان خۆیان تێدا حەشار دەدا و بە شەوو ڕۆژ لە ناو ئەشکەوتەکانی کێوەڕەش دەمانەوە. بارودۆخێك دروست بوو، چاوەڕوان دەکرا ڕاپەڕین بەرپابێت...

## ئامادەکاری بۆ ئەگەرەکان:

پارتی و یەکێتی یەك بە یەك و دوو قۆڵی خۆیان ئامادە دەکرد بۆ ئەگەرو پێشهاتەکان. ئەگەرچی لایەنەکانی تر وەکو حزبی شیوعی و سۆسیالیست ئەندامی دامەزرێنەری بەرەی کوردستانی بوون، بەڵام پارتی و یەکێتی بەجۆرێکی تایبەت حزبی (شیوعی و سۆسیالیست)یان پەراوێز خستبوو. ڕۆژێك هاوڕێ مەلا حەسەن ڕۆیشت بۆ قاسمەڕەش، کە گەڕایەوە وتی پێم وایە یەکێتی و پارتی، هەر بۆخۆیان راوێژ لەگەڵ یەکتر دەکەن. لەڕاستیدا دوای پەلاماری ئاسمانی بۆ سەر سوپای عێراق، سەرۆك بارزانی زۆر لە قاسمەڕەش لای سەرکردایەتی یەکێتی دەمایەوە، جاری وا هەبوو هەفتەیەك پتر لە قاسمەڕەش دەبوو، چونکە ڕووداوەکان زۆر خێرا بەرەو پێش دەڕۆیشتن. لە ١/١٧/وە بەردەوام لە هاتوچۆدا بووم بۆ نۆکانێ و ئۆردووگای سونێ. پەیتا پەیتا بەرپرس و هاوڕێیانی ناوەوە سەردانیان دەکردین. یەکێك لەو هاوڕێیانەی چەند ڕۆژ پێش ڕاپەڕین سەردانی کردین(کاکەڕەش) بوو، کاکەڕەش بارودۆخی ناوەوەی باس کرد و ڕای وابوو ڕاپەڕین ڕوو دەدات و داوای کرد حزب پشتگیری بکات. منیش پێم ڕاگەیاند حزب بە هەموو شێوەیەك هاوکاریتان دەکات هەرچی پێتان دەکرێت بیکەن. لە گەڕانەوەمدا، لامدا بۆ بارەگای هاوڕێیانی مەحەلی هەولێر. هاوڕێ مام سالح و هاوڕێ کانەبی گەورەو محسین یاسین و ملازم شێرزاد لە وێبوون. پێم ڕاگەیاندن بارودۆخەکە لە سنووری بیتوێن بەرەو ڕاپەڕین دەڕوات، پێشنیارم کرد کۆبوونەوەیەك بکەین، دەربارەی بارودۆخەکە، هاوڕێ

مام ساڵح هەر ئەو کاتە چوو بۆ لای هاوڕێ مەلا حەسەن و هاوڕێ مام قادر، بڕیاردرا بۆ رۆژی دواتر کۆبوونەوەکە گرێ بدرێت. لە کۆتایی مانگی شوبات دەیان کادری مەیدانی کۆبوونەوە و ئەگەری رووداوەکانیان تاوتوێ کرد. بەشداربوان بریتی بوون لە: مەلا حەسەن، مام ساڵح، مام قادر، کانەبی گەورە، ئەبو دڵشاد، محسین یاسین، ملازم شێرزاد، مام جوامێر، باوکی راستی(سامی) مام خدر ڕوسی لە هەولێر، محەمەد خدر، شەپۆل فتحی لە پشدەر و، ئەم خاڵانەی خوارەوە بڕیاریان لەسەر درا:

١- (٨) مەفرەزە لە هاوڕێیانی هەولێر، کۆیە، پشدەر، پێك بهێنرێت و، بە زووترین کات هاوڕێکان دەست نیشان بکرێن و پەیوەندی بە بەرپرس و جێگاکانییەوە بکەن...

٢- ئەو مەفرەزانە بە شێوەی پارتیزانی لە سنووری شارو شارۆچکەکانی کوردستان لە جوڵان دابن. هاوئاهەنگی بکەن لەگەڵ بەرپرسی رێکخستنەکانی ناوەوە لە سنووری چالاکی ئەو شوێنە کە مەفرەزەکە بۆی دیاریکراوە...

٣- پەیوەندی بکرێت بە هێزی پێشمەرگەی لایەنەکانی تری بەرەی کوردستانی. هەر مەفرەزەیەك لە سنووری چالاکی خۆیدا، دەسەڵاتی پێدرا لە چوارچێوەی هاویکاری بەرەییدا، هاوکاری لایەنەکانی بەرەی کوردستانی بکات و چالاکی سەربازی و رێکخراوەیی و ... هتد ئەنجام بدات.

٤-پێداویستی ئەو مەفرەزانە دابین بکرێت کە دادەبەزن، پێویستییەکان وەکو پێڵاوی ئەدیداس، چەك و تەقەمەنی و جل و بەرگ و شتی تر.

٥- دەلیلی رێگای نۆکان بەرەو کێوەڕەش، ئەرکی هاوڕێیانی پشدەر بوو. دوای کۆبوونەوەکە پەیوەندیم کرد بە هاوڕێیانی لقی پشدەرەوە. لە ناو ئەو هاوڕێیانەی کە بۆ ئەرکی دەلیلی رێگا گونجاو بوون، هاوڕێ عەلی سیدە بوو، کە بە یەکێك لەو هاوڕێ تێکۆشەرانە دادەنرێ و کوڕی رۆژانی تەنگانەیە. هاوڕێ عەلی سیدە هەر ئەو رۆژە گەیشتە جێ. بڕیاردرا یەکەم جار سێ هاوڕێ خۆیان و مەفرەزەکانیان دەربازبکرێن، کە هاوڕێ مام جوامێر، محسین یاسین، هاوڕێ سامی ئەبو راستی، بوون. لە ١٩٩١/٣/١ ئەو سێ مەفرەزەیە بەرەو ناوەوە وەڕێکەوتن. مەفرەزەکانی تریش لە نۆکان چاوەڕوانی گەڕانەوەی هاوڕێ عەلی سیدە بوون، چونکە بناری رەزگەو مارەدوە هەمووی مینڕێژکرابوو، تەنانەت کانی و رووبار و قەدی داری لێڕەواری بناری رەزگەش نەمابوو، مینی لێ دانەنرابێ. هاوڕێ عەلی سیدە کە کوڕی ئەو

بنارەیە، هەر خۆی باریکە ڕێگایەکی لە مین پاك کردبۆوە. ڕێگاکە تەنیا خۆی و چەند هاوڕێیەك شارەزای بوون. بۆ ئەوەی ڕێگاکە سەلامەت بێت بە هەموو کەس نەدەگوترا. ڕۆژانی ١،٢،٣،٤،٥ /٣/١٩٩١ نۆکان خرۆشا هەموو لایەنەکانی بەرەی کوردستانی لە حالّەتی ئامادەباشیدا بوون. لایەنەکانی تریش خەریکی دابەزاندنی مەفرەزە بوون بەرەو ناوەوە، ئەوانیش کێشەی ڕێگایان هەبوو، هیچ لایەك ڕێگای تایبەتی خۆی بۆ ئەوی تر ئاشکرا نەدەکرد، ڕووداوەکان زۆر خێرا بوون، هەر چۆنێك پەلەت دەکرد، کەچی ڕووداوەکان خێراتر تێدەپەڕین...

## ڕاپەڕین:

ڕۆژی ١٩٩١/٣/٥ ڕۆژێکی هەورو باران بوو، بارانێك دەباری وەك کوندەی سەرەوژێر. ئەو ڕۆژە لە ڕۆژەکانی تر جیاواز بوو. ئاسمان تووڕەبوو زۆر تووڕە. بە خەیالّ و ئەندێشەی خۆمدا ڕۆچووبووم. لە ناو جێگاکەمدا جینگڵم دەدا. بەتانییەکەم لەخۆم کردەوە و هاتمە دەرێ، دنیا بولێڵ بوو، لە ژێر سوانەی خانوی بارەگای نۆکان خۆم کرۆشم کرد. سەیری شەپۆل و کەفچڕینی چۆمی نۆکانم دەکرد. مەگەر ئەو بارانە هەر لە دەڤەری پشدەر باری بێت؟! ڕووباری نۆکان لە کاریتە درێژەکەی ژێر پردەکەی دەدا، لە دڵی خۆم دا دەمگوت دیسان وەك ساڵی گۆڕین پردەکە لەگەڵ خۆی دەبات. هێمای ڕووبارەکە لە پێچ و خشکەی مار دەچوو هەر هاشەی دەهات. ئەو پێچەی دەهاتەوە سەر پردەکە زۆر بە تووڕەیی شەپۆلی دەدا دەنگی دەگەیشتە لای بارەگا. منداڵ بووم دایکم باسی تووڕەیی ڕووباری دەکرد، دەیگوت ڕۆڵە ڕووبار، کە ویستی کەتنێك بکات وەکو ئەسپ دەحیلێنێ، ئەو حیلاندنە لەبیرناکەم بە منداڵی زۆر بیرم لە حیلاندنی ڕووبار و چۆمەکان دەکردەوە تەنانەت لە کاتی حەراسەتی شەوانی پێشمەرگایەتیش دا حیلە ڕووبارم لەبیر نەدەکرد، سەرنجی نیگاکانم هەر لەسەر لرفە لرف و حیلەی ڕووباری نۆکان بوو، وتم ئەوێ ساڵی جارێك ئەو ڕووبارە حیلاندی هاوڕێیەکی تێکۆشەری عەرەبی ڕاپێچی ناو شەپۆلەکانی خۆی کرد، دوای سێ ساڵ لە ژێر پردێکی دەستە خوشکی ئەو پردە لە گوندی بەردقسل دۆزرایەوە، وا ئەمڕۆش ڕووباری نۆکان و ناوزەنگ دەحیلێنن دەبێ مەرگی کێی پێوە بێت، خوابکا خێر بێ، ئەمجارە مەرگی ڕژێمی دیکتاتۆری پێوە بێ. ئەگەر وابوو، بەڵێن بێت خۆشمبوێت، بەڵام ئەگەر ئەمجارەش گیانی تێکۆشەرێك دروێنە بکات بە نەفرەتی

دەکەم... لە ژێر پاڵتۆ خاکییەکەم توند ئەژنۆکانم لە باوەشم گرتبوو، وەکو شتێك لە ژێرم ڕابکات وابوو هەر دە پەنجەم لە هەر دوو ئەژنۆم کردبوو بە قوڵفە. لەبەر سڕ بوونی پێیەکانم جوڵەیەکم کرد، هاوڕێی حەرەس هەستی پێکردم و وتی ئەوە هەر لێرەی؟ هاوڕێ وەرە ژوورەوە کاتی هەڵساندنی هاوڕێیان هاتووە...نانێکی بە پەلەمان خوارد ژەمی بەیانیانی بارەگاکان راشی، گوێز، پەنیر، هێلکە بوو. من زۆر ڕقم لە ڕاشی بوو، بەڵام برادەرانی عەرەب گاڵەیان پێدەکرد. ئەو بەیانییە هێلکەی کوڵاو هەبوو، هەر هاوڕێیەك دوو هێلکەی بۆ دانرابوو. دوو هێلکەو لەتکە پیازێکی شیرینم هەڵگرت و، پشتم وەتاشە بەردێکی بناغەی خانووی بارەگادا، سەرنجم هەر لەسەر تووڕەیی رووبارەکە بوو قەپاڵی گەورە گەورەشم لەپارووی نان و هێلکەی کوڵاو دەدا... هاوڕێیەك وتی: ئەرێ هاوڕێ کاتی ئەوە نەهاتووە بڕۆین؟... خێرا خۆم پێچایەوە، کۆڵەپشت و تاقمە مەخزەنی پڕ لە فیشەکم لەخۆ بەست و، لەگەڵ هاوڕێکانم کۆڵەپشت و بارانگیرمان هەڵگرت و بەرەو سونێ وەڕێ کەوتین. لە رێگادا پۆل پۆل خەڵکی شێنێمان دەبینی، لە ئۆردووگای حاجیاواوە دەگەڕانەوە بۆ شێنی. دەیانگوت بارەدۆخی حاجیاوا تێکچووە، خەڵك خەریکی ئەوە بوون لە حکومەت راپەڕن. گوندی سونێ و بەرقسل پڕ بوو لە هێزی پێشمەرگەی بەرەی کوردستانی، چاوەڕوانی بارودۆخەکەیان دەکرد، هاوڕێیانی هەولێرو کۆیەش گەیشتن، مام کانەبی گەورەو ملازم شێرزاد بەیەکەوە بوون، وەکو رۆژانی رابردوو تاوتوێی بارودۆخەکەیان دەکرد، برادەرانی یەکێتی وەکو فاقە محموری و ژمارەیەکی تر کە ناویان نایەتەوە بیرم بە هێزێکەوە لە سونێ و بەردقسل بوون. کاك فاروق وتی راسپاردەیەکمان ناردوە بۆ لای ئامر فەوجی گۆجارێ بۆ ئەوەی بەبێ جەنگ خۆیان رادەستی بەرەی کوردستانی بکەن. ئەگەر خۆیان رادەست نەکەن پەلاماریان دەدەین. ئێمە هەر خەریکی قسە کردن بووین کە وەڵامی ئامر فەوجی گۆجاری هاتەوە، راسپاردەکە پیاوێك بوو نەم دەناسی وتی ئامر فەوج دەڵێ چاوەڕوانی فرقە دەکەم ئەوان خۆیان رادەست کرد منیش فەوجەکە رادەست دەکەم، کە ئەو قسەیەمان لە ئامر فەوجەکە بیست زانیمان بارودۆخەکە ئاڵۆزە شیرازەی ڕژێم تێکچووە. هێزێکی هاوبەش بەرەو فەوجەکە ڕۆیشتین، پێشمەرگەش خەبەری بیستبوو کە حاجیاواو چوار قورنە راپەریون و ناوچەکە ڕزگارکراوە، زۆر بە دڵ گەرمی و حەماسەتەوە بەرەو فەوجەکە دەڕۆیشتین ئەو ڕۆیشتنەی ڕۆیشتن هەتا ناو فەوجی گۆجاری نەگەڕاینەوە، فەوجەکە هیچ تەقەی نەکرد. لە چاو تروکانێکا هەرچی چەك و کەل و پەلی

فەوجەکە هەبوو دەستی بە سەردا گیرا، ئەو فەوجەی پێش کاتژمێرێك وەکو قوللەی قاف سەیردەکرا، وەکو پۆڕی خوراوی لێهات پەڕو باڵی بلاوبۆوە. (٥٩) سەربازو ئەفسەرێك دیلکران، رێگەیان درا لەسەر ئارەزووی خۆیان بەرەو ئێران بڕۆن. ئەو کاتەی فەوجەکە دەستی بە سەردا گیرا، پێشمەرگەیەك دەمانچەی لە قەدی ئامر فەوجەکە کردەوە، یەکێکی تر لە پیشمەرگەکانی یەکێتی دەیگوت دەمانچەکە هی خۆم بووە، ئەو ئامر فەوجە هەر گوللەباران دەکەم، ئامر فەوجەکەش زۆر دەترسا، کەزانی ئێمە هاوڕێیانی حزبی شیوعی عێراقین هانای بۆ هێناین، رووی لە من کرد وتی(٥) مندالم هەیە مەهێلە ئەو پێشمەرگەیە بمکوژێت، وتم شتی وانابێ رێگا نادەین نەك هەر تۆ هیچ سەربازێکیش لوتی لە خوێن بێ، تازە ئێوە دیلکراون دیلیش ناکوژرێت. ئێمە هەم لە هاوڕێیانی خۆمان مام کانەبی و ملازم شێرزاد دابڕاین هەم لە کاك فاقە مەحموری، تەنانەت رادیۆیەکەم کە بە کاك فاقە بوو بردی. ئەو ئەفسەرو سەربازانەی لە فەوجی گۆجاری دیلکرابوون هەتا گوندی بەردقسڵ یاوەرو چاوەدێریان بووین بۆ ئەوەی دەست درێژیان نەکرێتە سەر. ئامر فەوجەکە لە بری ئەو هەڵوێستەی ئێمە نیتاقێکی پێ بوو لە خۆی کردەوەو بە دیاری پێشکەشی کردم، ئێستاش ئەو دیارییەم پاراستووە، کە ئەفسەرو دیلەکان بەرەو ئێران ڕۆیشتن ئێمەش گەڕاینەوە، کاتێ گەڕاینەوە ئەو سەیارانەی بۆ گواستنەوەی هێزی پێشمەرگە هاتبوون گەڕابوونەوە، ناچاربووین بە پێیان ملی رێگا بگرین هاوڕێ شوانە و هاوڕێیانی تر وتیان ئەو قوڕشێلانەت تووش کردین، وتم لەسەر هەڵوێستی مرۆڤ دۆستی بووە پەشیمان مەبن. بارانی ئەو رۆژە هەر نەیکردەوە قوڕوقاڵی رێگای سونێ- قەلادزێ لە کەفی سابوون دەچوو، خۆمان پێوە نەدەگرت، پێلاوی ئەدیداس و بەرگی بارانیمان لەبەر بوو وەك لەناو قوڕەکەدا سەما بکەین وابوو. کاتێ بە ناو تۆڕی رەبیەو کەلاوەی مۆڵگاکانی ڕژێم دا شۆڕدەبووینەوە، ئەوەندە دڵخۆش بووم هەستم بە ماندووبوون و برسێتی و سەرماو لێزمەی باران نەدەکرد گیانمان تەڕ بوو، دڵمان گەرم. ئەو شەوانەم دەهاتەوە یاد کە لەگەڵ هاوڕێیاندا بەرەو قەلادزێ دەڕۆیشتن، حەزم دەکرد داروبەردی دەڤەری پشدەر ماچ بکەم، پڕ بە گەروم بڵێم پشدەر گیان ئەو دوژمنە سەر سەخت و دڕندەی تۆی راگواست، کانیاوەکانی کوێر کردییەوە، گۆڕستانەکانی بە(T.N.T ) تەقاندییەوە، وا ئەمڕۆ بە پێی پەتی و شەرمەزاری داوادەکەن رۆڵەکانت داڵدەیان بدەن، خۆیان بە تاوانبار دەزانن. چەند کاتژمێر بەر لە ئێستا پشدەر ناوچەیەکی قەدەغەکراو بوو، هاوڕێ شوان وتی ئێمە دڵ ساف و سادەین بۆچی

خۆمان لە هاوڕێکان دابڕی بۆ ئەوەی گیانی چەند سەربازێکی دوژمن رزگار بکەین لە دەستی تۆڵەی پێشمەرگە؟ وتم: نا، پێشمەرگەو خەڵکی کوردستان رەوشت بەرزن، لێبوردەیی لە سەرۆك و باوك و باپیرانمانەوە سەرچاوەی گرتووە، کوشتنی خەڵکی بێ دەسەڵات و دیل ئازایەتی نییە، کاتی گەیشتینە خڕو دۆپەکانی گوندی **چۆم خڕکە**، سەیری کەلاوەی چۆم خڕکەم کرد ماڵی دۆست و برادەرەکانم هاتەوە یاد وەکو ماڵی کاك **محەمەدی** کامەلای بێگەلاسی و براکانی کاکە سوارە کە دەیان شەو هاوڕێ مستەفا و هاوڕێکانی تر نمەکیان کردوون لە خەوی شیرین هەڵیانستاندوون، بێ ئەوەی تاکە جارێکیش نێوچاوانیان گرژ بکەن، پێخۆری رێگایان بۆ بپێچاونەتەوە. بەو خەیالانەدا رۆچووبووم، هاوڕێ شوان وتی هاوڕێ دەنگی تراکتۆر دێت، بەڵکو جێگای هەبێ سوارمان بکات و زوو بگەینە رانیە. بێ ئەوەی دەست ڕابگرین تراکتۆرەکە راوەستا، شۆفێرەکە فەرمووی کردین، وتی سوار بن، بێ سێ و دوو خۆمان هەڵدایە سەر تراکتۆری تاین. خاوەن تراکتۆرەکە وتی لە بەیانی زووەوە بەردەوام خەریکی گواستنەوەی هێزی پێشمەرگەم. شۆفیرەکە ئاوڕێکی بۆ لای من دایەوە، زەردەیەکی هاتێ و وتی قەلادزێ دەبینن چی بەسەر هاتووە؟ چۆن کاول و وێران کراوە؟ بە قوربانتان بم لەگەڵ ئەو درندانە شەڕی مان و نەمان بکەن، یا هەموومان دەمرین یا لەم دوژمنە رزگارمان دەبێ. شۆفیرەکە پاکەتێکی لە باخەڵی پاڵتۆکەی دەرهێناو فەرمووی جگەرەی کردین، سوپاسمان کرد و وتمان هیچمان جگەرەکێش نین. لە دڵی خۆمدا گوتم حەسەن لە کوێی پڕ بە پاکەتە جگەرەی کابرادا بکەیت!. شۆفێری تراکتۆرەکە پیاوێکی دەستە پیاو بوو تەمەنی لە(٤٠) ساڵ زیاتر بوو، ڕیشی ماشو برنج بوو زۆر لە ئێمە پێشمەرگەتر بوو. سەیرێکی شۆفێرەکەم کرد و وتم گەلێك خەڵکی ئەوا دڵسۆزی هەبێت چۆن ژێردەستی قبوڵ دەکات، لە شۆفێرەکەم پرسی خەڵکی کوێی؟ لە وەڵامدا وتی: بە قوربان خەڵکی ئەو پشدەرە کاول کراوەم، ماڵم لە ئۆردووگای حاجیاوایە، دوو ساڵە راگوازراوین، ئەوە یەکەم جارە بگەڕێنەوە پشدەر. بە غاباتی قەلادزیدا ڕەتبووین شۆڕبووینەوە بەرەو پردی ژاراوێ، لە وێشەوە بۆ رووباری شەروێت، حەزمدەکرد کاتم هەبێ لەو جێگایانە وچانێك بدەم، هەڵتروشکێم و لوێچێك ئاو لەهەر یەکێك لەو رووبارەکانی پشدەر بخۆمەوە، بە ئاسوودەیی ئاخ هەڵکێشم و بڵێم ئافەرین پشدەر وا دوژمنەکەت بەزاند، تۆ نەبەزی. ئاخر هەقم بوو، کوێی پشدەر هەیە بۆ من و پشدەرییەکان یادگاری نەبێ. گەیشتینە راست گوندی بەستەستێنی خوارێ و سەرێ، ئۆردووگای

بەستەستێن، وەك ئەوەی نوێژم دابەستبێ وابوو بە پێچەوانەی(قیبلە) بەرەو قەندیل دەمڕوانی، دەتگوت برادەرەکانم بانگم دەکەن و دەڵێن وەرە یاری قەرەرۆ قەرەرۆی بکەین، برایم لە لایەك، حوسێن لە لایەکی دی، عەولا لەو سەری یەخەم دەگرێ و دەڵێ: وەرە گرەو لەسەر سوارچاکی بکەین، منیش وەك ئەوجارە ملی ئەسپێکی ڕەوەکیم گرتووەو لە بناری بیری بێ لغاو بەبێ زین و کورتان سوار بووم، هەر سواربووم و هەڵیگرتم، چ هەڵگرتنێك لە ئاو بارەو خەندرك و کاولە خانووی رووخاویش نەدەگەڕایەوە، توند کەزییەکانم گرتبوو، وەکو گەنە بە پشتی ئەسپە(شێ)وە نووسابووم، تەنها گوێم لە دەنگی برادەرەکانم بوو هاواریان دەکرد: ئافەرین سواری چاکی وەکو(حەمە) کەمە، منیش سوارنەبووم، بەڵکو ولاخەکە هەڵیگرتبووم... بیرم دەکردەوە لە کوێ دەکەوم، لە ناکاو ئەسپە شێ کەفەزگ بوو، لمبۆزی وەکو گزۆزی سەیارە هەڵمیان لێ دەهاتەدەر، لە نزیك جۆگای سیفۆن راوەستا ئارەقێکی کردبوو هەموو گیانی شەلاڵ بوو، خێرا خۆم فڕێدا، بە ڕاکردن ڕامکرد بەرەو برادەرەکانم، هەموویان لە سوارچاکی من سەرسام بوون، منیش کەیفم بە خۆم دەهات لە دڵی خۆشم دا دەمگوت جارێکی تر هەڵەی وا ناکەمەوە سواری ولاخە بەرزە بم. کاتێ گەڕامەوە مام ئەحمەد وەرانگەی دراوسێمان وتی: رۆڵە ئەوە بۆ بێ لغاو سواری ئەو ولاخە بوویت؟ تۆ دەزانی کە ولاخەکە لە گۆشەی خانووی خۆتان پێچی کردەوە، خەریکبوو سەرت بە کاریتەی کەپری ئێمەوە بڕوات...

نازانم سواری تراکتۆرەکە چەندی خایاند، پێم وابوو کەژاوەیەکە تایبەت بۆ من رازاوەتەوە چونکە ئەو رۆژە بۆ من رۆژێکی مێژوویی و وەرچەرخانێکی گرینگ بوو، بە ئازادی و سەرکەوتوویی دەگەڕێمەوە بۆ ئەو جێگایەی(١٢) ساڵ بوو پێیدا نەڕۆیشتبووم بەسەربەستی. کاتێ گەیشتمە بەرامبەر رێگای ئۆردووگای بەستەستێن، بیرەوەری ئازیزێکم هاتەوە یاد کە هاوڕێیەکم دەیگوت لە کچە هیندییەکە دەچێ. کچە هیندییەکە لە راپەڕینی شاری قەلادزێ لە رۆژی ١٩٨٢/٤/٢٤، کاتێ جەماوەری ئۆردووگای بەستەستێن بۆ پشتگیری راپەڕینی شاری قەلادزێ شەقامی(رانیە، قەلادزێ) یان کۆنترۆڵ کردبوو، کچە هیندی یەکە وتی منیش چووم بۆ سەر شەقامی گشتی و بە دەستی خۆم بەردم هەڵگرت بۆ ئەوەی بەربەستێك لەسەر رێگاکە دروست بکەین. چیرۆکی کچە هیند یەکەش بەسەرهاتێکی تری ژیانی کلۆڵی گەنجایەتی منە... هێشتا هەر لە ناو ئەو بیرەوەرایانەدا ڕۆچوو بووم سەیرم کرد تراکتۆرەکە لە کەلێنی دەربەند رانییە ئاوا بوو... جلەکانم تەڕ و بڕ بوون، بەلام بە هەڵمی لەشم بەرەبەرە

وشكدەبوونەوە. برسی و ماندوو، گەیشتینە رانیە شۆفێری تراکتۆرەکە فەرمووی کردین میوانی بین، قبولّمان نەکرد، سوپاسمان کرد و بەرەو مزگەوتی گەورە ڕۆیشتین. پێش ئەوەی بگەینە مزگەوت گوێبیستی دەنگی میکرۆفۆنی راپەڕین بووین، چووینە ژووری مزگەوت، ناوی مەفرەزەکەمان لەسەر بلّندگۆی مزگەوتی گەورە راگەیەنرا، خێرا دەیان هاوڕێی شاری رانیە لە دەوروبەرمان کۆبوونەوە، لەوێ لەگەلّ هاوڕێ کانەبی گەورەو ملازم شێرزادو هاوڕێیانی تر یەکترمان گرتەوە، چووین بۆ مالّی هاوڕێیانی خۆمان، مالّی هاوڕێ عەبدوللّا ڕەش، مالّی مام حەمەدەمین ئاللّاوێردی، کاك عوسمانی مام حەمەدەمین ئاللّاوێردی مام عەبدوللّا تاپرو سەلام حەوێز کە وەك بارەگای حزب وابوون جمەیان دەهات لە هاوڕێیانی پێشمەرگەو هاوڕێیانی تری رێکخستن.

## وەرچەرخانێکی گرینگ:

نازانم ئەو شەوە چۆن رۆژ بۆوە، ئەگەرچی زۆر ماندووبووین، بەلّام زۆر کەم خەوتین، بەیانی زۆر زوو خۆمان ئامادەکرد بە دەیان ئەرك و کاری هەمەجۆرە پەیدابوون، کە پێویست بوو بە پەلە جێ بە جێ بکرێن، وەکو دۆزینەوەی شوێنێك بۆ بارەگای(حزب) پێکهێنانی لیژنەی بەرەی کوردستانی، ئامادەکاری راپەڕین بەرەو شارەکانی تری هەولێر و سلێمانی...هیتر. ئەو شەوە راپۆرتێکی دوورودرێژم بۆ هاوڕێیانی لیژنەی سەرکردایەتی هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی عێراقی نووسی. لە راپۆرتەکەدا ئاماژەم کرد بوو بە چەندان دەستکەوتی گرینگ لەوانە: دەبابەیەکی بەرازیلی و سەدان پارچە چەکی جۆراوجۆر سەیارەو دەستکەوتی تر، نووسیبووم تەنها دوو دەبابە دەستی بەسەردا گیراوە لە راپەڕیندا یەکێك دەست هاوڕێیانی خۆمان و، ئەوی تریش دەست برادەرانی پارتی کەوتووە. ئەو رۆژە واتا رۆژی دووەمی راپەڕین نامەکەم نارد بۆ بارەگای لیژنەی هەرێمی کوردستان لە نۆکان و ناوزەنگ، گفتوگۆکان زۆر بە خێرایی دەکران بە خێراییش بڕیار وەردەگیراو جێبەجێدەکرا. رۆژی دووەم و سێیەمی راپەڕین سەدان(دیل) لە بەرپرسانی ئەمن و ئیستخبارات و ئەفسەرو سەربازەکانی ڕژێمی عێراق لە مزگەوتی گەورەی رانیەو مزگەوتەکانی تر کۆکرابوونەوە، لیژنەیەك لە لایەنەکانی بەرەی کوردستانی پێکهاتبوو سەرپەرشتی دیلەکانیان دەکرد. یەکێك لەو هاوڕێیانەی ئێمە خوشکە(زارا) بوو رۆلّێکی سەرەکی گێڕا لە سەرپەرشتی کردنی دیلەکان، تاکە ئافرەت بوو لە

ناو گەنجەکاندا، وەك کچێکی دەروازەی ڕاپەڕین کاری ڕۆژانەی ڕادەپەڕاند، لە ناو لیژنەی سەرپەرشتی دیلەکان ئەو هاوڕێیە بەرگێکی خاکی پێشمەرگایەتی لەبەر کردبوو زۆر چالاك و وریا بوو. هەواڵی هەمەجۆرە بڵاودەکرایەوە لەسەر چارەنووسی (ڕاپەڕین) سیخوڕو نۆکەرانی ڕژێم پڕوپاگەندەیان لە ناو بازارو شەقام بڵاودەکردەوە کە ڕانیەش وەکو شاری هەڵەبجە کیمیاباران دەکرێت، تەنانەت پڕوپاگەندەکە کاری کردبوو لەسەر هەندێك سەرکردەی زۆر بە ناوبانگی لایەنە سیاسییەکان، یەکێك لە سەرکردەکان کە نامەوێت ناوی بهێنم لە مزگەوتی گەورەی ڕانیە، هاوڕێ مام کانەبی جیا کردەوە، پێی وتبوو: پێم وایە ڕژێم ڕانیەش وەکو هەڵەبجە کیمیاباران دەکات، وتم هاوڕێ تۆ وەڵامت چی بوو؟ وتی پێم وتووە جەماوەر ڕاپەڕیوە نابی خەڵك نائومێد بکرێت، ڕژێم دڕندەیە هەرچی پێی ی بکرێ دەیکات، بەڵام نابێ ئێمە وەکو پێشمەرگە بکەوینە ژێر کاریگەری پڕوپاگەندەی پیاو خراپەکانی ڕژێم، با وەڵامی ئێمە گواستنەوەی ڕاپەڕین بێت بەرەو شارەکانی تری کوردستان...

لە ڕۆژانی ٦و٧/ ١٩٩١/٣ پێشمەرگەی بەرەی کوردستانی جڵەوی ڕاپەڕینی لە جەماوەری ڕێکخستنەکانی شار وەرگرت و، بەرەو شارەکانی تری کوردستان گواستییەوە، جەنگی چێومالکردن و دەستەو یەخە لە نێوان هێزی پێشمەرگەی بەرەی کوردستانی لەلایەك و، ئەمن وئیستخبارات و سەربازو جاشەکانی ڕژێم لەلایەکی تر دەستی پێکرد.لەسەر چیای هەیبەت سوڵتان لە سنووری کۆیە هاوڕێ ملازم شێرزاد و هێزێکی تری بەرەی کوردستانیدەستیان بەسەر (١٣) پێگەی سەربازی سەر چیای هەیبەت سوڵتان داگرت، بەداخەوە (٣) هاوڕێی پێشمەرگە لەو شەڕەدا شەهیدبوون هاوڕێ ئاسۆ، شەپۆل، کرێکار. هێزی پێشمەرگەی بەرەی کوردستانی بەسەر شارو پارێزگاکاندا دابەشبوو. ئەرکی شاری ڕانیە زۆر گران بوو، هەم پێویست بوو سووتەمەنی و سەیارە بۆ هێزی پێشمەرگە دابین بکات، هەم سەرپەرشتی دیلەکان بکات، ئارامی و ئاسایشی ناوچەکە و هاوڵاتیان بپارێزێت...

## حوکمڕانی بەرەی کوردستانی:

ڕۆژی ١٩٩١/٣/٩ لایەنەکانی بەرەی کوردستانی لە بینای قائمقامی ڕانیە کۆبوونەوە. قائمقام لە ترسی تۆڵەی جەماوەری ڕاپەڕیو ڕایکردبوو، هاوڕێیانی ئێمە سەیارەکەیان لێ سەندبوو کە سۆپەرێکی مۆدیل(٩٨٢) بوو. سەیارەکە ماوەیەك سوودی لێ وەرگیرا و هاوڕێ

ئەحمەدی کاکی بەکر لێی دەخوڕی، دواتر لەسەر داوای کاك ئاکۆی هەباس ئاغا، هاوڕێ سەلیمەسوور سەیارەکەی دایەوە بەقائمقام.

نوێنەری لایەنەکانی بەرەی کوردستانی پێکهاتبوو لە: عەزیز بەگ، مامۆستا عەلی حەمەد بەگ نوێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان. شێخ لەتیف نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان. عبدللە ڕەش و محەمەد خدر نوێنەری حزبی شیوعی عێراقی. لەو کۆبوونەوەدا نوێنەری برادەرانی حزبی سۆسیالیستی کوردستان دیاری نەکرابوو...

ژوورەکانی خانووی قائمقام تا ئەژنۆ ئاویان تێدا بوو، وەك هەر دائیرەیەکی تری حکومی تالآنکرابوو، ناچار لە کۆبوونەوەکاندا بلۆکی چیمەنتۆ لە ژێر خۆمان دابنێین بۆ ئەوەی تەڕ نەبین، حەسیرێکی دار خورمای لێبوو لەسەر خشتەکان رامان خست. کۆبوونەوە کراو بڕیار لەسەر ئەو خالآنەی خوارەوە درا:

١- کۆنترۆڵکردنی بەنزینخانەی گشتی بکرێ، بۆ ئەوەی بەنزین بەسەر هێزی پێشمەرگەدا دابەشبکرێت، تا شالآوی راپەڕین بەرەو شارەکانی تر پێشڕەوی بکات.

٢- پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ سەرپەرشتی دیلەکان، تا لەڕووی خواردەمەنی و ئاسایش ئیدارەیان بکات.

٣- لیژنەی راگەیاندن پێکهێنرا بۆ ئەوەی چالاکییەکانی راپەڕین بە جەماوەر بگەیەنێ. لە رۆژی راپەڕین بە هیمەتی ژمارەیەك رۆشنبیری گەنج لە شاری رانیە رادیۆیەکی لۆکال دانرا، کە دەنگوباس و هەواڵەکانی راپەڕینی بلآودەکردەوە، ئەو رادیۆیە، لە هاندانی جەماوەری دەڤەری راپەڕیندا، رۆڵێکی گرینگی گێڕا.

٤- لیژنەی ئاسایش لە نوێنەری هەموو لایەنەکان پێکهات، بۆ ئاسایشی هاوولآتیان و فەرمانگەکان بەتایبەتی نەخۆشخانەو بازار و شوێنە گشتییەکان.

٥- دەست نیشان کردنی باڵەخانەیەك بۆ بارەگای بەرەی کوردستانی و دیاریکردنی نوێنەری فەرمی لایەنەکانی بەرە بۆ ئەوەی رۆژانە دەوام بکەن. بۆ کاروباری رۆژانەی پێشمەرگەو هاوڕێیان، بەندە وەکو نوێنەری حزبی شیوعی عێراقی لە لایەن حزبەوە دیاریکرام بۆ لیژنەی بەرەی کوردستانی. یەکەم ئەرك لە ئەرکەکانی بەرەی کوردستانی دابینکردنی سووتەمەنی بوو. بارودۆخی سووتەمەنی لە قەیراندا بوو. رانیە تەنها یەك بەنزیخانەی هەبوو، بە ناوی بەنزینخانە ١٤ی رەمەزان. خاوەنەکەی ناوی سەید محەمەد بوو، ئەو

بەنزینخانەیە تەنها دوانزدە هەزار لیتر بەنزینی بۆ لیژنەی بەرەی کوردستانی ئاشکراکردبوو، بەڵام کاتێ لەگەڵ کاك (موفەق) چووین سەیری عەمبارەکانمان کرد پتر لە بیست و دوو هەزار لیتر بەنزینی تێدا بوو. بۆ ئەوەی ئەو برە بەنزینە تەنها بۆ هێزی پێشمەرگە و شەڕ بەکاربهێنرێت، ناچاربووین خاوەنی بەنزینخانەکە ئاگاداربکەین ئەو برە بەنزینە نەفرۆشێت. پێمان راگەیاند خۆمان سەرپەرشتی دابەشکردنی بکەین. بۆ ئەو مەبەستەش رۆژانە(٥٠) پەنجا پسولەم بە خەتی خۆم دەنووسی و ئیمزام دەکرد، بۆ ئەوەی بە رێکوپێکی بەنزینەکە دابەشبکرێت، هەر خۆشم پسولەکانم وەردەگرتەوە و، پارەی بەنزینەکەشم دەدایەوە خاوەنەکەی.

رۆژێك شۆفێرێك واژۆیی خۆمی تەزویر کردبوو، دەیەویست لە رێگای ئەو تەزویرەوە بەنزین وەربگرێت، بەڵام فێڵەکە سەری نەگرت. ماوەی سێ چوار رۆژ بەو برە بەنزینە ئیدارەی پێشرەوی هێزی پێشمەرگە درا بەرەو شارەکانی تر. راپەڕین وەکو پوشی ئاگرگرتوو وابوو، لە ماوەی(١٥) رۆژدا هەر چوار پارێزگاکەی کوردستان سلێمانی، هەولێر، دهۆك و کەرکووك رزگارکران. کوردستان، سوپای داگیرکەری عێراق، پتر لە (هەشتا) هەزار ئەفسەرو سەرباز بە دیلی کەوتنە بەردەستی هێزی پێشمەرگەی بەرەی کوردستانی و جەماوەری شۆڕشگێڕی راپەڕین. سەر شەقام و پێدەشتەکان پڕ بوون لە سەربازی دیل، وەك مێرولە رێچکەیان دەبەست. ژن و منداڵی کوردستان لە جیاتی ئەوەی تۆڵەی شەهیدەکانیان لێ وەربگرنەوە، کە لە پرۆسەی ئەنفال و کیمیاباران دا شەهیدکرابوون، پێخۆریان پێ دەدان، بەرگ و پۆشاکیان بە سەردا دابەشدەکردن و بەرێیان دەکردنەوە بۆ باوەشی خێزانەکانیان. سەرەڕای ئەو هەموو تاوانەی سەرباز و پلەداری ئەو سوپا درندەیە، لێبوردەیی خەڵکی کوردستان دۆست و دوژمنەکانی سەرسام کرد. تاکە سەربازێکش خوێن لە لوتی نەهات. بەڵام جەماوەر رقی راستەقینەی خۆی بە کاربەدەست و دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات رشت، تاکو تەرا لەو دەزگا سەرکوتکارانە رزگاریان بوو، زۆربەیان لە لایەن جەماوەری راپەڕیو بە سزای گەل گەیەندران.

ماوەی هەفتەیەك بوو (راپەڕین) بەردەوام بوو، رانیە و دەوروبەری لە بارودۆخی راپەڕین دا بوو. ئێمەش وەکو هاورێیانی پێشمەرگەو رێکخستنەکانی ناو شار، هەر لە ماڵی مام حەمەدەمین ئاڵلاوێردی و هاورێ عەبدوڵڵا و هاورێیانی تردا نیشتەجێ بووین، ئەو دەبابەی

کاتی راپەڕین دەستکەوتی هاوڕێان بوو لە کۆڵانی ماڵی مام حەمەدەمین ڕاگیرابوو. ژمارەیەك پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامی سواری دەبابەکە بوون دەیانەویست بیبەن بۆ خۆیان، هاوڕێیان بە پەلە هەواڵیان بۆ هێناین وتیان خەریکن دەبابەکە دەبەن، کە چووین پێمان گوتن ئەو دەبابەیە بۆکوێ دەبەن؟ ئەی نازانن هی حزبی شیوعییە؟ وتیان کاك عەلی باپیر دەڵێ کارمان پێیەتی؟! پێمان وتن ئەگەر کاك عەلی باپیر کاری بە دەبابە بوو، بۆچی لە کاتی راپەڕین دا ئامادە نەدەبوو بۆ ئەوەی ئەو دەبابەیەو هی تریشتان دەست بکەوێت؟! هاوڕێیان فیشەکیان وەبەر چەکەکانیان دا وتمان دادەبەزن یا داتان بەزێنین؟! خێرا خۆیان لە دەبابەکە فڕێداو ڕۆیشتن.

لە سەرەتای رۆژانی راپەڕین دا رووداوی سەیر روویان دەدا لە ناو بازاردا دەنگۆی(**مجاهدین**) پەیدابوو، کە شان بە شانی سوپای عێراق پارێزگاریان لە ڕژێمی عێراق دەکرد، بەشداریان لەشەڕدەکرد، بەتایبەتی لە داگیرکردنەوەی دەوروبەری شاری کەرکووك و شارەکانی تری کوردستان... ژمارەیەك هاوڕێی عەرەب لە رانیە خەریکی خۆ ئامادەکردن بوون تا بەرەو دهۆك بڕۆن. (۳) کەس لەو هاوڕێیانە رۆژێك چوو بوون بۆ بازاری رانیە، لە ناو خۆیاندا قسەیان بە زمانی عەرەبی کردبوو، یەکێك لە خەڵکی ناو بازبار هاوار دەکات دەڵێ: ئەوانە(**مجاهدینی خەڵقی**) ئێرانین، لە چاو تروکانێکا بە دەیان کەس پەلاماری ئەو(۳) هاوڕێیەیان دابوو، خستبوویاننە ژێر شەق و پێلاقە... هاوڕێ حەسەنی مام حەمەدەمین فریایان دەکەوێت لە ژێر دەست و پێی خەڵکەکە دەریان دەهێنێتەوە، یەکێك لەو سێ هاوڕێ عەرەبە چەك کرابوو، ئێشتاش نەمانزانی کلاشینکۆفەکەی چی بەسەر هات. کاتێك لە بازار گەڕانەوە زۆر شپرزە بوون، پێمان وتن ئەمڕۆ رۆژی چوونە بازارە، دەرکەوتنی عەرەب مەترسیدارە، خەڵك عەرەبەکان بە ئەمن و ئیستخبارات دەزانێ، باش بوو هاوڕێیان فریاتان کەوتن ئەگەرنا بە مسۆگەری دەیانکوشتن.

## ڕێکخستنی نوێ:

نامەیەکی ترم بۆ هاوڕێیانی لیژنەی هەرێمی کوردستان نارد لە نامەکەدا ئاماژەم بە گرینگی قۆناغەکە کرد بوو، کە پێویستە سەرکردایەتی لیژنەی هەرێمی کوردستان لە ناوزەنگ و نۆکان بگوازرێتەوە بۆ رانیە، بۆ ئەوەی هەم سەرپەرشتی ڕەوتی رووداوەکان بکات، هەم

تێکەڵاوی ئەرکی رۆژانەی(راپەڕین) بن. دوای نامەکە هاوڕێ مام سالح ئەندامی هەرێمی کوردستان هات بۆ رانیە، تاکو سەرپەرشتی ئەرك و کاری رێکخستنی حزب بکات، لیژنەیەکی حزب پێکهات کە بریتی بوون لەم هاوڕێیانە:

١- مام سالح بەرپرسی یەکەم ٢- مەحمود حاجی نادر ٣- سەرۆ قادر ٤-سەلیم حەسەن.

٥- هاوڕێ سورە ٦- ئیبراهیم ئەبوبەکر ٧- رزگار حوسێن ٨- محەمەد خدر.

کاتی راپەڕین قۆناغێکی زۆر پڕ کارو ئەرکی حزبی و بەرەیی بوو، رۆژانە لە دەیان کۆڕو کۆبوونەوەی بەرەیی و حزبیدا بەشداردەبووم. سەیارەی تایبەتیم نەبوو بە پێیان دەڕۆیشتین، نوێنەری لایەنەکان سەیارەیان پێ بوو، ئێمەش لە دوای سەیارەکەی قایمقام بێ سەیارە ماینەوە. ئەو سەیارانەی وەکو دەستکەوت لە کاتی راپەڕیندا کۆکرابوونەوە وەکو مڵکی شەخسی سەیردەکران، کەمتر دەدرانەوە حزب وەکو دەستکەوتی راپەڕین بەرەو سنوور ئاودیو دەکران و دەفرۆشان... بەرەی کوردستانی بڕیاریدا سەیارەی سەربازی و سەیارەی حکومی و ئەمنەکان لەو خەڵکانە وەرگرێتەوە کە دەستیان بە سەردا گرتبوو. یەکێك لەو سەیارانە کرۆلەیەکی سوور بوو لە جاشێکی سەر بە ئاکۆی عەباس ئاغا وەرگیرابوو، درابوو بە حزب بۆ هاتوچۆ و ئەرکی رۆژانە سوودی لێ وەردەگیرا. ئەو پیاوەی سەیارە کرۆلاکەی لێ سەندرابوو لە دەرفەتێکدا کرولایەکی تری حزب دەفرێنێت، کە هاوڕێ عەبدوڵڵا ڕەش لای فیتەر بۆ چاککردنەوە داینا بوو. ئێمەش چاومان دەگێڕا ئەو کابرایە بگرین و سەیارەکەی لێ وەرگرینەوە. بارەگای حزب لە نەخۆشخانەی سەربازی رانیە بوو لەسەر شەقامی گشتی رانیە — قەڵادزێ. بەیانییەك بە پەلە هاوڕێی حەرەس وەژوور کەوت وتی: هەر ئێستا سەیارە دزراوەکە بەجاددەی بەردەمماندا تێپەڕی بەرەو قەڵادزێ، کاك مەحمود و هاوڕێیانی تر خێرا چوینە سەر جاددە و سەیتەرەمان دانا، کە سەیارەکە گەڕایەوە هاوڕێیان میلی چەکەکانیان لە شۆفێرەکە راکێشا و هێنامانە خوارێ هاوڕێیان دوو سێ مستیان لە شۆفێرەکە دا وایان زانی کابرایە، کەچی ئەو نەبوو، سەیارەکە هەمان رەنگ و مۆدیل بوو، داوای لێبوردنمان لە کابرای شۆفێر کرد و ڕۆیشت... رۆژانە بە دەیان شەڕ و کێشە لە ناو بازاری رانیە لەسەر سەیارەو شڕەخۆری دروستدەبوون. ئەو شڕەخۆرییە لە ناو عێراقدا مێژوویێکی دوورو درێژی هەیە. رووخانی دەسەڵاتی سیاسی کۆمەڵێك دیاردەی لەو شێوەی لەگەڵدایە. ئەو شڕەخۆرییە لە

شەڕی ناوخۆش دووبارە کرایەوە، ئیتر بوو بە نەریت. دوای راپەڕین قۆناغێکی نوێ هاتە پێشەوە، شێوازی خەباتی چەکداری و خەباتی ژێرزەمینی گۆڕا بۆ خەباتی ئاشکرا. پێش راپەڕین رێکخستنەکانی رانیە فرەهێڵ بوون، هەر هێڵێك سەربەخۆ و ئاگایان لە یەکتری نەبوو. هاوڕێ رزگار حوسێن، سەلام حەوێز هەر یەکە بەرپرسی هێڵێك بوون. مام قادر، هاوڕێ ئیبراهیم ئەبوبەکر تاکە کادری شاخ و پێشمەرگایەتی بیتوێن بوو لە راپەڕین، ئەویش لە کاتی راپەڕین دا لە ناوەوە بوو. ئەندامانی لقی بیتوێن و لیژنەی حزبیی (بیتوێن)، یا خۆیان رادەستی رژێم کردبۆوە، یا چوو بوون بۆ هەندەران... هەندێك لە هاوڕێیانی رانیە، هاوڕێ سەلام حەوێزیان بە مستەهەق تر دەزانی لە هاوڕێ رزگار هەندێکی تر بە پێچەوانەوە هاوڕێ رزگاریان بە شایستەتر دەزانی، کێشەکەش لەبەر ئەوە بوو لەسەر پێشنیاری هاوڕێ ئیبراهیم ئەبوبەکر، هاوڕێ رزگار حوسێن لە لیژنەی باڵا و بە بەرپرسی هێڵەکانی رانیە دانرابوو. بە داخەوە ئەو گرفتە تا ماوەیەك درێژەی کێشا، لە کۆتایی هەشتاکان رێکخستنەکانی بیتوێن زەبرێکی بەهێزیان بەرکەوت، گرتن و ئیعتراف پەیدابوو، ژمارەیەك هاوڕێی تێکۆشەرو دڵسۆز لە لایەن دائیرەی ئەمن و ئیستخباراتەوە دەستگیرکران، لەوانە مامۆستا ئەمین، خدر گۆمانی و عەبدولڕەحمان حاجی نادر و... هیتر.

## کۆڕەو:

دوا ئەوەی هاوپەیمانان، بە سەرۆکایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، رێکەوتننامەی (سەفوان)یان لەگەڵ رژێمی عێراق واژۆکرد، چالاکی سەربازیان راگرت. سەرانی رژێم رق و تۆڵەی دۆڕاندنی جەنگەکەیان بە جەماوەری راپەریوی خوارووی عێراق ڕشت. بە سەدان گەنج و پیرو پەککەوتەیان بە زیندوویی و بە کۆمەڵ زیندە بە چاڵ کرد. مەرقەدی ئیمام حوسێن لە کەربەلا بە موشەکی حوسێن بوردومان کرا، پارێزگا شیعە نشینەکان وەبەر شاڵاوی کوکوژی کەوتن. دوای ئەوەی راپەڕینی خوارووی عێراق سەرکوت کرا سوپای عێراق بەرەو کوردستان ئاراستەکرا. بە سەدان دەبابەو زرێپۆش و هێلی کۆپتەری جەنگی و تۆپ و کاتیۆشا ئامادەکران. لە سێ قۆڵی سەرەکییەوە هێرشەکە دەستی پێکرد، لە رێگای موسل، کەرکووك، سلێمانی. لە هەرسێك قۆڵەکە، ناهاوسەنگی سەربازی لەڕووی چەك و چۆڵەوە، لە نێوان هێزی پێشمەرگەو جەماوەری راپەریو لەلایەك و سوپای عێراق لەلایەکی تر لە ئارادابوو. ئەو

پێشمەرگانەی لە شاخەوە دابەزی بوون، ژمارەیان زۆر کەم بوو. بڕواناکەم بە هەموو لایەنەکانی بەرەی کوردستانی(١٠٠٠) پێشمەرگەی کارامە لە راپەڕیندا بەشدارییان کردبێ. هێزەکانی تر لە خەڵکانی دڵسۆزو ڕەشۆکی و مەدەنی پێکهاتبوو، کە لە جەنگی بەرەیی بەرامبەر سوپای عێراق هیچ ئەزموونێکیان نەبوو. لە یەکەم رووبەڕووبوونەوەدا سوپای عێراق لە هەر سێ بەرەکە باڵادەست بوو. لە شاری کەرکووك ژمارەیەك هاوڕێی پێشمەرگە وەکو هاوڕێ ملازم شێرزادو هێزێکی کۆیەی حزبی شیوعی عێراق لەگەڵ سوپای عێڕاقدا تووشی شەڕێکی نابەرامبەر بوون، بە جۆرێك گەمارۆ دەدرێن ناتوانن پاشەکشێ بکەن. ملازم شێرزادو شەش کەس لە هاوڕێیانی هاوسەنگەری دەکوژرێن، دوای شەهیدبوونیان دەبابە دەیان شێلێ، جەستەی ئەو تێکۆشەرانە وا شێوێنرابوو بە زەحەمەت دەناسرانەوە. شاری کەرکووك و سلێمانی و هەولێر داگیرکرانەوە... ڕژێم فەرمانی بە سوپادا بوو هێرش بکاتە سەر کوردستان. هاوکات موکەرەم تاڵەبانی، بۆ سازدانی گفتوگۆ لەگەڵ لایەنەکانی بەرەی کوردستانی لە کوردستان بوو. لە ئەنجامی ئەو شاڵاوە سەربازییەدا کۆڕەوێکی گشتی مرۆیی لە سەرانسەری کوردستانی باشوور بەرپابوو. دوو ملیۆن و نیو مرۆڤی کورد لەسەر خاك و زێدی باوك و باپیرانی خۆی بەرەو وڵاتی ئێران و تورکیا دەربەدەرو ئاوارە بوون. دیمەنەکانی کۆڕەو ئەوەندە جەرگ بڕ بوون ویژدانی مرۆڤایەتی دەهەژاند.

دوایی ڕوودانی ئەو کارەساتە مرۆییە، لەسەر پێشنیاری نوێنەری فەرەنسا جۆن مێجەر سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتی (UN)، بڕیاردرا ناوچەی دژە فڕین دیاری بکرێت، کە بە هێڵی (٣٦) ناسرا. هێڵەکانی بەرگری پێشمەرگە پاشەکشەی کردبوو، ئەو پاشەکشەیە بوو بەهۆی ئەوەی پێشمەرگە خۆی نەگرێتەوە.

هاوڕێ کەریم ئەحمەد و ژمارەیەك ئەندامی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی حزبی لە رانیە بوون. هاوڕێ کەریم وتی پێم باشە ئەرشیڤ و مەلەفەکانی ئەمن و ئیستخبارات، کە لە شارەکانی تر هێنرابوون و لە رانیە کۆکرابوونەوە، ڕابگوێزرێن بۆ نۆکان. رۆژی **١٩٩١/٣/٢٩** هاوڕێ کەریم و هاوڕێیانی سەرکردایەتی لەگەڵ مەلەفەکان گواسترانەوە بۆ بارەگای(نۆکان). من لەگەڵیان چووم، ئەو رۆژە دووەم رۆژی سەرەتای کۆڕەو بوو. لە رانیەوە لەگەڵ رێچکەی کۆڕەو تێکەڵبووین سەیارە زۆر بە زەحەمەت گەیشتە **کانی شینکە**. لە نزیك گوندی باداوێی دەڤەری پشدەر، ماوەی (٧) کاتژمێر لە ناو ئاپۆرەی جەماوەری کۆڕەوەکەدا گیرمان خوارد.

دیمەنی زۆر دڵتەزێنمان بەرچاو کەوت. کۆڕەوەکە کارەساتێکی مێژوویی بوو، سەدان دیمەنی دڵتەزێنی دەهێنایە بەرچاو، پیر و منداڵی ساوا، ژنی دووگیان، منداڵی پێخاوس، لە ژێر لێزمەو ڕەهێڵەی باراندا، بە گریان و ناڵەوە ملی ڕێگایان گرتبوو. چیای کێوەڕەش دەنگی دەدایەوە، چ ڕۆژێکی تووش بوو، گریان و نوزەی منداڵان هەر لە گمەی کۆتر دەچوو. ئێوارەی سەرەتای کۆڕەوەکە کە گەیشتە رانیە، لەگەڵ هاوڕێ سەرۆ چووین بۆ ئۆردووگای حاجیاوا، ویستم سۆراغی ماڵی مام برایم بکەم، کەچی ماڵیان چۆڵوهۆڵ بوو. وتیان بەرەو پشدەر ڕۆیشتوون. لە گەڕانەوە لە نزیك دووڕییانی حاجیاوا ژمارەیەك خێزانی جۆراوجۆرمان بەرچاو کەوت، لە ناویاندا پیرە ژنێکی پشتکۆم بەخۆی و گۆچانێکەوە بەلۆژەلۆژ بێ ئەوەی کەسی بەدەورەوە بێ لە ترسی گیانی خۆی ئەو ڕێگایەی گرتبۆ بەر. کاك سەرۆ کە سەیری ئەو پیرەژنەی کرد دەستی بە گریان کرد، وا بە کوڵ دەگریا خەریکبوو کۆنترۆڵی سەیارەکەی لە دەست دەربچێ.

منیش خەم دایگرتم، بەڵام وەك کاك سەرۆ نەبووم، دیاربوو کاك سەرۆ وەك نوسەرو ڕۆشنبیر، هەستی زۆر لە هەستی پێشمەرگەیەکی وەك ئێمە ناسکترە. دیمەنێکی تری لەوەش دڵتەزێن تر، گەنجێك بوو لە سەرجادەی گشتی رانیە — قەڵادزێ بە رووتی خۆی وێك هێنابوو، ئەژنۆکانی توند لەباوەش گرتبوو. لە شێت نەدەچوو، کەچی خەڵکەکە لە بەر ئازار و مەینەتی خۆیان، بە ئاسایی بە لایدا تێپەڕ دەبوون و ئاوڕیان لێنەدەدایەوە.

ئەو کاتەم پێ لە ڕۆژی حەشر دەچوو، کە مامۆستایانی ئایینی باسی دەکەن. هیچ کەس هۆشی کەسی نەبوو، کورد گوتەنی: باب ئاوڕی لە کوڕ و کوڕ ئاوڕی لە بابی نەدەدایەوە، دایك نەدەپرژایە سەر کۆرپەکەی. نازانم ئەو گەلە گوناهی چی بوو ئابەو شێوەیە سەرگەردان و ئاوارە بێ، ئاخۆ چارەنووس و ئایندەی ئەو خەڵکەو گەلێکی ژێردەستە چی بەسەر دێت؟!...

کاتێ کە دڵنیابووم سەیارە لە ناو ئاپۆڕەی کۆڕەودا هیچی تر بڕناکات، ناچاربووم مەلەفەکان بە چەند بارێکی هێستر بە کرێ بگوازمەوە بۆ نۆکان، خۆشم لەگەڵ هاوڕێ کەریم ئەحمەد و هاوڕێیانی تر بە ناو کۆڕەوەکەدا ڕۆیشتین. زۆر بە درەنگەوە گەیشتینە شێنێ و قوڵە هەرمێ. لە قەراخ رووباری نۆکان پیرە مێردێکی بە ساڵاچوو پاڵی وە تاشە بەردێك دابوو کۆچی دوایی کردبوو. پیرەمێردەکە پیاوێکی دەم و ددان تێك قوپاو بوو، تەمەنی لە(٧٠) ساڵ بەرەو سەرتر بوو. سێ کەس خەریکی شاردنەوەی تەرمەکەی بوون. وێدەچوو ئەو سێ کەسە

هی یەك بنەماڵە بن، مێردمنداڵێك و دوو پیاوی تر بوون، لەبەر ئەوەی پاچیان پێنەبوو، بە خاکە ناز زەویان بۆ تەرمی پیرەمێردەکە هەڵدەکەند. بە لایاندا ڕەتبووم پێم وتن یارمەتیتان ناوێت؟ یەکێکیان سەیرێکی کردین وەك ئەوەی بمان ناسێت وابوو، وتی بە خێر چن ئێوە بە پەلەن خۆمان تەرمەکە دەشارینەوە...تەنگەبەرێك لە خوار گوندی قولکە هەرمێ هەیە، لە قەراخ چۆمەکە ئافرەتێکی گەرمیانی کەوتبۆ ناو رووبارەکە و خنکابوو. خزم و کەسەکانی بەدەم گریان و رۆرۆوە لە لێواری رووبارەکە بۆ تەرمەکەی دەگەڕان... لەو کاتەدا بینیم ئافرەتێکی ئەو کۆمەڵەیە کەوتە ناو رووبارەکە، ناچار خێرا تاقم و تفەنگەکەم فڕێدا و ملم لەبەر ملی چۆمەکە نا، چۆمەکە زۆر رێژەو بوو زۆری نەمابوو ژنەکە منیش لەگەڵ خۆی بخاتە ناو رووبارەکە و هەردووکمان بخنکێین. خەڵکی گەرمیان لە ناو شاخ و لێڕەوار کۆڵەوارن. رێگاکە زۆر ئاسایی بوو بۆ خەڵکی ناوچەکە و پێشمەرگە، بەڵام بۆ ژن و منداڵە گەرمیانییەکان سەخت بوو...

لەو رێگایە بە سێ چوار جێگا(کۆ)ی چەکی جۆراجۆر وەك لیژنە دار هەڵدرا بوونەوە. بە سەدان چەك لەو دەورە فرێدرا بوو. باشترین چەك بە هەرزانترین نرخ دەست دەکەوت. خەڵکەکە ئامادەبوو چەکەکەی فرێ بدات، بەڵام تەسلیمی کۆماری ئیسلامی ئێرانی نەکات.

ئەو شەوە لە نۆکانماینەوە زۆر هیلاك و شەکەت بووین، خەوتنێك خەوتین لە بورانەوە دەچوو. بەیانی زوو لە خەو هەستام مۆڵەتم لە هاوڕێ کەریم و هاوڕێیانی تر وەرگرت و گەڕامەوە. لە رێگا چاوم بە زۆربەی خزمەکان کەوت، سەر پێی لە ساغی و سەلامەتی هەموویانم پرسی. لەسەر پردی بەستەستێن ئەو شۆفێرەم چاو پێکەوت کە لەگەڵ ئێمە هاتبوو منداڵەکانی پێی بوو بەرەو(سونێ) دەڕۆیشتن. وتی بۆ کوێ دەگەڕێتەوە؟! وتم بۆ؟ دەگەڕێمەوە رانیە، وتی پێم وایە هاوڕێیان لە بارەگای حزب نەماون، دەڵێن جیش گەیشتۆتە هیزۆپ. وتی بارەگا ئاگری تێ بەر دراوە؟! وتم کێ ئاگری تێ بەرداوە؟ وتی هاوڕێیان، وتم دڵنیای هاوڕێیان بەنزینیان بە ژوورەکاندا کردووە ئاگریان لە بارەگا بەرداوە و هەرچی تێیدا بوو سووتاوە؟ وتی بەڵێ. سووتانی بارەگای حزب شتێکی ناخۆش بوو بۆ سومعەو ناوبانگی(حزب)، بەڵام دەبێ ئەو راستییەش بگوترێت هاوڕێیان کاتی بارەگایان سووتاند بوو پێیان وابوو سوپا رانیە دەگرێتەوە، چونکە بێ هیچ بەرگرییەك ڕژێم هیزوپی گرتەوە، تەنانەت پێشمەرگە لەسەر چیای هەیبەت سوڵتانیش نەمابوو. تەنها لە کۆڕێ شەڕێکی مەردانە لەگەڵ هێزەکانی ڕژێمی

عێراقدا کرا، ئەو شەڕە جەیشی لە پێشڕەوی وەستاند، ئەو کاتەی پێش بە سوپای عێراق گیرا پێشمەرگەش خەریکبوو لەگەڵ کۆڕەوەکە بەرە و ئێران بڕوات و رۆڵی مێژوویی خۆی لە دەست بدات. کاك مەسعود کە سەرکردایەتی هێزەکانی بەرەی کوردستانی دەکرد، پێشمەرگە و جەماوەری هان دەدا رووبەڕووی سوپای ڕژێمی دیکتاتۆر ببێتەوە، هەرخۆشی سەرپەرشتی شەڕی کۆڕێی کرد. لەو شەڕەدا ژمارەیەك تانك و زیرپۆشی ڕژێم سووتێنران، دەیان سەرباز کوژران و بریندارببوون، شەڕەکە خاڵێکی وەرچەرخان بوو بۆ هێزی پێشمەرگە و هێوربوونەوەی ڕەوتی کۆڕەو لەو ناوچەی کۆڕی و دەوروبەری.

## گفتوگۆ و هەڵوێستی حزب:

پارتی و یەکێتی و سۆسیالیست ئامادەبوون گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێمی عێراق بکەن. بەڵام حزبی شیوعی عێراق گفتوگۆی لەگەڵ ڕژێم ڕەتکردەوە، سەرکردایەتی حزب (تحفظ) یان لە گفتوگۆی نێوان ڕژێم و بەرەی کوردستانیدا راگەیاند. لە کۆبوونەوەیەك لە سلێمانی، لەسەر مفاوەزاتی نێوان ڕژێم و بەرەی کوردستانی زۆربەی هاوڕێیان پشتگیریان لە هەڵویستی حزب دەکرد، بەڵام من لە کۆبوونەوەکەدا ڕای جیاوازم هەبوو، لەسەر هەڵوێستی حزب، پێم وابوو ئەوە راست نییە، بەڵکو پێویستە پشتگیری لە هەڵوێستی بەرەی کوردستانی بکرێ، چونکە مفاوەزات مانای هەڵوێست دۆڕاندن نییە، بەڵکو بەشێکە لە سیاسەت و شێوازێکی دیبلۆماسییە. ئەوسا گفتوگۆ هەزار جار باشتر بوو لە ئاوارەیی و سەرگەردانی لە ئێران... ئەو کاتانەی گفتوگۆ بەردەوام بوو بەرەی کوردستانی سوودمەند بوو، پێشمەرگە خۆی رێکخستەوە و، لە سلێمانی هێرشی کردە سەر سوپای عێراق و دەیان سەرباز و ئەفسەر کوژران و دیلکران. سوپای ڕژێم هەیبەتی نەما بوو هەر بۆیە ڕژێم ناچاربوو پاشەکشێ بە سوپاکەی بکات. مەیدانەکە ئازاد بوو بۆ حوکمڕانی بەرەی کوردستانی. گفتوگۆی نێوان ڕژێم و بەرەی کوردستانی مەودای زۆر نەبوو، نزیکەی دوو مانگ درێژەی کێشا. لەبەر ئەوەی ڕژێم لە گفتوگۆکاندا کۆمەڵێك مەرجی هیچ و پوچی دیاریکردبوو هیچ لایەك قبوڵی نەدەکرد، راپەڕینی دووەم ئەنجامدرا.. حوکمڕانی سەدام زۆر ستەمکار بوو لە لاوازترین بارودۆخی خۆیدا لە هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە مافەکانی گەلی کوردستان نەدەهاتە خوار. کاتێ ڕژێم هەستی بەبێ هەیبەتی و پەرپوتی خۆی کرد لە کوردستان، بە فەرمی ئیدارەو دەسەڵاتی حکومەتی لە

هەر سێ پارێزگای هەولێر، سلێمانی، دهۆك کێشایەوە، بۆ ئەوەی بۆشایی ئیداری لە کوردستان دروست بکات گەمارۆی ئابووری خستەسەر. بەو هەنگاوە ڕژێم هەڵەیەکی مێژوویی ئەنجامدا، چونکە هیچ یەکێك لە خەونەکانی ڕژێم بەدی نەهات، بەرەی کوردستانی بە فەرمی بۆشایی دەسەڵاتی سیاسی ئەو سێ پارێزگایەی لە کوردستان پڕکردەوە، ئەگەرچی کەم و کورتیش لە شێوەی حوکمڕانیدا هەبوو، بەڵام حوکمڕانی بەرە ئەزموونێکی سەرکەوتوو بوو...

سەرۆك بارزانی سەردانی رانیەی کرد لەگەڵ لایەنەکانی بەرەی کوردستانی لە رانیە کۆبۆوە منیش وەکو نوێنەری بەرەی کوردستانی و نوێنەری حزبی شیوعی عێراقی لەو کۆبوونەوەیەدا بەشداربووم، کاك نازم عومەر ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی وەکو نوێنەری یەکێتی رووی لە من کردو وتی: نازانم سیاسەتی(تحفظ) یەعنی چی؟ حزبی شیوعی سەبارەت بە مفاوەزاتی نێوان بەرەی کوردستانی و حکومەت چۆن دەکرێت بەو دووفاقییە سیاسەت بکات، لە لایەك ئەندامی بەرەی کوردستانییە لە لایەکی تر پشتگیری لە مفاوەزات ناکات؟... سەرۆك بارزانی وتی حەزدەکەم لە جیاتی هاوڕێ من وەڵام بدەمەوە... کاك مەسعود وتی دڵنیام حزبی شیوعی کۆسپ دروست ناکات بۆ مفاوەزات، چونکە حزبی شیوعی عێراقی بە درێژایی مێژوو کۆسپ نەبووە بۆ کێشەی کورد، هەمیشە پشتگیری لە مافەکانی گەلی کورد کردووە، ئەگەر ئێمە شتێکمان پێ بکرێت بێگومان هاوڕێیانیش پیرۆزبایمان لێ دەکەن... دواتر سەرۆك ڕووی لە من کرد وتی مام کانەبی گەورەم شاهیدە لە جەنگی کۆڕێ زۆرم هەوڵدا یەکێك لە هاوڕێیانی مەکتەبی سیاسی پەیدابکەین بۆ ئەوەی پرسیان پێ بکەین بەڵام نەمان دۆزینەوە!. سەرۆك وتی هاوڕێ مفاوەزاتیش وەکو هەر شێوازێك لە شێوازەکانی سیاسەت، سیاسەت کردنە. لە رێگای ئەو گفتوگۆیەوە گەلەکەمان لەسەر لێواری ئاوارە بوونی بە ڕەزیلی گێڕاوەتەوە...

### محوەری بیتوێن – پشدەر:

کاتێ ڕژێم ئیدارەکانی لە کوردستان کێشایەوە، بەرەی کوردستانی لە رێگای نوێنەرەکانییەوە ئەو بۆشاییەی پڕکردەوە. حزبی شیوعی عێراقیش بەو پێیەی لایەنێك بوو لە دامەزرێنەرانی(بەرە) لە هەموو ئەرك و کارێکی بەرەییدا بەشداری دەکرد، بۆ ئەوەی بە ئەرکەکانی ڕا بگات پێویست بوو تەشکیلاتی گەورەترو فراوانتر پێك بهێنێ، دوا ئەوەی

راوێژمان لەگەڵ کۆمەڵێك کادری پێشکەوتووی حزب کرد لە لیژنەی سەرکردایەتی، دەڤەری بیتوێن وپشدەر کرا کە(محوەری بیتوێن — پشدەر) پێك بهێنرێت. لەسەر پێشنیاری(حزب) بەندە وەکو بەرپرسی یەکەمی(محوەر) دیاریکرام. وەرگرتنی ئەرکی بەرپرسیاری لەو هەلومەرجەدا زۆر سەخت بوو، چونکە هەندێك بڕیاری گرینگ وەردەگیران و لایەنەکانی بەرەی کوردستانیش لە ئاستی ئەندامی سەرکردایەتی نوێنەریان دیاریکردبوو. لە دیدارێکی سەرۆك بارزانیدا، کاك نازم گلەیی لای سەرۆك کردو وتی: پێویستە نوێنەرەکانی بەرە ئەندامی سەرکردایەتی لایەنەکان بن، مەبەستی کاك نازم بەندەو کاك مەحمود محەمەد بوو کە نوێنەری پارتی و حزبی شیوعی بووین، بەڵام(حزب) متمانەی بە ئێمە هەبوو هەر بۆیە ئەو دەسەڵاتەیشی پێ بەخشی بووین، سەرۆك بارزانی وتی: کاك مەحمود محەمەد دەسەلاتی ئەندامی سەرکردایەتی هەیە وەکو پارتی!.

دوای ئەوەی محوەری پشدەر — بیتوێن پێکهێنرا بە پێویستمان زانی ژمارەی پێشمەرگەکانی محوەر زیاد بکەین بۆ ئەوەی بە ئەرك و کاری ڕۆژانەی بەرەی کوردستانی ڕابگەن. کادری شایستە دەست نیشان بکرێت بۆ ئۆرگانەکان و، ریکخستنی حزبی، لە چوارچێوەی هەرەمی نەهێنی کاری سەردەمی شاخ دەربچێ و، لەسەر شێوازێکی نوێ دروست بکرێتەوە. لەسەر بنچینەی ئاشکرا کاری ڕێکخستنەکان ئۆرگانیزە بکرێنەوە. لە سنووری دەڤەرەکە نوێنەری حزب لە بەرەی کوردستانی شارەکان دانرا لەوانە قەڵادزێ هاوڕێ شەپۆل فەتحی، رانیە هاوڕێ ئیبراهیم عەزیز، چوارقوڕنە هاوڕێ مەحمود حاجی نادر، حاجیاوا هاوڕێ خالید فەتحی، سەنگەسەر هاوڕێ ڕەسوڵ سەعید، ئۆردووگای پێمالك هاوڕێ عومەر حەسەن مەختار. نوێنەرەکان وەکو لیژنەیەکی حزبی کۆبوونەوەی هەفتانەیان بۆ سازدەکرا. من سەرپەرشتی ئەو لیژنەیەم دەکرد. هەفتانە گفتوگۆ لەسەر سیاسەتی حزب دەکرا وەکو بەرەی کوردستانی. دیاردەیەکی خراپ سەری هەڵدا ئەویش ئاودیوکردنی شۆفلْ و سەیارەو میکانیکی هەمەجۆرە بوو بەرەو ئێران. بە ئاشکرا ئەو کارانە ئەنجام دەدران. ڕۆژنامەیەکی ناوخۆ لە شاری قەڵادزێ هەبوو، کۆمەڵێك گەنج سەرپەرشتیان دەکرد، بە ناوی(هەنگاو) دەردەچوو. ئیمزاو خەتی ئەو بەرپرسانەیان بڵاودەکردەوە، کە شۆفلْ و دامودەزگای میکانیکیان ئاودیودەکرد، کەچی تەققەی سەریان دەهات هەر گوێیان بەو بڵاوکراوانە نەدەدا. ئاودیو کردن وەکو کاسبییەکی ئاسایی لێهات. ڕۆژانە دەستەیەك چەکدار کۆدەبوونەوە بە کەڵەگایی

شۆفلّیان ئاودیو دەکرد. خالّەکانی گومرگ لیژنەیەکی هاوبەشی بەرەی کوردستانی سەرپەرشتی دەکرد، رۆژانە کێشەیان بۆ دروستدەکرا، قاچاخچییەکان سولّحیان لەگەلّ هەندێکیان دەکرد بە پارە هەندێکی تریان غافلّ گیر دەکرد، بۆ ئەوەی شۆفلّ و کەل و پەلەکانیان ئاودیو بکەن. شەڕ و ئاژاوە دروستدەبوو، جار جارە تەقەقە لە نێوان قاچاخچی و خالّەکانی گومرگ دروستدەبوو. لە میحوەری بیتوێن – پشدەر، گرفتی گەورە گومرگ بوو. لەسەر گومرگ کێشە لەنێوان هاوڕێیان و نوێنەری لایەنەکانی تردا دروستدەبوو. سولّح لەگەلّ قاچاخچییەکان دەکرا، پەنجەی تۆمەت بۆ نوێنەرەکانی ئێمەش درێژ دەکرا، کە گوایە شیرینی واتا بەرتیلیان وەرگرتووە. هەر لەبەر ئەو هۆکارانە بوو ناچاربووین سزای ئەو هاوڕێیانە بدەین کە تۆمەت و قسەو قسەلۆکی گومرگیان لەسەر بوو. تۆمەت و گومانی دزی و پارە پەیداکردنی ناشەرعی و لە خالّەکانی گومرگ لەو سەردەمەدا پەیدابوو. ئەوسا گومان و تۆمەت بە ئاسانی بۆ کەس نەدەچوو سەریّ، چونکە شتێکی دزێو و ناشایستە بوو لەناو شۆڕشگێڕان.

ئامادەکاری دەکرا بۆ هەلّبژاردن، پێویست بوو جارێکی تر محوەری بیتوێن و پشدەر رێکبخرێتەوە. هاوڕێ سورە وەك بەرپرسی رێکخستن دانرا، هاوڕێ مەحمود حاجی نادر بە بەرپرسی عەسکەری، هەیکەلی ناوچەی قەلآدزێ و رانیە دانرایەوە، دوکان و پیرەمەگرونیش خرانە سەر میحوەری پشدەر بیتوێن. هاوڕێ شەپۆل فەتحی بوو بە بەرپرسی رێکخستنی قەلآدزێ، هاوڕێ سەلام حەوێز کرا بە بەرپرسی رێکخستنی رانیە. (مام قادر) ئیبراهیم ئەبوبەکر وەکو بەرپرسی چوارقوڕنە و چۆمان دیاریکرا، هاوڕێ زیرەك کەمال و کاوە کلّکە سماقی وەکو بەرپرسی سیاسی و عەسکەری لە دوکان دانران... رێژەی ئەندام و لایەنگرانی حزب بە شیوەیەکی بەرچاو زیادیان کردبوو، ئەرکەکانی حزب لە چوارچێوەی بەرەی کوردستانی بە شێوەیەکی رێکوپێك ئەنجام دەدران...

## پرۆسەی هەلّبژاردن:

بڕیاردرا هەلّبژاردن لە سەرانسەری کوردستان ئەنجام بدرێ، هەلّبژاردن لەسەر وەدەستهێنانی رێژەی ٧٪ کۆی دەنگەکان دیاریکرا. رێژەی ٧٪ لە بەرژەوندی حزبە بچووکەکان نەبوو، بەلآم پارتی و یەکێتی سوور بوون لەسەر ئەو رێژەیە، لەبەر ئەوە بڕیاری لەسەر درا. رۆژی ١٩/٥/١٩٩٢ دیاریکرا بۆ رۆژی هەلّبژاردن. پڕوپاگەندەی هەلّبژاردن ململانێیەك بوو لە

شەڕێکی راستەقینە دەچوو. لایەنگرانی یەکێتی لە هەموو لایەنەکانی تر دەم هەراش تر بوون، زیاتر رووی پڕوپاگەندەیان لە پارتی بوو، مافی ئۆتۆنۆمی کە ئەوسا دروشمی پارتی بوو کرا بە جێگای توانجی یەکێتی لە رۆژانی هەڵبژاردندا، گوایا یەکێتی دروشمی چارەی خۆ نووسینی بەرز کردۆتەوە هەنگاوێك لە پێشەوەی لایەنەکانی ترە کەچی ژیان پێچەوانەکەی سەلماند یەکێتی دوای هەڵبژاردن بەرەو دروشمی عێراقچییەتی چوو پارتی دروشمی نەتەوەیی بەرز کردەوە،دواتر دەرکەوت دروشمی یەکێتی تەنیا لە پێناوی هەڵبژاردندا بوو. پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن کە ململانییەکی پڕ لە توند و تیژی نێوان پارتی و یەکێتی بوو، زەمینە خۆشکەری شەڕی ناوخۆ بوو. چونکە پڕوپاگەندەکە شەڕە جوێنێکی بێ پەردە بوو، یەکێتییەکان پەنایان بۆ سووکایەتی پێکردنی پارتییەکان دەبرد... شوکریە خان لایەنگرێکی پارتی بوو لە رۆژی هەڵبژاردن کراسێکی زەردی لەبەر کردبوو بەرەو سندوقەکانی دەنگدان دەچوو، ژمارەیەك هەرزەکاری یەکێتی بەرد بارانیان کرد. پارتییەکانیش یەکێك لە دروشمەکانیان ئەمە بوو: بۆیە پێت دەڵێین کاکە چونکە رابردووت پاکە. یەکێتییەکان دەیانگوت ئەگەر مامە دەرنەچێ کەرکووك لەدەست دەردەچێ، ئەگەر مامە دەربچێ دنیار بە دۆلار دەچێ... بزووتنەوەی ئیسلامی پروپاگەندەی ئایینی دەکرد لایەنگرەکانیان دەیانگوت ئەی خەڵکی مسوڵمان دەنگ بە قورئان بدەن، حزبی شیوعی عێراق دروشمی چینایەتی و دروشمی رووخاندنی ڕژێمی دیکتاتۆریان بەرز کردەوە، رۆژێك پێش هەڵبژاردن سەردانی مەکتەبی سیاسی(حزب)م کرد هاوڕێ عەزیز **محەمەد** لەوێ بوو، پێی گوتم هاوڕێ لە ٧٪ ی دەنگەکان مسۆگەر دەکەین لە سنووری پشدەرو بیتوێن؟ وتم نەخێر مسۆگەری ناکەین! وتی بۆ مسۆگەری ناکەین؟ وتم قۆناغەکە گۆڕاوە، خەڵك دەنگ دەداتە ئەو حزبانەی بە مسۆگەری دەسەڵاتدارن و، بەرژەوەندییەکانیان دابین دەکەن.

رۆژی هەڵبژاردن دیاریکرام بچم بۆ ئۆردووگای حاجیاوا، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە چاوەدێری هەڵبژاردنەکە بکەم. هاوڕێیانی تریش هەر یەکەو بۆ ناوچەکەی خۆی دیاریکرابوو. رۆژی هەڵبژاردنەکە لە کاتژمێر(١٠)ی بەیانییەوە تاکۆتایی هەڵبژاردنەکە تەزویر دەستی پێکرا، یەکێتی زۆربەی سندوقەکانی بیتوێن و پشدەری کۆنترۆڵ کرد بوو، قسەیەکی عەلی نەبی هەیە ئەو رۆژە بە لایەنگرانی یەکێتی دەوت: (سندوقەکە ببەن بۆ ناو فریزی باخچەکە هەتا پڕ دەبێ تێی کەن هەر کەسێکی نارەحەتە با بۆ خۆی هەر بڵێ؟!) نوێنەری لایەنەکانی بەرە جگە لە

یەکێتی لە زۆربەی سندوقەکانی بیتوێن و پشدەر سندوقەکانیان بایکۆت کرد، محزەری هەڵبژاردنەکانیان واژۆ نەکرد، ئەنجامی دەنگەکان هێشتا ڕانەگەیەنرا بوو، یەکێتی هەموو هێزەکانی خستبوو ئامادەباشییەوە، بە چرکە چاوەڕوان دەکرا شەڕدەست پێ بکات. بۆ شەقلاوە چووم هاوڕێ عەزیز محەمەد لە مەکتەبی سیاسی بوو پرسیاری رەوشەکەم کرد وتی پارتی زۆرینەی دەنگەکانی وەدەست هێناوە. رێژەی دەنگەکانی پارتی لە هی یەکێتی پتر بووە، بەڵام مام جەلال بە کاك مەسعودی راگەیاندووە ئەگەر حوکمڕانی (٥٠ بە ٥٠) تان قبوڵە، فەرموون با ئەنجامەکان رابگەیەنین ئەگەرنا ئەنجامی هەڵبژاردنەکە قبوڵ ناکەین؟!...

ئەوە بوو پارتی حوکمڕانی ( ٥٠ بە ٥٠)ی قبوڵ کرد، ئینجا لە ناو بارەگاکانی پارتی و یەکێتی پەڕۆی سەوزو زەرد تێکەڵبوو، ئاهەنگی سەرکەوتن سازکرا، بارودۆخی جەنگ گۆڕا بە ئاهەنگ و زەماوەندی سەرکەوتن، سەرەتایەکی نوێ لە قۆناغی سیاسی دەستی پێکرد. ئەوانەی لە هەڵبژاردنەکەدا دۆڕاندیان زۆر بە خراپی بەسەریاندا شکایەوە، زۆربەیان بڕوایان وا نەبوو بەو شێوەی دەدۆڕێن. حزبی سۆسیالیست و پاسۆك و پارتی گەل دوای هەڵبژاردنەکە تێکەڵبوون حزبی یەکگرتنیان راگەیاندن، بەڵام بەهۆی ناکۆکی نێوان باڵەکانی سەرکردایەتی، حزبی یەکگرتن کۆنگرەی یەکەمی پێ گرێ نەدرا و، جارێکی تر بوو بە دوو باڵ باڵێك چوو بۆ ناو پارتی و باڵەکەی تر بوو بە یەکێتی...

حزبی شیوعی عێراقی هۆکاری دەرنەچوونی بۆ دوو هۆکار گێڕایەوە هۆکاری یەکەم هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت و بلۆکی وڵاتانی سۆسیالیست، بەو پێیەی حزبی شیوعی عێراقی لایەنێکی عێراقی یە گوایا خەڵکی کوردستانی کەمتر پشتگیری لایەنە عێراقیەکان دەکات... بەڵام هۆکارەکە ئاشکرابوو پارتی و یەکێتی دوو هێزی سەرەکی کوردستان بوون و، لایەنەکانی تر ڕکەبەری ئەو دوو لایەنەیان پێ نەدەکرا، هۆکارەکەیشی زۆر ئاشکرابوو پارتی و یەکێتی جەماوەرێکی زۆر پشتگیرایان دەکردن. خەڵکی کوردستان و پرۆسەی دەنگدان مۆرکی حزبی گەورەو گچکەی بە لایەنەکانەوە لکاند...

## هەڵبژاردنی ناوخۆی حزب:

بڕیاری کۆمیتەی ناوەندی مەکتەبی سیاسی دەرکرا لە شانەیەکەوە بۆ باڵاترین ئۆرگانی(حزب) بە هەڵبژاردن بەرپرسی یەکەمی ئۆرگانە باڵاکان دابنرێن، پرۆسەی هەڵبژاردن

دەستی پێکرد لە هەرسێ قەزاکە لە قەلادزێ، رانیە، دوکان هەڵبژاردن ئەنجامدرا، لە زۆربەی ئۆرگانەکان هاورێی لاوازو کەم ئەزموون هەڵدەبژێردرا، بۆ نموونە لە هەڵبژاردنی لیژنەی محەلی سلێمانی هەڵبژاردن ئەنجام درا یەکێك لە هاورێیان رەخنەی زۆر توندو بریندارکەری لە هاورێ شێخ سەعید گرت، ئەو هاورێیە گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو، کە قسەکانی تەواوبوو چوومە لای پێم گوت رەخنەکانت لە جێگای خۆی نەبوو، هاورێ شێخ سەعید(٤٠) ساڵە خەبات دەکات تێکۆشەرێك چل ساڵ خەبات بکات، (٤٠) هەڵەی دەبێ... هەڵبژاردن لە ناو حزبی شیوعیدا وەکو دادگایی وابوو، هەر هاورێیەك خۆی بپالاوتایە بۆ هەر ئۆرگانێکی حزبی دەبوایە لە بەردەم کۆنگرە یا کونفرانس تقیم بکرێت واتا هەڵسەنگێنرێت، مێژووی سیاسی و چینایەتی، باری کۆمەلایەتی باس دەکرا، کەم و کورتییەکانی، مێژووی سیاسی رووبەرووی دەکرایەوە، هەڵبژاردن ئەگەرچی وەکو نەریتێکی دیموکراتیانە شتێکی زۆر باشە بەلام زیاتر لە روانگەی هەست و سۆزی برادەرایەتی و بەرژەوەندی شەخسی و دەعوەتکارییەوە دەنگەکان دەدران. لە ٥١٪ ی براوەکان لە رێگای میزاج و خواستی شەخسی دەنگەکانیان وەدەست دەهێنا. تێکۆشەرانی شاخ پێیان وابوو لە رێگای مێژووی خەباتی سیاسی و چەکدارییەوە هەڵدەسەنگێنرێن، بۆیە کاتی لە هەڵبژاردنەکان دەدۆران زۆر بێ ئومێد دەبوون، ئەوەی جێگای دڵگرانی بوو ئەگەر کادرێك لە ئۆرگانەکانی خۆی لە هەڵبژاردن سەرکەوتوو نەبا خەسڵەتی کادری (محتریف)ی لەسەر لادەچوو و، موچەی مانگانەی حزبی بۆ دیاری نەدەکرا. ئەو کاتە هەڵبژاردنی ئۆرگانەکانی حزب لە دادگا دەچوو نەك لە کۆنگرە...

بابەتێکی تر کە لە کۆنگرەدا بە گەرمی گفتوگۆی لەسەر کرا، پێکهێنانی حزبی شیوعی کوردستانی بوو. بیرۆکەی پێکهێنانی حزبی شیوعی کوردستانی لە سەردەمی شاخەوە لە ناو ریزەکانی حزبدا پەیدابوو، بەلام بە هۆی هەلومەرجی سیاسی بێدەنگەی لێکرا. مانگی حوزیرانی ساڵی ١٩٩٣ یەکەم کۆنگرەی دامەزراندنی حزبی شیوعی پێکهێنرا، ئەو کۆنگرەیە لە کاتێکدا پێکهات، کە پرۆسەی هەڵبژاردنی ئۆرگانەکانی محەلی سلێمانی و هەولێر ئەنجام درابوو، بەلام لەبەر ئەوەی محەلی هەولێر زۆربەیان وەکو بیرۆکە کوردستانی بوون، کۆنفرانسی هەولێر لە لایەن سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراقی یەوە هەڵوەشێنرایەوە. هاورێیانی محەلی هەولێر زۆربەیان لە حزب جیا بوونەوە، باڵێکی سەربەخۆیان راگەیاند بە ناوی شیوعییە کوردستانییەکان. بە جیابوونەوەی ئەو باڵە لە(حزب) دردۆنگی و گومان لە ناو ئۆرگانەکانی

حزب دروست بوو. کاتێك لە هۆڵی کۆنگرە دەچوومە ژوورەوە، یەکێك لە حەرەسەکانی کۆنگرە منی بە تەنها پشکنی، زۆرم پێ سەیر بوو!؟ بۆچی تەنیا من دەپشکنن؟ پرسیارم لە هاوڕێیەك کرد وتی رەنگە تۆ بە لایەنگری شیوعییە کوردستانییەکان بزانن. ئەو پشکنینە بۆ من بوو بە گرێ کوێرەیەکی دەروونی و دەتوانم بڵێم بەخۆداچوونەوە و وەرچەرخانێك لە ژیانی سیاسیمدا. منێك وەکو پێشمەرگەیەکی دانەبڕاوی(حزب)، هەموو تەمەنی گەنجی خۆم و ژیانی ماڵ و منداڵم، لە پێناوی سەروەری گەلەکەمدا، لەبن بەردو دەوەنەکانی قەندیل بەسەربردووە، کەچی بە فەرمانی خەڵکانێك دەپشکێنرێم کە خۆی رادەستی رژێم کردۆتەوە. پێم وابوو سووکایەتیم پێ دەکرێ، لەبەر ئەوە مێژووی خەباتی چەند ساڵەی خۆمم لەبەر چاو کەوت...بەندە راستە وەکو بیرۆکە، بیرۆکەی کوردستانیم پەسند دەکرد، بەڵام هەرگیز پشتگیری دروستکردنی حزبی شیوعی کوردستان و جیا بوونەوەیم نەکردووە لە حزبی شیوعی عێراقی. من حزبی شیوعی عێراقیم خۆش دەویست و، ئێستاش هەر خۆشم دەوێت. بەڵام پێم وایە حزب ئامرازێکە بۆ بەدی هێنانی ئامانجی سیاسی ناکرێت حزب وەکو ئایین سەیر بکرێت.

کۆنگرە لە ناو بارەگای لیژنەی محەلی کەرکووك پێکهات، گفتوگۆیەکی زۆر چڕوپڕ لەسەر پرۆژەی حزبی شیوعی کوردستانی کرا. یەکێك لەو هاوڕێیانەی بە دڵ گەرمی گفتوگۆی لەسەر دامەزراندنی حزبی شیوعی کوردستانی دەکرد، هەر ئەو کەسە بوو کە فەرمانی دابوو بە پاسەوانەکان من بپشکنن. هەر ئەویش بڕیاریدا ئەو هاوڕێیە لە کۆنگرە دەرهێنرێ و ئەشکەنجە بدرێت، خێزانی ئەو هاوڕێیە کە ئەندامی کۆنگرەبوو هاتە سەر شانۆی کۆنگرە و قیژاندی وتی: ئەوە دیموکراتییەتە یا دیکتاتۆرییەت بۆچی مێردەکەمتان ئەشکەنجە داوە. دواتر کوڕە گەنجەکە هاتە سەر شانۆی کۆنگرە، قۆڵ و پشتی ئەشکەنجە دراوی نیشانی ئەندامانی کۆنگرە داو، وتی ئێرە ئەمنە سوورەکەیە!! و کۆنگرەی بەجێهێشت... هاوڕێ عەزیز محەمەد کە لە کۆنگرەکە دابوو، چووم بۆ لای و پێم وت: چارەنووسی ئەو حزبە بە کوێ دەگات کاتێك لەسەر بیروڕای فیکری ئەشکەنجەی هاوڕێکانی بدات؟! هاوڕێ عەزیز وتی هاوڕێ من هەتا ئێرەم هێناوە، لێرە بەولاوە چۆنی بەڕێوەدەبەن، کەیفی خۆیانە!؟

کە لە کۆنگرە گەڕامەوە، محەمەد خدری جاران نەما بووم، ڕووخانێك ڕووخام کە ئیرادەی کاری حزبایەتیم بە تەواوی لەدەستدابوو. مرۆڤ کاتێ لەڕووی ئایدولۆجییەوە دەڕووخێ مرۆڤێکی ئاسایی نامێنێ. رۆژانە بیرم لە خەباتی سیاسی ناو حزبی شیوعی دەکردەوە، کە

مام برایمی مامم له پەنجاكانەوە شیوعی بووە و، لەسەر حزبی شیوعی هەزاران سووكایەتیمان پێ كراوە، لەسەر ئەو حزبە هەزاران جار لە لێواری مەرگ گەراووینەتەوە. ماندووبوون و شەونخونی و قوربانی ڕابردوو لە لایەك، خەباتی پێشمەرگایەتی و ئاوارەیی و كوێرەوەری سالانی سەختی شۆڕش لە سالی ١٩٧٩ بۆ سالی ١٩٩٣، لەلایەكی تر. ئەمانە وەكو شریتێكی نەپساوە رۆژانە دەهاتەوە بەرچاوم، هەرگیز چاوەڕوانی رۆژگارێكی وەكو ئەو رۆژە نەبووم، ئەو گرفتە دەروونییە بوو بە مۆتەكە و گەرووی گرتم. لە ڕووی تەندروستی زۆر شەپرزە بووم. ئەوەی زیاتر نیگەرانی دەكردم ئەو گومانە بوو تا دەهات لە ناو حزب پتر دەبوو، متمانە نەمابوو، وای لێ هاتبوو هاوڕێ نزیكەكانیشم گومانم لێ بكەن، گوایا لایەنگری شیوعییە كوردستانییەكانم، لە كاتێكدا هاوڕێ شیوعییە كوردستانییەكان داوایان نەكرد بوو پشتگیریان بكەم، خۆشم بڕوام بە جیابوونەوە و لەت كردنی حزب نەبوو. ئەو گومانە ناچاری كردم واز لە كاری حزب بهێنم، لەبەرئەوە وەك پێشمەرگە چووم بۆ ناو سوپای یەكگرتووی كوردستان...

## سوپای یەكگرتوو:

تەمەنی سوپای یەكگرتووی كوردستان كورت بوو، سالێك درێژەی نەكێشا كە شەڕی ناوخۆ دروست بوو. ئەو ماوە كورتەش ئەزموونێكی تر بوو، سەركردایەتی حزب خەمسارد بوو لەسەر رێژەی بەشداری هاوڕێیان لە ناو سوپای یەكگرتوودا. بە سەدان هاوڕێ ناویان تۆماركرابوو لە سوپای یەكگرتوو. ئەو كاتە سوپای یەكگرتوو بۆ ئەو هاوڕێیانەی پێشمەرگەی شاخ بوون گرینگ بوو، جگە لەوە سەرچاوەیەك بوو بۆ ژیانی خێزانەكانیان، خواردەمەنی و مووچەیان لە سوپا وەردەگرت. حزبی شیوعی سێ فەوجی وەرگرتبوو، دەیان هاوڕێ كە پێشمەرگەی دانەبڕاو بوون لەوە نیگەران بوون كە ناویان تۆمارنەكرابوو. بەرپرسی فەوجی قەرەداخ هاوڕێ حەمە ڕەشید قەرەداخی بوو و، هاوڕێ عەبەی مامە و هاوڕێ سەلیم حەسەن جێگری فەوج بوون، منیش ئەفسەری هەوالگری بووم. هاوڕێ كاوە كلكە سماقی ئەفسەری میرە و دارایی بوو، هاوڕێ سورە ئامر سریە بوو. بە مەبەستی دابینكردنی مووچەی مانگانە، بۆ ئەو كۆمەلە هاوڕێیەی ناویان لە(فەوج) تۆماركرابوو، پێشنیارم كرد داوا لە سەركردایەتی سلێمانی سوپای یەكگرتوو بكەین. هاوڕێ حەمە رەشید پێشنیارەكەمی پەسند كرد و، شاندێك بە سەرپەرشتی ناوبراو چووین بۆ لای كاك(جەبار فەرمان)، بەرپرسی قیادەی سوپای یەكگرتوو لە سلێمانی،

هاوڕێ حەمە ڕەشید وتی لیستێکی دوو سەد کەسیمان پێیە لەو هاوڕێیانەی پێشمەرگەی دێرینن مووچەیان نییە. بەپەرۆشەوە کاك جەبار وتی بە سەرچاو، بێ ئەوەی سەیری لیستەکە بکات یەکسەر واژۆیی لەسەر کرد و، بەدەم ئیمزا کردنی لیستەکە سەری هەڵبڕی وتی: شەرم دەکەم کە ئێوە دەبینم فەوجێکتان هەیە، جێگای خۆیەتی ئێوە زۆربەتان لە ئەفسەرە پلە باڵاکانی قیادەی دەڤەری سلێمانی بن، حزبی شیوعی زۆری کردووە و هیچی پێ نەبڕاوە.

ساڵی١٩٩١، ٩٣، ٩٤ ساڵانی نەك هەر گرانی بگرە قاتی و قڕی بوون، زۆر جار ئەو برە ئەرزاقەی دەدرا بە فەوجی قەرەداغ، بەشێکی دابەشدەکرا بەسەر خێزانی هاوڕێیانی پێشمەرگەدا. هاوڕێ خاڵە شێخ محەمەد خەڵکی ناوچەی هەورامان و دەوروبەری هەورامان بوو، لیستێکی ئامادە دەکرد لە خێزانە نەدارەکانی حزب وتی: وم بە قوربانی لالو حەمە هیمەتێك بکەن هەندێك ئەرزاق بەین بەو خەڵکە هەژارە. بە پێی توانا مانگانە ئەرزاق و خۆراکی هەمەجۆرە بەسەر خێزانە هەژارەکاندا دابەشدەکرا...ڕۆژ بە ڕۆژ پەیوەندی نێوان پارتی و یەکێتی بەرەو خراپی و گرژی دەڕۆیشت. مانگێك پێش ئەوەی شەڕی ناوخۆ دەست پێ بکات، شێخ جەعفەر ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی، هاتە شارۆچکەی قەرەداغ و ئاڵای پارتی دیموکراتی کوردستانی لەسەر بینای ناوچە داگرت. هەڤاڵێکی بەرپرسی ناوچەی قەرەداغی پارتی هاتە لای ئێمە بۆ ئەوەی ناو بژیوانی بکەین، چووین بۆ لای شێخ جەعفەر پێمان وت بۆچی ئاڵای پارتی دادەگری؟ لە وەڵامدا وتی نابێ لە سنووری قەرەداغ پارتی وجودی هەبێ؟! گەڕاینەوە بەرپرسی ناوچەی پارتی کە هەر لە بارەگای(فوج) بوو، پێم گوت بڕۆ بە برادەرانتان بڵێ، یەکێتی شەڕی لە دژی پارتی ڕاگەیاندوە..

زۆری پێ نەچوو شەڕی ناوخۆ دەستی پێ کرد و، سوپای یەکگرتوو هەڵوەشایەوە و بارودۆخی کوردستان لە خراپەوە بەرەو خراپتر چوو. دەڵێن ماڵ خۆی نەبوو میوانیش رووی تێکرد. سەرەڕای گرانی و برسێتی ئێشو ئازاری گەمارۆی ئابووری، شەڕی ناوخۆشی هاتەسەر، جارێکی تر خەڵکی کوردستان سەرگەردان و بێ ئومێد کرایەوە.

## شەڕی ناوخۆ:

شەڕی ناوخۆ وەك خۆرکە و مۆرانە، هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ لە بەریەکترازانی کۆمەڵگای کوردەواری. بە هۆی ئەو شەڕەوە کۆمەڵێك دیاردەی مەترسیدار لە ناو کۆمەڵگادا

سەریان هەڵدا. لەوانە دابەشبوونی کۆمەڵگا بەسەر حزبەکاندا، ئینتمای حزبایەتی بوو بە مۆرك بە ناونیشان، لە هەردوو بەرەی شەڕەکە پێگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێ دیاریدەکرا. خاڵێکی تری زۆر خەراپ لە شەڕی ناوخۆدا لەبارچوون و تێکشکاندنی پێوەرەکان و بێ نرخ کردنی بەهاکان بوو. پێوەرێك نەما بۆ لە محەك دانی موستەشارێکی ڕژێم و پێشمەرگەیەکی دێرین، بە پێچەوانەوە جاش و مستەشارەکان بە حورمەتەوە پلەو پایەی حزبی و عەسکەریان پێدەدرا، چونکە هەر بە هەمان مەبەستی شەڕکردن بۆ ڕژێمی بەعس، بەشداری شەڕی براکوژی ناوخۆیان دەکرد. شەڕی ناوخۆ هۆکار بوو بۆ کاڵ کردنەوەی ئینتمای نەتەوەیی و نیشتمانی. لایەنێکی زۆر خراپتری شەڕی ناوخۆ تالان و شڕەخۆری بوو. یەکێك لە بنەماکانی گەندەڵی کوردستان لە شەڕی ناوخۆوە بڕەوی پەیداکرد. بە ئاشکرا سەروەت و سامانی ماڵی دراوسێ لە لایەن دراوسێیەکەی تری تالان دەکرا، تەنیا لەبەر ئەوەی لە ریزی بەرەکەی تری شەڕەکە بوو. ئەو شەڕە کەرامەتی مرۆڤی کوردی ڕوشاند بوو. بە سەدان کەس لە دۆست و لایەنگرانی پارتی و یەکێتی، ئاوارەی سنووری ژێر دەسەڵاتی دوو بەرەی شەڕی ناوخۆ بوون کە دواتر بە ئاوارەی شەڕی ناوخۆ ناودێر کران. هەنگاوێکی تری زۆر قێزەون لە شەڕی ناوخۆدا، کە بە داخەوە یەکێتی پەنای بۆ برد، سەپاندنی خێزانە ئاوارەکانی یەکێتی بوو بەسەر خێزانە پارتییەکاندا کە ژیانیان دابین بکەن. خێزانە پارتییەکان لە سنووری بیتوێن و پشدەر سەرژمێرکرابوون. ئەو خێزانەی لە رووی داراییەوە توانای هەبوو، یەکێتی ماڵێکی ئاوارەی هەولێری یا ڕەواندوزی خۆیانی بەسەردا دەبڕی، لە ناو ماڵەکەی خۆی بە پێخەف و خواردن و حەمامی خۆیان وەکو خۆیان ئەو ماڵە ئاوارە بژیەنێ.

ئەو کارە ئەوەندە ئابڕو بەر بوو، زۆر کەس لەو خەڵکانە ئەوەندە شەریف و بە حورمەت بوون، کە بەسەر ماڵە پارتییەکاندا دەدران، خۆی قبوڵی نەدەکرد، ناچار خانوی بە کرێ دەگرت وەکو کەسێکی ئاسایی ژیانی رۆژانەی خۆی بەرێ دەکرد... شەڕی ناوخۆ دوای ڕاپەڕین، لە ١٩٩٤/٥/١ دەستی پێکرد تا کۆتایی ساڵی ١٩٩٨ درێژەی کێشا. زۆر نوسەر و رۆشنبیری کورد، لەسەر شەڕەکە ڕای خۆیان بە نووسین نووسیوە و بڵاوکردۆتەوە، بەڵام شەڕی ناوخۆی نێوان پارتی و یەکێتی، هێشتا بەبێ لایەنی هەڵنەسەنگێنراوەو هەقی خۆی نەدراوەتێ، رەنگە ڕاوبۆچونی بەندەش بێ لایەن نەبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو شەڕە هەموو تاکێکی کۆمەڵگای کوردەواری ئەزییەت دەدا، لەڕووی سیاسی و ئابووری و دەروونی و قوربانییەوە، هەموو

کۆمەڵگای کوردستانی گیرۆدە کردبوو، چەند قۆناغێك ئەزموونی کوردستانی لەڕەوتی ژیان دواخست، لەبەر ئەوە جێگای خۆیەتی وەك دیاردەیەکی قێزەون و رۆژگارێکی رەش لە مێژووی کورددا تۆمار بکرێ. شەڕی ناوخۆ دەرهاویشتەی مێژووی خەباتی هاوچەرخی کوردستانی باشوورە. ئەو شەڕە تەنیا لەسەر دەسەڵات نەبوو، پێم وایە گرفتەکە یەکتر قبوڵ نەکردن بوو، پاوان کردنی گۆڕەپانی سیاسی بوو، ئامانج ئەوە بوو جارێکی تر، بنەماڵەی بارزانی و پارتی دیموکراتی کوردستان وەك سەردەمی شۆڕشی ئەیلول لە مەیدانی کوردایەتیدا رۆڵی سەرەکی نەبینن. لە کاتی یەکلاکردنەوەی دەنگەکانی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ پارتی لە یەکێتی پتر هێنا بوو، بەڵام مام جەلال لە رێگای سیاسەت مەدارێکی ناسراو، پەیامێکی بۆ سەرۆك بارزانی ناردبوو کە یەکێتی دەرئەنجامی هەڵبژاردنەکە قبوڵ ناکات، بە واتایەکی تر کێشەکە چۆوە سەر ریشەی مێژوویی خۆی، کە لە شەستەکانەوە گەلی کوردستان بەدەستییەوە دەناڵێنێ.

## ئەرکی خێزان و کاری حزبایەتی:

لەو رۆژەوە کە لە نەغەدەوە بەرەو قاسمەڕەش بەڕێکەوتم، واتا لە کۆتایی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٩١ بۆ سەرەتای ساڵی،١٩٩٣ لە دەروێشێکی کۆڕی زیکرو سۆفیگەری دەچووم، جگە لە کاری حزب رۆژانە بیرم لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە. هەر بە هەواو نەفەسی شاخ سەیری ژیانی خێزانی خۆم دەکرد. ماوەی هەفتەیەك مۆڵەتم لە حزب وەرگرت بۆ ئەوەی ماڵەکەم لە نەغەدەوە بهێنمەوە بۆ ئۆردووگای حاجیاوا. مانگی تشرینی یەکەم بوو ساڵی ١٩٩١ ماڵی بەندەو هاوڕێ حەسەن و د.کاحوسێن بە یەکەوە گەڕاینەوە. من و هاوڕێ حەسەن خدر لە حاجیاوا بە هەردووکمان خانوویەکمان بۆ خێزانەکانمان بە کرێ گرت. لەبەر سەر قاڵی کاری(حزب) سەرپەرشتی خێزانەکەم پێ نەدەکرا. دایکی هاوێر دوو گیان بوو، لە کاتی لەدایکبوونی نوالای کچم، بۆم نەکرا ئەو رۆژە مۆڵەت وەربگرم، پێم وابوو گلەیم دێتە سەر، کچەکە پێویستی بە نەخۆشخانە بوو بۆ ئەوەی بخرێتە ژێر چاودێری دکتۆری پسپۆر لە سلێمانی یا لە هەولێر، بەڵام من بۆم نەکرا منداڵەکەم ببەم بۆ ئەو شارانە لەبەرئەوە کچەکەمان مرد. لە کۆتایی ساڵی ١٩٩١ ماڵەکەم گواستەوە بۆ رانیە، لەگەڵ ماڵی هاوڕێ زراری شەهید مام ڕەسوڵ سوور پێکەوە لە خانوویەك دا بووین، خانووەکە بینایەکی حکومی بوو بۆ فەرمانبەرانی

تەندروستی دروستکرابوو، ئەو فەرمانبەرانەی کە لایەنگری حزبی بەعس بوون، هاوڕێیان وەکو بینای حکومی لە کاتی راپەڕیندا دەستیان بە سەردا گرتبوو. خانووەکە دوو ژوورو چێشتخانەیەکی هەبوو، بۆ دوو ماڵ بچووك بوو بەڵام بە کرێ نەبوو لەڕووی ئاسایش لە بارەگای حزب نزیکبوو. هاوڕێ زرار لە ژوورێك و منیش لە ژوورێکی تردا بووم، واتا هەردوو ماڵەکە هەر یەکەو ژوورێکمان هەبوو، هەم چێشتخانە بوو هەم جێگای خەوتنی خۆمان و منداڵەکانمان بوو. کاتێ دەچووم بۆ کۆبوونەوەکانی(حزب) لە سلێمانی هاوڕێ حەمە شوان بە گەرمی خولقی دەکردم لە گەڵیدا بچمەوە ماڵەوەیان، زۆر لە هاوڕێیان لەگەڵی دەچوون، بەڵام من خۆم دەپاراست لە دەعوەت و ژەم بەڕێ کردن. لە سەردانێکدا هاوڕێ حەمە شوان ناچاری کردم لە گەڵیدا بڕۆم بۆ ماڵەوەیان، دەعوەتێکی زۆر باشی کردین، خانوو باخچەیەکی دڵگیرو ناوماڵێکی زۆر خۆشی هەبوو، کتێبخانەیەکی زۆر گەورەی لە ماڵەکەدا هەبوو، ماڵێکی شارستانی بە تەواوی مانا، ژووری تایبەتی خەوتن و چەند ژووری تر و ناو ماڵی رێکوپێك. ئەوێ رۆژێ تێگەیشتم ژیانی شارو شاخ چەندە لە یەکتر جیاوازن. جارێکیان هاوڕێ حەمە شوان بۆ کۆبوونەوە هاتبوو بۆ رانیە، منیش لە ماڵی خۆم بۆ ژەمی نیوەڕۆ دەعوەتم کرد. کاتێ هاتە ژوورەوە پێڵاوەکانی دانەکەند، پێی وابوو دەچێتە ناو بینایەکەوە ژووری پێشوازی و خەوتن و چێشتخانەو کۆمەڵێك تایبەتمەندی تری تێدایە. منیش ڕووم لە هاوڕێ حەمە شوان کرد وتم هاوڕێ من هەر ئەم ژوورەم هەیە جێگای خەوتن و خواردن و پێشوازی میوان، تکایە پێڵاوەکانت داکەنە؟! هاوڕێ حەمە شوان چاوی ئەبڵەق بوو زۆر پێی سەیر بوو، وتی: بەڕاستی هەر لەم ژوورەدا ژیان بەسەر دەبەن؟ وتم بەڵێ، وتی ئەی ئەو بوختان و قسە نابەجێیانە چییە بەرامبەرتان دەکرێ؟ وتی پێم وابوو خانووی خۆت هەیەو ناو ماڵێکی تۆکمەت بۆ خۆتان پێکەوەناوە. لە وەڵامدا وتم خەڵك هەرچی دەڵێن با بیڵێن، من وەکو پێشمەرگەکەی شاخ دەژیم شانازیشی پێوە دەکەم.

لە(١٠)ی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی **١٩٩٣** سۆرانی کوڕم لەدایکبوو، بە لەدایکبوونی سۆران منداڵەکانم بوون بە پێنج منداڵ، وەکو خێزان بووین بە(٧) کەس لە ماڵەوە. باری ئابووری عێراق و کوردستان تا دەهات پتر بەرەو تەنگژەو گرانی دەڕۆیشت، بەڵام هەر چۆنێك بوو ژیانی خۆمان بەو مووچەیە بەڕێوەدەبرد، کە لە سوپای یەکگرتووی کوردستان وەرم دەگرت. گرانی و نەبوونییەکی زۆر خنکێنەر رووی لە کوردستان کردبوو، هەم گەمارۆی ڕژێم و هەم گەمارۆیی نێودەوڵەتی لەسەر کوردستان بوو، رۆژ بەرۆژیش بارودۆخی کوردستان بەرەو ئاڵۆزی دەچوو.

## شەڕی بزووتنەوەی ئیسلامی و یەکێتی:

پەیوەندی نێوان پارتی و یەکێتی بەرەو گرژی دەڕۆیی. بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان خۆی پڕ چەك دەکرد و، بەردەوام خەریکی مەشقی سەربازی بوو. بێ ئەوەی سروشتی گۆڕەپانی مەشق ڕەچاو بکەن، لە ناو جەرگەی شار و شەقامی گشتی رانیە مەشقیان بە چەکدارەکانیان دەکرد. لەسەر شێوازی چەکدارەکانی تالیبان، لەڕووی راگەیاندنەوە رۆژانە وتارو لێدوانی مەلا کرێکارو مەلا عەلی باپیر، لە شاشەی تەلەفزیۆنە لۆکاڵیەکەیان بڵاودەکرایەوە. وتارەکانیان پڕ بوون لە سووکایەتی و قسەی ناشایستە بە حکومەتی هەرێمی کوردستان. ناوی پەرلەمان و حکومەتیان بە پیاوە نەخۆشەکە ناو دەبرد. دانیان بە حکومڕانی کوردستان دانەدەنا. شەڕیان بە یەکێتی فرۆشت و، بە پیلانێك بێ هیچ پاساوێك کاك محەمەد سوڵتان و هاوڕێکانیان کوشت. هەر بەو ئەقلیەتەوە خۆیان تووشی شەڕێکی خۆ تڕێن کرد. یەکێتی هێرشی راگەیاندنی دەست پێکرد، لە وتارێکی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان دا وتیان مێرولە بە گژ قوللەی قاف دا چووە. ئەو کاتە لە رانیە پەیوەندیم بە ئیشوکاری بارەگای حزبەوە نەمابوو. ئەو رۆژە هاوڕێ کەریم ئەحمەد سەردانی بارەگای(حزب)ی کردبوو لە رانیە داوای لێکردم وتی حەزدەکەم سەرپەرشتی بارەگای حزب بکەیت تاکو ئەو گرژی و ئاڵۆزییە کۆتایی دێت. لای هاوڕێ کەریم دانیشتبووم کە کاك محەمەد سوڵتان تەلەفۆنی بۆ بارەگا کرد. نیو کاتژمێر پێش ئەوەی شەهیدبکرێ قسەی لەگەڵ کردم و، داوای کرد سوود لە وجودی هاوڕێ کەریم وەربگرین بۆ ئەوەی شەڕ و پێکادان دروست نەبێ. بەندەو هاوڕێ کەریم ئەحمەد خەریکی خۆ ئامادەکردن بووین بچین بۆ لای کاك محەمەد سوڵتان. بە داخەوە بەوەرانەگەیشتین بچینە لای ناوبراو، کە بزووتنەوەی ئیسلامی پەلاماری کۆمیتەی یەکێتی نیشتمانی کوردستانیان دا، محەمەد سوڵتان و هاوڕێکانیان شەهیدکرد. چەکدارەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی، شاری رانیە و شارۆچکەی چوارقوڕنەیان کۆنترۆڵ کرد. شەڕ لە دووڕییانی حاجیاوا بوو. بزووتنەوەی ئیسلامی ماوەی سێ رۆژ، شاری رانیەو چوارقوڕنەیان لە ژێر دەستدابوو. لەناو بارەگای(حزب) بووین لە رانیە هاوڕێیەك بانگی کردم وتی بەرپرسێکی بزووتنەوەی ئیسلامی لەسەر تەلەفۆنە داوات دەکات. تەلەفۆنەکەم هەڵگرت یەکێك بە ناوی بزووتنەوەی ئیسلامی هەڕەشەی لێکردین، ئایەتێکی خوێندەوە کە دەقی ئایەتەکەم لەبیر نەماوە، بەڵام ئایەتەکە (مفسد فی الارض) ی تێدا بوو، بەرپرسەکە بە تەلەفۆن وتی ئەگەر رێگا بدەن یەکێتی لە بارەگاکەتانەوە پەلامارمان بدات بە

موشەکی گراد تەفرو توناتان دەکەین!! زۆر بە هێمنی وەڵامم دایەوە و وتم: لە خۆتان بایی مەبن، ئەو بەردەی هەڵتانگرتووە زۆر قورسە، بەر کەللە سەری خۆتان دەکەوێ. کۆمیتەی چوارقورنەی یەکێتی لە ترسی بزووتنەوە بارەگایان چۆڵکردبوو، چووبوونە ناو بارەگای حزبمان لە چوارقورنە، لە بارەگای حزبەوە گوایا تەقەقە لە نێوان هاوڕێیانی ئیمەو بزووتنەوەی ئیسلامی دروست بووە، کەچی هاوڕێیان ئاگاداریان نەکردبووینەوە. بارەگای رانیە نزیکەی(٦٠) هاوڕێی لێبوو. بە پەلە هاوڕێیانم کۆکردەوە و پێم راگەیاندن، کە بزووتنەوەی ئیسلامی هەڕەشەمان لێدەکات، شەڕ دەرگای پێ گرتووین، بەرگری لە بارەگای حزب و ئاڵاکەی دەکەین. دیاربوو هەموو هاوڕێیان ئامادەیی ئەوەیان تێدا بوو، لە پێناو پاراستنی کەرامەتی حزبەکەیان قوربانی بە خۆیان بدەن. چەك و تەقەمەنی هاوڕێیانم لە بارەگای رانیە سەرژمێری کرد ئەو هاوڕێیانەی ئەزموونی شەڕی چەکداریان هەبوو جیام کردنەوە، ئەوانەش کە پێشمەرگایەتیان نەکردبوو، داوام لێکردن بگەڕێنەوە ناو ماڵەکانیان. ئەوانەی لە بارەگا مابووینەوە لە رووی چەك و تەقەمەنییەوە، پۆشتەو ئامادەبووین. فەرمانم بە هاوڕێیاندا ژوورەکانی ناو بارەگا بە کوین کون بکەن. بەهۆی ئەو شەڕەوە هاوڕێ کەریم هەفتەیەك بوو لە رانیە گیری خوارد بوو. ناوبراو پێی راگەیاندین کە دەیەوێت بگەڕێتەوە هەولێر. لەگەڵ هاوڕێ ئەمیر حوسێن و هاوڕێیانی تر کە بەرپرسی لیژنەی ناوچە بوون، سەبارەت بە گەڕانەوەی هاوڕێ کەریم و هاوڕێیانی تر راوێژو گفتوگۆمان کرد. لەبەر ئەوەی پەیوەندی نێوان بزووتنەوە و پارتی باش بوو، هەندێ لە هاوڕێیان پێیان باشبوو بۆ دەربازکردنی هاوڕێ کەریم و برادەران، داوای یارمەتی لە برادەرانی پارتی بکەین، کە بزووتنەوەی ئیسلامی بە پێچەوانەوە پەیوەندیان لەگەڵ حزب زۆر خراپ بوو. بێ ئەوەی ئەو هەڵوێستانە بە هاوڕێ کەریم رابگەیەنین، شەو و رۆژێك لە نێوان خۆماندا لە راوێژو گفتوگۆدا بووین، ئەو بەیانییەی کە دەبوو وەڵامی هاوڕێ کەریم بدەینەوە بۆ گەڕانەوەی هەولێر، هەڵوێستی خۆم یەکلاکردەوە، بە هاوڕێیانم وت: خۆمان هاوڕێ کەریم دەربازدەکەین، هەرچی دەبێ با ببێ! خۆم بەرپرسیارم لە هەر پێشهاتێك لە کاتی دەربازکردنیاندا رووبدات. ژمارەیەك هاوڕێی وریا و چاپووکمان هەڵبژارد و دوو سەیارەمان ئامادەکرد. ئاڵای سوورمان لە سەیارەکان چەقاند. هاوڕێ ئەمیر حوسێن سەیارەکەی لێ دەخوڕی لەپێشەوە دەڕۆیشتین، بە ناو گرمەی R.B.G و تەق و تۆقی شەڕەکەدا ڕۆیشتن. لە سەیتەرەی چوارقورنە بزووتنەوەی ئیسلامی ڕایان گرتین و، وتیان بۆچی پێشەکی ئاگادارتان

نەکردوینەتەوە؟ وتمان ئاگادارکردنەوەی ناویٚ بە مۆڵەتی هیچ لایەك هاتوچۆ ناکەین. دواتر ڕێگایان پێداین و ڕۆیشتین. لە نزیك دووڕییانی چوارقورنە- حاجیاوا، دوو چەکداری بزووتنەوەی ئیسلامی بە لێواری شەقامەکەدا پارێزیان دەبرد بۆ ئەوەی سەیتەرەی دووڕییانەکە بگرن. یەکێکیان R.B.G پیٚ بوو ئەوی تر B.K.C، گەیشتینە دووڕییانەکە، گەنجێك خۆی بە لا دیواری سەیتەرەی دووڕییانەکەوە نووساند بوو، پێمانوت خێرا لێرە بڕۆ ئەگینا دەکوژرێی، هەرئێستا بە R.B.G لێتان دەدرێت. لەویٚ تێپەڕین و تا قەمتەران لەگەڵ هاوڕیٚ کەریم و برادەران ڕۆیشتین، لەویٚ هاوڕیٚ کەریم وتی ئێوە بگەڕێنەوە لێرەوە خۆمان بەرەو هەولێر دەڕۆین. کاتیٚ کە گەڕاینەوە دیاربوو هێزەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی بە R.B.G لە سەیتەرەی دووڕییانەکەیان دا بوو دەستیان بەسەرداگرتبوو. هێزەکانی یەکێتیش بەرەو گوندی گردجان پاشەکشێیان کردبوو. ماوەیەك لە گوندی گردجان چاوەڕوانی بارودۆخەکەمان دەکرد. لە سەیارە هاتینە دەریٚ، سەیرمان کرد لێواری شەقام و ناو دڕوەکانی لێواری شەقامەکە، بە دەیان هەویەی سەوزی بە دڕاوی لیٚ فڕێدراوە. کاك تۆفیق کانی وەتمانی و ژمارەیەك پێشمەرگەی یەکێتی لە ناو خەندەك و ئاوبارەی گوندی گردجان پەڕاگەندە ببوون. هاوڕیٚ ئەمیر رووی تێکردم وتی چی بکەین؟ وتم دەڕۆین لێخوڕە!! کاتیٚ گەیشتینە دووڕییانەکە تەنها ئەو دوو گەنجە لەویٚ بوون کە لە هاتنماندا بینیمان پارێز بۆ سەیتەرەی دووڕییانەکە دەبەن. بە ئازایەتی ئەو دوو کوڕە گەنجە سەرسام بووم، کە بە دوو کەس دووڕییانەکەیان لە پێشمەرگەکانی یەکێتی ستاندووە. هەر ئەو ڕۆژە دوای نیوەڕۆ، هێزێکی گەورەی یەکێتی بە فەرماندەیی جەبار فەرمان گەیشتە مەیدانی شەڕەکە، لە ماوەی کەمتر لە(٢٤) کاتژمێر، سەر ئەشکەوتان دەستی بەسەردا گیرا، کە سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئیسلامی لیٚ بوو، مامۆستا مەلا عوسمان و ژمارەیەك ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئیسلامی دیلکران و کوژران. بزووتنەوەی ئیسلامی لە رانیە، هەر ئەو شەوە بیٚ بەرگری بارەگاکەی چۆڵکرد. لە مەڵبەندی(٣)ی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە بەرپرسێکی مالّبەندەکەیان بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ کردم و، داوای کرد بارەگاکەیان لیٚ وەربگرین. پێم وت ئێمە کاری وا ناکەین، بارەگای هیچ لایەك وەرناگرین، لەو شەڕە (حزب) بیٚ لایەن بووە، ئەگەرچی بزووتنەوەی ئیسلامی هەڕەشەی (مفسد فی الارض)ی دەکرد و دەیەویست بە موشەکی گراد بارەگاکەمان بۆردومان بکات، بەڵام بیٚ لایەنی خۆمان پاراست. یەکێتی لە ڕێگای برادەرێکەوە داوایان لێکردین، ڕێگایان بدەین لە بارەگای ئێمەوە هێرش بکەنە سەر

مەڵبەندی(٣)ی بزووتنەوە، بەڵام ڕازی نەبووین و پێمان ڕاگەیاندن لایەنگری هیچ لایەکتان ناکەین. ماوەی کاتژمێرێك بوو بارەگای مەڵبەندی(٣)ی بزووتنەوەی ئیسلامی چۆڵکرابوو. کەچی پێشمەرگەکانی یەکێتی نەیاندەوێرا بچنە ناوی، دەترسان بە(T.N.T) مینرێژ کرابێ. عەلی نەبی تەلەفۆنی بۆ بارەگا حزب کردبوو تا دڵنیا بێت کە چۆڵکراوە. ئیتر لە هەموو لایەکەوە وەکو شارە مێرولە دەست کرا بە تالانکاری شڕەخۆری. ئەو شەوە تا بەیانی خشت و دارو بەردی ئەو بارەگایەیان بارکرد، زۆر دڵگران بووم بە تالان و شڕەخۆری، چ بیروباوەڕێکە بەو جۆرە هانی خەڵك دەدات دارو خشتی بینایەك بگوازنەوە، هەر لەبەر ئەوەی بزووتنەوەی ئیسلامی لە ناو بارەگاکەدا بووە!، ڕووخاندنی خانوو بۆ؟! بۆچی بیناکە سوودی لێ وەرنەگیرێت. من ئاگاداری هاوڕێیانم کرد کە هیچ کەس نەچێتە ناو بارەگای مەڵبەندی(٣)ی بزووتنەوەی ئیسلامی و، بیر لە پاتاڵ و شڕەخۆری نەکەونەوە. هاوڕێیان گوێڕایەڵ بوون، دوای مانگێك زانرا هاوڕێیەك سەرپێچی کردووە و، یەك فەردە برنجی بە کۆڵێ داداوە بیباتەوە بۆ ماڵ و منداڵی، کە لەماڵێ سەیری دەکەن دەبینن ساوارە. سەرپێچی ئەو هاوڕێیە لەبەر هەژاری و نەداری بوو، ناوبراو خێزانێکی زۆری هەبوو لەبەر هەژاریش خانووی پێ بە کرێ نەدەگیرا لە ناو بارەگای حزبدا دەژیا، لەبەر ئەوە سەرزەنشتمان نەکرد چاو پۆشیمان لە هەڵەکەی کرد.

لەو شەڕە خۆترێنەی بزووتنەوەی ئیسلامی، کە بە سەر یەکێتیدا سەپاند، یەکێتی ژمارەیەکی بەر چاوی لە کادری سەربازی و سیاسی بزووتنەوە گوللەباران کرد، لەوانەی ناسراو بوون مەلا شەریف، مامۆستا حەسەن کانی توەیی. مامۆستا حەسەن بریندار دەبێ و لە ناو تەرمە کوژراوەکاندا خۆی بە مردوو نیشان دەدا، کە هێزەکانی یەکێتی دەڕۆن لە ناو تەرمەکان دێتە دەری وخۆ دەربازدەکات. ناوبراو ئێستاش لە ژیاندا ماوە. شەڕی نێوان بزووتنەوەی ئیسلامی و یەکێتی لە کانوونی یەکەمی ساڵی **١٩٩٣** دەستی پێکرد و زوو کۆتایی هات. دوای ئەو شەڕە لە ١٩٩٤/٥/١ شەڕێکی تری ناوخۆی زۆر خوێناوی تر سەری هەڵدا. بزووتنەوەی ئیسلامی و پارتی بوون بە هاوسەنگەری یەکتر دژی یەکێتی.

## گومان و چاوەڕوانی:

شەڕی ناوخۆ کۆتایی بە تەمەنی سوپای یەکگرتووی کوردستان هێنا. پێشمەرگە بوو بە دوو بەش و بەسەر پارتی و یەکێتیدا دابەشبوون. ئێمەی شیوعی گەڕاینەوە بەرەو ماڵ و کاری

حزبی. هەروەك لە جێگایەکی تر باسم  کردووە، لە دوای کۆنگرە دڕدۆنگی و گومانی کوردستانی و عێراقچییەتی، سەرتاپای حزبی شیوعیدا پۆشی بوو، لە ناو ئەو تەمومژو گومانەدا، ڕۆژێك هاوڕێ ئەبو حکمەت و هاوڕێ محەمەد حلاق و محسین یاسین و هاوڕێ ڕابەر، هاتن بۆ رانیە بۆ لای کاك مەحمودی حاجی نادر بۆ ئەوەی پشتگیریان بکات، لە پێکهێنانی حزبێکی چەپی کوردستانی. هاوڕێ مەحمودیش خۆی و ئەو هاوڕێیانەی هێنا بۆ ماڵی ئێمە. کە هاوڕێ ئەبو حکمەت و هاوڕێ محەمەد حەلاق گەیشتنە ماڵی ئێمە، خەبەریان بە بارەگای حزب ناردبوو، کە گوایا شیوعییە کوردستانییەکان بە دەستی من دەست بەسەر بارەگای حزبدا دەگرن، لەکاتێکدا شتی وا بوونی نەبوو هێشتا من لایەنگری شیوعییە کوردستانییەکان نەبووم، چونکە بڕوام بە جیابوونەوە نەبوو لە حزب، بەڵام هیچ کەسێك نەهات پێم بڵێ تۆ پشتگیری شیوعییە کوردستانییەکان دەکەیت یا ناکەیت؟ ئەو گومانە لای حزب بوو بەڕاستی، من بە یەکجاری مۆرکی شیوعی کوردستانیم پێوە نرا، لەکاتێکدا هیچ پەیوەندییەکم پێیانەوە نەبوو. بەڵام بە داخەوە هەندێك هاوڕێ ڕقیان لە من بوو لە دەرفەتێك دەگەڕان من لە بەرامبەر(حزب) ڕەش بکەن، بە داخەوە کردیشیان!

لەگەڵ هاوڕێ سورە، مەحمود حاجی، عەبدوڵڵا رەش، کۆبوونەوەکەمان بردە ماڵی هاوڕێ عەبدوڵڵاڕەش بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە گفتوگۆ لەگەڵ هاوڕێ ئەبو حکمەت و هاوڕێ محەمەد حلاق و برادەرانی تر کرا، هاوڕێ سورە وتی ئەو حزبەی دروستدەکرێت پارە لە هەر لایەك وەربگرێت دەبێ کلکایەتی ئەو لایەنە بکات، هاوڕێ مەحمود حاجی وتی ئەگەر هاوڕێ سورە و محەمەد بیکەن منیش لەگەڵ ئەوان دەیکەم، منیش وتم بڕوام بە بیرۆکەی کوردستانی و بوونی حزبی شیوعی کوردستان هەیە، بەڵام لەگەڵ دروستکردنی حزب نیم لە دەرەوەی(حزب)، چونکە بڕوام وابوو پەرت بوونی چەپەکان ئەوەندەی تر چەپ لاواز دەکات، هیچ لایەك یارمەتی حزبێك نادات، ئەگەر نەبێتە پاشکۆی ئەو لایەنە، کۆبوونەوەکە بێ ئاکام بوو، هاوڕێ ئەبو حکمەت و برادەرانی تر پارتی کاری سەربەخۆیان ڕاگەیاند، دوای چەند ساڵێك لە تەمەنی پارتی سەربەخۆ و شەهیدبوونی هاوڕێ محەمەد حلاق و یانزدە کەس لە هاوڕێکانی لە سەیتەرەی کۆیە لە لایەن یەکێتییەوە، پێشبینی بەندە ڕاست دەرچوو پارتی کار نەبوو بەو حزبەی کە هاوڕێ شیوعییە کوردستانییەکان خەونیان پێوە دەبینی...

ڕۆژ بەرۆژ ژیان و گوزەرانمان بەرەو خراپی دەڕۆیی، مووچەی سوپای یەکگرتوو بڕابوو حزبیش مووچەی بڕیبووم، وەك دوژمنی(حزب) سەیردەکرام، دۆست و هاوڕێ نزیکەکانم نەدەوێران سەردانم بکەن، ئەوانیش وێڕای هاوڕێ نەیارەکانم بوختان و تۆمەتی زۆر نابەجێ و دوور لە ویژدانیان بۆ هەڵ دەبەستم. منیش بڕیارم دابوو ئەگەر لە برسان بمرم، لە پێناو ژیاندا ملکەچ نەکەم بۆ ئەوانەی بە ناڕەوا تۆمەت و بوختانیان بۆ دروستکردبووم. ئەو کاتە ڕێبواری کوڕم تەمەنی هەر(٧)ساڵ دەبوو، وێدەچوو ئاگاداری گفتوگۆی نێوان من و دایکی بووبێ کە لە بارودۆخی ژیانی خۆمان دەدواین، ڕۆژێك وتی بابە بۆچی واز لە پێشمەرگایەتی دێنی ئەی چی دەکەیت؟! ئەو چی دەکەیەی ڕێبوار بۆمن بوو بە پرسیارێکی وەڵام نەدراوە، سەیرێکم کرد و هەر ئەوەندەم وەڵامی ڕێبوار دایەوە وتم: ڕۆڵە بیر لە شتێك دەکەینەوە... ماوەی(٢)ساڵ بوو چاوەڕوان بووم بۆ ئەوەی( بیر لە شتێك دەکەینەوە) وەڵامەکەی ڕێبوار بێت، ئەو دوو ساڵەی لە ماڵەوە دانیشتبووم ڕاوێژم بە زۆر لەگەڵ هاوڕێ نزیکەکانم دەکرد، ئەو پرسیارەی ڕێبواری کوڕمم ئاراستە دەکردن(چی بکەم)؟ هەبوو دەیگوت وا باشترە بگەڕێتەوە ناو حزب، بە وەڵامی ئەو برادەرانە دەمگوت: چۆن بگەڕێمەوە خۆ من وازم لە حزب نەهێناوە حزب وازی لە من هێناوە، بە پێی پەیڕەوی ناوخۆ هەر کەسێك واز بێنێ لە حزب، پێویستە بە نامەیەك واز هێنانەکەی خۆی ئاڕاستەی ئۆرگانی پەیوەندیدار بکات. ئێستاشی لەگەڵ بێت بەنوسین نە من وازم لە حزبی شیوعی هێناو نە حزبی شیوعی لە منی پێچایەوە، کە بۆچی لە حزب ناڕازیم؟! هەر ئەو گومانەی لە من دەکرا بوو بە مۆرك و مێژوویی دەیان ساڵەی خەبات و فیداکاری خۆم و خێزانەکەم. وەکو پێشمەرگەیەکی دێرین و دانەبڕاو خەباتی من بوو بە(سووتەرۆ) لە ناو حزبی شیوعیدا، وەکو هیچم نەکردبێ وابوو. زۆر جار لە خۆمەوە دۆش داماوم سەت ڕەحمەتم بۆ گۆڕی ئیمام خومەینی ڕابەڕی شۆڕشی گەلانی ئێران دەنارد کە وتویەتی: سیاسەت پدرو مادر ندارد. کاتێ هەر بە گومان مێژوویی پێشمەرگەیەکی ڕۆژانی خەبات و فیداکاری دەسڕدرێتەوە، مرۆڤ چۆن بڕوای بە خۆی بمێنێ کە جارێکی تر بە بەندو بڕگەکانی پەیڕەو پرۆگرامی حزبایەتی خۆی هەڵخەڵەتێنێ؟ شیوعی بوون هیچ ئیمتیازێکی شەخسی تێدا نەبووە و نییە، بەڵام من شانازیم بە شیوعی بوونی خۆمەوە کردووە، ئێستاشی لەگەڵ بێت لە رووی فیکرو تیۆرییەوە بڕوام بە مارکسیزم هەیە. هەرگیز بە خەیاڵم دانە دەهات سەرکردایەتی حزب و هاوڕێ دێرینەکانم، بەو جۆرە ڕەفتار لەگەڵ مێژووی دەیان ساڵەی خۆم و خێزانەکەم دا بکەن؟!

## کاسبی یا سیاسەت:

مرۆڤ کە بەرپرس بوو بەرامبەر بە چارەنووس و ژیانی چەند مرۆڤێکی تر لە ناو خێزانی خۆیدا بێ یا لە دەرەوەی خێزانی خۆی دەبێ ژیرانە هەنگاو هەڵگرێت بۆ ئەوەی ژیانێکی شەرەفمەندانەیان بۆ دابین بکات، رۆژێکی پاڵم دابۆوە لە ژووری لە فیکرکردنەوەیەکی قووڵ ڕاچوو بووم، لەگەڵ خۆم دەدوام دەمگوت(حەمە) چاوەڕوانی چی دەکەیت بۆ قۆڵی لێ هەڵناماڵی یا سەنگەر بگۆڕی، یا دەست بکەی بەکاروکاسبی، ئەدی بۆ نایکەیت،، دەڵێن مرۆڤ کە بە گەورەیی فێری پلاو خواردن بوو پارووەکە بۆ لوتی دەبات. رۆژێك بەیانی بوو بە دایکی هاوێرم گوت بە قاچاخی دەرۆم بۆ سەردەشت سەرێك لە مستەفای برا دەدەم با بزانین چی دەکرێت؟! کە چووم مستەفای برا بە دوورو درێژی گفتوگۆی لەگەڵ کردم هەموو پێشنیارەکانیم بە دڵ بوون تەنها لەگەڵ یەك پێشنیاریدا هاوڕا نەبووم!. لە لای مستەفای برا ڕۆیشتم بۆ ئۆردووگای بێزیلێ کاك عوسمانی کوڕی کاك برایمی مام مستەفای برادەرم لەوێ بوو. لە سەر کاروکاسبی و چۆنییەتی کڕین و فرۆشتنی کەل و پەلی هەرزان قیمەت قسەم لەگەڵ کرد، کاك عوسمان وتی دەرمان نرخێکی باش دەکات ئەگەر پارەت هەبێ نیوەی پارەکە بدەو نیوەکەی تریش من زەمانەتت دەکەم، پێشنیارەکەم بە دڵ بوو. گەرامەوە رانیە لە دوای چوار رۆژ مستەفا غەفور واتا مچەی برام بە مامە خالیدی برایدا (٥٠٠) تمەنی وەك هاوکاری بۆ نارد بووم، ئەو کات نزیکەی(٢٥) دۆلاری ئەمریکی دەکرد بەڵام من پارەکەم بۆ هاوڕێیەکی تر نارد، کە باری دارایی زۆر لە من خراپ تر بوو. لە ماڵەوە پێنج هەزار دینارمان هەبوو دەمانچەیەکی خۆم هەبوو. خاڵ برایمی ئاشنام راسپارد، دەمانچەکەی بۆ فرۆشتم، ئەویش بڕە پارەیەکی باش بوو. هەموو پارەکەم کۆکردەوەو گەڕامەوە لای کاك عوسمان، لیستێکی ئەو دەرمانەم برد بوو کە فرۆشیان لەسەر بوو. کاك عوسمان بڕێك لە دەرمانەکانی پەیداکردبوو، بەڵام زۆربەی دەرمانەکانی ترهەر وا بە هەرەمەکی خرابوونە ناو بارە دەرمانەکە، ماوەی مانگێك خەریکبووین هەتا دەرمانەکەمان ساغ کردەوە واتا فرۆشتمانەوە، لەو بارە دەرمانەش هەندێك زەرەرم پێ کەوت، دواتر هاوڕێ حەسەن خدر و هاوڕێ ئەحمەدی کاکی بەکر، دۆستێکیان پەیداکرد، کە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو تاناکۆڕا واتا کەونەی لە مهابادەوە بۆ دەناردنە رانیە، بەندەش بوومە هاوبەش پارەیەکمان پێکەوەنا چەند جارێك بە وەجبە کەونەمان بۆ هات، لە بازاری رانیە دوکانێکی جوملە فرۆشی کەونەمان بە کرێ گرت،

لەویٚ کۆبووینەوە ڕۆژانە فرۆشیار دەهاتن باڵەیان دەکڕی. بەڵام ئێمە زۆر بووین ئەو برادەرەی لە مهابادەوە باڵەکانی بۆ دەناردین زۆر جار فرۆشیان لەسەر نەبوو لە وەرزی فرۆشی خۆیدا نەدەگەیشت، هەر بۆیە وازم لەو دوکانەش هێنا. ئەو دوکانەش چیرۆکی خۆی هەبوو وەکو بارەگای حزبی لێهاتبوو برادەرانی پارتی زۆر دەهاتن بۆ لامان. سەرەتای جەنگی ناوخۆ بوو، ڕۆژێك برادەرێکی یەکێتی پێی گوتم بە دوکانەکەتان دەڵێن (لقی ١١)ی پارتی، وتی خێرە ئەو هەموو پارتییە لەویٚ کۆدەبنەوە؟! وتم هەر چی دۆستی ئێوە نەبیٚ بە پارتی دەزانن، برادەرەکە پێکەنی وتی تاوانی ئێمە نییە، ئێمە خاترتان دەگرین، هەر هاوڕێیانی خۆتانن دەڵێن: ئەوە دوکان نییە بارەگای پاراستنی پارتییە...

ڕۆژی ١٩٩٥/٥/٣٠ بوو هاوڕێیەك بە پەشۆکاوی هات وتی نەتانزانیوە؟ ئەمڕۆ هێزێکی گەورەی یەکێتی لە چوارقوڕنە چۆتە سەر ماڵی مامۆستا ئەمین، شەڕبووە دوو پێشمەرگە لە یەکێتی کوژراوەو، مامۆستا ئەمین بەدەست بەستراوی لە لایەن ئەو هێزەوە، بە دیلی بردراوە بۆ مەڵبەندی ڕاپەڕین. بەو هاوڕێیەم گوت مامۆستا ئەمین کوژراوە، وتی چۆن دەزانی؟ وتم یەکێتی دەمێکە ڕقی لە مامۆستا ئەمین هەڵگرتووە. چووم بۆ چوارقوڕنە کاك مەحمودی حاجی نادرم بینی ئاگری لە چاوان دەباری، وتی پێت وایە چارەنووسی مامۆستا ئەمین چی بەسەر دێت؟ وتم مامۆستا ئەمین دەکوژریٚ وتی هیچت زانیوە وتم هیچ زانینی ناوێت یەکێتی دوو پێشمەرگەی لە ناو ماڵی ئەودا لیٚ کوژراوە، لەوەش زیاتر زۆر ڕقیان لە مامۆستا(ئەمین)ە. هێشتا هەر خەریکی قسەکردن بووین، خەبەر هات کە تەرمی مامۆستا ئەمین لە غاباتی قەڵادزیٚ فڕیٚ دراوە. مامۆستا ئەمین بە دەست بەستراوی درابۆ دەست کەس و کاری نۆکەرێکی ئاغاکان، کە لە سەردەمی لەشکرکێشی ئاغا میراودەلیەکان بۆ سەر ماڵی مەحمودی حاجی حەمە ڕەش، لە ساڵی ١٩٥٩- ١٩٦٠ کوژرا بوو. باوکی مامۆستا ئەمین ڕابەری بزووتنەوەی جووتیارانی دەڤەری پشدەر بوو... خوێنەری بەڕێز سەرنج بدە لە کوێوە بۆ کویٚ؟! دروشم شتێك و کردار شتێکی ترە!

کاك مەحمودی حاجی نادری پیاوێکی زۆر شەرم بە خۆو مەردانە بوو. ئەگەر دەسەڵاتی بڕیاردانی هەبا، هەر ئەو ڕۆژە جەنگێکی خوێناوی لە بەرامبەر یەکێتیدا رادەگەیاند. بە هاوڕیٚ مەحمودم وت تۆ وا دەزانی مەحمود حاجییەکەی سەردەمی شاخی؟ مرۆڤ شەرم دەکات کە بەیاننامەی حزب لەسەر ئەو ڕووداوە دەبینیٚ و دەڵیٚ: مەفرەزەیەکی نەناسراو چۆتە سەر

ماڵی مامۆستا ئەمین و شەهیدیان کردووە، لەکاتێکدا یەکێتی خۆی نکۆڵی لە کوشتنی مامۆستا ئەمین نەدەکرد... مامۆستا ئەمین ئەندامی دەستەی کارگێڕی بزووتنەوەی جووتیارانی کوردستان بوو، لە ساڵی **١٩٩٣** لە دەڤەری پشدەرو بیتوێن، رێبەرایەتی راپەڕینی جووتیارانی کرد...

یەکێتی گومانی لە مامۆستا ئەمین بوو، کە پەیوەندی بە پارتییەوە هەبێت، کاك وەتمان و سوارە بابەکرو چەند کادرێکی سەرکردایەتی لە زیندانی مەعسکەر سەلام نزیکەی ساڵێك زیندانی کران... لە ساڵی **١٩٩٥** هاوڕێ محەمەد حلاق و یانزە کەس لە پێشمەرگەکانی **پارتی کاری سەربەخۆی کوردستان**، لە لایەن سەرکردایەتی یەکێتییەوە، بە رۆژی رووناك لە سەیتەرەی کۆیە درانە بەر ڕەهێڵەی گوللە و، کاك محەمەد حەللاقیش بە بریندارى لە مەعسکەر سەلام گوللەباران کرا. هاوڕێ محەمەد حلاق کادرێکی هەڵکەوتوو شۆڕشگێڕ بوو، لە دەیان جەنگی گەورەی شاخ بەشداری کردبوو، یەکێتی ڕقی لە محەمەد بوو بە خوێنی سەری تینو بوو پێی وابوو دەبێتە پارتی. ساڵی **١٩٩٥** ساڵێکی زۆر ناخۆش و پڕ لە ئازار بوو، دەیان رووداوی جەرگ بڕ روویان دا، ژمارەیەکی زۆر لە دۆست و برادەرە دێرینەکانمان بوون بە سووتەرۆیی کۆنەقین و رووداوە نەخوازراوەکان. وەکو ژمارەیەك کادری دانیشتووی حزبی شیوعی، زۆر دوودڵ و نیگەران بووین لە بارودۆخەکە. لە لایەك حزبی شیوعی پشتی تێکرد بووین و بە خائینی دەزانین و پێیان دەگوتین پاراستن، لەکاتێکدا هیچ پەیوەندییەکی دوور و نزیکمان بە پارتی و پاراستنەوە نەبوو. لە لایەکی تر یەکێتی لێمان دڕدۆنگ بوو لە ژێر کاریگەری پڕوپاگەندەی هاوڕێیانی خۆمان لەحزبی شیوعی بە پاراستنیان دەزانین. برادەرێکم لە ناو یەکێتیدا پێی گوتم: پێویستە خۆتان ساغ بکەنەوە بۆ لایەك، برادەرەکانی خۆتان تووشی شتێکتان دەکەن، وتی هەڵوێستیان زۆر خراپە بەرامبەرتان. بەندەو هاوڕێیان مەحمود حاجی، سورە، عەبدوڵڵا رەش بە تەواوی لە حزب دابڕابووین، رۆژانە کە کاك مەحمود نەهاتبا بۆ رانیە ئێمە دەچووین بۆ چوارقورنە. هاوڕێ سورە ماڵەکەی لە سلێمانی بوو ئەویش زۆر دەهات بۆ لامان. بە وردی بارودۆخەکەمان شەنەو کەو کرد، بەڵام نەدەگەیشتینە هیچ ئەنجامێك. لە خۆمان دڵنیا نەبووین ترسی ئەوەمان هەبوو پێم وابوو یەکێتی گێچەڵێکمان پێ بکات، چونکە هیچ پەنایەك نەمابوو لێی دڵنیابین و پشتگیریمان بکات. هاتم بۆ هەولێر قسەم لەگەڵ کاك سەرۆ کرد، پێم باش بوو ڕای کاك سەرۆ بزانم. کاك سەرۆ یەکێك بووە لە هاوڕێ دێرین و

نزیکەکانم، بە دڵنیاییی ڕاو قسەی ناخی دڵی خۆمان بۆ یەکتر هەڵدەڕێژین، وتم چی بکەین باشە؟! وتی ئەو کاتە حەزم دەکرد هەموو بە یەکەوە پەیوەندی بە پارتییەوە بکەین، تۆ پێت وابوو حزبی شیوعی هێشتا کەڵکی ئەوەی ماوە کاری تێدا بکەین. وتی لە بیرتە نامەی وازهێنانم نووسیبوو بۆ حزبی شیوعی، بەڵام پێت دڕاندم دواتر بردتم بۆ شەقلاوە بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ هاوڕێیانی مەکتەبی سیاسیدا بکەین؟ وتی ئێستا لە سبەی باشترە، پێم وایە هەرچی زووترە جێگای خۆتان لە ناو پارتی بگرن، وتی ئێوە لە دەڤەری پشدەر و بیتوێن کادری سەربازی و سیاسی ناوچەکەن، دەتوانن خۆتان وجودی خۆتان بسەلمێنن، ڕای کاك سەرۆم گەیاندەوە هاوڕێ مەحمود و هاوڕێ سورە... بەڵام هیچ لایەکیان راستەوخۆ و بە گەرمی خۆیان یەکلا نەدەکردەوە، هەر یەکە کۆمەڵێك هۆکاری دەهێنایەوە کە زۆربەیان راست بوون...

ساڵی ١٩٩٥ کۆتایی هات پێمان نایە ناو ساڵی ١٩٩٦. سەرەتای ساڵی ١٩٩٦ سەرەتایەکی خۆش بوو چونکە بڕیاری نەوت بەرامبەر بە خۆراك لە لایەن حکومەتی عێراق و(UN) پەسند کرا. تا ڕادەیەك خەریکبوو ژیانی خەڵکانی هەژارو کەم دەرامەت دەبووژایەوە. ماوەی سێ ساڵ بوو لەگەڵ هاوڕێ زراری کوڕی شەهید ڕەسوڵ لە خانوویەك دابووین، ئەگەرچی بۆ هەردوو ماڵەکە بچووك بوو بەڵام چونکە بە کرێ نەبوو زۆر ئاسوودە بووین. کاك مستەفا چاوڕەش تێی هەڵپێچاین کە خانووەکە بۆ ڕێبواری برای چۆڵ بکەین. ئەو جۆرە خانووانە لە کاتی دەسەڵاتی ڕژێم لەسەر لایەنگرانی حزبی بەعس تاپۆ دەکرا. بەرەی کوردستانی بڕیاریدابوو لە کاتی راپەڕین کە دەستیان بەسەردا بگیرێ وەکو دەستکەوتی(راپەڕین). بەڵام لە مانگی کانوونی دووەمی ١٩٩٦ بە فەرمانی مستەفا چاوڕەش دەرکراین، دەرکردنێکی زۆر سەیر ماوەی(٢٤) سەعاتیان بۆ دیاریکردین خانووەکە چۆڵ بکەین، وتیان ئەگەر نەڕۆن بە زۆر دەرتان دەکەین؟! هاوڕێ زرار بە لایەکدا و بەندە بە لایەکی تردا ڕۆیشتین. ئەو ڕۆژەی لەو خانووە دەرکراین مێژووی خۆم و(بنەماڵەی شەهید مام ڕەسوڵ)م بەراورد دەکرد لەگەڵ مێژووی ڕێبواری برای مستەفا چاوڕەش کە ڕەفیق حزبی بووە. ئەوێ ڕۆژێ هەستم بە بێ دەسەڵاتی و غەدر کرد، کە ماڵی پێشمەرگەیەکی دێرینی دانەبڕاو، کوڕە شەهیدێکی سەنگەر لەسەر خواستی ڕەفیق حزبی یەك دەردەکرێت. خانوویێکم لە گەڕەکی کێوەڕەش بە کرێ گرت. لە دوای دەرکردنەکە لەگەڵ ناخی خۆم دەدوام ئاخۆ بە کوێ دەگەین؟ جارێکی تر سەردانی کاك سەرۆم کردەوە ئەو جارەیان لە پیرمام بوو، دیارە زۆر جاری تریش دەچووین بۆ لای کاك سەرۆ،

بەتایبەتی ئەو کاتانەی کە لە ناو وتێلی شیراتۆن بوو، هێزەکانی یەکێتی دەزگای گولانیان گەمارۆدابوو. هەفتەی وا بوو لەگەڵ کاک مەحمود دوو جار دەچووین بۆ ناو(شیراتۆن)، زۆر نیگەران بووین بۆ کاک سەرۆ و برادەرەکانی. بەلام ئەو کاتانەی کە بە کاری تایبەتی خۆم دەچووم، مەبەستم ئەوە بوو لەسەر بارودۆخی خۆم و هاوڕێ پەراوێز خراوەکانی تر ئالوگۆڕی بیروڕا بکەین. بۆ ئەوە بوو جەنابی سەرۆك یا کاک نێچیرڤان ببینین خۆم یەکلا بکەمەوە واتا قسەی کۆتایی بکەین. لەگەڵ کاک سەرۆ جارێکی تر کەوتینەوە گفتوگۆ. ناوبراو وتی هەر لەسەر ڕای خۆمم، بەلام دەبێ ئەوەش بزانن پارتی لەگەڵ یەکێتی لە شەڕدایە، ڕەنگە بەیانی بتان نێرێت بۆ لوتکەی کولاو قاسم و کەپکی حەمەدەئاغا. وتم کاکە تازە لەسەر پارتی ساغ بووینەوە هەم کۆنە هاوڕێکانی خۆمان هەم یەکێتی ئێمە بە پارتی دەزانن. پارتی بچێتە ئەو سەری دونیاش تازە لەگەڵی دەرۆین. لەوێوە چووم بۆ دەهۆك سەردانی هاوڕێ کاروان ئاکرەیی و کاک سەردار ئامێدیم کرد. کاك سەردارو کاك کاروان بە وەردی لەژیان و گوزەرانی هەموو لایەکیان پرسی، بەتایبەتی لە هاوڕێ سورە و هاوڕێ مەحمود حاجی، لەگەڵ ئەوانیشدا قسەم کرد کە نیازمان وایە خۆمان یەکلا بکەینەوە بۆ ناو پارتی. ئەوانیش زۆریان پێ خۆش بوو، کە وتم سێ ساڵە لە ماڵەوە دانیشتووین و، حزبی شیوعی مووچەی لێ بڕیوین هیچ کاروکاسبیمان نییە، کاك سەردار ئامێدی زۆر نیگەران بوو. کاتێ ویستم بکەڕێمەوە هەزار دۆلاری خستە باخەڵمەوە، ئەو کاتە(١٠٠٠) دۆلار نزیکەی (٤٥) هەزارو پێنج سەد دیناری سویسری دەکرد، گەڕامەوە درێژەی دیدارەکانم بۆ کاك مەحمود باس کرد. پێم گوت کاك سەردار ئامێدی هەزار دۆلاریشی داومەتێ، کاك مەحمود زۆری پێ خۆش بوو، وتم دەڵێی چی کاروکاسبی پێوە بکەین...؟ لە وەلام دا وتی لەوە باشتر نابێ، حەمەدەمین کوڕی مام عەبدولڕەحمانی کوزینەیی، خزمێکی کاك عەلی سیدە و کوڕەخاڵی هاوڕێ عەلییە، لە کاتی شاخیش دەمناسی زۆر جار بۆ کاری(حزب) هاوکاری دەکردین، سەردانی کردم ڕاوێژم پێ کرد لەسەر کاروکاسبی، حەمەدەمین سێوەڕەی هێنایە چۆکان!! وتی خەمتان نەبێ ژیانی هەمووتان لەسەر من ئێوە هەر لێرە بارەکانم بۆ بکڕن خەمی هیچی ترتان نەبێ، ڕۆژێك چووم بۆ لای کاك مەحمود وتم حەمەدەمین دەڵێ خەمی هیچتان نەبێ، لای حەمەدەمین باسی کاك مەحمودم کرد بوو حەمەدەمین چوو بوو بۆ لای کاك مەحمود لەگەڵ کاك مەحمود هەموو شتێکمان بڕاندبۆوە، بارەکانی حەمەدەمین و چۆنییەتی فرۆشتن و کێشەکانی ئەودیو سنووریش بۆ خۆی چیرۆکێکی

دوورو درێژە قسە زۆر هەڵدەگرێت. بە هۆی حەمەدەمین تووشی بەند کردن و کێشەیەکی زۆر بووم هەمووی ناگەڕێتەوە بە پێویستی نازانم باسی بکەم، هەر ئەوەندە دەڵێم کاتێ لە پایەگایەکی گوندی کەوپەرێ بە فەرمانی بەرپرسی پایەگاکە بە ناوی ئاخوندی بەند کرام. کاک مەحمودی خدری کە پێشمەرگەو فەرماندەیەکی ناسراوی حزبی دیموکراتی کوردستان بوو، سەردانی پایەگایەکەی کرد بۆ کارێکی خۆی، بەندە بە چاو بەستراوی لە ژوورەوە دەهێنرامەوە دەرێ چاوی پێ کەوتم، بە ئاخوندی گوت چاوی ئەو پیاوە بکەنەوە با بزانم کێیە؟ کە چاویان کردمەوە کاک مەحمود ناسیمییەوە، و وتی: ئاخوندی لە سەرچی ئەو پیاوەت گرتووە؟ وتی چوار رۆژە چاوەڕوانی هەندێك بار بووین، جیگاکەمان دەست نیشان کردبوو لە ناو کرشە گیایەك، چووین بارەکان بێنین هیچ لەوێ نەمابوو، گومانمان لەو پیاوەیە و هیچمان پێ نالێ؟! کاک مەحمود وتی ئێوە هەڵەن، ئەگەر لەسەر سیاسەت دەیگرن لە جێی خۆیەتی، بەڵام کە لەسەر قاچاخچییەتی گرتووتانە ناهەقییە، چونکە نەمزانیوە ئەو پیاوە قاچاخچی بوو بێت. وتی ئەگەر رەزایەت بدەن دەبم بە کەفیلی، کاتژمێر(٩)ی شەو بوو کاک مەحمودی خدری لە دەستی ئاخوندی ئازادی کردم. ئاخوندی وتبووی بە شتێك زانیم ئەو پیاوە سیاسییە، کە داوام لێکرد هاوکاریمان بکات لە وەڵامدا وتی ئەوەی شەرەف و کەرامەتی هەبێت سیخوڕی لەسەر وڵاتی خۆی ناکات... لە رێگایە وتی هاوڕێ تۆ چی دەکەی لێرە بۆچی هاتویت؟ وتم ئاخوندی راست دەکات بارەکانم لێ دزیوەتەوە!! کاک مەحمود وتی: هاوڕێ تکات لێ دەکەم واز لەو کارە بێنە هەموو دنیات هەبێ بە یەك سووکایەتی ئەوانە نابێ کە بە تۆی دەکەن، ئێوە تێکۆشەرو دڵسۆز بوون، غەدرە لەگەڵ قاچاخچی و خەڵکانی ئەوها تێکەڵبکرێن، بەڵێنم بە کاک مەحمودی خدریدا، کە واز لەو کارە بهێنم وازیشم هێنا...

## دیداری کاک نێچیرڤان:

هاوڕێیان مەحمود حاجی و سورەو بەندە سێ قۆڵی چووین بۆ(پیرمام)، لەوێ لەگەڵ کاک سەرۆ جاریکی تر باسمان لە چارەنووسی سیاسی خۆمان کردەوە. کاک سەرۆ بە راشکاوی رای خۆی پێ راگەیاندین و وتی ئەمرۆ لە بەیانی باشترە خۆتان ساغ بکەنەوە، پێموت بەندە خۆم ساغ کردۆتەوە، بەڵام کاک مەحمود و هاوڕێ سورە دەنگیان نەکرد. کاک سەرۆ ئەو رۆژە بروسکەیەکی بۆ کاک نێچیرڤان بارزانی کرد، بۆ ئەوەی دیدارێك بۆ هەر سێکمان رێك بخات،

کاك نێچیرڤان کاتژمێر(١٠) رۆژی ١٩٩٦/٢/١٤ دیاریکرد. کاك سەرۆ پێی راگەیاندین کە بەیانی دیداری کاك(نێچیرڤان)مان هەیە. هاوڕێ مەحمودو هاوڕێ سورە سەیرێکی یەکتریان کردو پێیان سەیر بوو کە دیدارەکە وا زوو پێکهات. کاك مەحمود وتی من هێشتا خۆم ساغ نەکردۆتەوە بە یەکجاری ببم بە پارتی، بەڵام دێم وەکو دۆستێکی پارتی دیداری کاك نێچیرڤان دەکەم، هاوڕێ سورە حەزی دەکرد خۆی ساغ بکاتەوە بۆ پارتی، بەڵام هەندێك داوای شەخسی هەبوو. بەڕاشکاوی بە هەر دووکیانم وت من هیچ داوایەکی شەخسیم نییە، تەنانەت وەك پێشمەرگەیەکی سادەش بێت ئامادەم ببم بە پارتی. لە کاتی دیاریکراو لە دەهۆك ئامادەبووین، لە دیدارەکەدا کاك شەوکەتی رەحەمەتی و کاك سەرۆ ئامادەبوون. کاك نێچیرڤان زۆر بە گەرمی پێشوازی کردین، وتی خۆشحاڵ بووم لەو کاتەدا کە پارتی لە ناو گەرمەی جەنگی ناوخۆیە، لەکاتێکدا یەکێتی لە هەولێر و سنووری سلێمانی و ناوچەکەی خۆتان، بەتایبەتی پشدەرو بیتوێن زۆر باڵادەستە، هاتوون بۆ دەهۆك بۆ ناو پارتی، وتی ئەو هەڵوێستە جێگای شانازییە، کاك نێچیرڤان قسەکانی تەواوکرد. ئاماژەم بۆ کاك مەحمود کرد قسە بکات، بەڵام ئەو بەدەنگ وتی کاك محەمەد فەرموو. بەندە بە ڕاشکاوی قسەم کرد، وتم کاك نێچیرڤان ئێمە کۆمەڵێك کادرو پێشمەرگەی حزبی شیوعی بووین ماوەی دوو ساڵە بە کردەوە لە حزبی شیوعی دابڕاوین، وتم لە نێوان حزبی دایك و شیوعییە کوردستانییەکان دەرهاوێژراوین یا پەراوێزخراوین، لەو نێوانەدا پەڕاگەندەبووین چاکتر وایە بڵێین لەگەڵ هیچیان نەماوین، پارتی بۆ ئێمەی شیوعی بەدیلی فیکرو رێکخستن نییە، بەڵام لە رووی سیاسییەوە هیچ گومانێکمان لە فیداکاری و دڵسۆزی پارتی نییە لە رووی نەتەوەییەوە، هەر بۆیە بەندە ئامادەم وەك پێشمەرگەیەك لە ژێر فەرمانی ئێوەدا پێشمەرگایەتی پارتی بکەم، دواتر کاك مەحمود قسەی کرد وتی من وەکو دۆستێکی پارتی خۆشحاڵ بووم کە بە خزمەت بەڕێزتان گەیشتم، هاوڕێ سورەش قسەکانی نزیکبوون لە هاوڕێ مەحمود. کاك نیچیرڤان بۆ دڵنیایی ئێمە ئاماژەی بە هەڵوێستێکی بارزانی نەمر کرد لە ساڵانی شەستەکان، کە بە هۆی جیابوونەوەی جەماعەتی مەکتەبی سیاسی لە پارتی، بارزانی نەمر لە دڵسۆزی و لێهاتوویی شیوعییەکان دڵنیابووە زۆر جار هاوڕێ عەزیز محەمەدو بارزانی بە یەکەوە گفتوگۆیان لەسەر پەیوەندی و بەشداری هاوڕێیان لە شۆڕش دا، کردووە پێگەی زۆر گرینگ لە شۆڕش دا دراوە بە شیوعییەکان، بارزانی نەمر هەمیشە پێی وابووە و فەرمویەتی: ئێمە شۆڕش و کوردایەتی

دەکەین نەك حزبایەتی تەسك... كاك نێچیرڤان دڵنیایی کردینەوە کە ڕێزێکی زۆری بۆ تێکۆشەرە شیوعییەکان هەیە و جێگای متمانەن و، لای جەنابی سەرۆکیش جیگای ڕێز و تەقدیرن، بەڵام هەندێك گرفتی نەشاردەوە، کە ڕەنگە خەڵکانێك هەبن دژایەتی شیوعییەکان بکەن و خۆشیان نەوێن، ئاماژەی بە كاك سەرۆ کرد و وتی: بۆ نموونە خەڵکێکمان هەیە ئەوەندەی دژایەتی كاك سەرۆ دەکات ئەوەندە دژایەتی نەیارەکانی پارتی ناکات.

ئەو دیدارەی كاك نێچیرڤان بارزانی بۆ من بوو بە پەیوەندییەکی روحی و ئەخلاقی، لەوێ ڕۆژێوە خۆمم بە کادرێکی پارتی زانیوە هەرچی پێم کرابێ بۆ خزمەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و ڕێبازی بارزانی درێغیم نەکردووە...

لەو کاتانەدا کە خەریکبووم بە یەکجاری ئەرکێك لە ناو پارتیدا وەربگرم، بارودۆخی کوردستان بە قۆناغێکی زۆر ئاڵۆزدا تێپەڕ دەبوو. شەڕی ناوخۆ بە گەرمی بەردەوام بوو، جەماوەری پارتی لە بارودۆخێکی نالەبارو دژوار دەژیا، بەتایبەتی لە سنووری ژێر دەسەڵاتی یەکێتیدا ئەگەرێکی زۆر هەبوو ژیانمان بکەوێتە مەترسییەوە، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو مەترسیانە لەڕووی دەروونییەوە ئاسوودەبووم، کە ماوەی دوو ساڵ پتر بوو لە گومان و چاوەڕوانیدا دەژیام. مرۆڤ زۆر جار دەبێتە دیلی مێژوویی سیاسی خۆی بێ ئەوەی بزانێت ئاوێتەی ئەو مێژووە دەبێ، ئەگەرچی حزبی شیوعی هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بە منەوە نەمابوو ئێمەی بە تاوانبار دەزانی، کەچی ئەو سێ ساڵە لە جەنگێکی دەروونیدا دەژیام نەم دەتوانی دەست بەرداری مێژووی خۆم بم لە ناو حزبی شیوعیدا، ئێستاش نازانم بۆچی وابوو؟! شەهید عەلی حەسۆ میرخان، لە لادیواری بارەگایەکی پارتی لەسەر ڕێگای(پیر مام-شەقلاوە)، چەند دێڕێکی زۆر سەرنج ڕاکێشی نووسیبوو، (بۆ کەسێك بمرە دڵی بۆت بێشێ). بەڕاستی ئەو چەند پیتە ئەگەر شەهید عەلی نەینووسیبا زانایەکی وەك (سوقرات) وتبای، لە سەدان کتێب و وتاری هەمەجۆردا ئاماژەی پێدەکرا. بەداخەوە ئەو چەند دێڕەش وەکو پەند و دروشمەکانی تر، شوێنەواری لەسەر دیوارەکە کوژاوەتەوەو نەماوە وێدەچێ ڕەش کرابێتەوە، پێم سەیرە چۆن دڵیان هاتووە ئەو دێڕانە ڕەش بکەنەوە، ڕەنگە ئەو کەسەی ڕەشی کردبێتەوە خوێندەواری نەبووبێت یا مێژووی نەخوێندۆتەوە...

## دیسان قەندیل:

کاك مەحمود حاجی زۆر حەزی دەکرد لە ڕێگای کاسبییەکی ئازادەوە ژیانی خۆی و ئێمە دابین بکرێت، هەمیشە دەیگوت ئەگەر عەیب نەبێ و ویژدانم ڕێگام پێبدات پێم دەکرێ و بە ڕەوای دەزانم پەنا بۆ مادەی هۆش بەریش ببەم هەر بۆ ئەوەی نان و ژیانم نەکەوێتە دەست ئەم و ئەو. دەیگوت چۆن دەبێ لەو کوردستانەی خوێنمان بۆڕشتووە ژیانمان دابین نەکرێ. ڕۆژێکی کاك مەحمود هاتە لام لە دوورووە پێکەنی... وتی بەڕێم کرد! وتم چیت بەڕێکرد؟ وتی: حەمەددەمین!! وتم: پارەت چۆن پەیداکرد؟ وتی: دەمانچەکەی خۆمم فرۆشت! کاك مەحمود دەمانچەیەکی چواردەخۆری هەبوو بە(١٠/٠٠٠) دیناری سویسری فرۆشتبو و پارەکەی رادەستی(حەمەددەمین) کردبوو. حەمەددەمینیش چەند بارێکی قاچاغی کڕیبوو، بڕیاریش بوو لە ئێرانەوە دوو بار دەرمان بکرێت و بیهێنێتەوە. کاك مەحمود وتی حەمەددەمین دڵنیای کردووم قازانجی ١٠٠٪ ە، بەڵام بڕی(٢٠/٠٠٠) دیناری دەوێ تۆش خۆت هەڵتەکێنە(١٠/٠٠٠) دینار پەیدابکە، لە سەرخۆ وتم: ئەو پارەشمان فت!! تۆ لە فیشاڵی حەمەددەمین حاڵی نەبوویت؟ ئەم جارەش وا بزانە پارەکەت لە گۆمێ کردووە چاومان بە فلسێکی ناکەوێتەوە، بەڵام دڵت ناشکێنم هەندێك پارەم هەیە ئەوە(١٠/٠٠٠) دینار فەرموو بیبە لەگەڵ خۆت. وتی هەر ئەوەندە نا حەمەددەمین لە ئێران چاوەڕێی هەردووکمان دەکات، بەیانی خۆت ئامادەبکە بڕۆین. لەگەڵ کاك مەحمود دوو قۆڵی بەرەو ئێران وەڕێکەوتین. لە ڕێگای پشت ئاشانەوە بەرەو قەندیل هەڵکشاین. ئەو سەفەرە دووەم جار بوو دوای ساڵانی پێشمەرگایەتی بە بناری قەندیل دا بڕۆم. پێم وابێ کاك مەحمودیش یەکەم جاری بوو دوای ساڵانی پێشمەرگایەتی بە قەندیل دا بڕوات. ماوەی کاتژمێرێك بوو بە ڕێگای(بەستە مەڵی و گۆڕتیسوێ)دا دەڕۆیشتین نە کاك مەحمود ورتەی لێهات نە منیش هیچم گوت. لەو کاتانەدا کە بە ڕێگای قەندیل دا دەڕۆیشتم سەدان بیرەوەری ساڵانی پێشمەرگایەتیم دەهاتەوە یاد، ڕووداوی پشت ئاشانی ساڵ ١٩٨٣ کە یەکێتی پەلاماری پشت ئاشان و قرناقاوی دا، لە ماوەی(٢٤) کاتژمێردا پتر لە(٦٥) هاوڕێی حزبی شیوعی عێراقی شەهیدکرد، کە زۆربەیان بە دیلی کوژران. رابردووی خۆمم دەهاتەوە بیر کە بن دارو بەردی قەندیل هەمووی بۆ من یادگاری بوو. بە کورتی و کرمانجی ڕۆیشتن بە قەندیلدا، وەك بە ناو هەوارگەی مێژووی نیشتمان و بەرگری و فیداکاریدا بڕۆین وابوو. هەر بن دەوەنێکی قەندیل، هەر هەوارگەیەکی بۆ بەندە مێژوویەك بوو دەیان نەهێنی ڕۆژانی پێشمەرگایەتی بە گوێدا دەچرپاندم...

کاتێ لە هەورازی خیزی سەرکەوتین بایەکی زۆر ساردی دەهات، کاك مەحمود پاڵی وە تاشەبەردێکی گەورە دابوو، هەردوو برۆیە ڕەش و کوڵکنەکانی وێك هێنایەوە و، خەندەیەکی پڕ مانا سیمای داگرت. ئاخێکی هەڵکێشاو وتی سەرکردایەتی حزبی شیوعی چیت پێ بڵێم؟! دیاربوو کاك مەحمودیش وەکو من بە دالغەیەکی قووڵ و پڕ بیرەوەریدا ڕۆچوو بوو، کە لە مێشك و دەروونیدا پەنگیان دەخواردەوە. بۆ دڵنەوازی وتم کاکە زۆر بیر لە رابردوو مەکەوە، خێراکە بابڕۆین بگەینە مینە هەتا ماڵوێرانی نەکردووین. کاتێ بە هەوارگەکانی تاتی دۆ، چۆمە، ئاوی سپی، کەلان دا، دەڕۆیشتین، هۆبەی خێلاتی خزمانی عەشیرەتی خدر مامە سینەم دەهاتەوە یاد، بەتایبەتی مامەکانی هاوڕێ حەسەن خدری و ماڵی خاڵ مەحمودی و بابە خدری. ئەو هەوارگەیە، بالای هاوڕێ ڕەسوڵ و خولق و شکۆی ئەو پیاوە بەڕێزەیان لێ بەدی دەکرا، هەر بۆیە جارێکی تر حالاتی بێدەنگی و مت بوون لە ناو بیرەوەرییەکانی رابردووم دا نقومی کردمەوە، وەك لاشەیەکی بێ گیانی لێکردم، بەرد دەنگی لیهاتبێ من دەنگم لێوە نەهات. دیاربوو کاك مەحمود قسەیەکی چەند جارێك دووبارە کردۆتەوە و گوێم لێ نەبووە. زۆر لێم نزیکبۆوە و وتی کاك محەمەد ئەوە نەخۆشی یا زۆر ماندووبوویت؟ وتم هیچ نییە، زۆر جار کە بە ڕێگادا دەڕۆم سەر دەکەمە سەر بیرکردنەوە و ئاگام لە دەوروبەرم نامێنێت. لە سەرەو ژێری کوێستانەکانی **ترکەش و کەوپەر**، مەڕدارەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان لە دەیان هۆبە رەشماڵیان هەڵدابوو، زۆر خۆشحاڵ بووم کە چاوم بەو خێلانە کەوت. ئەو شەوە چووین بۆ ئۆردووگای (دێڵێزێ) لە سنووری پیرانشار، میوانی هاوڕێ حازم بووین. هاوڕێ حازم کوڕی مام عەلی کوتك، ئەو بنەماڵە تێکۆشەرە بە هۆی سیاسەتەوە تووشی دوژمنایەتی بوون و، لەسەر زێدی خۆیان ئاوارە بوون. لە دوای (راپەڕین) یش هەر لە ئاوارەییدا دەژیان. لە ساڵی١٩٩٩ ئامۆزایەکیان بە ناوی حاجی محەمەد لە ناو شاری هەولێر بە دەستی دوژمنەکانی کوژرا. ئەو بنەماڵەیە زۆر دۆستی کاك مەحمود بوون... رۆژی دواتر چووین بۆ پیرانشار بۆ لای برادەرێك بە ناوی کاك ئەحمەدە سوور، کە بە هۆی کاك حازم و کاك ئەحمەدەوە ناسیمان. دۆستێکی باش و راستگۆ و بە بیرو باوەڕ چەپڕەو بوو. چاوەڕوانی هەواڵێکی حەمەدەمین بووین ئەمجارە هەر خۆی سەرپاڵە بوو، واتا زۆر باش لە داوەکەوە گلابوو. کاك مەحمود وتی: وەرە هەواڵێکی خۆش، حەمەدەمین بارەکانی بەرێکردووە بۆ تاران بە نرخێکی زۆر باش فرۆشراون. وتم چاوەڕوان بە، هەواڵی گیرانی بارەکان دەبیستی! کاك مەحمود وتی تۆ زۆر ڕەشبینی. هەمووی کاتژمێرێکی پێ نەچوو کە کاك مەحمود رەنگی تێکچوو. وتی قسەکەت

راست دەرچوو، حەمەدەمین دەڵێ لە ڕێگای تاران — تەوریز بارەکان گیراون، بەڵام دەڵێت بارەکە هەمووی نییە، وتم کاکە ئەوە تەڵەیە! کێ هەیە لە راستی هەواڵەکە بکۆڵێتەوە؟ چۆن دەکرێ باری قاچاغ نەفرۆشێ دەدرێتە کەسێکی تری قاچاغچی کە خەڵکی وڵاتی خۆت نەبێ؟، قاچاغچییەتی هیچ شتێکی لەسەر هەڵناچنرێت. ئێستاشی لەگەڵ بێت بارەکان بزربوون. بڕی ئەو پارەشی نەدایەوە کە بە دەرمان درابوو. دواتر حەمەدەمین پارەکەی وەرگرتەوەو خواردی، کاك مەحمود لەو سەودایەدا سەگ و شوانی بە یەکەوە هاتنەوە، نە سەرمایە بوو نەقازانج!. لە دوای کۆچی دوای کاك محەمەدیش چەند جارێك هەوڵم دا لەگەڵ حەمەدەمین پارەی کاك مەحمود بداتەوە کە(١٠/٠٠٠) دیناری سویسری بوو، بە داخەوە بێ سوود بوو منیش لە بەر دۆستایەتی و کۆمەڵێك هۆکاری تر کە نمەکی ماڵی باوکیانم کردبوو، هیچم بەرامبەر حەمەدەمین نەکرد. پارەکە تێدا چوو دەستمان لە بنی هەمبانەکە دەرچوو! بەم جۆرە کارو کاسبی کاك مەحمودو بەندە هیچ ئاکامێکی نەبوو. لە جیاتی قازانج قۆڵیان بڕین، ئەگەر هەر ئەو پارەیەی دامان بە حەمەدەمین، بۆ خۆمان بە شێنەیی بمانخواردبا، ماوەیەك سکی ماڵ و منداڵمان لەو گرانییەدا تێر دەکرد. پێشینیان وتویانە نان بۆ نانەوا گۆشت بۆ قەساب.

وتم: کاك مەحمود من بەڵێنم بە کاك مەحمودی ترکەش داوە، کە واز لەو کارە بێنم، ئەگەر لەبەر دڵی تۆ نەبێ کاك مەحمود بەڵێنی خۆم دەبەمە سەرێ و نایشکێنم. ڕۆژی ١٩٩٦/٧/١٧ لە شاری پیرانشارەوە لە پادگانی خانێ و پایەگای قەبری حوسێن لە نزیك گوندی کەوپەڕێ، بە کاتیۆشاو تۆپی دوور هاوێژ بنکەو بارەگاکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە قەسرێ و سنووری حاجی هۆمەران بوردومان دەکرا. هاشمی ڕەفسنجانی سەرکۆماری ئەو کاتی کۆماری ئیسلامی ئێران، بە دیدارێك هاتبوو بۆ شاری(خانێ)، وتەیەکی پێشکەش بە خەڵکی شارەکە کردبوو. لە درێژەی وتارەکەیدا وتی: هیوا دارم خەڵکی پیرانشارو هەموو کوردەکانی ئێران نموونەی کوردستانی عێراق بە هەند وەربگرن، کە وڵاتی خۆیان دووچاری ماڵوێرانی و شەڕی ناوخۆ کردووە. دڵنیام خەڵکی موسڵمانی کورد لە ئێران ئەو ئەزموونە تاڵە دووبارە ناکەنەوە. ئەمە لە کاتێکدایە کە کۆماری ئیسلامی ئێران، خۆی هاندەری سەرەکی بوو لە شەڕی ناوخۆی کوردستانی باشوور. بەبەر چاوی میدیاکانی جیهانەوە هاوکاری لایەنەکانی شەڕی ناوخۆی دەکرد، بۆ ئەوەی ئەزموونی هەرێمی کوردستانی لەبار بەرێ و، بە ئەزموونێکی فاشیل و تاڵی بچوێنێت و، بڵێ ئەوەیە ئیدارەو قەوارەی کورد، سەربەخۆیی چی دەوێ؟!

## ٣١ی ئاب:

شەڕی ناوخۆ پێی نایە قۆناغێکی مەترسیدارەوە. کۆماری ئیسلامی ئێران راستەوخۆ بەشداری شەڕەکەی دەکرد. چاوەڕوان دەکرا ڕژێمی عێراقیش بێتە ناوشەڕەکەوە. لە راستیدا پارتی دوو ڕێگای لە بەردەمدا بوو: یا دەبوو ئالأی سپی خۆبەدەستەوەدان بۆ یەکێتی لەو شەڕە ناوخۆییەدا بەرزبکاتەوە، کە لە شەستەکانەوە هەر جارە بەشێوازێك درێژەی هەبوو، یا دەبوو پارتیش وەکو یەکێتی بکات، بۆ گرتنەوەی هەولێر و گۆڕینی هاوسەنگی شەڕەکە، ڕژێمی عێراق بەکاربێنێ. کاتێك هەولێر لە چەنگی یەکێتی دەرهێنرا، بارودۆخەکە بەرەو ئالۆزی ڕۆیشت. ولأتێکی وەکو ئەمریکاو تەنانەت ولأتانی ئەوروپاش سەریان لەو شەڕە ناوخۆییە دەرنەدەکرد، هەربۆیە لە بەرامبەر وەرگرتنەوەی هەولێر بە هاوکاری ڕژێمی عێراق هیچ هەڵوێستێکی ئەوتۆیان نەنواند. ئەو شەڕە لەسەر ئاستی ناوخۆ، شۆڕبۆوە بۆ ناو هەموو جومگەکانی کۆمەڵگای کوردەواری. پێناسەی حزبی جێگای پێگەی کۆمەڵایەتی و هەڵسەنگاندنی ئەم و ئەوی گرتەوە. لە هەر شوێنێك لایەنێکی شەڕەکە شکەستی هێنابا، لەو جێگایەی کە دەسەڵاتی تێدا بالادەست بوو تۆڵەی لە دۆست و لایەنگرانی لایەنەکەی تر دەکردەوە. ڕاگەیاندنیش هەموو سنوورێکی بەزاند، بەتایبەتی ڕاگەیاندنی یەکێتی دەستەواژەی زۆر ناشایستەیان بەرامبەر بە ڕەمزەکانی پارتی و نەتەوەیی بەکاردەهێنا وەکو بارزانی نەمر. لە دوای ڕووداوی(٣١)ی ئاب هەموو شتەکان گۆڕان، لەسەر ئاستی حزبیش گۆڕانکاری پێکهات، تەرازوی هێزەکان تێکچوو، پارتی لە دوای ٣١ی ئابەوە پێگەی بەهێزتر بوو. شالأوی راگەیاندنی یەکێتی کە ٣١ی ئابی بە خیانەت دەشوبهاند کاریگەری لەسەر رای شەقام نەما. تەنیا دۆست و لایەنگرانی یەکێتی ٣١ی ئابیان بە خیانەت ناودەبرد، بەڵام دۆست و لایەنگرانی پارتی و خەڵکانی تری بێ لایەن بە هەنگاوێکی ژیرانەیان دەزانی. تەنانەت(ستران عەبدوڵڵا) نووسەرو رۆشنبیری ناو یەکێتی، وتارێکی لە کوردستانی نوێ بڵاوکردەوە، لە وتارەکەدا چەند رستەو دەستەواژەی زۆر گرینگ ئاماژەیان پێکرابوو، بۆ نموونە نووسیبووی: ئەگەر پارتی و ڕێبازی ژەنەڕاڵ بارزانی، لە دوای ٣١ی ئاب متمانە لەدەستنەدەن، ئەوا هەرچی بیکەن بۆیان دەچێتە سەرێ و ئەوسا پارتی هێڵی سوور قبوڵ ناکات، بەدیوێکی تردا مانای ئەوەیە کە زۆرینەی جەماوەری خەڵکی کوردستان، پارتی بە دەستێکی ئەمین دەزانن بەرامبەر بە ئایندەی سیاسی گەلەکەیان، بڕوایان وایە پارتی لە ٣١ی ئابی ١٩٩٦ دا

سوودی سەربازی لە سوپای عێراق وەرگرتووە، لەڕووی سیاسییەوە سازشی لە سەر پرسە نەتەوایەتییەکان نەکردەوەو ناکات. لە ٣١ی ئاب یەکێتی لە هەولێر تووشی شکەستێکی سەربازی بوو، هەتا سنووری شێنێ و پەروێز خان خۆی نەگرتەوە. جارێکی تر کۆماری ئیسلامی ئێران پشتگیری لۆجیستی یەکێتی کردەوە، لە دوای مانگی ئەیلول بە ئەندازەی ڕاکە ڕاکەی یەکێتی، پارتیش لە سنووری پارێزگای سلێمانی و چەند شوێنێکی تر، وەك کۆیەو دۆڵی سماقۆڵی و ئالانە بەڕاکە ڕاك گەرایەوە سنووری هەولێر. بارودۆخەکە دووبارە گۆڕانکاری بەسەردا هاتەوە، واقعی دوو ئیدارەیی خۆی بەسەر هەرێمی کوردستاندا سەپاند. بە سەدان خێزان لە لایەنگرانی پارتی و یەکێتی ئاوارە بوون، شەڕەکە بوو بە ڕاکە ڕاکەی سەیارەو شەڕی بەرەیی لە سنووری چیای سەفین و کەپکی حەمەد ئاغاو کولاو قاسم. ڕۆژانە لەسەر شاخ و تەپۆلکەکان شەڕ دەهاتە ئاراوە. لە شەڕی نێوان هێزەکانی پارتی و یەکێتیدا، دەیان کوڕە کوردی قارەمان لەسەر کلاو قاسم و کەپکی حەمەد ئاغا و ...کوژران.

ئەو ڕووداوە بۆ ئێمە لە هەموو کاتەکانی تر خراپتر بوو. هەنگاو هەڵگرتن بۆ خۆ یەکلایی کردنەوە کارێکی زەحمەت بوو. لەگەڵ کاك مەحمودو برادەرانی تر ڕۆژانە یەکترمان دەبینی. زۆر جار بە بیرم دادەهات کە ماڵەکەم وەپێچم بار بکەم بەرەو هەولێر، بەڵام کاك مەحمود ساردی دەکردمەوە، کاك مەحمود پێی وابوو لە بارودۆخێکی وا ئاڵۆزدا کاتی یەکلابوونەوە نییە، چونکە ئاوارەکانی پارتی لە بارودۆخێکی زۆرر شەپرێو دابوون. هاوڕێ سورە هەڵوێستی لە هەڵوێستی کاك مەحمود نزیکبوو، لەڕاستیدا ڕای هەردووکیان لە جێگای خۆی بوو، چونکە ئەوان خەمی منیان بوو، دەترسان سەرگەردانبم، چونکە هیچ پەناو کەس ریکخراوێك لە ناو پارتیدا نەبوو پشتی پێ ببەستم، تەنیا ئەو دیدارەی کاك نێچیرڤان نەبێ، کە ئەویش سەردانێکی ئاسایی بوو. سەرەڕای تێکڕای ئەو هۆکارانەش، پێم وابوو بارودۆخەکە بەرەو ئاڵۆزتر دەڕوات، مانەوەی ئێمە لەو واقعە چەق بەستووەدا هیچ مانایەکی نەبوو، هەربۆیە بڕیارمدا بەهەر نرخێك بێت خۆم یەکلاکەمەوە ببم بە پارتی، ئەگەر هیچ پلەو پێگەیەکیشم نەبێت لە ناو پارتیدا گرینگ نییە.

## بەرەو شەقلاوە:

پێش ئەوەی ماڵەکەم باربکەم سەردانێکی کاك سەرۆم کرد پێم راگەیاند خۆم یەکلاکردۆتەوە، وتی کارێکی باشت کردووە، ماڵەکەت بار بکە وەرە بۆ هەولێر یا شەقلاوە، لە هەولێرەوە بەرەو شەقلاوە رۆیشتم چووم بۆ لای کاك شریف حاجی ڕەسولَ دێلۆیی، کە هەم خزمەو هەم برادەرێکی خۆشەویستمە، پێم راگەیاند کە نیازم وایە ماڵەکەم ببەم بۆ(شەقلاوە)، ئەویش وتی: هیچ پەیوەندییەکت بە پارتییەوە کردووە؟ وتم: جارێك دیداری کاك(نێچیرڤان)م کردووە و، لەو ساوە خۆم بە پارتی دەزانم بەڵام پارتی خۆی نازانی! مام شریف پێکەنی و پێی وابوو کەڵەبابی خۆم بە لەپەنۆك لێناوە، چونکە دیداری کاك نێچیرڤان گرینگە لە ناو پارتی. گەڕامەوە رانیە خێرا سەردانی دۆستێکم کرد لە ناو یەکێتی کە بەرگەیەکی ئاسایشم بۆ بکات بۆ ئەوەی لە سەیتەرەکانی یەکێتی رێگام پێ بدرێت. برادەرەکەم بەرگەکەی بۆ کردم، خۆشم چووم بۆ لای کاك مەحمودو لەوێشەوە بۆ سلێمانی بۆ لای هاوڕێ سورە، پێم وتن ماڵەکەم بار دەکەم بەرەو شەقلاوە، هەردوو هاوڕێ بە پەرۆش بوون بۆ چارەنووس و ئایندەی من، چونکە دڵنیا نەبوون چارەنووسم بە چی دەگات. هاوڕێ حەسەن خدر لە ماڵ بارکردندا بە دەست و بردە بەڵام هات و هاواریشی زۆرە، حەسەن بەو پێیەی زاوامە و ئامانی خوشکم خێزانییەتی، ئەگەر لە هەندێك هەڵوێستیشدا لەگەڵ ڕای من نەبوو بێت، وەکو خزم لێم دوور نەکەوتۆتەوە، هەمیشە وەك براو هاوڕێی لە یەکتر نزیکبووین و حورمەتی یەکترمان گرتووە. ئەو رۆژەی لە رانیەوە بارمان کرد بۆ شەقلاوە رۆژێکی زۆر گەرم بوو لە ۱۹۹۹۷/۷/۲۲ گەیشتینە شەقلاوە. ئەو خانووەی تێدابووم مانگانە بە(٤٥٠) دیناری سویسری لە شەقلاوە بە کەریم گرتبوو، باخچە هەنارێکی لەگەڵ بوو، هەنارەکانی مێخۆش و زۆر بە تام بوو، توێکڵیان زۆر تەنك و دنکەکەیان ناوی تێدا نەبوو. لە ژیانم دا هەناری وا بە تام و خۆشم نەخوارد بوو. من لە میوەدا هەناری مێخۆشم پێ لە هەموو میوەیەکی تر خۆشترە، بۆیە لە هەنار خواردن وێنەم نییە، ئەگەر بڵێم ئاشقی باخچەی هەنارم پێموایە زیادە ڕەویم نەکردووە. ئەو ساڵەم لە ناو باخی هەناردا بە ئاسوودەیی بەسەربرد، لە بەختی خۆشم کە لە هەمووشتێکدا رەش بووە، ئەو ساڵە ساڵی هەنار بوو.

لە مانگی تشرینی یەکەمی ئەو ساڵە جەولەی چوارەمی شەڕی ناوخۆ دەستی پێکرد، هێزەکانی یەکێتی لە رێگای تاکتیکی سەربازییەوە هێڵەکانی پێشەوەی پێشمەرگەکانی پارتی

دیموکراتی کوردستانیان برِدا، واتا لە پشتەوەی هێڵی دیفاعی پێشەوە، بەشێك لە زنجیرە چیای سەفینیان گرت. بەرەو هاوینە هەواری شەقلاوە پێشرەویان کرد، کە شەهید سامی عەبدولرەحمان لەشەڕی ناوخۆدا شەقلاوەی بە گەرووی پارتی ناو دەبرد. ئەو رۆژەی یەکێتی بەشێك لە بناری سەفینی لە پارتی وەرگرتەوە، پڕ بەدڵ حەزم دەکرد وەك پێشمەرگەیەك لە شەڕەکەدا بەشداربم. ئەو پێشمەرگانەی بەرگریان لە شەقلاوە دەکرد بەراستی دڵسۆزی پارتی بوون، کەچی بە داخەوە هەندێك بەرپرسی خۆپەرست، لە جیاتی ئەوەی بیر لە بەرگری بکەنەوە خەریکی راگواستنی ماڵەکانیان بوون. یەکەم رۆژی شەڕەکە ۱۹۹۷/۱۰/۱۷، هێزەکانی یەکێتی هێڵی بەرگری پێشمەرگەکانی پارتیان بڕی بوو، شەڕەکە لە زنجیرە چیای سەفین و دەوروبەری شەقلاوە بە گەرمی بەردەوام بوو، کوردوتەنی شەڕبەردەرگای پێ گرتبووین. ئەو کاتە سەیارەیەکی بەرازیلیم هەبوو منیش ڕاکە ڕاکم بوو لە لقی ۱۱ بۆ سپیگرە. گوندی سپیگرە کەوتۆتە دەروازەی شەقلاوە، هێزەکانی یەکێتی گەیشتبوونە باکووری سپیگرە، تۆپخانەی یەکێتی بە هەرەمەکی بۆردومانی ناو شەقلاوەی دەکرد. زاواو بوکێك ئەو رۆژە ئاهەنگی هاوسەرگیریان سازکردبوو، تۆپێك کەوتە ناو ئەو باخەی ئاهەنگیان تێدا دەگێڕا، هەردووکیان بەیەکەوە شەهیدکران. گوایە بووك و زاوا هەردووکیان لایەنگری یەکیتی بوونە. کوژرانی ئەو دوو هاوسەرە جوانە مەرگ و خێر لەخۆ نەدیوە، بۆخۆی چیرۆکێکە لە چیرۆکی لە چیرۆکەکانی شەڕی ناوخۆ.

هێشتا چەك و دووربینێکی سەردەمی پێشمەرگایەتیم مابوو. چەك و دووربینەکەم لە ناو سەیارە دانا بوو. بە دووربین سەیرم کرد، لەسەر تەپۆلکەیەکی قەراخ شەقامی شەقلاوە — هیران لە رۆژهەڵاتی سپیگرە شەڕ گەرمە، چەند پێشمەرگەیەکی پارتی لە شەڕەکە گەڕابوونەوە زۆر شەپرزەو بێ ورە دیار بوون. هەر چەندە هەوڵم دا نەمزانی ئەوان لە کوێی بەرەی شەڕەکە بوون. لە یەکێکم پرسی ئەوانەی ئەو شەڕە دەکەن کێن و کێ سەرکردایەتییان دەکات؟ یەکێك پاروە نانێکی وشکی لە دەم دابوو بە دەم جوێنی پاروەکەوە وتی: موسا گەردییە رێگەی لە پێشرەوی هێزەکانی یەکێتی گرتووە، بەڕاستی کاك موسا گەردی و هاوسەنگەرەکانی ئازایانە شەڕیان دەکرد. بەندە تفەنگ هاوێژێك لەشەڕەکە دوور بووم، شەڕێکی دەستەو یەخە بوو، ویزە ویزی گوللە لە هارووژانی شارەی زەردەواڵا دەچوو. بەندە وەکو ئەو دێوانەیەم لێ هاتبوو، کە دەروێش لە کۆڕی زیکرو رەخشی دەردەکرێت، دوور بە دوور گوێبیستی ڕەخشی شێخ و زیکری

دەروێشەکان دەبێ، حاڵاتی زیکرو ڕەخش سەرگەرمی دەکات منیش وا بووم. هەرچەندە هەوڵم دەدا سپیگرە بە جێ بهێڵم نەم دەتوانی. وەك فەرماندەیەکی پارێزکار دوور بە دوور بە دووربین سەیری شەڕەکەم دەکرد. ئەگەرچی شەڕەکە شەڕی ناوخۆ بوو، بەڵام ئەو ڕۆژە ئیرەیم بە کاك موسا گەردی دەبرد کە فەرماندەیەکی ئاوا قارەمانە. دووربینم هەر بە چاوەوە بوو شەڕەکەش تا دەهات گەرم تر دەبوو. هێزێکی سوپای دوو گەیشتە مەیدانی شەڕەکە دەستە پیاوێکی سوورکەڵەی مو زەرد، بەرەو رووم هات، پێکەنی و وتی: هاوڕێ وەك ڕەسوڵ هەمزە تۆف دەڵێ کە ئاگر لەسەر شاخ کرایەوە پیاوی ئازا لە ماڵەوە خۆی ڕاناگرێت، خەڵك وا ڕادەکات تۆ لێرە چی دەکەی؟ کێ تۆی هێناوەتە ئێرە؟! هەر نزیك دەبۆوە، منیش نەم دەناسییەوە، بەرگێکی مغاویری لەبەر بوو، تفەنگ لە گۆڵمیدا، وتی: ئەوە نامناسییەوە هاوڕێ محەمەد خدر؟ بێ ئەوەی وەڵام بدەمەوە، وتی: سەنگەرم سەنگەر ئەوەی لە ناوزەنگ لەگەڵ هاوڕێ محەمەدی حلاق بوو. باوەشمان بەیەکدا کرد وتم سەنگەر گیان ئاگاداری خۆت بە، زۆربەی کوڕە ئازاکان لە شەڕی ناوخۆدا کوژران. وتی ئێستا ئامر لیوام لە سوپای دوو. بەسەر پێوە بارودۆخی شەڕەکەمان تاوتوێ کرد، دیار بوو برادەرەکانی چاوەڕوانیان دەکرد وتی هەر ئێستا هەڵیان دەبڕین و ڕاویان دەنێین. سەنگەرو هێزەکەی وەك ئاگر وا بوون ئەو هەڵمەتەی کردیان، مليیان لێناو نەگەرانەوە، تا پاشەکشەیان بە هێزەکانی یەکێتی کرد بەرەو گوندی **ئاقوبانێ**.

زۆر جار مرۆڤ دەکەوێتە هەڵوێستی ئەوتۆ نازانێ چۆن هەڵوێست وەربگرێت، شەڕی ناوخۆ شەڕێکی براکوژی بوو، براوە و دۆڕاوی نەبوو. لەو کاتەدا تا پتر چاوم بە مەیدانی شەڕەکەدا دەخشاند پتر بۆ داهاتووی سیاسی گەلەکەم نیگەران دەبووم. پێم وابوو ڕۆژێك دێت بە شەرمەوە باس لە ڕۆژانی شەڕی ناوخۆ دەکرێت. بە کردەوە ئەو ڕۆژە هات.

لە دوای ۳۱ی ئاب یەکێتی زۆر بە تەنگەوە بوون بۆ وەرگرتنەوەی هەولێر، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. وەك چۆن یەکێتی سەرکەوتوو نەبوو لە وەرگرتنەوەی هەولێر، پارتی دیموکراتی کوردستانیش نەیتوانی لە سلێمانی بمێنێتەوە، لەبەر یەك هۆکاری سیاسی سادە، ئەویش دابەشبوونی هەرێمی کوردستان بوو بۆ دووبەش یا دوو حکومەت، حکومەتی یەکێتی لە سلێمانی و حکومەتی پارتی لە هەولێر، یا بەسەر دوو جەمسەردا جەمسەری ئێرانی و جەمسەری تورکی و عێراق. لەبەرئەوە جەولەی چوارەمی شەڕی گەرمی یەکێتی و پارتی، بوو بە شەڕی ڕاگەیاندن و دیبلوماسی.

## چاوەڕوانی:

ساڵی ١٩٩٧ بۆ کۆتایی ساڵی ١٩٩٨ لە ماڵەوە بووم، چاوەڕوانی هەڵوێستی کاك نێچیرڤان بووم بۆ ئەوەی دیدارێکی تری لەگەڵ بکەم، یا راسپاردەیەك بنێرێت بۆ ئەوەی لە جێگایەکی گونجاو دەست بەکاربم، هیچ وەڵامی نەبوو. ناچار رۆژێك خۆم چووم بۆ دەهۆك، سەردانی کاك کاروان ئاکرەیم کرد و پێم راگەیاند کە ماوەی ساڵێکە بێ ئیش و کارم بێ کاریش لە هیچ کوێیەك خۆش نییە، وتی نامەیەك بنووسە بۆ کاك شەوکەت شێخ یەزدین و باسی دیدارەکەی پێشتریش بکە. وتی نامەکە دەدەم بە خۆی، نامەیەکم بۆ کاك شەوکەت نووسی بە زارەکی وەڵامیدامەوە، کە بە کاك نێچیرڤان دەڵێ، کە گەڕامەوە دوای چەند رۆژێك کەمێك پارەی وەکو هاوکاری بۆ ناردم. کاك شەوکەت مرۆڤێکی بە ویژدان و زۆر وردەکارو پشوو درێژ بوو، لە کاری رۆژانە هەر زوو هەستی بە کێشەو گرفتەکانی کادرەکانی پارتی دەکرد...

زۆربەی دۆستەکانم لە(لقی ١١) حەزیان دەکرد لە ریگای لقەوە دەست بەکاربم لە کاری پارتایەتیدا، بەڵام سەرەڕای هەڵوێستی ئەو برادەرانەم، پێم باشتر بوو ئارام بگرم بۆ ئەوەی بەراسپاردەو راوێژی کاك نێچیرڤان، یا مەکتەبی سیاسی پارتی ئەرکێك وەربگرم، چونکە پێم وابوو سەنگەرگۆڕین لە ژیانی سیاسیدا کارێکی ئاسان نییە. هەم ئەوانەی لایەنگری حزبەکەی پێشووترن دژایەتی ئەوانە دەکەن کە حزبەکەیان جێدەهێڵن، هەم لایەنگرانی ئەو حزبەش کە لە نوێ هەڵی دەبژێرێت، زۆر خۆشحاڵ نین بە پەیوەندی کردنی کادرو ئەندامانی حزبەکانی تر، بەتایبەتی ئەگەر بەپلەیەکی شایستەی ئەوتۆ وەربیگرن، کە لە پلەی هەندێك ئەندامی حزبی دووەم باڵاتر بێت. بەڵام سەرکردایەتی پارتی بە گشتی و جەنابی سەرۆك و کاك نێچیرڤان، بیرکردنەوەیان زۆر جیاوازترە لە هەندێك کادری خوارەوە، هەمیشە پێیان وابوو تێکەڵبوون و پەیوەندی کردنی کادرو جەماوەری حزبەکانی تر، هێزو وزەی پتر دەبەخشێ بە پارتی و بزووتنەوەی نیشتمانی نەتەوایەتی گەلی کوردستان. ئەم نەریتەش لە سەردەمی بارزانی نەمرەوە لە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان دا پەیڕەو دەکرێ. لەکاتێکدا من چاوەڕوان بووم سەرکردایەتی پارتی و جەنابی سەرۆك و کاك نێچرڤان بارزانی ئەرکێکم پێ بسپێرن، چەند جارێك کاك ڕەسوڵ شەهید وەسمان رەزگەیی، کە دەهات بۆ لام لە ماڵەوە پێی دەگوتم بۆچی هیچ کارێك وەرناگری؟ منیش پێم دەگوت پەلەم نییە، کاك ڕەسوڵ رۆژێك هاتە لام وتی سبەی

موعیدێکم بۆ وەرگرتوویت لای کاك ئازاد بەرواری. پێشتر پەیوەندیم بە کاك ئازاد بەرواری و هیچ یەکێك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی(پارتی)یەوە نەکرد بوو. بۆ رۆژی دوایی چووم بۆ لای کاك سەرۆ قادر و پێم راگەیاند کاك ئازاد بەرواری داوای دیداری کردووە. لای من تەلەفۆنی بۆ کاك ئازادکرد و دیدارەکەی پشت راست کردەوە. لەگەڵ کاك سەرۆ چووین بۆ لای کاك ئازاد بەرواری و نابراو بەندەی بە کاك ئازاد ناساند. کاك ئازاد وتی باسی کاکە حەمەم بۆ کراوە. وتم: پێشتر کاك نێچیرڤان بارزانی ئێمەی دیتووە. کاك ئازاد وتی: دەزانم کاك نێچیرڤان پێی راگەیاندوم کە لەگەڵتان دانیشم، لە دوای ئەو دیدارە چەند دیدارێکی ترمان لەگەڵ کاك ئازاد بۆ رەخسا و ئیتر وەك دوو برادەرمان لێهات. لە راستیدا کاك ئازاد بەرواری پیاوێکی هەق و ڕەقە، سیاسییەکی(٢٤) عەیارە و پێدا هەڵدان و ماستاوچییەتی قبوڵ نییە. ناوبراو بۆ من بوو بە فلتەری پاڵافتە بۆ ناو پارتی. ئەوی راستی بێ بە لامەوە گرینگ  بوو وەك کادرێکی حزبی شیوعی تێکۆشانی ساڵانی رابردوومان وەکو خۆی رێزی لێ بگرێت. دوا ئەوەی کاك ئازاد پێی راگەیاندم کە لەمەو دوا من کادرێکی پارتی دیموکراتی کوردستانم، پێم وابوو پێویستە هەموو توانایەکم تەرخان بکەم بۆ ئەوەی جێگای متمانەی جەنابی سەرۆك بم. هێشتا هیچ پلەیەکی حزبی دیاریکراوم پێ نەدرابوو لە ناو پارتیدا، بەڵام لە قۆناغی چاوەڕوانی دەرچووبووم. زۆر جار کاك ئازاد بەرواری دەرفەتی پێدەدام،گرفت و کێشەی دۆست و هاوڕێیانی ترم چارەسەر بکەم، هاوکات کۆمەڵێك کادری تری پەرتەوازە لە هاوڕێ نزیکەکانم پەیوەندیان پێوەکردم لەرێگای بەندە پارتی ئەو هاوڕێیانەی خانەنشین کرد، زۆر سوپاسی پارتی دەکەم هەمیشە دەرگەی واڵا بووە بە ڕووی بەندەدا.

## بەندەو وبزووتنەوەی جووتیاران:

چەند جارێك بوو کاك محەمەد صۆفی رەحمان باوکی چالاك سەردانی دەکردم. دەمێکە کاك محەمەد بە هۆی کاك(مەحمودی حاجی خدر) ەوە دەناسم. کاك محەمەد لە برایەك دڵسۆزتر بووە بۆ کاك مەحمود لە سەخترین قۆناغەکانی خەباتی پێشمەرگایەتیدا، هاوکارو پشتیوانی کاك مەحمودو هاوڕێکانی بووە، کاك محەمەد وەك پێشنیار پێی وتم: بۆچی کار لەگەڵ بزووتنەوەی جووتیاراندا ناکەیت؟ وتم کادرێکی پارتیم، کاك محەمەد وتی بزووتنەوەی جووتیارانی کوردستانیش هەموویان پارتی و لایەنگری پارتین خۆشم کاریان لەگەڵ دەکەم. وتم کاك محەمەد

نامەوێت پارتییەکی کاڵ بم راستەوخۆ دەبم بە پارتی؟! کاک محەمەد وتی من حەزدەکەم تۆ کارێك بکەی هەر ئاوا دانەنیشی. دوای دوو هەفتە لە دیدارەکەی کاک محەمەد، کاک باپیری کاک مەلای بێگەلاسی هاتە لام. یەکەم جار بوو کاک باپیر ببینم. گەنجێکی وریاو دەم گەرم بوو. وتی هەر ئێستا لە لای کاک ئازاد بەرواری بووم لەسەر تۆ قسەمان کردووە، داوام لێکردووە تۆ کارمان لەگەڵ دا بکەیت. سبەی بە یەکەوە موعیدمان هەیە لەگەڵ کاک ئازاد بەرواری، لەسەر موعیدەکە لەگەڵ کاک باپیر چووم بۆ لای کاک ئازاد، پێش ئەوەی قسە بکەم کاک ئازاد وتی حەمە گیان داوات لێ دەکەم کار لەگەڵ بزووتنەوەی جووتیاران بکەیت،بۆ ئەوەی بزووتنەوەی جووتیاران لەو تەنگژەیە دەربازبێت کە لە دوای پەلاماری یەکێتی دوچاری بووە. دیار بوو کاک ئازاد و کاک باپیر کارەکەیان یەکلاکردبۆوە. من پێم وانەبوو کاک ئازاد بڕیاریداوە خۆم بۆ هەڵوێستێکی لەو جۆرە ئامادە نەکردبوو. لەکاتێکدا چاوەڕوان بووم پارتی لە لقەکانی خۆی کارێکی حزبیم پێ بسپێرێت، بەڵام وا کاک ئازاد دەمنێرێتەوە ناو بزووتنەوەی جووتیاران، کە پێشتر رازی نەبووم کاریان لەگەڵ دا بکەم. سەیرێکی کاک ئازاد و کاک باپیرم کرد و وتم: ئێوە هەموو شتێکتان بڕاندۆتەوە. روومکردە کاک ئازاد و پێمگوت: ئەگەر ئاگریش بێت دەچمە ناوی بە مەرجێك بە فەرمانی پارتی بێت، هەروەها پارتی پشتگیری بزووتنەوەی جووتیاران بکات. کاک ئازاد وتی حەمە گیان خەمت نەبێ لە نزیکەوە خۆم پشتگیریتان دەکەم. ئەو رۆژەی کە دەست بەکاربووم لە ناو بزووتنەوەی جووتیاراندا ئەو پەندەم دەهاتەوە یاد کە زۆر جار ژنان لەسەر کانییە ژنان بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە، یەك بە ئەوی دیکەی دەگوت خوشکێ خۆم فلانکەس لە کۆلکی ڕەویەوە بەسەر بەرازیدا کەوت! لەگەڵ رێزو خۆشەویستیم بۆ هەموو هەڤاڵانم لە بزووتنەوەی جووتیاران بەڵام خۆم وەکو ئەو پەندەی کانییە ژنان دەهاتە بەرچاو، برادەرانی جووتیاران بارەگایەکی زۆر پەڕپوت و وێرانیان هەبوو لە ماڵە جووتیارێکی یەك تەن یا ژن مردوو دەچوو، تەنانەت سەماوەریان نەبوو چایی پێ بدەنە میوانان، چا بەکتری لەسەر تەباغی لێ دەنرا. بە کاک باپیر و کاک سوارەو هەڤاڵانی ترم گوت ئێوە هەمووتان خەڵکی(پشدەرن)،پشدەریش ناوبانگیان هەیە لە میوانداری و خوان چاکیدا، دەبێ هەر ئەمڕۆ سەماوەر بکڕین، هەر ئەو رۆژە سەماوەر کردرا و چایی پێ خورایەوە. ئەو رۆژگارانەی لەگەڵ بزووتنەوەی جووتیاراندا بردمە سەرێ بەدەر نەبوو لە تەنگژەو رووداوی جەرگ بڕ. لە رووی رێکخراوەییەوە، بزووتنەوەی جووتیاران لەو دووفاقییەی سەردەمی یەکەم

کۆنفرانسی دامەزراندندا گیری خواردبوو، پێویست بوو لە دوای سەرهەڵدانی شەڕی ناوخۆ خۆی لەو دووفاقییە دەربازبکات کە سەرکردەو جەماوەرەکەی دابەشبوو بەسەر هەردوو لایەنی شەڕەکە پارتی و یەکێتی و لایەنەکانی تر. لە رێکەوتی ١٩٩٨/١١/٦ بە ئامادەبوونی(٥٩) نوێنەر لە ئوتێل قەسر ئەلزەهەبی هەولێر کۆنگرە گرێ درا، بەندەش هەڵبژێردرام بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و دواتر بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزووتنەوەی جووتیاران و چەوساوانی کوردستان. کاك باپیر کامەلا بە سکرتێری بزووتنەوە، کاك سوارە بابەکر، کاك هاوکار مەحمود بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی و کاك حەمەرەش ئەحمەد، کاك ئەحمەد(برایم) رەش، کاك شوان مەحمود، کاك عەبدوڵڵا پۆلیس، بە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و کاك قهار گەزنەیی بە یەدەکی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران. کۆنگرە ناوی بزووتنەوەی جووتیارانی گۆڕی بۆ بزووتنەوەی جووتیاران و چەوساوانی کوردستان، بەشێك لە ئەندامانی سەرکردایەتی کۆنفرانسی یەکەم لە رێگای رادیۆیی ئازادی حزبی شیوعی کوردستانەوە رەخنەیان لە کۆنگرە گرت. ماوەی هەفتەیەك بەیاننامەیەك، کە لە لایەن کاك عبدالرزاق مەرزینگ و هەندێك لە هاوڕێکانی لەسەر کرنگرە دەرکرا بوو لەو رادیۆیەدا دەخوێندرایەوە. ئێمەش لە رێگای چەند گوتارێکی توانج ئامێزەوە لە رۆژنامەی (پاڵە) دا وەڵامی ناڕاستەوخۆی ئەو بەیاننامەمان دایەوە. کۆنگرەکە سەرکەوتوو بوو، بزووتنەوەی جووتیاران لەو تەنگژەیە قورتار بوو، لە روویی رێکخراوەییەوە هەنگاو بە هەنگاو ئاستی خۆی گەیاندەوە ریزی لایەنە سیاسییەکانی کوردستان. لە ناو کۆڕو کۆبوونەوەکاندا رۆڵی خۆی هەبوو. زۆر جار لە کێشە گشتییەکاندا دەنگێکی دیاربوو. شەهیدبوونی کاك سوارە بابەکر، هەم وەکو بزووتنەوەی جووتیاران هەم وەکو برادەرێکی هاوڕێ و هاوکارم لە رووی مەعنەویەوە کەلێنێکی گەورە بوو. ناوبراو لە شەوی ١٩/٢٠ ١٩٩٩/٩ کاتێك لە ماڵی ئاشنایەکی دەگەڕایەوە فرسەتیان لێ وەرگرت و لە گەڵ منداڵێکی تەمەن (٢) ساڵەیدا بە ناوی ئەدیب، بە دەستی نۆکەری یەکێك لە ئاغا میراودەلیەکان شەهیدکرا و، کچێکی تەمەن(٧) ساڵەشی بە ناوی شیبا بریندابوو. کوژرانی کاك سوارەو کۆرپەکەی دەچێتە خانەی تاوانە گەورەکان. دوای شەهیدکرانی کاك سوارە بزووتنەوەی جووتیاران و چەوساوانی کوردستان کەوتنە هەڵوێستێکی سەخت و دژوارەوە، چونکە ئەوانەی کاك سوارەیان شەهیدکردبوو لەگەڵ پارتی بوون، پارتیش بۆ ئێمە وەکو حزبی دایك وابوو، دەترساین ئەو رووداوە دیزە بە دەرخۆنە بکرێت، بەڵام بە هیمەتی جەنابی سەرۆك

و سەرکردایەتی پارتی و ئیدارەی حوکمڕانی هەولێر، بکوژەکانی کاك سوارەو کوڕەکەی دۆزرانەوەو درانە دەستی یاسا و زیندانی کران. بزووتنەوەی جووتیاران زۆر قۆناغی سەختی بەرێکرد. کاك هاوکار مەحمود ئەندامی مەکتەبی سیاسی بەرەو هەندەران ڕۆیشت. تەنگژەی دارایی و سیاسی لەسەر ئاستی ناوخۆو نێودەوڵەتی و هەرێمی دروست بوو، نالەبارترین قۆناغ لەسەردەمی پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراقدا هاتە ئاراوە، چونکە بڕیاردرا میزانییە و مووچەی حزبەکان ڕاگیرێ. ماوەی (٩) مانگ مووچە و هاوکاری حزبەکان نەدرا. هەر حزبە خۆی ئیدارەی گرفتە داراییەکانی خۆی دەکرد. بزووتنەوەی جووتیاران تارادەیەك خۆی بۆ ئەگەری بارودۆخی ناخۆش ئامادەکردبوو، بۆیە توانی خۆی رابگرێ. هاوڕێ حەسەن خدر و هاوڕێ ئەحمەدی کاکی بکر، کە دوو هاوڕێی دێرینی بەندە بوون لە سەردەمی خەباتی شاخ، ئەگەرچی لە کاتی کێشەی بەندە لەگەڵ حزبی شیوعیدا، هاوڕای بەندە نەبوون، بەڵام هیچ کاتێ پەیوەندی نێوانمان تێك نەچوو، هەمیشە ڕێزی بیروڕای یەکترمان دەگرت، بەڵام کاتێ بەندە لە ناو حزبی شیوعی ڕۆیشتم ئەو هاوڕێیانەش گلۆڵەیان کەوتە لێژی. هاوڕێ حەسەن خدر کە ماڵەکەی لە رانیە لە ناو خانووی بارەگای حزب دابوو، کۆمەڵێك کێشەی بۆ دروستکرا، کاتێك هاتە لام گرفتەکانی خۆی باس کرد زۆر نیگەران بووم. ناوبراو وتی هاوڕێیان پێیان وایە پەیوەندیم بە پارتی و پاراستنەوە کردووە. ئاگادارم کردەوە کە ئەگەر هاوڕێیان بڵێن پارتییە، یەکێتی بێ سێ و دوو گومانت دەخاتە سەر، واباشترە لە رانیە نەمێنی. هاوڕێ ئەحمەدی کاکی بکر و هاوڕێ حەسەن خدر، پێویست بوو پێگەیەکی شایستە لە ناو بزووتنەوەی جووتیاراندا وەربگرن. لەگەڵ کاك باپیرو هەڤاڵانی کۆمیتەی ناوەندی بزووتنەوەی جووتیاراندا قسەم کرد، بە پشتگیری خودی کاك باپیر و هەڤاڵانی تر بۆ ڕێزلێنان لە خەباتیان بە تێکڕای دەنگ لە کۆمیتەی ناوەندی بڕیاردرا، کاك ئەحمەدو کاك حەسەن خدر پلەی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بزووتنەوەی جووتیارانیان پێ ببەخشرێ. دواتر ژمارەیەکی تریش لە هاوڕێیان و برادەرە دێرینەکانم پەیوەندیان بە بزووتنەوەی جووتیارانەوە کرد، پەیوەندی ئەو کۆمەڵە هاوڕێیە بە بزووتنەوەی جووتیارانەوە حزبی شیوعی کوردستانی لە بەندە دڕدۆنگ کرد. بۆ نموونە رۆژێك من و هاوڕێ حەسەن خدر، وەك شاندی پەیوەندییەکانی بزووتنەوەی جووتیاران، لە یادی دامەزراندنی حزبی شیوعی عێراقیدا، چووین بۆ بارەگای مەکتەبی محەلی هەولێر. کاك حەسەن کاکە لەوێ بوو، دیاربوو تازە لە هەندەران گەڕابۆوە، زۆر بە هەڵچوون و دڵگەرمی

قسەی لەگەڵ کردم وتی: تۆ بۆچی حزبی خۆت بەجێهێشتووە برادەرو هاوڕێیان لە ناو پارتیدا کۆدەکەیتەوە؟! لە وەڵام دا وتم کاکە حەسەن ئێوە ناگۆڕێن، ئێوەش دەچنەوە سەر سروشت و تایبەتمەندی ئاغاکانی میراودەلی. میراودەلیەکان کە ژنەکانیان تەڵاق دەدەن حەزناکەن ژنە تەڵاق دراوەکە شو بە کەسی تر بکاتەوە، وەکو تۆڵەو ڕقی ئاغایەتی ئارەزوو دەکەن ژنە تەڵاق دراوەکە بە ڕەزیلی بمرێت و کەزی سپی بوەنێتەوە، بە تەمەنی پیریش پێی بڵێن فلان ژن کۆنە ژنی فلان ئاغا بووە. هاوڕێ حەسەن کاکە و هاوڕێکانی تری، هاوشێوەی ئەو(**لە سووریان دۆڕاندووە دەیانەوێ لە لابا تێیهەڵبێننەوە**)، وا دەزانن بە چەند کەسێکی وەکو ئێمە هەڵوەداو پەڕاگەندە، دەتوانرێت باری لەنگی رووخانی یەکێتی سۆڤیەت و بزووتنەوەی کۆمۆنیستی لە دنیادا راست بکەنەوە. لە کاتی دەسەڵاتی ئاغاو دەرەبەگەکانی پشدەردا کە لەوەرزی هاویندا بەرەو قەندیل و باژێری، لە بێورێ خوارێ و سەرێ دەچوون، خەڵکە هەژار و ڕەعیەتەش کە لە گەرمیانێ خەریکی دروێنە و کۆڵ کێشی و ڕاکە ڕاکی بێگاری ئاغا بوون. ئاغا ژنێك نۆکەرێکی هەبوو پێیان دەگوت شینکە، ئاغا ژن لە کاتی گەرمای نیوەڕۆیان لینگی بە ڕەنوە بەفریدا شۆڕدەکردنەوەو دەیگوت (**شینکە بدرو فێنکە**). مەبەستی ئاغا ژن شینکەی نۆکەر بوو کە لە گەرمیانێ دروێنەی دەکرد، پێی وابوو گەرمیانیش وەکو سەر ڕەنوی بەفرەکە فێنکە، نەیدەزانی شینکەی بەد بەخت لەبەر ماندوویەتی و هەژاری کەللە شەکری پێ فلە. کاك حەسەن و هاوشێوەکانی خۆیان لە هەندەران بوون، ئاگاداری ئێشو ئازاری ناوخۆی خەڵکی کوردستان نەبوون، یا ئاگاداربوون و خۆیان لە راستییەکان لا دەدا...رۆژانە ژمارەیەکی بەرچاو لە هاوڕێ دێرینەکانم لە ئەندام و کادرەکانی حزبی شیوعی سەردانیان دەکردم بۆ ئەوەی لە رێگای منەوە پەیوەندی بکەن بە پارتی و بە بزووتنەوەی جووتیارانەوە. بەڵام حەزم نەدەکرد لەوە زیاتر حزبی شیوعی بەرامبەر بە من دڕدۆنگ بێت، چونکە لەو کاتەوە کە حزبی شیوعیم جێهێشتووە حەزم نەکردووە و حەزیش ناکەم شیوعییەکان وا بزانن ڕقم لەو حزبەیە، ئێستاش شیوعییەکان و حزبی شیوعیم ناخۆش ناوێت، دۆست و هاوڕێ نزیکەکانم هەر کەونە هاوڕێ دێرینەکانم بوون و هەن...

بەڵام سەرەڕای ئەوە هەمیشە ئازارم چەشتووە، کە زانیومە پێشمەرگەیەکی دێرین و کادرێکی رۆژگارە سەختەکانی خەباتی شارو شاخ، بەتایبەتی ئەوانەی هاوڕێی ئەو رۆژگارانەم بوون سەرگەردانبوون، بێ مووچەو هەژار لێرەو لەوێ خۆیان و خێزانەکانیان رەزیل و پەڕپوت

بوون. وەك ویژدان و ئەخلاقی هاوڕێیەتی نەمتوانیوە ڕوویان لێ وەرگێڕم. ناچاربووم دەیان نامە و چەندان ڕاسپاردەو هەوڵی بێ پسانەوە بدەم، بۆ ئەوەی هەم ژیانێکی نەمر نەژی بۆ ئەو هاوڕێیانە و خێزانەکانیان لای پارتی دابین بکەم، هەم پارتیش سوود لەو کۆمەڵە تێکۆشەرانە وەربگرێت، کە لە دەرەوەی حزبی شیوعی پەراگەندە بوون. لەو هەوڵەمدا تا رادەیەك سەرکەوتوو بووم. بە هاوکاری و پشتگیری برای بەڕێزم کاك ئازاد بەرواری و سەرکردایەتی پارتی، توانرا کۆمەڵێك لەو کادرو هاوڕێیانەی وەکو خۆم پەرتەوازە بوون لە دەورەی پارتی کۆ بکەمەوە، ئەو کارە سەر ئێشەو گرفتێکی یەکجار زۆری بۆ دروستکردم، بەڵام لە رووی ویژدانییەوە زۆر ئاسوودە بووم کە توانیومە گرفتێکی ژیان و گوزەرانی ئەو هاوڕێیانە چارەسەر بکەم.

## گەڕانەوە بۆ ناو پارتی:

کاتێ کە لەسەر دەستی هاوپەیمانان بە رابەرایەتی ئەمریکا ڕژێمی دیکتاتۆری ڕووخا، وەرچەرخانێکی گرینگ لە مێژووی سیاسی عێراق و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا هاتە گۆڕێ. ئەو رۆژگارانە لە مێژووی عێراق و ناوچەکەدا وەکو مێژووی قۆناغێکی نویی مرۆڤایەتی وان، بە هاوکاری و پشتگیری بە هێزترین وڵاتی دنیا سەر سەخترین ڕژێمی هاوچەرخی دوو بلوکی و حوکمڕانی شمولی کۆتایی پێهات. هەوری ڕەشی حوکمڕانی دیکتاتۆری لەسەر ئاسمانی عێراق و کوردستان لاچوو. ئەو ڕژێمە سەرکوتکارە بە هەموو دامودەزگا فەرمی و سوپاشەوە کۆتایی هات. ساڵی ٢٠٠٣ ساڵێك بوو پڕ لە رووداوی هەمەجۆرە و کرانەوە بوو بە رووی عێراق و دنیادا. بزووتنەوەی جووتیاران و چەوساوانی کوردستان، لە لایەن کۆمەڵەی جووتیارانی عێراقییەوە بانگهێشت کرا بۆ بەغدا. بۆ ئەومەبەستەش شاندێکی ئامادەکرد بۆ بەشداری کردن لە کۆنگرەیەك کە بنەماڵەی شانشینی عێراقی پشتگیری دەکرد. زۆربەی نوێنەرو رێکخراوەکانی ئەو کۆنگرەیە لایەنگری ڕژێمی رووخاوی سەدام بوون...

بۆ دیداری شا لە بارەگای سەرەکی پاشا کۆکرابووینەوە، بە هەوڵی ئێمە وەك نوێنەری بزوتنەووەی جووتیاران و چەوساوانی کوردستان، تاوانەکانی ڕژێمی دیکتاتۆری وەك ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە، لە بەلاغی کۆتایی کۆنگرەکەدا تۆمارکرا.

بەلاغی کۆتای کۆنگرەکە بۆ پاشا خوێندرایەوە بەندەو کاك هاوکاریش بە پاشا ناسێندراین و، وتیان ئەمانە نوێنەری جووتیارانی کوردستانن. بەغدا لە پایەگایەکی سەربازی دەچوو، شەو و رۆژ هێلیکۆپتەر و فرۆکەی شەڕکەری ئەمریکا بەئاسمانی بەغدادا دەگەڕان. ناو شاری بەغدا بۆنی خوێنی لێ دەهات، ئەو ئێوارەیەی گەیشتینە ناو بەغدا، لە چەند شەقامێك گەڕاین بۆ نان خواردن، لەبەر پیسی و مێش و بۆگەنی ناو شەقامەکان نانمان پێ نەدەخورا. خەریکبوو زیاتر دەگەڕاین بەڵام برادەرێکی هەولێریمان لەگەڵ بوو، وتی ئێوە ئاگادار نین وا خەریکە بمانکوژن یا بمانڕفێنن. لەبەر مەترسیداری بارودۆخەکە چیتر بە دوای نانخواردندا نەگەڕاین. ئەو شەوە لە ئوتێلێك بووین خاوەنەکەی کورد بوو، شوێنێکی زۆر پیس بوو، هەر ئەو شەوە ماینەوە بۆ رۆژی دواتر گەڕاینەوە هەولێر.

ئەو ساڵە واتاساڵی ٢٠٠٣، لە چەند کۆبوونەوەیەکی ئاسایی و نائاسایی کۆمیتەی ناوەندی بزووتنەوەی جووتیاران و چەوساوانی کوردستاندا، لەسەر چارەنووسی بزووتنەوەی جووتیاران و چەوساوانی کوردستان گفتوگۆمان دەکرد. بەندەو بەشێك لە هەڤاڵانی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی، پێمان وابوو لە دوای رووخانی رژێمی دیکتاتۆری سەدام و حزبی بەعس قۆناغێکی نوێ لە ژیانی سیاسی عێراق بە گشتی و کوردستان بەتایبەتی دەست پێ دەکات. ئەو قۆناغەش قۆناغی پیادەکردنی دیموکراسی دەبێ. لە دیموکراسیشدا سندوقەکانی دەنگدان قەبارەی گەورەیی و بچووکی حزبەکان دیاریدەکەن. لە بارودۆخێکی ئەوهادا شانسی ئەو حزب و رێکخراوە سیاسیانەی لە بنچینەدا قەوارەی جەماوەریان لاوازە، زۆر کەمدەبێتەوە. هەر بۆیە بەندە پێی وابوو باشترە بزووتنەوەی جووتیاران و چەوساوانی کوردستان لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان تێکەڵبێت، کە وەك دەیان گرووپی سیاسی گچکە دەرئەنجامی شەڕی ناوخۆ بوو و، دابەشببوون بەسەر هەردوو لایەنی شەڕەکەدا. ئێمە وەك (ب. ج. چ. ك) هەموو نەفەسێکمان لە پارتی وەردەگرت، لە هەموو هەلومەرجێکدا پێم باشتر بوو، پارتییەکی تەواو پارتی بین نەك پارتییەکی کاڵ و بەر سێبەر.

بەڵام کاك باپیر ئەگەرچی بەرواڵەت پشتگیری تێکەڵبوونەوەی دەکرد، بەڵام لە ناخی خۆیدا دژی تێکەڵبوونەوە بوو، هەر لەبەر ئەو هۆکارەش بوو پرۆسەی یەکگرتنەوە سەری نەگرت... رۆژێك کاك میرخان ئاگاداری کردم و وتی: کاك ئازاد بەرواری دەیەوێت دیداری بکەیت. چووم بۆ لای کاك ئازاد و ناوبراو پێی وتم: حەزدەکەین بگەڕێیتەوە( لقی ١١) لە سنووری خۆتان،

پێم وت: خۆت ئاگاداری کە من کادرێکی سەرکردایەتی بزووتنەوەی جووتیاران و چەوساوانی کوردستانم، پێویستە هەڤاڵانی بزووتنەوەی جووتیاران و چەوساوانی کودرستان رازی بن. کاك ئازاد وتی ئەوەیان بۆ من لێگەڕێ، وتم حەزدەکەم خۆم ئامادەبم، کە قسەیان لەگەڵ دەکەیت. وتی باشە خۆشت ئامادەبە، بۆ رۆژی دواتر کاك ئازاد، کاك باپیر و کاك هاوکاری داواکرد، خۆشم ئامادەبووم. کاك ئازاد بە کاك باپیرو کاك هاوکاری وت: خۆتان دەزانن محەمەد و هاوڕێکانی کادری پارتین، پێتان خۆش بێت یا ناخۆش دەیانگێڕینەوە بۆ لقی (١١). کاك باپیر و کاك هاوکار وتیان زۆر ئاساییە، بەڵام حەزدەکەین گرینگی زیاتر بدرێت بە بزووتنەوەکەمان...

لە کاتی گەڕانەوەم بۆ لقی (١١)، سەبارەت بە وەرگرتنی پلەی حزبی و ئەرك و کاری رۆژانە راوێژم لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوڕێکانم کرد. لیستێکمان ئامادەکرد کە فەرمانی پلە بەندی فەرمی مەکتەبی سیاسی پێ دەرچێ، لیستەکە ناوی(١١) کادر بوو، لە ناوی خۆمەوە دەستی پێدەکرد بە ناوی کاك (عەبدوڵڵا) کۆتایی دەهات. لەگەڵ کاك ئازاد جارێکی تر کۆبووینەوە، لەو کۆبوونەوەیەدا کاك ئازاد، کاك مەسعود ساڵەیی ئەندامی مەکتەبی سیاسی و کاك د. حەسەن محەمەد سوورە بەرپرسی (لقی١١) و بەندە بووین، کاك ئازاد بە (د.حەسەن)ی راگەیاند، محەمەدو برادەرەکانی بە پلەی کارگێڕی لق و ئەندام لق و کارگێڕی ناوچەو ئەندام ناوچە ژمارەیان(١١) هەڤاڵە، دەگەڕێنەوە سنووری (لقی ١١). د.حەسەن بە نابەدڵی وتی باشترە فەرمانی وەرگرتنیان دوابخرێت تاکو دەگەڕێنەوە(لق)، بەڵام کاك ئازاد بەرواری وتی ئەوەی ناوێ. بە کاك مەسعود ساڵەیی وت: فەرمانی مەکتەبی سیاسی دەربکە، بە پێی لیستی دیاریکراو کە کاك محەمەد خۆی نووسیویەتی، بەڕێز و بایەخەوە پلەکان دیاری بکە. هەڵوێستی کاك ئازاد هەڵوێستێکی یەکلاکەرەوە بوو. زۆر خۆشحاڵ بووم بەو هەڵوێستە، ناوەرۆکی فەرمانی مەکتەبی سیاسی جێگای خۆشحاڵیم بوو.

## سەنگەرگۆڕی و ئاستەنگەکان:

کاتێ بەندەو هەڤاڵەکانم چووین بۆ(لقی ١١)، بەرپرسی لق و هەندێ لە کارگێڕەکانی (لق) زۆر بە ساردی و سڕی پێشوازیان لێکردین، زۆر سەیر بوو زۆربەی هەرە زۆری کادرو بەرپرسەکانی (لقی ١١) دۆست و برادەرمان بوون، کەچی مەحزەرێکی هاوبەشیان واژۆکردبوو

بۆ(م.س و م.ن.ڕ) قبوڵیان نەبوو لە (لقی ١١) کاربکەین. ئێستاش نەمزانی هۆکاری ڕاستەقینەی ئەم هەڵویستەی ئەو هەڤاڵانە چییە. هیچ هۆکارێکی سیاسی و گرفتی کەسایەتی ئێمە مەمانان لە گۆڕێ نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ، وام هەست دەکرد پێیان وابوو سەرکردایەتی پارتی زیاد لە پێویست بایەخیان بە ئێمە داوە. لەبەر ئەوە هەمیشە خۆم وبرادەرەکانم هەستمان بە جۆرێك لە نامۆیی دەکرد. کارگێڕو ئەندام لقەکان دەیان دۆست و برادەریان بە پلەی شایستە لە ئۆرگانەکانی لق دامەزراند، کەچی بە بەندەو برادەرەکانی ڕازی نەبوون. زۆر بەلامەوە سەیر بوو بۆ دەبێ بەرپرس و هەندێ لە کادرەکانی (لقی ١١)، حەزنەکەن کادرو لایەنگرانی حزبەکانی تر پەیوەندی بە پارتییەوە بکەن. لە ڕاستیدا پارتایەتی لە دەڤەرەکەی ئێمەدا قوربانییەکی زۆری دەوێت، چونکە پارتی بوون لە پشدەر و بیتوێن بڤە بوو. دوای شۆڕشی ئەیلول هەڵسوکەوتی دەسەڵات لە دەڤەری پشدەرو بیتوێن لەگەڵ پارتییەکانیش زۆر تەندوتیژ بووە، لە کاتی ئاسایی بوونەوەی بارودۆخە سیاسییەکانیش دا مافی دۆست و لایەنگرانی پارتی لەو دەڤەرەدا بەردەوام پێشێل دەکرێت، لەبەر ئەوە پێویست بوو ئەوانە حەز بکەن لایەنگرو ئەندامانی حزبەکانی تر پەیوەندی بە پارتییەوە بکەن. چونکە ئەو کاتە مرۆڤ هەست بە ئاسوودەیی دەکات کە حزبەکەی بەهێز بێ و جەماوەری بێت، نەك دوورە پەرێزو لاواز ساڵ بە ساڵ بچووك بێتەوە. هەڵوێستی جەنابی سەرۆك و کاك نێچیرڤان بارزانی و سەرکردایەتی پارتی، کە شوێن پێی ڕێبازی بارزانی نەمرە جیاوازە، پارتی لەسەر ئەو ڕێرەوە دەڕوات، هەربۆیە ئەو کادرانەی لەناو لایەنەکانی ترەوە دێن بۆ ناو پارتی، هەر یەکە خاوەنی مێژووی خۆیەتی و پارتی وەك ڕەمزی کوردایەتی سەیردەکەن کە بارزانی نەمر بناغەکەی داڕشتووە!؟.

چەپەکانی ناو پارتی بوونەتە جێگای تیر و توانجی ناحەزانی پارتی، ناحەزانی دەرەوەی پارتی پێیان وایە کۆنە شیوعییەکانی ناو پارتی ڕۆڵێکی کاریگەر دەگێڕن لەسەر خستن و گەشە پێدانی دەزگاکانی پارتی بەتایبەتی ڕاگەیاندن. ئەو ناحەزانە لەسەر دوو ئاستی جیاواز هەوڵدەدەن شیوعییەکانی ناو پارتی لە پارتی بتۆرێنن، لە لایەك دەزگاکانی ڕاگەیاندن بە کار دەهێنن بۆ سەر لێ شێواندن و بەلاڕێدا بردنی جەماوەری پارتی، بۆ ئەوەی گومان بخەنە سەر دڵسۆزییان، لە لایەکی تر کنەی هەواڵگری دەکەن، بۆ ئەوەی متمانەی سەرکردایەتی و سەرۆك

بارزانی، سەبارەت بە ئەو کۆمەڵە کادرە لاواز بکەن. مخابن کاریگەری ئەو هەوڵانە لە هەندێك بوارو هەڵوێستی جۆراوجۆردا بە روون و ئاشکرا هەستی پێدەکرێت.

ڕایەك هەیە لە ناو پارتیدا پێی وایە چەپەکانی ناو پارتی، بەتایبەتی کۆ شیوعییەکان، پێیان لە بەرەکە بردۆتە دەرەوە پێویستە جڵەویان بگیریت، ئەوان ڕاگەیاندنیان قۆرخکردووە، بە واتایەکی تر پێیان وایە ڕاگەیاندن بە پێی میزاج و فکری ئەوان تاودەدرێت، نەك بە گوتاری پارتی دیموکراتی کوردستان، لەکاتێکدا بە پێچەوانەیە، دەزگای ڕاگەیاندنی پارتی بە هاوکاری دڵسۆزانەی ئەو کادیرانە، لەسەر ئاستی کوردستان کاراترین دەزگا بووە، هەم بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ناحەزانی کورد و پارتی هەم بۆ ئاراستەکردنی گوتار و سیاسییەتی گشتی پارتی، ڕووەو ڕاستەڕێ کردنی تێزە نەتەوەییەکان کە کروکی ڕێبازی بارزانی و پارتییە، کەواتە بۆچی شیوعییەکان دەکرێنە ئامانج لە کاتێکدا ئێستا بە تەواوی مانا پارتین؟! بەڕای بەندە ئەوەش پیلانێکە لەو پیلانانەی ئاڕاستەی پارتی دەکرێ بۆ لێك ترازانی پارتی و ڕێبازی بارزانی کە هەمیشە بەنەفەسێکی نەتەوەیی و دیموکراتیانە بیری کردۆتەوە.

## هەڵوێست و کاردانەوە:

ماوەی دوو مانگ زیاتر بوو لە(لقی ١١) بۆ خۆم لە ژوورە تاریکەکەی بارەگای (لق) بێ کار دادەنیشتم و دەخەوتم. ئەو ژوورە جێگای خەوتن و پشوودانی ئەندام و کارگێڕەکانی(لق) بوو، زۆر تاریك و بەر تەنگ بوو، پتر لە ژووری زیندان دەچوو. بۆ کۆبوونەوەکانی کارگێڕیی بانگ دەکرام، بەشداری گفتوگۆی خاڵەکانی کۆبوونەوەکانم دەکرد. دوای شەڕی ناوخۆ بوو، وەرزەکە وەرزی ئاشکراکاری (لقی ١١) بوو. لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی(پەرلەمان) نزیك دەبووینەوە. دەسەڵاتی تەواو درابوو بە لقەکان کە دۆست و لایەنگرەکانی پارتی دامەزرێنن. (لقی ١١) بە سەدان کەسی دامەزراند، شەو ڕۆژ بارەگای(لق) جمەی دەهات لەو خەڵکەی هەوڵیان دەدا پەیوەندی بە پارتییەوە بکەن بۆ ئەوەی مووچەیان بۆ ببڕدرێتەوە. بە فەردە پارە دابەشدەکرا. بە دەیان کەس لە کادرو لایەنگرانی یەکێتی، بەرواڵەت سەنگەری خۆیان دەگۆڕی و پەیوەندیان بە لقەوە دەکرد. بەڵام دوایی دەرکەوت هەندێکیان لە ژێرەوە هان دراون بۆ ئەوەی پارە لە پارتی بکێشنەوە. بەشێکی زۆر لەو خەڵکانە لە کاتی هەڵبژاردندا گەڕانەوە لای یەکێتی. لەم ڕێگایەوە بەشێك لەو توانا ئابوورییەی، کە پارتی تەرخانی کردبوو،

بۆ ئەوەی جەماوەری دەڤەرەکە بۆ لای خۆی راکێشێت بەفیڕۆچوو. ئەو قەرەباڵغیەیی رۆژانە بەردەم لق و بارەگاکانی(لقی ١١)ی گرتبوو، لە لایەن بەرپرسی لق و هەندێك لە هەڤاڵانی(لق) لێکدانەوەی هەڵەی بۆ دەکرا. چەند مانگێك پێش هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٥ لە دیدارێکی کاك نێچیرڤان دا کە بەرپرس و جێگرو کارگێڕەکانی(لق) تێدا ئامادەبوون، لە وەڵامی کاك نێچیرڤان دا رایانگەیاند کە جەماوەری پارتی زۆر بووە و، فراوانتر لە قەبارەی خۆی نیشانیان دا. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا کاك نێچیرڤان لە منی پرسی بۆ ئەوەی منیش ڕای خۆم لەسەر ئەندازەی قەبارەی جەماوەری پارتی دەربڕم. منیش لە وەڵامی کاك نێچیرڤان دا، ڕای خۆم لەسەر بارودۆخی دەڤەری پشدەر و بیتوێن دەربڕی، ڕادەی جەماوەری پارتی لە دەڤەرەکەدا بە مەزندەی بەندە زۆر جیاواز بوو لە ناوەرۆکی ئەو راپۆرتەی بەرپرس و کارگێڕانی لق رایان گەیاند. کاك نێچیرڤان پشتگیری لە ڕایەکەی من کرد، بەرپرس و جێگری لق و بەشێك لە هەڤاڵانی کارگێڕ لە هەڵوێستی من نیگەران بوون، پێیان وابوو دیدارەکەم لێ تێکداون گوایا کاك نێچیرڤان بە هۆی هەڵوێستی من لەوان تووڕەبووە. لە راستیدا لێکدانەوەم بۆ بارودۆخەکە زۆر جیاواز بوو، حەزم نەدەکرد راستییەکان یا واقعەکە لە کاك نێچیرڤان بشاردرێتەوە. چونکە من هەرگیز بڕوام بە نمایشی دوور لە واقع نییە لەبەردەم بەرپرسان بە تایبەتیش لە بەرامبەر کەسایەتییەکی وەك کاك نێچیرڤان بارزانی.

بە دیوێکی تردا نابێ زیادەرۆیی لە سیاسەتدا بکرێت، بەتایبەتی لەو کاتەدا کە زۆربەی جەماوەری دەڤەری بیتوێن و پشدەر، لایەنگری یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوون.

کاتێك هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٥ی پەرلەمانی کوردستان و ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق ئەنجامدرا، راستییەکان ئاشکرابوون لقی (١١) تەنیا (١٥/٠٠٠) دەنگی هێنا، یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە سەرووی(٩٠/٠٠٠) دەنگی مسۆگەرکرد ئەگەر تەزویر کاریشی تێدا کرابێت ژمارەکە جیاوازی زۆربوو. لەو هەڵبژاردنەدا بەرپرس و جێگری لق و بەشێك لە کارگێڕەکان تووشی شۆك بوون. بەڵام پێم وابوو ئەو ژمارەی (لقی١١) لە پرۆسەی هەڵبژاردنی ساڵی (٢٠٠٥) هێناویەتی لە راستی نزیکە، چونکە جەماوەری پارتی وەك لە ژێر دەستارێك دابێ وابوو، هەمیشە لەم دەڤەرە هاڕدراوە و بەرەو کەمبوونەوە چووە. لە دوای هەڵبژاردنی ساڵی (٢٠٠٥) مەکتەبی سیاسی بەدوای بەرپرس و جێگرو کارگێڕو ئەندامانی(لقی١١)یاندا نارد. کاك ئازاد بەرواری لەگەڵمان دانیشت، لەو کۆبوونەوەیەدا هەڵبژاردنی (٢٠٠٥)

هەڵسەنگێنرا، کاك ئازاد بەرواری بە تووڕەییەوە وتی ها(لقی١١) ئەو هەموو زیادەڕۆییە چی بوو پێش هەڵبژاردنەکە دەتان کرد؟ کۆبوونەوەکە کۆبوونەوەی سەرزەنشتی(لق)بوو، زۆر پێم ناخۆش بوو سەرزەنشتی لق بکرێت چونکە جەماوەری پارتی لە سنووری (لقی١١) زۆر غەدر لێکراوە، هەم لە لایەن پارتی پشت گوێ خراووە هەم یەکێتی وەك دەسەڵات لە سەردەمی شەڕی ناوخۆدا زۆر ئەزیەتی دەدان. بەندە لە کۆبوونەوەکەدا پشتگیری (لقی١١) م دەکرد کە جۆرێك لە هاوسۆزی هەڤاڵانی (لقی١١) بوو. لە دوای هەڵبژاردنی (٢٠٠٥) (لقی١١) بە تەواوی پشتگوێ خرا، ئەو پشت گوێ خستنە هەتا ئێستاش درێژەی هەیە.

## ئەرکی دەزگای راگەیاندن :

کاك سەرۆ قادر لەگەڵ شاندێکی مەکتەبی ناوەندی راگەیاندن، هات بۆ(لقی١١) و سەردانی بەرپرس و جێگری لق و کارگێڕەکان. پێی وتم دەمانەوێت رادیۆ و تەلەفزیۆنێکی ناوخۆ لە رانیە لەگەڵ هەڤاڵانی لق دابنێین، بۆ ئەمەش دەبێ کادرێکی شارەزا دەست نیشان بکەین سەرپەرشتی رادیۆ و تەلەفزیۆن بکات. کاك سەرۆ وتی حەزدەکەم تۆ ئەو ئەرکە وەربگریت. هێشتا بەندە هیچ ئەرکێکم لە(لق) وەرنەگرتبوو، بە کاك سەرۆم وت بە کاك دکتۆر حەسەن بڵێ، کاك سەرۆ وتی بە جەنابی سەرۆك دەڵێم تۆ ئەو ئەرکە وەربگریت. کاك سەرۆ گەڕایەوە هەولێر و دوای رۆژێك ئامێرو کورسی و کەل وپەلی تەلەفزیۆنی(گولان) گەیشتە رانیە. لەو رۆژەوە بە شەورۆژ لە بارەگای رادیۆ و تەلەفزیۆن بووم، لە ماوەی سێ رۆژدا بارەگای رادیۆ و تەلەفزیۆن ئامادەکران بۆ پەخش، گرفتی گەورەمان بورجی پەخش بوو. بورجەکەش لەسەربانی بارەگای راگەیاندن کە خانووی کرێ بوو هی کاك(قادرە ڕەش) جێگر کرا. جهازی پەخشەکە(٢٥) وات بوو تەنیا لە ناو شاری رانیە وەریدەگرت، رۆژی ٢٠٠٤/٩/١١ یەکەم رۆژی پەخشی راستەوخۆی رادیۆیی دەنگی کوردستان بوو لە رانیە. تەلەفزیۆنی ناوخۆ و رادیۆی دەنگی کوردستان، لە دوای ساڵانی شەڕی ناوخۆ لە ناوچەکە، دەنگ و رەنگیان دەرکەوت. قۆناغی(Test)مان نەبڕی دەستمان کرد بە پەخشی راستەوخۆی بەرنامەی ئاسایی، شاندێکی مەڵبەندی راپەڕینی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەسەردان هاتبوون بۆ (لقی١١) پیرۆزبایی پەخشی رادیۆ و تەلەفزیۆنی ناوخۆیان لە دکتۆر حەسەن کرد کە بەرپرسی(لقی١١) بوو. دکتۆر وتی من ئاگاداری پەخشی تەلەفزیۆن نیم، لە جێگای ئەوەی

سوپاسیان بکات بڵێ ڕاستە ڕادیۆ و(T.V)یمان دەست بەکاربووە، سەیری منی کرد وتی ئاگاداری کردنەوەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن نیم. کاك کوردەو شاندەکەی مەڵبەند، سەیریان کردم و پێکەنین بە سەرسوڕمانەوە وتیان هاوڕێ خێرە بەرپرسی(لق) ئاگادار نییە؟ لە وەڵامدا چەند قسەیەکم کرد لەبەردەم ئەوان و دکتۆر حەسەن کە حەزناکەم لێرە دووبارەیان بکەمەوە. ئەو ساردو سرییەی لە سەرەتای دەست بەکاربوونمان لە(لقی١١) دەستی پێکرد لە دوای دیداری کاك نێچیرڤان زیاتر بوو. لە جیاتی ئەوەی هاوکاریم بکەن هەوڵیان دەدا فاشیل بین لە دەزگای ڕاگەیاندن، تەنانەت هەندیك دۆست و برادەریان لە ناو تەلەفزیۆن هاندا بۆ ئەوەی کێشە و گرفتمان بۆ دروست بکەن. ئەو چەند کادرە هاوکار و برادەر بووین لە یەکتریان تووڕەکردین، لەبەر ئەوەی ستافی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن زۆربەیان لە هاوڕێ و برادەرە دێرینەکانی خۆم بوون، دەرکیان بە ئاستەنگەکان کردبوو، زۆر خۆگرو ئارام و کارامە بوون لە ئەرك و کارەکانی ڕۆژانەیاندا. لەگەڵ ستافی ڕاگەیاندن بڕیارمان دابوو هەموو تواناکانمان تەرخان بکەین بۆ ئەوەی نموونەیەکی سەرکەوتوو لە کاری ڕاگەیاندن پێشکەش بکەین. مەکتەبی ڕاگەیاندن بڕیاریدا بورجێکی پەخش لە سنوورەکە دابنێ بۆ ئەوەی دەنگ و ڕەنگی پارتیمان لە هەردوو دەڤەری پشدەرو بیتوێن ببیسترێ و ببینرێت. بۆ ئەو مەبەستەش سەری شاخی ماکۆك، لە لایەن پسپۆرانی بیانی بۆ دانانی بورجەکە پەسند کرا. شاندێکی مەکتەبی ڕاگەیاندن و بەشی تەکنیکی ناوەندی سەردانی دەڤەرەکەیان کرد. لە لق کاك محەمەد عەلی کارگێڕی لق یاوەری شاندی ڕاگەیاندنی کرد کە کاك تەحسین دۆڵەمەری و تیمی تەکنیك بوون، بۆ(سوسە) کردنی ناوچەکە هاتبوون. بڕیاردرا بۆ دانانی بورج دەست بەکاربین، بەندەو شاندی ڕاگەیاندن و کاك محەمەد عەلی کارگێڕی لق ڕۆیشتین بەرەو چیای(ماکۆك). بەڵام کاك محەمەد عەلی وتی زۆر زەحمەتە مرۆڤ لە وەرزی زستاندا بتوانێ لە سەر چیای ماکۆك بژی! باسی ژمارەیەك سەربازی سوپای ڕژێمی کرد، کە لەساڵانی حەفتاکان لە ناو ڕەبیەکانی سەر چیای ماکۆك ڕەق بوونەتەوەو لە سەرمان مردوون. کاك محەمەد وتی: بەفرێکی زۆر لەو چیایە دەبارێت هەر کەسێ لە ماکۆك بێت لە خوارەوە دادەبڕێت. تیمی تایبەت لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەم، دەستیان بە دروستکردنی بورجەکە کرد و زوو تەواوبوو. ڕۆژێك برادەرێك سەردانی کردم وتی هەواڵێکم بیستووە هەندێك کەسی نەیار هەوڵدەدەن بورجی ماکۆك بتەقێننەوە، هەواڵەکەم بە دروست زانی بە مەکتەبی ڕاگەیاندنم گوت، کاك سەرۆ وتی جارێ خۆت لەگەڵ (لق) چارەسەری

گرفتەکە بکەن، لەو ڕووەوە قسە لەگەڵ وەزیری ناوخۆ دەکەین تا پۆلیس بنێرێت بۆ پارێزگاری بورجەکان. ڕاوێژم لەگەڵ کادرێکی لقدا کرد بۆ ئەوەی ژمارەیەك پێشمەرگە بنێرێ بۆ ماکۆك. ئەو هەڤاڵە وتی قسەی خۆت خەسار مەکە لق ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکە بە هی خۆی نازانێ، ئیتر چۆن لەسەر چیای ماکۆك پاسەوانی بورجەکە دەکات. زۆر نیگەران بووم بڕیارم دا ئەگەر خۆم چووبم بۆ ماکۆك ناهێڵم بورجەکە پشتگوێ بخرێت. داوام لە چەند دۆست و خزمێکی خۆم کرد، کە سەر بکەون بۆ سەر چیای ماکۆك و ئێشك لە بورجەکە بگرن. ئەو خزم و دۆستانە، بێ ئەوەی مووچەیان بۆ دیاریکرابێ خۆبەخشانە سەرکەوتن بۆ سەر چیای (ماکۆك). ئەو خۆبەخشانە بریتی بوون لە: ڕەسوڵ مامە مینە، کاك عومەر عەولا شوانەی بێگەلاسی، کاك دڵشاد بابەکر، مەلای مام خدری زورکان، ئاراس فەقێ محەمەد، ئەو(٥) کەسە جێگای بڕواو متمانەی من بوون. لە ٢٠٠٤/١٢/٢٥ بەفرێکی زۆر لە چیای ماکۆك باری، هەورە تریشقە لە بورجەکە و خانووەکەی دابوو، کە کاك عومەر بە وشکە کەلەك دروستی کردبوو. بەهۆی هەورە تریشقەکەوە مولیدە و ئامێری کارەبایی سووتابوون، کاك ڕەسوڵ و کاك ئاراس لە لێواری مەرگ گەڕانەوە، دەست و پلی وەکو داخ کرابن وا بوو. لە مانگی ئازاریساڵی (٢٠٠٥)، وەشاندنی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکەمان لە دەڤەری پشدەر و بیتوێن بەر فراوان کرد و لەو سنووره تێدەپەڕی بەرەو دەوروبەری قەڵاچوالان و پێنجوێن و دەشتی کۆیەو دەوروبەری کەرکوك. بە مەزەندەی چاودێران و ئەو تیمانەی لە دەزگای موکریان لە سەر ڕاگەیاندن ڕاپرسییان دەکرد، هەموو جارێ ڕادیۆ و (T.V) ناوخۆی پارتی لە ڕانیە لە ڕیزبەندی یەکەمەکان بوون. لە ساڵانی (٢٠٠٦ بۆ ساڵی ٢٠٠٨) لە سنووری پشدەرو بیتوێن ڕاگەیاندنی پارتیمان پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی. لەو ساڵانەی بەندە لە دەڤەری پشدەرو بیتوێن، ئەرکی بەرپرسیاری ڕاگەیاندنم وەرگرتبوو، هەم بەرپرسی ڕاگەیاندنی(لق) بووم هەم سەرپەرشتی ڕادیۆ و (T.V) ناوخۆی زاگرۆس و دەنگی کوردستانم دەکرد. لەو ڕووەوە ویژدانم ئاسوودە بوو چونکە هەموومان بە پاکی و دڵسۆزی ئەرکی سەرشانی خۆمان ئەنجام دەدا. بەرپرس و کادرەکانی ناوەندی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی بیتوێن و پشدەر، (٤٥) کارمەند بووین. لیژنەی سەرپەرشتی بریتی بوون لە: ڕادیۆ- کاك خالیدی فاتحی، بەرپرسی تەلەفزیۆن- کاك محەمەد ئەحمەد بوو، محەمەد گەنجێکی بە توانا و دڵسۆزبوو، دارایی- کاك محەمەد عەبدوڵڵا بوو، لاوێکی دەرچووی زانکۆ بوو لە بەشی ئیدارەو ئابووری. ڕەنگە گونجاو نەبێ

ناوی هەموو کارمەندەکانی تر بنووسم، بەڵام پێویستە بگوترێ زۆربەی کادرو کارمەندەکان لە کەسانی دڵسۆزو پاك بوون، زۆربەیان لە بواری راگەیاندندا پسپۆری خۆیان سەلماند. لە ناوچەکەدا جۆرێك لە ڕکابەری راگەیاندن لە نێوان لایەنە سیاسییەکاندا دروست بوو. هەفتانە بەرنامەی نوێ و چالاکی هەمەجۆرمان پەخش دەکرد. لە شێوازی راگەیاندن دا هەندێك لایەن شوێن پێی ئێمەیان هەڵدەگرت. لە زۆر بەرنامەدا تەنانەت مۆسیقا و تایتلی بەرنامەکانیشیان وەکو ئێمە دادەڕشت. ئەو لاسایی کردنەوەیە لە راگەیاندن دا ئاماژەیەك بوو بۆ داهێنان و بەهرەی راگەیاندنی ئێمە، وەك دەڵێن لاسایی کدنەوەی باشترین شێوازی پیاهەڵدانە ...

سەخترین ئەرك ئەرکی زستان بوو، ستافی پەخشی(ماکۆك) سالآنە گرفتێکی گەورەیان هاتوچۆی رێگای ماکۆك بوو. رێگاکە بەبەفر دادەپۆشرا تا کۆتایی مانگی کانوونی یەکەم سەیارە نەیدەتوانی بگاتە بورجەکە. جگەلەوە لە وەرزی زستاندا هەورە تریشقە لە بورجەکەی دەدا و ئامێرەکانی پەخشی دەسووتاند. ماوەیەکی زۆر پەخشی رادیۆ وT.V دەوەستاند جەماوەری بینەرو بیسەر لە رێگای تەلەفۆنەوە گوشاریان دەخستینە سەر کە پەلە بکەین لە چاك کردنەوەی ئامێرە پەککەوتوەکە. زستانی ساڵی (٢٠٠٦) پەخشەکە سووتا بوو، تیمی تەکنیك لە ناوەندی تەکنیکی هەولێر ئامێرە سووتاوەکانی چاك دەکردەوە. یەکێك لە تەکنیك کارەکان کاك ئومید بوو لە بەشی تەکنیکی ناوەندی هەولێر، بە چاککردنەوەی زۆربەی ئامێرە سووتاوەکان رادەگەیشت، ناوبراو ئەگەرچی ئەندازیار نییە، بەڵام زۆر شارەزایە لە کاری ئامێری پەخش، بە قەدەر ئەندازیارێك لە کاری تەکنیکی و پەخش و راگەیاندندا ئەزموونی پەیداکردووە، بە دەیان ئامێری پەخشی ناوخۆیی دروستکردووەو چاك کردۆتەوە. کاك ئومید زۆر لە بەفرو رێگای ماکۆك دەترسا، بەڵام خاتری ئێمەی دەویست دڵی نەدەشکاندین، چەندان جار بە رێگای ماکۆك دا هەڵگەڕاوە. ئەو ساڵە رێگاکە بە تەواوی گیرا، دوو مەتر بەفر باری، ناچاربووین ئامێرە سووتاوەکە بە کۆڵ دابگرین و هەر بە کۆلیش سەری بخەینەوە سەر شاخی ماکۆك. رۆژانە لە بارەگای ناوەندی رۆشنبیری و راگەیاندنی بیتوێن پشدەر، راوێژمان لەسەر چۆنییەتی هەڵگرتنی ئامێری پەخشەکە دەکرد. ئەو ئامێرە پتر لە(٦٠) کیلوگرام دەبوو. هەڵگرتنی (٦٠) کیلو بۆ ماوەی کاتژمێرو نیوێك بە ناو دوو مەتر بەفردا، ئەویش لە هەورازی ماکۆك پیاوی خۆی دەویست!، بەدەم ئەو گرفتە دا مابووین، کاك عومەر عەبدوڵڵا بێگەلاسی لەگەڵ دایکی سۆران خاڵۆزای یەکترین، بەندەو کاك عومەریش ئاوەڵزاواین. کاك

عەمەر کوڕە جووتیارە لە ئیشوکاری ڕۆژانەدا کارامەیە، بەتایبەتی بۆ کاری هێزی بازوو. ناوبراو هاتە لام و وتی: ئەو هەموو گفتوگۆیە بۆ هێنانە خواریێ و سەر خستنی جهازی پەخشی(ماکۆك)ە؟ وتم: بەڵێ. وتی هیچ خەمت نەبێ، هەندێك خورماو خواردنم بۆ ئامادەبکەن، سبەینی جهازەکە دەهێنمە خوارەوە. بەیانی زوو کاك عومەرو کاك محەمەد ئەیوبی شۆفێر، ڕۆیشتن کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ گەیشتنە سەر چیای(ماکۆك). ناوبراو ئامێرە سووتاوەکەی لە بەتانییەك وەرپێچابوو بە کۆڵی دادابوو، هێنابوویەخواریێ. بە سێ کاتژمێر ئامێری پەخش گەیشتەوە رانیە. دەست خۆشیم لە کاك عومەر کرد. هاوەنە (١٢٠) ملیمەکەی سەردەمی پێشمەرگایەتیم هاتەوە یاد کە هێستر لە ژێریدا پەکی کەوتبوو، کەچی هاوڕێ حەسەن خدر بە قاعیدەوە هەڵیگرت بۆ سەر چیای مامەندە، کاك عومەر جووتیارێکی نەخوێندەوارو هەژارە کاك حەسەن خدریش پێشمەرگەیەکی نەخوێندەوار بوو، نەخوێندەوارەکانیش سووتەرۆیی شۆڕشن. کاتێ کە شۆڕش بە ئامانج دەگات ئەوانە پشتگوێ دەخرێن، چونکە نەخوێندەوار کاری ئیداری و حوکمڕانی پێ ناکرێت، بەڵکو خەڵکانی تری خاوەن بڕوانامە دەبنە هەمە کارە، خۆش بەختانە کاك حەسەن پشتگوێ نەخراوە، بەڵام کاك عومەر هێشتا مووچەخۆری گرێبەستە.

کە ئامێری پەخشی چاککرایەوە بە هەمان ڕێگادا بە کۆڵی کاك عومەر سەرخرایەوە. کاك ئومێد و کاك ئەحمەدی تەکنیکار لەگەڵ ئاراسی رەحەمەتی، بە کامێرە ڕێڕەوی شکاندنی بەفری هەورازی ماکۆکیان ڕووماڵ کردووە لە خوارەوە تا سەریێ.

ئەو چەند ساڵەی راگەیاندن بۆ بەندەو بۆ کارمەندەکانی تری راگەیاندن لە بیتوێن و پشدەر ئەزموونێکی گرینگ بوو، بۆ ئەوەی بیسەڵمێنین بە نەفەسی پێشمەرگایەتی خزمەت دەکەین، ئەویش لە سەردەمێك دا کە دیاردەی گەندەڵی و لرف لێدانی سەروەت و سامان وەك دیاردەیەکی ترسناك هەڕەشە لە ئەزموونی کوردستان دەکات.

## ناکۆکی و کاردانەوە:

مرۆڤ چۆن پەروەردە و گۆشکرابێ هەروا دەمێنێتەوە. (سینۆهە) دەڵێ: **هەموو شتێك گۆڕانکاری بەسەردا بێت سروشتی مرۆڤ گۆڕانی بەسەردا نایەت.** ئێمەش جۆرێك پەروەردەکراوین یا باشتر وایە بڵێین تەبیعەتمان وایە هەق و ڕەق دەدوێین، کە ئەم هەق و ڕەقیە

لە هەموو سەردەمێك دا شیاو بوو بێت لەم سەردەمەدا شیاو نییە. ڕەسوڵ هەمزە تۆف دەڵێ: **کە بتەوێت شەڕ لەگەڵ کەسێکدا بکەی کە لەسەر بینایەك ڕاوەستاوە خۆت لە خوارەوەی، هەم خشتی ئەو کە دەیهاوێژێت، هەم خشتی خۆت کە ڕووەو ئەو دەیهاوێژێت بەر خۆت دەکەوێتەوە**. ئێمەش بێ ئەوەی بایەخ بەو پەندە بدەین وامان لێهات. لە کۆبوونەوەکانی (لقی١١) بەشداردەبووم، زۆر جار لەسەر کاری نابەجێ و چەوت لەگەڵ هەندێك کەس تووشی کێشە دەبووم. دەیان جار بەرەنگاری ئەو خەڵکانە دەبوومەوە کە دوو سەرە کاریان دەکرد. بۆ نموونە مامۆستای ئایینی هەبوو لە ژێرەوە لەگەڵ گروپە ئیسلامییەکان کاری دەکرد و، مانگانە مووچەی لە پارتی وەردەگرت و خۆیان بە لایەنگری پارتی دادەنا. زۆر جار لە کۆبوونەکان دا بە سەربەستی ڕای خۆم لەسەر ئەو کەسانە دەردەبڕی. دیارە ئەوانیش هەڵوێستی منیان زانی بوو منیان بە شیوعی دەزانی، گوشاریان دەخستە سەر لایەنی پەیوەندیدار بۆ ئەوەی لە ڕاگەیاندن نەمێنم. لە ڕۆژی هەڵبژاردن، کاتی تێ هاویشتنی پسولەی دەنگدان بۆ ناو سندوقەکان، کاك عومەر هەمزە کارگێڕی (لقی١١) وەك ڕێز لێنان، ئەو مەلایە وە پێش خۆی دەدات، بە ڕێکەوت ئەو مامۆستایە پسولەکەی لە دەست بەردەبێتەوە، کاك عومەریش پسولەکە هەڵدەگرێتەوە، کە سەیری دەکات دەبینێ (مەلا) دەنگی داوە بە کۆمەڵی ئیسلامی، کاك عومەر دەڵێ: مامۆستا تۆ دەنگت داوە بە (کۆمەڵ)!، (مەلا) زۆر بەخۆدا دەشکێتەوە زمانی دەبێتە تەڵەی تەقی و...؟!

بەرامبەر هەندێ هەڵسوکەوتی تر هەمیشە نیگەران بووم پێم ناخۆش بووە(لقی١١) گلەیی لێ بکرێ. حەزم دەکرد پارتی پێگەی جەماوەری بە هێز بێت. لانی کەم ڕێز لە جەماوەری ڕەشوڕووتی پارتی بگیرێت. زۆر جار لەسەر خەڵکی هەژارو غەدەر لێکراو لەگەڵ بەرپرسی لق و هەڤاڵانی تر تووشی مشت ومڕ بووم. ڕۆژێك لە ڕۆژان لەسەر خواستی شەخسی خۆم گرفتم نەبووە، بەڵکو هەمیشە کێشەی من لەسەر خەڵکانی غەدر لێکراو بووە. مشت و مڕەکە بوو بە دەمەقاڵێ لەگەڵ بەرپرسی یەکەمی(لق)، کە زۆرینەی کارگێڕو ئەندام لق و کادرەکانی خوارەوە گلەیان هەبوو ناڕازی بوون، بەندەش یەکێك بووم لەو ناڕازییانە. کێشەکە گەیشتە مەکتەبی سیاسی و جەنابی سەرۆك بارزانی. لە کۆبوونەوەیەکی بەرپرس و ستافی لق و مەکتەبی سیاسیدا، بەندەو زۆربەی کادرەکانی لق ڕای خۆمان بەرامبەر بە بەرپرسی لقی ئەو کاتە دەربڕی، کۆبوونەوە کە تەواوبوو. جارێکی تر بە ئامادەبوونی جەنابی سەرۆك و مەکتەبی

سیاسی و ئەندام لق و کارگێڕەکان و بەرپرسی لق لە پیرمام کۆبوونەوە، بەندە بانگ هێشت نەکرا بووم، لە جیاتی ئەوەی بانگ بکرێم بۆ کۆبوونەوەکە نامەی(نەقل) بوونم درایە دەست، زۆر پێم ناخۆش بوو کەوا بە خێرایی و بە پەلە فەرمانی نەقلم دەرکراوە. لە نامەی نەقل بوونەکەم نەنووسرابوو نەقل بکرێم بۆ کوێ؟ نامەی نەقل بوون و نامەیەکی تری توندم بۆ کاك ئازاد بەرواری نووسی، ناوەرۆکی نامەکەش جۆرێك بوو لە رەخنەی توند لە کاك ئازاد بەرواری... لەبەر ئەوەی ناوبراو خۆشی لە ناو پارتیدا بە سەرکردەیەکی راشکاو و هەق و رەق ناسراوە، تەحەمولی نامەکەی منی کرد. بەندەو کاك جەبار تاهیرو خوشکە ناسکە کارگێڕانی لق لە (لقی١١) نەقڵ کراین. بەندە بۆ مەکتەبی ناوەندی راگەیاندن، کاك جەبار بۆ مەکتەبی هەڵبژاردن، ناسکە خان بۆ مەکتەبی رێکخراوە جەماوەرییەکان. ئێمە هەرسێکمان نامەیەکی هاوبەشمان بۆ مەکتەبی سیاسی نووسی، وێنەیەکیشمان نارد بۆ جەنابی سەرۆك بارزانی. لە نامەکەدا پابەند بوونی خۆمان دووپات کردەوە بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان و رێبازی بارزانی. ڕامان گەیاند ئامانجمان بەرژەوەندی پارتیمان بووە، نەك سەرپێچی و زیادەڕۆیی لە فەرمانی سەرۆك و مەکتەبی سیاسی.

پێم وایە دڵسۆزی و هەق و ناهەق تێکەڵ بەڕای تر دەبن هەر یەکەو لە روویێکەوە راستییەکان دەبینێ، ئێمە راستگۆ بووین لەگەڵ فیکرو باوەڕی خۆمان ئێستاش پێم وایە بەرپرسەکان دەبێ لە بەرزاییەوە نەڕواننە خەڵکی خوار خۆیان، پێویستە بێنە سەرخاك و خاکی بن بۆ ئەوەی خاکیانە هەقیقەت ببیستن و وەربگرن، بۆ ئەوەی دیوارێك لە نێوان سەرکردەو جەماوەری خوارەوە دروست نەبێ.

## کێشەی چینایەتی:

دەڤەری پشدەر لەگەڵ تەواوی کوردستان جیاوازە، یەکێك لەو تایبەتمەندیانەی پشدەر کێشەی چینایەتی بووە، ئاغا و دەرەبەگەکانی پشدەر دەسەڵاتی تەواویان هەبووە، دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی دەڤەری پشدەر لەشێوەی نیمچە دەسەڵتێکی سیاسی لەناوچەکە دا حوکمرانیان کردووە، دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی ئاغا میراودەلیەکان تاکو شارەزوور و نۆکانی رۆژهەڵاتی کوردستان بڕی کردووە، لەسەر بنچینەی سیستەمێکی عەشایری رێکخراو باڵا دەستی دەرەبەگایەتی حوکمڕانی کردووە، لەسەردەمی ڕژێمە هاوچەرخەکانیشدا دەسەڵاتی

دەرەبەگایەتی هەر باڵادەست بوو، جگە لەو چەند ساڵەی دوای شۆرشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ تەواوی ڕژێمەکانی عێراق لەبەرژەوەندی ئاغا و دەرەبەگەکان بوون. لەدوای بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلول بە ڕێبەرایەتی بارزانی نەمر قۆناغێکی نوێ لە هاوسەنگی کۆمەڵایەتی دروست بوو لەبەرژەوەندی جووتیار و هەژارەکانی ناوچەکە. بەدرێژایی ساڵانی شۆرشی ئەیلول زۆربەی ئاغاو دەرەبەگەکانی ناوچەی پشدەر چەکی خیانەتیان دژی شۆرش و بزووتنەوەی شۆرشگێری و کوردایەتی هەڵگرتبوو، کاتێك شۆرشی ئەیلول نشوستی هێنا ئاغا سەرۆك جاشەکان دەیان جووتیاری شۆرشگێرو بەهەڵوێستیان شەهیدکرد. لەدوای شۆرشی ئەیلول کێشەی چینایەتی دەڤەرەکە درێژەی هەبوو، کێشەکە فۆرم و قالبێکی تری وەرگرت، هەم لەناو شۆرشی چەکداری نوێ، هەم لەناو ریزەکانی جاش و فەوجە چەکدارەکانی ڕژێمی عێراق دا خانەبەندی چینایەتی دروست بوو بۆ نمونە: لەناو شۆرشی نوێ دا جگە لە حزبی شیوعی و کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و حزبی سۆسیالیستی کوردستان لەناو خودی حزبەکانیشدا خانەبەندی چینایەتی ئاغا و جووتیاران شکل گرتووو بوو، کاك حاجی حاجی برایم لەناو حزبی سۆسیالیست دا لە شۆرشی نوێ وەکو ڕکەبەرێکی سەرسەختی ئاغا میراودەلیەکان ناسرابوو، (٥) کەس لە بنەماڵەی کاك حاجی بەدەستی ئاغاکان کوژران، لە ئاغاکانیش ژمارەیەك کوژران. ململانێی چینایەتی دەڤەری پشدەر لەقالبی ململانێی چینایەتیش دەرچوو بوو خوێنێکی زۆری تێدا ڕژا، لەناو ڕژێم و لەناو شۆرش دا شەڕو خوێن ڕێژی درێژەی هەبوو، بۆ نمونە لەناو شۆرش دا هێزی چەکداری ئاغا و کوێخاکانی ناوچەکە دیار بوو، جگە لە ئەرکی پێشمەرگایەتی کە ئەرکێکی نەتەوەیی بوو، خواست و خولیای چینایەتیش ڕەچاو دەکرا، لەڕووی پراکتیك و کرداریشدا خواستی چینایەتی ڕەنگی دەدایەوە. کوێخاکانی ناوچەکە وەکو کوێخا و ئاغا مەنگوڕەکان لەدژی ڕیفۆرمی زەوی و زار پەنایان بۆ شاخ برد بوو لە دژی جووتیاران چەکیان هەڵگرت ژمارەیەك جووتیار خوێنیان ڕژا بەدەستی ئاغاو دەرەبەگەکانی ناوچەکە. لەناو ریزەکانی جاش و فەوجە خەفیفەکانی ڕژێمیش دا بەهەمان شێوە بوو، فەوجی ئاغا و جووتیارەکان جیاواز بوو بەپێی خانەبەندی چینایەتی ڕێکخرابوو، ڕژێم لەجیاتی چارەسەرکردنی کێشەکە سوودی لە کێشەکە وەردەگرت بۆ بەرژەوەندی سیاسی، لەناو شۆرشی نوێشدا بەشێوازێکی تر سوودیان لەململانێی چینایەتی ناوچەکە وەردەگرت. لەدوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ جارێکی تر کێشەکە سەری هەڵدایەوە، کێشەی چینایەتی دەڤەری پشدەر لەسەرەتای نەوەدەکانەوە

قۆناغێکی نوێی بەخۆوە گرت، ئاغا و دەرەبەگەکانی دەڤەری پشدەر سوودیان لە بۆشایی دەسەڵاتی سیاسی بەرەی کوردستانی وەرگرت، ئەو دەرفەتەیان قۆستەوە بۆ ئەوەی هەموو یاساکانی ریفۆرمی زەوی لە ناوچەکە ڕەتبکەنەوە، لەکاتێکدا گەمارۆیی ئابووری دەوڵەتان لەسەر عێراق بوو، ڕژێمی عێراقیش گەمارۆی ئابووری لەسەر کوردستان دانا بوو، حوکمڕانی ئەزموونی ساوای هەرێمی کوردستانیش هێشتا لە دۆخێکی دەڵەمی و سەرەتایی دا بوو. گرانی و قاتی و نەبوونی بوو ئاردو دانەوێڵە بۆ جووتیاران و خەڵکی هەژار شتێکی ژیاری و چارەنوساز بوو، کە تەنها لەڕێگایی زەوییەکانیانەوە وەدەست دەهات، لەو بارودۆخە نالەبارەدا ئاغاکان ڕێگایان نەدەدا جووتیارەکان بگەڕێنەوە سەردێهاتەکانیان زەوی و زاری خۆیان ڕەنێوبێنن. لەساڵی **١٩٩٣** چوو بووم بۆ گوندی (دۆڵەبەفرە) بۆ ئەوەی گفتوگۆ بکەین لەگەڵ کوێخا عەلی (قەلاویٚ) لەسەر کێشەی زەوی و زاری (بەستەستێن)ی سەریٚ، کوێخاکانی قەلاویٚ کێشەیان لەگەڵ جووتیارەکان هەبوو، هەر ئەو ڕۆژەش جووتیارێکی گوندێکی دەوروبەری دێهاتەکانی (قەڵادزیٚ) هاتبوو بۆ لای کاك سەلیمی حەمە ئاغا، جووتیارەکە بە کاك سەلیمی دەگوت: بەنیوەکاریش بێت ئامادەم بگەڕێمەوە سەرگوندەکەی خۆم کە ڕێگام پیٚ بدەیت؟ کاك سەلیم ئەگەر چی بە پیاوێکی شۆرشگێرو بەویژدان ناسرابوو، کەچی دەماری ئاغایەتی ئەقلیەتی نەگۆری بوو وتی: ڕێگاتان پیٚ نادەم بگەڕێنەوە! وێدەچوو جووتیارەکە پێشتر دانیشتووی ئەو گوندە بووبیٚ کە کاك سەلیم ئاغا گوندی بوو. منیش رووم لەجووتیارەکە کرد وتم بۆچی پرسی بە کاك سەلیم دەکەی؟ خۆتان چەکدار بکەن و بگەڕێنەوە سەرگوندەکەتان. کاك سەلیم ئاغا لە کاك بایزی مام ڕەسوی پرسی کە پێکەوە بووین بۆ دیداری کوێخا عەلی وتی: کاك بایز ئەو برادەرە کیٚ یە؟ کاك بایز گوتی: ئەوە (**محەمەد خدر**)ە ئەویش گوتی ئەو (**محەمەد خدر**)یە کە کوێخا عەلی زۆر باسی دەکات دەڵیٚ ئەو شیوعی یە، دەیان وتاری لەسەر کێشەی زەوی و زار لە ڕۆژنامەکان نوسیوە. وتی کاك **محەمەد** ئەو ملکانەی هی خۆمانن، ڕژێم لێرە نەماوە یاسای ریفۆرمی زەوی لەناوچەکە کۆتایی پێهاتووە... منیش وتم کاك سەلیم ئەو بەردەی هەڵتانگرتووە بیکێشن بەسەری جووتیاراندا خۆتان دەکەونە ژێرییەوە...لەشکری برسی و هەژاران بەکەس بەرزەند ناکرێت...بەقسەی من پێکەنی ..کەچی هەموو مانگێکی پیٚ نەچوو سەدان پێشمەرگەی کورە جووتیار بە جیاوازی بیروباوەڕی سیاسی لەسەر ریزبەندی چیتایەتی یەکیان گرتەوە، لەڕۆژی **١٩٩٣/٥/٢٣**

پەلاماری ئاغاکانیان دا هەموو دێهاتەکانی دەڤەری پشدەر پاکسازی کرا لە نەفوز و دەسەڵاتی ئاغاکان...ڕاپەڕینی جووتیارانی دەڤەری پشدەر وەرچەرخانێکی چینایەتی و نەوعی بوو، لەو ڕاپەڕینە چینایەتییەدا جووتیارانی پارتی و یەکێتی و شیوعی و سۆسیالیست و ئیسلامی خۆڕسکانە یەکیان گرتبوو بەرژەوەندی چینایەتی خۆی فەرزکرد بەسەر ئیرادەی حزبایەتیدا..ئەگەر چی ئەو ڕاپەڕینە هەندێك زیادە ڕۆیی تێداکرا کە سووتان و تالآنکردنی بنەماڵەی ئاغاکانی لێ کەوتەوە...بەڵام ئەو زیادە ڕۆییەش بەشێك بوو لە ڕق و کینەی چینایەتی و تۆڵەساندوە لە بەرامبەر ئەو ستەمە چینایەتییەیی ئاغاکان بە درێژایی مێژوو لە دەڤەرەکە کردویانە پەیڕەویان کردووە.ئەو ساڵە دەیان وتارم لەسەر کێشەی چینایەتی دەڤەری پشدەر لەگۆڤار و ڕۆژنامەکانی حزبی شیوعی بڵاوکردەوە. ڕاپەڕینی جووتیاران لەسنوری عەشیرەتی مەنگوڕان هێدی تر بوو، هەمیشە ئاغا و کوێخاکانی مەنگوران گونجاوتر بوون لەگەڵ جەتیاران دا. لەناو عەشیرەتی مەنگوڕندا ڕاو بۆچونی عەلی ئاغا لەسەر سیاسەت و پاشەکشێی مەیدانی شەڕ لە گوێی بەتەمەنەکان ئاشنایە، بۆنمونە دەیگوت: ((سیاسییەکان بە درۆیان دەڵێن سیاسەت، بەهەڵاتنێ دەڵێن ئینسحاب)) لەبواری کۆمەڵایەتی ڕەدوکەوتن و گەورە بەگچکە و بنەتۆو هەبوو، هەمو ئاسنکارییەك دەکرا بۆ پێکهێنانی خێزان، زۆر جار وارێك کەوتووە بۆ ڕەدوکەوتنی ژنێ بە مێردیش ئەو جۆرە سولحە کراوە، کێشەی کۆمەلآیەتی لێ نەکەوتۆتەوە، (بنە تۆو) بنەتۆوی دەستەواژەییە جووتیاران لەچاندن و ڕەنێوهێنانی گەنم و دانەوێڵە وەریان گرتووە. بنەتۆو بەو وەچەیە دەگوترا کە هێشتا لە ناو رحمی دایکیدا نەڕسقاوە،لە لایەن ریش سپی و پیاوماقووڵان ئاسانکاری دەکرا بۆ پێکهێنانی ژیانی هاوبەش. ڕەدوکەوتن یا بەدواکەوتن ئاسانترین شێوازی پێکهێنانی خێزان بووە لەناو عەشیرەتی مەنگوڕ و مامەش دا، ئەگەر ڕەدوکەوتن نەبا زۆر ئەستەم بوو خەڵکی هەژار ژیانی خێزانی پێك بهێنێ، پەیوەندی خێزانی لەناو عەشیرەتی مەنگوڕدا زۆر بەهێز بووە خەڵکی عەشیرەت و تیرەو بەرەباوك وەکو یەك خێزان ژیاون، لەکاتی کوڵ و کانی و خۆشووشتن و کارو کاسپی، بەکۆمەڵ بووە. لەناوچە کوێستانییەکان (تەندور) دا دەخرا شەوانە هەموو خێزانەکە لەشێوەی بازنەیی لەناو لێفەو پێخەفی نووستندا لاقیان لە لاقی یەکتر دەهێشت، لەسەر شێوازی لەتەرەدانی ڕستە توتن دەخەوتن...ژیانی عەشیرەتی مەنگوڕ و مامەش زۆر سادە بووە، هەژاری و نەبوونی زیاتر پەیوەندی خێزانەکانی توندو تۆڵ تر کردووە، ئەوانەی ئیرو بوون و

توانای داراییان باش بوو، هاوکاری خزم و دراوسێیەکانی دەکرد، لەباوك و باپیرانمان دەگێڕنەوە دەڵێن: لەساڵانی گرانیدا(١٠) خێزان بوونەوە بەخێزانێك بۆ ئەوەی بەکۆمەڵ و هەرەوەزی ژیانی رۆژانە دەربازبکەن. عەشیرەتی مەنگوڕ لەناو موکریاندا عەشیرەتێکی گەورەیە بەشی موکریانی لە کوردستانی باشوور و ڕۆژهەلات جێگیرن. ساڵی ١٩٩٨ لەسەر ئەرکی بزووتنەوەی جووتیاران نامیلکەیەکم بە چاپ گەیاند بە ناوی (چەمکێك لە ستەمی چینایەتی) بەشێك لە ڕووداوەکانی ئەو دەڤەرەی گرتۆتەخۆ سەبارەت بەکێشەی چینایەتی. چیرۆکی ڕووداوەکانی ئەو نامیلکەیە لە جووتیارە بەتەمەنەکانی دەڤەری پشدەر وەرگیراوە.

## خاپەرۆ:

خاپەڕۆ چییە و بە چی دەگوترێت؟، بەندە کوڕە جووتیارێکی هەژار بووم، لە منداڵییەوە لەگەڵ مامم دەڕۆیشتین بۆسەر جێخونێ، جێخونی گەنم و جۆو نیسك و نۆك هەر جۆخینی پێ دەگوترێ، جۆخین کرشەی لەسەر کۆدەکرێتەوە، کرشە بۆ کۆیی گەورە بە کار دێت گەنم و جۆو گیا دەکرێتە باقە، یا کلێشە دواتر دەگوازرێتەوە بۆ سەر جۆخێنی لەوێ دەکرێتە کرشە، گەنم یا دانەوێڵەی تر کە کرایە(کرشە) گێرە دەکرێ، جاران گێرە بە گاجوت و وڵاخە بەرزە دەکرا دواتر جەنجەر پەیدابوو، ئێستا گەنم بە دەراسە دەدورێتەوە، وەك جاران ناکرێت بە کرشە و گێرەی ناوێ، ئەو پێشەکییە بۆ ئەوە بوو باس لە خاپەرۆ بکەین، خاپەرۆ بەو دەنکە گەنم و دانەوێلانە دەگوترێ، کە لە کاتی شەنەکردندا ناکەونە سەر مالۆسکی گەنمە شەنەکراوەکە، بەڵکو تەرە دەبێ بۆ ناو لۆدە کایەکە بە دەورەی لەسکی سورە کۆیی گەنمەکە پەرت دەبێ، کاتێ دانەوێڵەکە لە کایەکە جیادەکرایەوە دەکرا بە(کۆ) لە شێوەی گومبەزی مزگەوت، ئینجا بۆ ئەوەی لە چاو نەچێ جووتیارەکە پاشەڕۆی (واتە تەرسی) رەشەوڵاخ یا گوێدرێژی بەسەر دارێکی تیژدا دەکرد و، لەسەر(کۆ) گەنمەکەی دەچەقاند. جووتیارێکی شارەزاو دەنگ خۆش بانگ دەکرا بۆ ئەوەی بەرهەمی جۆخینەکە بە تەنەکە بپێوێ، لە کاتی پێواندا بە ئاوازێکی خۆش دەنگی هەڵدەبڕی، دەیگوت: ئەوە یەك خوایە لە تۆ بەرەکەت، ئەوە دوو بەرەکەت لە تۆ، ئەوە سێ بەرەکەت بڕەخسێ، ئەوە چوار بەرەکەت لە لای محەمەدی نازدار...هتد. دوا ئەوەی هەموو جۆخینەکە دەپێوێرا یەك بە دە زەکاتی لێ دەردەکرا، زەکاتەکە دەدرایە خەڵکی هەژار- یا دەدرایە شۆڕش بەتایبەتی لە کاتی شۆڕشی ئەیلولدا شۆڕش وەری دەگرت. کاتێ

بەرهەمی جۆخینەکە کۆدەکرایەوە، ئەو دانەوێڵەیەی لاواز و پوچەك بوو، لە شارەی مالوسکی سورەی گەنمەکە دەترازا و ڕەگەڵ وردە (کایەکە) دەکەوت پێیان دەگوت گەنمی لابا. ئەو گەنمە پتر بۆ کڕینی میوەوو دۆشاوی پایزان بەکاردەهات کە لە وەرزی پایزاندا دۆشاو فرۆش و ترێ فرۆش دەهاتنە گوندەکان کە دانەوێڵەکە بە لاباوە دەگوازرایەوە. (کا)یەکە دەکرا بە لۆدە، لۆدە(کا)ش لە گۆڕی مرۆڤ دەچوو تەنیا کێلە بەردی نەبوو. تارمی (کا) یا لۆدە(کا) نەرم بوو وەك ئەسفنج، زۆر جار جووتیارەکان کاتی مانەوەیان لەسەر جۆخین، لە ترسی مێشولەو تەپۆ خۆیان لە ناو لۆدە(کایە) کە دەخست. دوا ئەوەی کایەکە دەگوازرایەوە، جووتیارە هەژارەکان ئەوانەی پێیان دەگوترا(قەرە)، واتا ئەوانەی هیچ زەوی و زاریان نەبوو سوودی لێ وەربگرن، بە ناچاری ئەو دەنکە گەنمانەیان کۆدەکردەوە، کە لە پاش هەڵگرتنی بەرهەمی جۆخینەکان لە کون و کەلەبەری جۆخینەکان بەجێدەما. بۆ نموونە جووتیارێکی هەژار دەیگوت ئەمساڵ(١٠) خاپەرۆم کۆکردۆتەوە، تا باراشێکم بۆ منداڵەکانم پەیداکردووە. ژیانی بەندەش لە دەنکە گەنمە خاپەرۆکان دەچێ، بەندە لە تەمەنی دووساڵیدا باوکم مردووە، خۆم و دوو خوشکم ئامان و فاتمە بۆ دایکە کلۆڵەکەم بەجێماوین، فاتمە تەمەنی یەك ساڵ بووە وەکو دایکم دەڵێ شیرەخۆرە بووە، ئامان لە هەردووکمان گەورەتر بوو تەمەنی (٣) ساڵ بووە، ژیان و گوزەران لە پەنجاکانی سەدەی رابردوودا زۆر سەخت و گران بووە. نان پەیداکردن و بژێوی خێزان بۆ پیاوان زەحمەت بوو چ چای(ئافرەت)، دایکم چەند ساڵێك بە کوێرەوەری و هەژاری سەرپەرشتیمان دەکات، دواتر خەڵکانی خێرخوازو برادەرەکانی باوکم هەوڵدەدەن قەناعەت بە مام برایمی مامم بکەن، دایکم مارە بکات، مام برایم وەکو خۆی دەیگوت: زۆرم پێ ناخۆش بوو براژنی خۆم مارە بکەمەوە، بەڵام لەبەر خاتری منداڵەکان ناچاربووم پێ لە جەرگی خۆم بنێم و ئەو کارە بکەم. هەموو جارێ دەیگوت لەبەر منداڵەکان ئایشم مارە کردۆتەوە. دیارە ئەو بەدبەختەش خواست و ئارەزووی خۆی هەبووە، کە بە ئارەزووی خۆی هاوسەری ژیانی دەست نیشان بکات و هەڵبژێرێت، بەڵام بۆ ئەوەی ئێمە سەرگەردان نەبین ناچاربووە دایکم مارە بکاتەوە، لەو رۆژەوە کە چاوم کردۆتەوە هەر مام برایم بە باوکی خۆم زانیوە، هەم باوك بووە وهەم مامم، بەڵام هەمیشە پێم گوتوە مامە، تەمەنی منداڵی و مێردمنداڵی بەندە بۆ خۆی چیرۆکێکی درێژە، بەو پێیەی خێزانەکەم بوو بە دوو خێزان دایکم منداڵی تری پەیدابوو، ژمارەی خێزانەکەمان زۆر بوو. ئەو کاتە بەرگریکردن لە منداڵ بوون نەبووە، ساڵانە ژنان سك بە دوای سك دا

وەچەیان دەخستەوە، ئەو ژنانەی لە وەچەخستنەوە کارامە بوون، بە نموونە دەهێنرانەوە بەتایبەتی لە کانییە ژنان، ئەو ژنانەش منداڵیان نەدەبوو و نەزۆك بوون، لەسەر گۆڕستان و پیاو چاکان خێریان بۆ دەبەشرایەوە بۆ ئەوەی سك پڕ بن و وەچە بنێنەوە. دایکم لەو ژنانە بوو هەموو ساڵێك منداڵێکی بووە، خێزانەکەمان بوو بە دوانزە کەس. ئەو دایکە هەژارەم رۆژانە لانکەی دەبردە بەر بەری دروێنە بۆ ئەوەی پشتوان لەدوای مامم بکات، پشت و واتا هەڵگرتنەوەی ئەو(سواڵە) گەنمانەی پاڵە لە دوای خۆی جێی دێڵێ، پشت و کێش هەم سواڵەکانی کۆدەکردەوە هەم پشتوی دەکردن لە پەرێزەوە بۆسەر جۆخین. هەڵگرتنی کۆڵەپشتی گەنم لە دەست هەموو کەس نەدەهات، پشتوە گەنم بە هۆی دانەکەیەوە زۆر قورسە، بەتایبەتی ئەگەر گەنمەکە ساڵەکەی بە باران و دەنکەکانی قەڵەو بووبێت... بەندەش لەوێ رۆژێوە کە دەستی چەپ و راستی خۆم ناسیوە لە ناو ئەو کوێرەوەرییەدا گەورە بووم. بەیانیان کاتژمێر چواری بەیانی دایکم زووتر لە خەوی هەڵیدەستاندم بچم جووتە(گا)یەکەمان ببەمە لەوەڕێ، (گا) لەوەوڕاندن بەیانیان زوو بوو، تا جووتیار دەهات دەبوو جووتە(گا)ی جووتکەر تێر بکرێن، بەتایبەتی لە وەرزی بەهاران دا. رەشەوڵاخ بەهاران دەریخێنێ پاشەرۆکەکەی (شلە). بەیانییەك لە ژێر کلکی(گا) زەرد راوەستا بووم، لە ناکاو(گا) زەرد پەڵە ریخێکی پێدا کردم لەسەرمەوە بۆ دامانم بوو بە ریخ، بەڕاکردن گەڕامەوەماڵەوە دایکم بە پەلە ریخەکەی شووشتەوەو جلەکانی لێ گۆڕیم. هەر(گا) لەوەراندن نەبوو، رۆژانە کاتێ لە قوتابخانە دەگەڕامەوە دایکم دەیگوت رۆڵە خێرا نانەکەت بخۆ برۆ بەرگایی بۆ مامت بکە. بەرگایی هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ ئەو گایەی جوتی پێ دەکرێ، بەرگایی بۆ ئەو(گا)یە دەکرێ کە تازە فێری جووتکردن کراوە، ئەو گایەش پێی دەگوترێ(کۆڵیە) یا خەرتە. زۆرجار لەبەر نە بوونی گاجووتی تەواو، گاجوتێك و گوێدرێژێك بەیەکەوە لە ژێر(نیر) دەکران و جوتیان پێ دەکرا. کەر وەکو(گا) بە هێزو شارەزا نییە لە جوت کردن، لەبەر ئەوە جووتیارەکان ناچاربوون منداڵێکی وەرگێرکە بکەنە گاگێرەوە، ئەوەیگاگێرەوە بوو ریشمەی کەرەکە یا ئەوساری (گا) کۆڵیەکەی رادەکێشا، بۆ ئەوەی لە خەتێ لا نەدات. بەندە رۆژانی خەلەو خەرمان ئەوە کارم بوو. لە وەرزی بەهاران زۆر ئارەزووم بوو لەگەڵ برادەرەکانم بچم بۆ جۆگای سیفۆن یا لە چۆمی بەستەستێن دا مەلە بکەم. بەڵام لەبەر بەرگایی دەرفەتم نەبوو بچم. رۆژانە لە گوندەکەی خۆمانەوە لەگەڵ برادەرەکانم دەڕۆیشتین بۆ قوتابخانە لە سەنگەسەر، ئەو رۆژانەی سەرما بوو لە

ماڵی پوور ئەستی و مام حوسێن دەبووم لە سەنگەسەر، زۆر جار کوڕە کوێخاکانی گوندەکەمان کە وێرای ئێمە دەهاتنە قوتابخانە شەڕیان بە کوڕە جووتیارەکان دەفرۆشت، بەندەش یەکێك بووم لەو کوڕەجووتیارانە. ئەگەرچی زۆربەی جار لێدانم دەخوارد یا بە هۆی گەلەکۆمەکی پێیان نەدەوێرام، چونکە ئەوان بە تەمەن و قەدوباڵا لە من گەورەتر بوون، بەڵام هەرگیز لێم قبوڵ نەدەکردن. زۆر جار سەریان دەشکاندم لە ماڵەوەش باسم نەدەکرد. دەستم دەکردەوە بەڵام کوڕە کوێخاکان زۆر بوون من تەنها بووم، کوڕە جووتیارەکانی تر نەدەوێران رووبەڕووی کوڕە کوێخاکان ببنەوە...بەیانییەکی بە تەنها بووم بەرەو قوتابخانە دەڕۆیشتم، لەسەر لێواری چۆمی بەستەستێنی کە رێگای سەنگەسەری پێدا دەرۆیی، حەمە ئێرانی رێگای پێ گرتم وتی هەتیوە چۆن زات دەکەی رووبەڕووی کوڕە کوێخاکان ببیەوە، هەنگڵی گرتم بەرزی کردمەوە بە ئەرزیدا کێشام. حەمە ئێرانی نۆکەری دیوەخانی کوێخاکان بوو، ئەو لێدانەی حەمە ئێرانی ئەوەندەی تر رِق ئەستوورتری کردم بەرامبەر کوڕە کوێخاکان. شەڕی بەندەو کوڕە کوێخاکان بەردەوام بوو تا بە یەکجاری وازم لە خوێندن هێنا. کاتێ چوونم بۆ قوتابخانە لە حوجرەی مزگەوتیش دەرسی قورئانم دەخوێند. لە هەردوو بوارەکە زۆر وریاو زیرەك بووم، کە بەیانیان ریز دەبووین لە قوتابخانە مامۆستا محەمەد لە ریزێ دەری دەهێنام گۆرانی پێ دەگوتم، نازانم هۆیەکەی ئەوە بوو دەنگم خۆش بوو، یا هەر حەیرانی پێ خۆش بوو، هەموو رۆژێ حەیرانێکی پێ دووبارە دەکردمەوە، حەیرانەکە حەیرانی سعدی عەلی بوو ئەو کاتە زۆر باو بوو...

مامۆستا عومەر کاکەرەش مامۆستا بوو زۆری خۆش دەویستم، هەمیشە لە ناو قوتابییەکان منی بە نموونە دەهێنایەوە. بەڵام مدیری قوتابخانەی سەنگەسەر ناوی مامۆستا سالح بوو، پێم وابێ سالح عائیلەیان پێ دەگوت، کە لە قوتابییەکان تووڕەدەبوو باش و خراپی بەیەکەوە دارکاری دەکرد، جارێك بەندەش بە ناهەق دارکاری کرام. ئەو ناهەقیەم پێ قبوڵ نەکرا وازم لە قوتابخانە هێنا. ئەو وازهێنانە وەکو بەردێك وابوو لە ئەژنۆی خۆم دا، تەمەن رۆیشت و دەرفەتێکی تر دروست نەبۆوە بگەڕێمەوە قوتابخانە، هەر چەند لە خوێندنی حوجرەی مزگەوت لە خزمەت مامۆستا مەلا سەعید مەلای گوندەکەمان بەردەوام بووم، دوایساڵێك لە خوێندنی حوجرەش دابڕام. بە هۆی ناکۆکی نێوان باڵەکانی شۆڕشی ئەیلول، بارودۆخی سیاسی لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە ئاڵۆز بوو، شەڕ و ئاژاوە سەرانسەری کوردستانی گرتەوە.

دەیان شەڕ و داستانی گەورە لە کۆتایی شەستەکان لە دەڤەری پشدەر لە نێوان شۆڕش و جاش و سوپای داگیرکەر بەرپابوو. بە ناو بانگترین داستان بە داستانی عومەرئاغا ناوبانگی دەرکرد بوو. داستانی دۆڵی شەهیدان و زینویٚ ماخۆبزنان بوو، جڵەوی پێشڕەوی سوپای داگیرکەری گرت، ئەمەش لە دوای داستانی (هەندرێن) بە دووەم داستانی شۆڕشی ئەیلول دەژمێردرێت، لە سنووری ناو دەشت و حاجی هۆمەران، سەدان کەس لە جاش و سەربازەکانی ڕژێم کوژران و بریندا بوون...

کە بەیاننامەی (١١)ی ئازار ڕاگەیەنرا قۆناغێکی نوێی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری هاتەئاراوە. ئەو بەیاننامەیە دەستکەوتێکی مێژوویی بوو بۆ گەلی کوردستان. شۆڕشی ئەیلول لە زاخۆوە بۆ مەندەلی دەسەڵاتدار بوو. ئەو جاشانەی پێیان دەگوترا کۆڵوانە سوور لە چەك داماڵران، بە ناچاری داوای لێبوردنیان لە سەرۆك بارزانی و ڕێبەرایەتی شۆڕشی ئەیلول کرد و ئەوانیش لێیان خۆش بوون. لە شۆڕشی ئەیلول دا زۆربەی دەرەبەگ و ئاغاکانی دەڤەری پشدەر، چەکی خیانەت و جاشەتیان هەڵگرتبوو. لە ماوەی(٤) ساڵی مفاوەزاتدا لە بەشێکی فراوانی کوردستانی باشوور، هەلومەرجێکی لەبار بۆ بەهێزکردنی ڕەهەندەکانی تری شۆڕش دروست بوو. بەڵام مخابن هەمیشە بەرپرسەکانی گەلی کوردستان لە کاتی ئاشتی و حوکمڕانیدا تووشی جۆرێك لە خۆبایی بوون دەبن. لەو چوار ساڵەی مفاوەزاتیش دا زۆربەی بەرپرسانی شۆڕش، پێشمەرگەیەتیان لە بیر کرد...

بەندە مێردمنداڵێکی تەمەن(١٧)ساڵە بووم لە دروێنەو ڕیزبەندی دارکەرو جحێڵەکانی گوند ئەژمار دەکرام. سەرەتای قۆناغی هەرزەکاری و سەر بزێوی گەنجایەتیم بوو. گوڕوتینی گەنجایەتی لەو تەمەنە هەرزەکارییەوە دەست پێ دەکات. مامم شەوانە باسی ژن و ژنخوازی دەکرد و هەموو جاریٚ ڕووی لە من دەکرد و دەیگوت: پێویستە محەمەدیش بە ماڵ و حاڵی خۆی بگات، دایکم بە دەم زەردەخەنەوە پشتگیری خۆی بۆ مام برایم دەردەبڕی. پێم وابوو مامم گاڵتەم لەگەڵ دەکات، بەڵام مامم زۆر بەڕاستی بوو، پێی وابوو گەنجایەتی جۆرێکە لە سەرشێتی، دەیگوت تا کوڕان زووتر ژن بێنن، پتر وەچە دەنێنەوەو منداڵەکانیان زووتر گەورە دەبن بۆ کچانیش پێی وابوو هەرکە باڵق بوون شو بکەن باشە. بە گوتەی مامم و پێشینان کچ چەند عادەی مانگانە بشوات، ئەوەندە والی ئەمری کچەکە گوناهبار دەبێ. دەیگوت کچ حەزو ئارەزووی لە کوڕ زیاترە بەڵام شەرم دەکات دەریبڕێ. مامم ئەگەرچی وەکو بیروباوەڕ

شیوعی بوو، بەڵام لە رووی ئایینییەوە زۆر باوەڕدار بوو بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام. بە درێژایی تەمەنی خۆی نەیهێشتووە هیچ نوێژێکی هەینی بچێ. بەردەوام بۆ نوێژی هەینی دەچوو بۆ مزگەوتی بەستەستێنی خوارێ. مزگەوتی گوندەکەی خۆمان نوێژی هەینی پێ تەواو نەدەبوو، لە رووی شەرعیەوە نوێژی هەینی نابێ لە(٤٠) کەس کەمتر بەشداربێ. ئەو کاتە جووتیارەکانی دێهات بەهۆی سەرقاڵی وکاری رۆژانە بە ئاسانی کۆ نەدەبوونەوە. لە دەڤەری پشدەر سیاسەت و حزبایەتی زۆر بە گەرمی وەرگیراوەو پەیڕەو دەکرا، هاو بیرو باوەڕیی پەیوەندی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنا. ماڵی خاڵە مینە وەکو ئێمە هاوڕێ بوون، لە کۆتایی پەنجاکانی سەدەی رابردوودا بەهۆی ستەمی ئاغا میراودەلیەکان کە بە **راوە فلاح** ناو بانگی دەرکردبوو، وێڕای جووتیارە ئاوارەکانی عەشیرەتی نورەدینی، ئاوارەی ناو عەشیرەتی مەنگوڕ دەبێ، بەهۆی پەیوەندی هاوڕێیەتی پەیوەندی کۆمەڵایەتی نێوان خێزانی ئێمەو خاڵە مینە دروستدەبێ. لە رێگای دۆست و هاوڕێیانی ترەوە بڕیاری ژن بە ژنە دەدەن. بڕیار دەدەن بەندەو خێزانم، فاتمەی خوشکم و کاك ڕەسوڵی برای خێزانم بە شەرعی ببینە هاوسەری یەکتر. بێگومان هیچمان یەکترمان نەدیبوو، بەڵام لە رووی بیروباوەڕەوە هاوسۆزی یەکتر بووین، ئەو کاتە تەمەنی بەندە(١٧) ساڵ و خێزانم ساڵێك لە بەندە بچووکتر بوو. فاتمەی خوشکم تەمەنی ساڵێك لە خێزانم بچووکتر بوو، کاك ڕەسوڵ تەمەنی(١٩) ساڵ بوو لە هەمووومان گەورەتر بوو. چوار هەرزەکار لە رێگای ژن بە ژنە، بووین بە ژن و مێردی شەرعی یەکتر، ئەوەندە وردیلەو بچووك بووین، زۆر جار کە میوانمان دەهات ناسراو نەبا پێی وابوو بەندە و خێزانم خوشك و برای یەکترین نەك هاوسەر. لە کۆتایی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی **١٩٧٣** ئاهەنگی ژن گواستنەوەی بەندەو خێزانم سازکرا، لە رێگای جیبێکی سێشن ئاڵوگۆڕی بووکەکان کرا، کاتێ کە بووك لەبەر دەرگا دابەزی، بانگیان کردم بچمە سەربان، بۆ ئەوەی وێڕای هەڵدانی بڕێك دراوی وردەو نوقڵ و شەکرۆکە، سەرە دارێکیش بگەیەنمە سەری بووکێ. ئێستاش تێنەگەیشتم بۆچی دەبێ زاوا بە دار لەسەری بووکێ بدات؟! ئەو نەریتە تا ئەو چەند ساڵەی دوایی لە زۆر شوێنی کوردستان مابوو.

بارودۆخی سیاسی عێراق و کوردستان ئارام بوو، بەڵام گرژی و گلەیی و تەنانەت ڕاوەدونانی شیوعییەکان، لە هەندێك ناوچەی کوردستان دەستی پێکرد بوو. ڕژێمی عێراق لە ساڵی ١٩٧٢ نەوتی خۆماڵی کردو وپەیوەندی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت باش بوو. حزبی بەعس

پرۆژەیەکی بەرەیی ڕاگەیاند حزبی شیوعی عێراقی پشتگیری خۆی لەو پرۆژە بەرەییە دەربری... شۆڕشی ئەیلول بە ڕێبەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان داوای جێبەجێکردنی بەندەکانی ڕێکەوتننامەی(١١)ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ی دەکرد. حزبی بەعس لە ساڵانی مفاوەزات دا گەمەیەکی سیاسی ژیرانەی کرد، کە ئامانجی پاشگەز بوونەوە بوو لە ڕێکەوتننامەی(١١)ی ئازار. حزبی بەعس و ڕژێمەکەیان دوو هەنگاویان هەڵگرت هەردوو هەنگاوەکە ئامانجی سیاسی خۆیان پێکا، پەیوەندی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و ڕژێمی عێراق چووە قۆناغی هاوپەیمانی ناوچەیی، سۆڤیەت عێراقی خستە ریزبەندی دۆستە ستراتیژەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست و، لە رووی راگەیاندن و سیاسی و چەك و تەقەمەنییەوە پشتگیری ڕژێمی دەکرد. حزبی شیوعی عێراقی لە شەستەکان پشتگیری لە شۆڕشی ئەیلول دەکرد بە ڕێبەرایەتی بارزانی. بەڵام لە دوای هاوپەیمانی نێوان ڕژێمی عێراق و یەکێتی سۆڤیەت، حزبی شیوعی عێراقی سەنگەری سیاسی خۆی گۆڕی و پرۆژە بەرەییەکەی لەگەڵ بەعسییەکانی پەسند کرد. بەم جۆرە ئاراستەی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول بەرەو بلوکی ڕۆژئاوا ڕۆیشت، حزبی شیوعی عێراقی و ڕژێمی عێراق بە ئاراستەی بلۆکی ڕۆژهەڵات چوون...

لە ساڵی ١٩٧٤ گفتوگۆی نێوان شۆڕش و ڕژێم کۆتاییهات، شەڕ لە نێوان شۆڕش و ڕژێم دەستی پێکردەوە، حزبی شیوعی عێراقی لە کوردستان قەدەغەکرا. شۆڕش شاڵاوێکی فراوانی دەست پێکرد بۆ گرتن و سزادانی شیوعییەکان. بە دەیان کادری پێشکەوتووی شیوعی لە زیندانەکانی ڕایەت زیندانی کران، حزبی شیوعی عێراقی بە ناوی ئەنساری(بەرە)، لە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی عێراقدا چەکیان هەڵگرت.

بنەماڵەی ئێمە هەر لە بەرەی شۆڕش دابووین، لەگەڵ حزبی شیوعیدا نەڕۆیشتین بۆ ژێر دەسەڵاتی ڕژێم. مام برایم ئەگەرچی خوێندەواری نەبوو بەڵام لەڕووی سیاسییەوە بە ئاگا بوو، هەمیشە دەیگوت حزبی بەعس جێگای بڕوا نییە. چەك هەڵگرتن بۆ ڕژێمی بەعس خیانەتە بە گەلەکەی خۆت. ئەگەرچی هەندێ کەسی نەیار ڕۆژانە ڕاپۆرتیان لەسەر مام برایم بۆ بەرپرسانی شۆڕش دەنووسی، گوایە هاوکاری شیوعییەکان دەکات، بەڵام لەڕاستیدا پێچەوانە بوو، مام برایم دەیان جار بەرەو شارۆچکەی سەنگەسەر دەچوو کە پێداویستی پێشمەرگە دابین بکات. مام برایم لە بەرپرسێکی شۆڕش ماندووتر بوو، کەچی سەرەڕای ئەو دڵسۆزییە کەسانی ناحەز

بەردەوام گومانیان دەخستە سەر مام، برایم هەر ئەو گومانەش بوو لە کاتی شکستی شۆڕش دا بۆ ماوەی هەفتەیەك مام برایمی بە زیندانی کردن دا. لەبەرئەوە ناچار کراین ماڵەکەمان لە گوندی بەستەستێنەوە ببەینە گوندی شەروێت. مام برایم وتی کێشە نییە شۆڕش زیدانیم دەکات، ماڵەکەم پێ رادەگوێزرێ شۆڕش هەرچی دەیکات با بیکات من هەرگیز خیانەت لە گەلەکەی خۆم ناکەم، رق و قینەش ناتوانێ پاڵمپێوەبنێ چەك بۆ ڕژێم هەڵگرم. مام برایم بە درێژایی تەمەن و مێژووی سیاسی خۆی ڕقی لە خیانەت و خیانەتکار بۆتەوە. هیچ کەس لە بنەماڵەکەمان لە شۆڕشی ئەیلول و دواتریش، چەکی خیانەتی هەڵنەگرتووە.

## شۆڕەبی:

شۆڕەبی یا شەنگە بی، لە ژینگەی شێدارو قۆپیدا دەڕوێ سەوزدەبێ. سێبەری شۆڕەبی زۆر لە سێبەری درەختەکانی تر خۆشترە. کە لە ژێریدا بحەویت لەشی مرۆڤ قورس ناکات. لق و پۆپی شۆڕەبی لە کەزی و زولفی شۆڕە ژن دەچێ، هەمیشە کە سەیری بەژن و باڵای شۆڕەبی دەکەم سەرو پرچی شۆڕە ژنێك لە هزرمدا وێنادەبێ.

برادەرێکی دڵتەڕم هەبوو دەیگوت ئافرەت کانییە، سەرچاوەکەی هەنگوینە هەتا بینی پێوەنێی چێژی زیاتر دەبێ و شیلەی هەنگوینی لێ هەڵدەقوڵێ، ئەو پێی وابوو ئافرەت ناشیرینی و ناجوانی  نییە، بەڵام خۆیان وا نازانن. هەروەها دەیگوت بەڵام کاتێ ژن لە پیاو هەڵگەڕایەوەو ڕقی لێ هەڵگرت غەزەبێکە جەهەننەم بۆ بەرامبەرەکەی دروستدەکات... پەندێك هەیە دەڵێ: سێ شت بۆ پیاو پێویستە: لە ژیاندا ژنێکی باش، خانوویێکی خۆش، ئەسپێکی سواری. هەر لەسەر ژن دەیان وتەو پەندی زانایان هەن کە لێرەدا بابەتی نووسین نییە، باسەکەمان لەسەر شۆڕەبی بوو، دەیان جار لە ناو شیوی بیشەلێندا بەتایبەتی لە چۆمی مەلا ئاڵی (شەروێت) لە کاتێ منداڵی خۆمان لە تەیارە دەشاردەوە، لە ناو بیشەلێنەکەدا باخچەیەك هەبوو لە ناوەڕاستی باخچەکە شۆڕەبییەکی جوانی لێ بوو، زۆر جار ئەو شۆڕەبییە سێبەری لێکردووین، حەزدەکەم لەسەر گۆڕەکەشم دوو شۆڕەبی بنێژرێن بۆ ئەوەی لە گۆڕیشدا شۆڕەبی سێبەرم لێ بکات، ئەم دێڕەش بنووسرێ...

**شۆڕەبی دەستم وەدامانت لقەکانت شۆڕ بکەوە**

**لـــە گـــۆڕیشـــدا دامپـــۆشـــەو بشـــارەوە**



شەهید هیوا و هاوڕێیانی – پشتئاشان ١٩٨٣/٤/٤



نووسەرو دایك و خوشك و برایەكانی ١٩٨٢



ناوەراست نووسەر، هاوڕێ محمد دەڵگەڵەیی، شەهید محمد رسول -سەردەشت ـ ١٩٨٠/٧/١٥



لە چەپەوە دووەم نوسەر، شەهید رسول ، هاورێیانی سلێمانی ـ گوندی بێتوش ١٩٨١



ناوەڕاست: نووسەر، شەهید مام ڕەسول، شەهید محەمەد ڕەسول



ناوەڕاست: نوسەر، هاوڕێ ئەحمەد کاکی بەکر، شەهید قادر دەڵگەیی ـ گوندی گۆرەشێر ـ
١٩٨٠/١١/١٥



له راستەوە: نوسەر، وەستا رەسول. سورە، خدر وەستا رەسول، فەقێ عەبدوللا. ئەحمەدی کاکی بەکر

ـ ناوزەنگ ـ ١٩٧٩/٥/١



نووسەر، کاك سەرۆ قادر - رانیە ـ ١٩٩١/٣/٣١



نوسەر، لەگەڵ هاوڕێیانی لقی پشدەر ـ پشت ئاشان ـ تشرینی دووەم ساڵی ١٩٨١



شەهید عەلی حاجی و هێزێك لە هاوڕێیانی پێشمەرگە



نووسەر هاوڕێیانی لقی پشدەر - رۆژهەڵاتی کوردستان  گوندی مەشکان ـ ١٩٨٣/٦/٥



هاوڕێیانی لقی پشدەر لەکاتی رۆیشتندا ـ ئالۆەتان ـ



نووسەر، مستەفا غەفور، خوالێخۆشبوو رەحیم عەزیز، کاك تۆفیق ـ مێرگی زەڵێ

١٩٨٠/٩/١٠



ئۆردوگای بەستەستین ماڵی کاك محەمەد حاجی بابەکری ـ مامەش ـ نوسەر لەکاتی ئەرکی رێکخستن

١٩٨٧/٥/٢٨



**له چەپەوە: نوسەر، شەهید هێمن ـ ئاڵوەتان ـ ١٩٨٣/٧/١٠**



**نوسەر لەگەڵ هاوڕێیانی لقی پشدەر کوردستانی ڕۆژهەڵات گوندی (مەشکان) ١٩٨٣**

\



نوسەر، مام وەلی ـ ئالوەتان ـ ١٩٨٦/٨/١٧



نوسەر، هاورێ مەحمود حاجی فەقێ خدر ـ ئالوەتان ـ ١٩٨٥/١٢/١٠



نوسەر ـ سەرچیای بێدو ـ ١٩٨٧/٥/٢٥



نووسەر، هاوڕێ مەحمود حاجی نادر، هاوڕێ حەمەرەشید قەرەداغی، خاڵە حەمە ـ قۆپی قەرەداغ

١٩٩٣/٢/٢٧



نوسەر، هاوڕێ سورە، کوێستانی خانی کچی هاوڕێ سورە ، ڕاستی برای. دوای ڕاپەڕین سلێمانی



نووسەر. هاوڕێ کاروان ئاکرەیی ، سورە، شەماڵ حەوێزی کانی گەرۆتە لە بناری سەفین ـ

١٩٩١/٦/٢٩



له راستەوە: نوسەر، هاوڕێ ریاز، کاتی بەفر ماڵین ـ ئاڵوەتان ـ ١٩٨٨/١/٢٩



دایکی هاوێر و خوشکە زەینەب خێزانی هاوڕێ گۆران لەکاتی نانکردن ـ ئالوەتان ـ ١٩٨٨/١/٢٣



نووسەر و هۆنیای کچی ـ ئالوەتان ـ تشرینی یەکەم **١٩٨٧**



مام خدر دەروێش، مام برایم، بەکری برام لەکاتی وەرگێڕانی فەردە توتن ـ بەستەستێنی سەرێ **١٩٨٢**



هاوڕێ عەلی سەیدە – کوێستانی قەندیل – ١٩٨٣



نووسەر- هاوڕێ حەسەن خدر

زەلێ - ١٩٨٠



نووسەر لەکاتی شەڕەبەفر لەگەڵ هاوڕێ عەلی گۆران – ئالوەتان – ١٩٨٨/١/٣٠



نووسەر، هاوڕێ هەمزەسور
ئالوەتان – ١٩٨٤/٤/٢٩



ناوەڕاست: نووسەر، هاوڕێ خەلیفە پیرۆت، مام برایم، رانیە بناری کێوەرەش — ١٩٩٦/٤/١٠



نووسەر و هەرسێك منداڵەكانی (هۆنیا، هاوێر، رەوەند) ١٩٨٨/١/٢١ ئاڵوەتان



نووسەر – لەکاتی ئەرکی پێشمەرگایەتی لە چیایی (بێدێو) ١٩٨٦



نووسەر ڕێگای دۆڵەکۆگە – سوێسنێ ١٩٨٦



نووسەر - لەکانی زودان لەکاتی مەفرەزە ١٩٨٧



مام جەبار - ١٩٨٤



نووسەر — گوێزلێ — تەمموزی ١٩٨٦

